


# میژوی ئەدەبی کوردی



## میژو ، ئەدەب ، زانیاری

« تأریخي کورد لەبەرەبەیانی میژوی ئادەمیزادەوە ،
باوەرری بیگانە بەرامبەر بە کورد .
میژوی ئەدەب ، ئەدەبی زمان ، داهاتنی ئەدەب لە
عالەمدا، ئەدەبی کورد ، چیروکی کورد ، پەندی پیشینان ،
شاعرە هەرە گەورەکانی کورد ، ئەدەبی روژنامە . .
ئەدەب لە روژەلانی کوندا ، بەزاوردی ئەدەبی
کوردی لەگەل ئەدەبی میسری کون ، فارسي کون ، چینی
کون ، هیندی کون ، عیبری کون ، یونان ، . روماز »

علاءالدین سجادی

١٣٧١هـ - ١٩٥٢م

لە چاپدانەوەی بەدەست خاوەنیەتی

(زانا دانایە، دانا توانایە)

# مێژوی ئەدەبی کوردی

## مێژو ، ئەدەب ، زانیاری

« تاریخي کورد لەبەرەبەیانی مێژوی ئادەمیزادەوە ،
باوەرری بیگانە بەرامبەر بە کورد . .
مێژوی ئەدەب ، ئەدەبی زمان ، داهاتنی ئەدەب لە
عالەمدا، ئەدەبی کورد ، چیروکی کورد ، پەندی پیشینان ،
شاعرە هەرە گەورەکانی کورد ، ئەدەبی روژنامە . .
ئەدەب لە روژەلانی کوندا ، بەزاوردی ئەدەبی
کوردی لەگەل ئەدەبی میسری کون ، فارسي کون ، چینی
کون ، هیندی کون ، عیبری کون ، یونان ، . رومان »

علاءالدین سجادی

١٣٧١هـ - ١٩٥٢م

لە چاپدانەوەی بەدەست خاوەنیەتی

چاپخانە معارف —

# سەرەتا

دەمی ساڵە ، بگرە ئەوەتی هۆشم کردوتەوە لە کانگای دڵمەوە حەزم لە ئەدەب و ئەدەبیات کردوە ، بەو بۆنەوە گەلێ جار خەریکی ئەدایە خوێندنەوەی ئەوشتانە کە ئاشنایەتیان بە ئەدەبەوە هەیە؛ بەتایبەتی هێنەکانی رۆژهەڵات چە عەرەبی، چە فارسی- ئەمە بێجگە لە ئەدەبیاتی رۆژاوا - جۆشو خرۆشێکی ئەدامی و ئەبخستمە عالەمێکی ترەوە . ماوەیەکی باش ئەمە ئیشم بوو بە بێ ئەوە بچم بەلای بیرو باوەڕێکی ترداا . .

رۆژێک شتێکم ئەخوێندەوە کە ، لێ بومەوە سەرلەنوێ لەدڵ خۆما وردم ئەکردەوە،لەمەوە کوتوپڕ ئەوە هات بە بیرما: کە ئایامن چیم؟. ئنگلیزم؟ نەأ عەرەبم؟ نەأ . بەڵکو کوردم . باشە کەکوردم ئەبێ لەنەتەوەی کوردبم ، کە لەنەتەوەی کورد بوم ئەمەی تێ گەیاندم : کە کورد ناوی لە لاپەڕەی روزگاردا هەیە و ئەمیش قەومێکە بۆ خۆی . زۆری پێ نەچو لەو دەریای خەیاڵەدا کەوتمە سەرئەوە .کە میلەت مادام میللەت بو بەبێ گومان ئەبێ زمان و ئەدەبیات وتاریخێکی بێ، ئەگەر نەبێ بە هیچ ئەژمێرری وهیچ نیە ، لێرەدا سەرم لێ تێک چو : . تەماشای خۆم ئەکەم هیچی ترنیم تەنها کورد نەبێ ، تەماشای بارەکەی تری ئەکەم سەیر ئەکەم تەنیا کورد نەبێ هەمو شتێکی ترم !.

کسپەیەک لە دڵمەوە هات ، بەوە دڵی خۆم دایەوە کە ، وتم : بەڵگەی قەوی کە زمانە ئەوا من هەمە ، من لەنەتەوەی قەومێکم کە لە بەرەبەیانی تاریخەوە بەم زمانە کەمن قسەی پێ ئەکەم و پێ ئەنوسم قسە ئەکەن وهیچ کوسپێک لای نەداون لەرێگەی خۆیان ، بەتایبەتی کە ئەمبینی « ئەمیر شرف خان » ی بتلیسی لە « ١٠٠٥ » ی هجری و « امین زکی بەگ » لە ١٩٣٦ ی میلادی تاریخیان بۆ قەومەکەم نوسیوە بست بست گەشکەم ئەکرد و هیوام بە خۆم و بە قەومەکەم تازەتر ئەبوەوە .

زور سەیربو، بەلیخوم و قەومەکەم بەکامەران ئەبینی وە ئەو ریچکەیەش کە گرتبوم لە خویندنەوە و فیکر کردنەوە هەر بەرەلام نەکرد تاروژیکێ هات بە دلما وتم : کولەکەی هەرە تاێی قەومیەت ئەدەبیاتە . پایەی قەومیکی پینج هەزارسال لەمەوپیشی ئیستە بە ئەدەبیاتە کەیدا بو پیاو دەر ئەکەوی وەکو هینەکەی ئیستە هەر بەو بو پاشەروژ دەر ئەکەوی . دەی خو ئیمە، یا یکیکی وەکو من شتیکمان بە دەستەوە نی‌یەکە میژویەکی ئەدەبیاتمان بیت تا روژانی رابوردومان بینیتەوە پیش‌چاو لەگەل ئەوەش گومانی تیدا نی‌یە کە بە هەزاران هەزار پیاوی نام، ئەدیب و شاعرمان تیدا هەلکوتوە هەر یەکە بوخویان دەوریکیان گیرٛاوەو رویشتون... ئەوەم هات بەدلداکە ئایا لەم هەمو رابوردوانەو لەم هەمو هەوانانسانە بوچ یکیک یا چەندەکەسیکمان نەبوزو نەهساتن میژویەکی ئەدەبمان بو دابنین تا نەنەوەکانی ئیمروژیان بەم جورە سەرگەردان نەبن ؟ . . وەلامی ئەم پرسیارە خوینەر لە ناو کتیبەکەدا بەرچاوی ئەکەوی . لە پاشەروکی خەیالەکانا کەوتمە سەر ئەوە کە بەلکو چاک بکەم بەلاداو میژویەکی ئەدەبی کوردی دابنیم بو خوم و بو ئەو قەومەم کە تا ئیستە لەم سوچەوە بی‌بەش بوون، ئەمەش بو ئەوەکە رولەکانی ئیمروژ و پاشە روژمان بیگرن بە دەستەوە و لە ریزی ئەو قەومانەدا راوەستن کە میژوی ئەدبیاتی خویانیان بە دەستەوەیە . . ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە بالومەی کوررانی کوردی پاشەروژمان نەیەتە سەر وەکو لومەی ئیمە ئەچیتە سەر پیشینەکانمان ، لەگەل ئەوەش ئیمە هەقمان نی‌یە لومەی ئەوانەی پیش خومان بکەین - وەکو لەمەودوا باسی ئەکەین - بەلام هینەکانی پاشەوە هەقیان هەیە لومەی ئیمە بکەن .

من دان بەوەدا ئەنیم کەدانانی میژویەکی ئەدەب - لە هەر زمانیکابی - ئیشی تاقەکەسیک نی‌یە بەلکو پیوستە بە لیژنەیەکی داناو زانا تا بتوانن ئەو ئەرکە بە ریوە بەرن . بەلام ئەم بروایە نابی پیاو لە ئامانجی خوی بخا ، پیاو

ئەبی باوەرری لە کیو و هیزی لە پولا تایتربی . گومان و ترس دو ئەهریمەنن بە دریژایی سال لەگەل پیاودا لە جەنگدان و پیاو بەرەو دوا ئەگیرنەوە ! ئەو کەسەش باوەرری بە سەرکەوتن بی ئەبی هیزە پولاینەکەی بخاتەکار بو لەریشە هەلکیشانی ئەو دو ئەهریمەنە: هیچ کەس لە هیچ ریگەیەکدا لەم جیهانە بەسەر هیچ ئارەزویکیدا زال نەبوە تا ئەو هیزەی خوی نەخستبیتەکار .

با ئەوەش بزانین وەکو ئەو ئەهریمەنانە بو هەموکەس هەن ئەو هیزەش هەر وەها بو هەموکەس هەیە . جا ئەگەر منیش بهاغایە و بەو تایە ئەم ئیشە لە توانای مندانیە یکیکی تریش لە پاش من ئەویش هەروای ئەووت وبەم جورە ئەم بو ئەوی ئەهیشتەوە و ئەو بو ئەو تا دنیا دنیابوایە بەم چەشنە ئەمایەوە و لە باتی ئەوە کە وەکو ئاویکی رونی رەوان هەر لە روەیشتندابین ئەبوین بە ئاوی بوگەنی گومیك کە لە شوینەکەی خویدا مایتەوە ! .

ئەمـــە ئاشکرایە کەیانی هیچ قەومیك چە سیاسي ، چە ئەدەبی ، چە کومەلایەتی ، چـە ئایینی کوتوپرر و لە پرریکا نەگەیشتونە ئەم پایەیە کە ئەبینری یا ئەخوینریتەوە ، بەلـکو لە سەرەتاوە تاقە یەکیك دەستی داوەتی ئینجا بەرە بەرە پاشماوەکانی ئەو ریك و پیکیان کردوە ؛ ئیستە منیش ئەمە دائەنیم و ئەیکەم بەبناغە، هیوادارم قەومە خوشەویستەکەم بەچاوی لی بوردن لە ناتەواوەکەی ئەبورن و لە روژانی پاشە روژدا لە کولیتیکەوە ئەیکەن بە کوشکیك .

ئەزانم ناتەواوی تیدا هەیە چونکە ئیستە من ئەگەر بەوی میژوەکی ئەدەبی عەرەبی یا فارسي ـ کە ئەمانە لە روژهەلاتدان ـ دابنیم زور زورم بەلاوە ئاسانە ، چونـکە کـتیب وسەرچاوە زورە بیانهینەو دایانبنی و لیان وەرگرەو کویان کەوە ئـــەوە بو بەکـتیب بەلام لە زمانیکی وەکو زمانی کوردیدا دو کوسپی زور گەورە لە ریگەدایە ؛ یەکەم بی سەرچاوەیی ، دوەم یەك نەخستن و یەك نەکردنی شیوەکانی زمانی کوردی . بەلی شیوەکانی زمانی

کوردی هـەمو لەیەکێ ریشەیەو پەل پەل بونەتەوە بەلام ئاگاداریی بەسەر ئەو پەل ولقانەدا وەنەبی شتیکی ئاسان بی ، لی کولینەوە لە شیوەیەکێ و تی گەیشتن لە بنچینەکەی تەنیا ئەمە ژیانیکیسەربەخوی ئەوی کەچی سەررای ئەمە پەلامارداتی بو شیوەکانیتر دیارە ئەمە ئەبی لە وزەی تاقە کەسیکا نەبی . لەکوی ئەوە کە پیاو تەنها خەریکی لی کولینەوەی شیوەی موکری بی ؟و لەکوی ئەوە بچی بو هی بوتان و لورر و هەورامان ؟ ئەگەر یکیک بەچاویکی وردبینەوە ورد ببیتەوە لام وایە ئەم ئەرکێ و عەزیەتە بەکەم نازانی وە ئەکەویتە سەر ئـەو باوەررە کە پیکهینانی شتیکی وەها زەمانیکی دور و دریژی ئـەوی وحەرام کردنی هەمو ناز و نعمەتیک .

ئەم کتیبەی ئیستە لەبەر دەستایە کردو کوشی گەلی سالە ، گەلی سالە کەلین وقوژبنی کوردەواری بە زمازو بەقەلەم ئەپشکنم،بیجگە لەباسی کوردو باسی ئەدەبی بیگانە ـ ئەسلی ئەدەبیاتە کە خوی هیچ سەرچاوەیەکی کالـکێ بەخش ـ کە لەسەر لاپەررەیەکێ چاپ کرابی ـ نەبوە و نی یە ، سەرمایەی دەستم بو ئەم ئیشە « ٤٩٨٠ » پارچە کاغەزە کە لەماوەی ئەم چەند سالەدا لەم و لەوم پرسیوەو کوم کردوتەوە لە باری چونیەی ژیانی ئەو شاعرانەدا کەمن لیرە نوسیومن ، ئەم ئەرکەش هەمو بو ئەوەکە « مستشرق ـ روژلانی ناس » یکێ ئاشنابی بە ئەدەبی کوردی وەکو چون کوردەکەش خوی لە ئەدەبی باو باپیری خوی نزیکێ ئەبیتەوە .

دیسان کەم و کورریەکیتر لەم کتیبەدا هەیە ، ئەوەش ئەوەیە : ئەبوایە لە سەرەتا دا کەباس ئەکرا بەپی دەورو چەرخ هەچ شاعریکێ بوە لە کورد دا بە ریزە باس بکرایە بو ئەوە بەسەرە بهاتنایە خوارەوە ، نەوەکێ ئیستە شاعریکی دو سەد سال لەمەوپیش قسەی لیوە بکریت و کەچی لە بەرگە ـ کەیتردا بچیتە سەر شاعریکێ کە دو سەد وپەنجا سال لەمەوپیش بوە ا ئەم رەوشتە دیارە بو باسی میژو یا بو میژوی ئەدەب من پی لی ئەنیم کە ناپەسەندە .

بەلام چبکەم لەبەر بێ سەرچاوەیی دەسەلاتم نەبو بە سەر پیکهێنانی ئـەم روشتەیەدا ، ئەمەش لەبەر دەست نەکەوتن بو . خو ئەگەر بەهاتبایەو چاوەرری ئەو یاسایەم بکردایە ئەبوایە لە کتیبەکە بگەررامایەو بکەوتایەتە گوشەی لەفکر چونەوەوە .

هەر وەها رەنگی ئەو رەخنەشە بگیریت : کە سەرەتای باسی شاعرەکان کوردیەکی رەقەو پیاو تێنا گەیەنی . بو ئەم رەخنەیە مل نادەمە پیشەوە چونکە کتیبەکە کتیبیکی ئەدەبی‌یەو ئەو کوردیە کە لەویدا هەیە هەموی کوردیەکی باوی بەسەر زارەوەیە و هیچی‌تازە کورەو دەست هەلبەست نی‌یە، ئەمە یەک ، دوهەم با ئەدەبی زمانی کوردی ئەوە پیشان مەردم بدا کە ئەگەر بهاتایەو خزمەتیکی راستەقینەی ئەم زمانە بکرایە تائیستە جوانی و دلکراوەییکی ئەبو نەوەک کورری زمانەکە بەلکو هەمو بیگانەیەک شیفتەی جەمالەکەی ئەبو،جا بو ئەوە ئەو جەمالە لەئاسمانی ئەدەبیاتی کوردیدا وەکو روژ دیاربی نەمتوانی دەست لەو نیگاوە هەلگرم .

ئەم کتیبە هەرچەندە میژوی ئەدەبی کوردی‌یە بەلام لەبەر ئەوە زانینی ئەو قەومە کەمیژوی ئەدەبی هەیە پیویستە ، ئیمەش هاتین رەوشتی ئـەم کتیبەمان بەو جورە دامەزراند کە لە پیشا باسی کورد و وشەی کوردو بنچینەی کورد بکا لە گەل شوین و سەرژماریانا ، لە پاش ئـەوە باسی ئەدەب وچونیەتی ئەدەب و داهاتی‌ئەدەب لە عالەمدا ، بەشوین ئەودا ئەدەبی کوردی لە ئەدەبیکی‌زور کونەوە، پاش ئەو ژماردنی هەندی لە شاعرانی کورد لە گەل میژوی مردن و ژیانیانا بەپێ دەسلات ، لەپاشا باسی شاعرە هـەرە گەورەکانی کورد ئەوانەی بەربەلاو کەوتون ، بەشوین ئەمانەدا ئەدەبی روژنامەی کوردی . ئینجا بەراورد کردنی ئەدەبی کوردی لە گەل ئـەدەبی عالەمدا تا ئـەگاتە سەرەتای چەرخەکانی ناوەراست و سـەرەتای داهاتنی ئیسلامەتی لەم بەرگەدا .

بو ئاگادار بون بەسەر گەلی لەم شاعرانەدا سوپاسی قەوی خوشەویستی کورد ئەکەم کە یارمەتیان داوم بە تایبەتی « حسن بەگی جاف » و « عقید محمد علي بەگی کوردی » کە زور دلسوزییان لەگەل نواندم ، سەرچاوەی هەمو سوپاسیک بو خوایە و هەمو یارمەتیەک هەر شایانی ئەوە .

٢٥ / ١ / ١٩٥١ : بەغدا .

علاء الدین سجادی



# بیخ و بنەوانی کورد

## میللەت ، یا ناسیون ، یا قەوم

زوتر بەپەرەوی کەری هەر ئاینێک پیان ئەوت میللەت ، وەکو میللەتی ئیسلام ، میللەتی گاور ، میللەتی جولەکە . ئەمانە با زمان و رەوشتیشیان جیا بوایە مادام پەیرەوی کەری ئاینێک بون هەر بە یەک میللەت ناو ئەبران . لە پاشا زاناکانی ئاوروپا کەوتنە سەر ئەو باوەڕە کە میللەت ئەوەیە زمان یا خوین یا نەژادیکی هەر بەخوی بی و وشەی « ناسیون » یان بو ئەم مەعنایە لە باتی میللەت دانا . لەم دەورەی دواییەدا توزی پیشتر کەوتن هەنگاویکی تر بو ئەم مەعنایە هاویژرا کە : گویا تەنها زمان یا خوین یا نەژارد بەش ناکا بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا رەوشت و عادەت لە شادی و لە شیوەن ، لە خەفەت و لە خوشی ، لە کاروباری مەلبەند و بنەماڵەییش پیویستە ، هینرا بو ئەم کومەلە مەعنایە وشەی « قەوم » دانرا .

کەوابو هەر کومەلە مەردمیک کە لە رەوشت وخوین و رەگەزو زماندا تیکلاو بون ئەمانە بو خویان ئەبن بە قەومیکی تایبەتی و جوی ئەبنەوە لە کومەلە مەردمیکی تر . لیرەدا پاش ئەوە بەشوین بەلگەدا بسوورڕینەوە بە ئاشکرا ئەزانین کە قەومیک هەیە ناوی « کورد » ە و بە یەک زمان قسە ئەکەن و لە سەرەتای ژیانیانەوە تائیستا هاوبەش وشەریکن لە شادی و سرودو لاوانەوەو شیوەن و هونینەوەی شعوری کومەلایەتی وسەرگوزەشتی و جەنگی ناو خویان و دەورو بەریان کە ئەمانە ئاوینەیەکی هەرە رونا کن بو بینین و ناسینی چونیەتی خوو رەوشت و ژیانی کومەلایەتی وسیاسی هەمو قەومیک. دیسان عالمە نەژاد شناسەکانی وەکو « ریبج » و « سولاک » و « فون

لوشان » و «ئوژن پیتار » و گەلیکی تریش بویان ساغ بوتەوە کە قەومیک هەیە بەکێ خویقیان هەبە و ناویان « کورد »ە. ئینجا ئیمەش بەپی توانا ئەمانەوی لەم روەی دوایەوە کە ئیستا پی ئەلین « میژوی ئەدەب » بو لاوانی دوا روژی کورد لیوە بدوین و قەومەکەمان لە سەرەتای ژیانیانەوە لەم ئاوینەیەدا پیشان بدەین .

ناوی ئەم کتیبە « میژوی ئەدەبی کوردی » یە و ئەبی لە ئەدەبی کورد بدویت ، بەلام ئەمە پیوستە بزانری ئەو قەومە ئەدەبەکەی هەبە چی یە و چەکەسە ، لەبەر ئەوە بەشیکی زور لە بەرگی یەکەمی کتیبەکە بو دوزینەوەی کورد و سەرچاوەی کورد دا گیر ئەکری کەئەمە ئەگەریتەوە سەر میژوی روت ولادان لە باسەکە ، بەلام لەبەر ئەوە تائیستە بە تەواوی قسەیەکی ساغ لە باری « کورد » دا بە راستی نەدراوە بە دەستەوە لام وایە ئەم باسە لە باسی ئەدەبەکە بەکەلکتر ئەبیت و پاشەروژی میژو چاکتر رون ئەکانەوە ، بەو بونەوە دور نیە تازانجی لەو زیانە زیاتر بی کە لادانە لە باس .

کورد : لە لایەن بناغەی کوردەوە گەلی کەس لە روژەلاتی ناسەکان و لە زاناکانی روژەلاتیش لیوە دواون ، بەلام ئایا باسەکە گەیەنراوەتە ئەنجام بەجوریکی وەها کە بە پاك کراوی لەبەردەم پیاودا دای بنین یان نە ؟ . رەنگی نەبوبیت چونکە جاری میژو نوسەکانی ئیسلامی و عەرەب هەریەکە بە جوری پیشانیان داون ! .

سەیر ئەکەیت یکیکی وەکو « مسعودی » دەمیک ئەلی : ( لە بەچکە دیوەکانی دەوری سلیمان پیغەمبەرن ! ) دەمیک ئەلی ( لە پاشماوەی ئەو ئادەمیزادانەن کە ئەکران بە خوراکی مارەکانی سەرشانی زوحاک ! ) دەمیکیش ئەلی : ( لە نەتەوەی صەعصەعەی کوری بزاری کوری معدن ، سەرچاوەیان ئەچیتەوە سەر غەسانی ! ) لە لا یەکی تریشەوە ئەلی : ( لەنەتەوەی

ئەسفەندیار و مەنوچهرن ! ) کە ئەمانە فارس بوون .

( ابن حوقل ) ئەلی : ( کوردی کورری ملردی کورری عمرو ! ) . (طبری) و ( فەیروزابادی ) بەو ریگەیەدا چون کە گویا ئەمانە ئەچنەوە سەر کوردی کورری عمروی موزیقیاء ، وورده ورده سەرەو ژور ئەبنەوە بو یعربی کورری قحطانولەویوە بو سامی کورری نوح !! .. لەسەر قسەی ئەمانە ئەم ولاتی کوردەواری‌یە ئەبی چولو هول بوبیت تا ئەو وەختە ئەمانە لە دەورو بەری پینج سەد سالیک پیش میلاد دا چوبن وئاوایان کردبیتەوە!.

لە روژەلاتی ناسەکان « مینورسکی » لە « دائرة المارفی ئیسلامیدا » ئەلی : ــ

« دورنیە قەوەی کورد لە وەختی خویدا لە روژەلاتی ئیرانەوە هاتبیتنە روژاوای‌ولەو شوینەدا خویشی قەومیکی‌لی‌بوبیت وەکو « کارود » ولەگەل ئەمانە تیکلاو بوبیتن وبوبن بەیەك » . هەر مینورسکی لە زمانی روژەلاتی ناس « توروودانگین » ئەیگیریتەوە کە گویا ئەو ئەلی : « لە هەندی لە گوفارەکانا چاوی بە دو پارچە لەوح کەوتوە و وینەیان لەسەر بوەو تاریخیان ئەگەریتەوە بو دوهەزار سال پیش میلاد ، گویا وا پیشان ئەدەن کە لە ولاتی ئاشوردا ولاتیك هەیە پی‌ئەلین « کار ـ داکا » ئەمەش‌وا پیشان ئەدا کە قەومی کورد لەو شوینەدا بوون» هەر وەها ئەلی : «لە گیرانەوەی عەرەب‌و ئەرمەندا وادەر ئەکەوی کە زەوی وزاری‌ولاتی « کارود » زور تەنگ بوەو سنوری ولاتی « کوردوئین » بوئیمە بە تەواوی دەر ناکەوی ، ئەوەندە هەیە «سە» شار هەبوون لە دەوروبەری«دجلە» ئەتوانین بەهی ئەوانی‌بناسین. وەکو « ساریز » « ستالکا » « پنیاکا » کە فنیکی ئیستەیە . لە باسەکەی روژەلاتی ناس « سترابو » وا دەر ئەکەوی کە وشەی « کوردوا » سەر دەمیك بەو کیوانە ئەوتران کە لە بەین « دیاربەکر » و « موش » دان .

هەرجوربیت قەومی « کاردخوی » هەبوون ئەوەندە هەیە وشەی

« خوی » لە شیوەی ئەرمەنیدا بوجمع بەکار هینراوە ـ ( کەوابو « خوی » لە ئەرمەنیدا وەکو « کان » لە کوردیدا وایە ، وای لی دیتەوە یەعنی کوردەکان ) ـ کاردو لە زمانی ئاشوریدا بەمانا بـەهیزوئیش کەرە . لە لایەکی تریشەوە لیکچون لەبەینی ئەو وشانەو وشەی « خالدی » دا هەیە . خالدیەکان لە زەمانی ئاشوریەکانا پیپان ئەوتن « ئورارتو » چونکە لەدەورو بەری کیوی ئارارات دائەنیشتن . لە دوانی هاتنی سەدەی نوهەمی پیش میلاد ئەم خالدیانە لە ئەرمەنیەدا هەبون وحکومەتیکی بەهیزیان دامەزراندو لەوانەیە تاسەرەتای سەدەی شەشەمی پیش میلاد لە دەورو بەری دەریاچەی « وان » دا ژیاون .

قەومی کاردو لە قەومەکانی سامي بن يان نەأ ، ذانیشتوی راستی ولاتەکەی خویان بن یان نەأ ، ئەوی . شکی تیدانەبی ئەوەیەکە ولاتەکەیان « کاردشو » ی کون نیشتمانی ئەم قەومی کوردی ئیستەیە بوە . ئەگەر ئەمە راست بیت ئەبی ئیمە دان بەوەدا بنین کەوشەی « کوردشوی » لە گەل وشەی « کورد » دا لە ونەکەدا هاوبەشن ، ئەمەش لەم سەرەتای چەرخی بیستەمەدا دەرکە وتووە

دیسان ئەگەر جاریکیتر سەیری ئەم باسە بکەین وامان بو دەرئەکەوی کە قەومی کورد لە گەل خالدیەکانا یەکن چونکە روژلانی ناس « ربسك » ئەلی : « خلدی ، کوردی ، الـکرد » هەموی لە گەل وشەی « کوردیای » یەکن ویەك مانمایان هەیە » . بە راستی روژەلانی ناس « هبشمان » کوششیکی زوری کردوە بو ئەوەکە « کوردریح ـ کوردیخ » و « کورتیوی » بکاتەوە بە یەك ، لە گەل ئەمەشدا ئەوجیاوازیە زمانیە کە «هارتمان» و«نولدکە» دایان ناوە نابیتە کوسپ بوئەوە شکلەکەیان تیکلاوبی ، چونکە نولدکە هەرخوی ئەلی وشەی « کارتیوای » لە لوغەتی ئارامیدا ووشەی « کارتاویە » لەعەرەبیدا ئەمانە هەردو کیان بەسەر قەومی کورددا ئەوترین « هوفمان » .

روژەلانی ناس « سیرسیدنی سمیث » لەژیر ناوی « کوردوستانی کون » دا پا کژینی باسەکەی ئەلی :

« دورنیە ئەو هەرێمەکە روژەلانەکەی کەرکوکە و روژاواکەی شیوی خاپور ، لای شمالی دەریاچەی وان و لای جنوبەکەشی ولاتی بابلە قەومی « شوبار » ی لی دانیشتبیت کە گەلی‌جار سوم‌ریەکان هەندیکی یا هەمویان داگیرئـەکرد ، شتیکـی‌وا بەرچاو ناکەوی کە ئاشنایەتی لە بەینی لوغـەتی دانیشتوانی راستەقینەی ئەو شوینە و لوغەتی ( سامی ) یا ئاری ( هیندو ـ ئاوروپی ) دا بەیدابکا ، هەروەها ئەم پچرانەی لەگەل لوغەتی سوم‌ریەکانیشا هەرهەیە . لەدەورو بەری ( ٢٣٥٢ ) ی پیش میلاد هـەموو کوردوستان پارچەیەکێ بو لە ولاتی ( سارگون ) پادشای ( ئاکاد ) و هی‌جی‌نشینە کەشی ( نارام سین ) بو . لە دەوری سیـەمی حکومەتی ( ئوور ) دا لە ( ٢٣٠٠ ـ ٢١٥٠ ) ی پیش میلاد ئەو بەشەی کوردوستان کە کەوتبوە روژەلاتی ( دجلە ) وەکو هەرێمی ( سیمورو ) کە ( ئالتون کوپری ) بە و دو ناوچەی ( ئەربو ) کە حەلوانەو ( سامرو ) لەگەل ( ئوربیللوم ) کە هەو- لیرە لەلایەن ئەم حکومەتی ئوورەوە گـەلی‌جار لەشکری تی‌ئەهـینراو ویران ئەکرا .

لە بەینی سەدەی دەهەم و سەرەتای سەدەی نوهەمی پیش میلاد دا ئارا- میەکان خویان گـەیاندە شیوەکانی ( خاپور ) و هـەموو ولاتی ( خوری ) کونیان داگیرکرد ، ئەم ولاتە لەبەین سەدەی چواردەهەم و سەرەتای سـەدەی نوزدەهەمـدا لەژیر چاویری ئاشوریەکانابو . ئاشوریەکان هەموو جار لەبەرئەوە کوردەکان هـەرخەریکی ئاژاوە و هەرا هەرابون بەرامبـەر بەوان چاویان ئەبردیە ولاتەکەیان بوئەوە بیخەنە ژیردەست خویان. لەبەلـگەـ کانی سەدەی ( ١٣ ) ی پیش میلاد وا دەرئەکەوی کە هیـچ گوبەندیکێ لەم هەرێمەدا روی نەداوە نەنیا ئەوە نەبی‌کە قەومیکێ بەناوی ( پاپهی ) بەوە پەیدا بون و ئەم ناوەش هەتا ئەم دەوری درایی‌بە بە ( کورتی ) ئەخوینرایەوە . هەندی‌کەس ئەم ناوە لەگـەل ناوی ( کورد ) دا بە یەکیك ئەزانن : بەلام

لەم ئاخرەدا بەلـگـە دوزراوەکانی ( بوغاز کوی ) وا پیشان ئەدەن کە قەوـ میکی‌تر هەبوون بەناوی ( پاپانخی ) یەوە ، دور نیە ئەم ناوە لەگـەل ناوی ( پابخی )دا یەک بگرنەوە و بەلام لەپیشا بەهەلە خوینرابیتەوە . لەناـ وەندی چەرخی ( ١٣ ) دا ( حیثی ) یەکان ئەهاتن پروپاگاندەیان بەپیچەـ وانەی ئاشوریەکان بلاو ئەکردەوە بەلام تیایا سەرنەکەوتن .

ئەبی ئەوەش بزانین کە خەلـکی روژەلاتی کوردوستان پابەندی شارـ ستانیتی ( شوباری ، کەلدانی و ئاشوری) یەکان بون . ئەمەشمانیە ، بەلـگـە بازرگانی و قضائیە دوزراوەکانی دەوری کەرکوکدا بو دەرئەکەوی کە تارـ یخیان ئەگـەرریتەوە بو سەدەی (١٥ و ١٦ ) ی پیش میلاد ، هەرچەندە هـەندی ناکوکی و دوبەرەکی لە بەینی دانیشتوانی ئەم ولاتەدا هـەبو بەلام لەگـەل ئەوەش هەمویان لەئایین و کومەلایەتی و رەوشت و یاسادا وەکو یەک وابون و بەرەنـگی شارستانیتی حەوزی ( دجلە ) رەنـگیان گرتبو

لەبەلـگـەی ئاشوریەکانەوەهی سەدەکانی (١٩ ، ١٨ ، ١٧) ی پیش میلاد وا دەرئـەکەوی کە بەهوی کوچ کردنی شەعبی ئاری ( هیندو ـ ئاوروپی ) لەروژەلاتی دەریای رەشەوە بو هەریمە جنوبیەکانی گوررانیك بەسەر روژەـ لاتی کوردوستاندا هاتوە . لەو سەردەمانەدا کە ئاشوریەکان رویان کردبوە راندنەوە گـەلی‌جار ناوی کورد ئەبینری ، بەتایبەتی ( گـەزەنەفون ) لەگەـ ررانەوەکەیدا لە ( ٤٠١ ) ی پـیش میلاد هەمودەم ناویان دینیت .

ئەوکەسەی کە ئەیەوی لە بناوانی کورد و میژویان بکولیتەوە ئەبی چاوی لەو قەومانەش بی کە لەکیوەکانی کوردوستان پـیکەوە ژیاون ؛ وەکو کورد ، ئاشور ، تورکان ، ئەرمەن . مەبەست بەچاولی بونەکە سەیرکردنیان نییە لەلایەن خوین و رەگـەزەوە بەلـکو تەماشاکردنی زمان و لوغـەتەکەیانە ، ئەگەر بەم چاوەوە سەیر بکەین ئەوە ئیتر هیچ گوملی تیدانابی ئەو (کاردـ ـوی ) یانە کە ( گەزەنەفون ) باسیان ئەکا هەر قەومی کورد بوون و هـەر

ئەوانە بوون کەبەوجورە ئارەزوی سەربەخەوبی و ئازادی‌یان کردوە ، بویەش وایان کردوە چونکە زمانەکەیان سەربەخو بووە .

لەم دەورەی دوایی‌یەدا بیروباوەرری ئەو زانایانە کە لەلوغەتی کوردی ئەکولنەوە بەتەواوی گوررا ، وە بەلکو ئەلین : زمانی کوردی وەنەبی لە فارسیەوە وەرگیرابیت یا خود ئەوبی و تیکدرابی ، بەلکو زمانیکی تایبەتی سەربەخویە و هەر لە زەمانی کونەوە هەلگیررو داگیرری خوی جوی بوە ، چونکە ئەم گەلی کونترە لەو فارسیە کونە کە پارچە لەوحەکەی ( دارا ) ی پی‌نوسراوەتەوە . ئەگەر ئەمە راست بیت پیویستە زاناکانی تاریخ دان بەوەدا بنین کە زمانی کوردی لەسەدەی شەشەمی پیش میلاد دا هەبووە ، نەوەکە هەربووە بەلکو زمانیکی سەربەخو بووە ، وە قەومی کورد لەقەومەکانی هیندو ئاوروپین و لەو وەختەوە کە میدیەکان هاتونەتە میدیا و فارسەکان چونەنە فارسەوە ئەمانیش چونەتە کوردوستانەوە . جا ئەگەر بکەونە سەر ئەم بارەرە لەوتەنگوچەلەمەیە رزگاریان ئەبی کە بلین تاریخیکی توزی نزیک لەباری چونە کورد بو کوردوستان دوای ( ٦٥٠ ) ی پیش میلاد بووە ، چونکە بەلگەکانی ئاشوری کە تاریخیان بو پیش ئەم تاریخە ئەگەرریتەوە لەم بابەتەوە هیچ باسیک ناکەن . هەروەها ئەو کەسانە کە ئەلین زمانی کوردی زمانی فارسیە و تیکدراوە دراساتی علمی و باسی تاریخی گەلی پیچەوانەی بیروباوەررەکەیانە . )

لە زاناکانی کورد خوالی‌خوش بو ( امین زکی بەگ ) ئەلی :

( ئەم کوردوستانە کە نیشتمانی ئادەمزادی دوهەم بوە و لەویوە بلاوبونەتەوە بە دنیادا لەبەرەبەیانی تاریخەوە قەومەکانی زاگروسی لی‌دائەنیشت کەپییان ئەوتن ( لولو ) و ( گوتی ) و ( کاسی ) و ( خالدی ـ کالدی ) و سوبارو ـ هوری ) . عیلامیەکان لەو بەرری روژهەلاتی جنوبی ئەم خاکەوە دائەنیشتن . لەبەر هەندی لیکچونی شیوەی زمانەکەیان گەلی کەس لەرو‌

زەلاتی ناسەکان ئەلێن ئەم قەومانە هەمو لەنەتەوەی قەوقاسین . ئەم شەعبانە بیجگە لەعیلامیەکان هەمویان ئەمن بەبناغەی قەومی کورد ، لە دەوری (سومری) و (ئاکادی) و سەرەتای ئاشوریەکاندا بزوتنەوەیەکی سیاسی سەبریان ئەگیرا .

وادەرئەکەوی لاقاوی هاتنی ئاریەکان (هیندو - ئاوروپی) سەرەتا بۆ کیوەکانی زاگروس و لەپاشا بۆ روژەلات و روژاوای - کە ئەم کوچ کردنە لەسەرەتای سەدەی دەهەم و نوهەمی پیش میلادەوە بوبیت - پاشماوەی دانیشتوە راستیەکانی زاگروس و کوردوستانی خستونە ژیر دەسەلاتی خوی و هەموی کردون بە ئاری . ئەمانەکە سەرەوخوار بونەوە شەعبی میدی لەهەمویان بەهیزتربون چونکە دانیشتنی سەرەتایان لەروژەلاتی دەریای ورمیەوە ئەم دەسەلاتەی دابونی ، ئینجا لەپاش ئەوان قەومە ئاریەکانی ـ تریش وەکو : (پارس ، مانای ، پارسیوی ، پارث ، کاردشوی) کوچیان کردو هاتن . وا دەرئەکەوی تاریخی هاتنی قەومی کاردشوی گەزەنەفون لە (٤٠١)ی پیش میلاد نوشیلن بوە ئەگەرریتەوە بو سەدەی حەوتەمی پیش میلاد (سیرسیدنی سمیث) .

ئەگەر ئەم قسەیە راپی ئەبی بلین - وەکو هەندی لەزانایانی بەلگە و میژو ئەلین - ئاشنایەتیەکی زور هەیە لەبەین رەچەلەکی قەومی کورد و شوین بنجی ئەوەلیان و لەبەین دەستەی یەکەمدا کە هەمو قەومەکانی زاگروسی ئەوەلن . کەوابو بو ئەو کەسە کە بیەوی لە رەگەزی کورد بکولیتەوە پیویستە قەومەکانی دەستەی یەکەم و دوهەم بناسی ، ئەوا بەکورتی باسی ئەکەین :

(١) - دەستەی یەکەم : قەومەکانی زاگروس

١ - (لولو) یا (لولوبوم) وا دەرکەوتوە کە ئەم قەومە لەهەریمی (زەهاو ـ شارەزور ـ سولەیمانی) دائەنیشتن ، بەلام نازانری کە کەی

هاتونەتە ئـەوی لە پاشا لەگەل گوتیەکان تیکلاو بون و لە ولاتی سولەیمانی ئیستەدا پیکەوە رایان ئەبواردو ولاتی « هالمان ـ حەلوان » یشیان خستە ژیر دەسەلاتی خویان. «ئەمین زکی» هەندی ئەرواو لە پاشا ئەلی:ـ لە بەلـگەکانی ئاشوری دەوری ( ئاشور ناصر پال ) ی دوهەم وادەر ئەکەوی کە ئەم ولاتی لولوبە شارستانیو ئاوەدانیەکی چاکی تیدابوە و مەردمەکەشی دەستیکی باشیان بوە لە هونەروپیشەسازیدا ، تەنانەت ئـەم پادشای ئاشوریە گەلی لە پیشە سازەکانی برد بو ولاتی ئاشور . پروفیسور ( سپایزر ) ئەلی : ئـەم لولوبانە باپیرە گەورەی لورری ئیستەن .

٢ ـ ( گوتی ) یەکیکن لە قەومەکانی زاگروس ، لە ( ٢٦٤٩ ) ی پیش میلاد دا ولاتی سومر و ئاکادیشیان داگیر کرد ، ئەم دەسەلاتیان ( ١٢٥ ) سال و ( ٤٠ ) روژ دریژەی کیشا . لە سالی ( ٢٥٢٤ ) ی پیش میـــلاد دا پادشای «ئورور» رەچەلەکی ئەمانەی دەرهینا بەناچاری گەرانەو بو کیوەکانی زاگروس . کەکاسیەکان لە دەوروبەری ناوەراستی سـەدەی هـەژدەهەمی پیش میلاد پەلاماری ولاتی بابلیان دا بو ئەم پەلامارە گوتیەکانیشیان لەگەل بون . لەوشتانە کە لە بەلـگەی ئاشوریەکان وەر ئەگیریت هیچ شکی تیدا نامینیتەوە کە کیوەکانی زاگروس نیشتمانیکی قـــەوي بوە بو ئـەم شەعبی « گوتی » یە .

دوکتور سپایزر لە کتیبەکەیا : (قەومەکانی مەعبینی بین النهرین) لاپەررە ( ١١٧ ) ئەلی : ( ئـــەم تیرەو هوزانەکە ئیستە بەکورد ناوئەبرین وەنەبی لە هیچ دەوریکا بە قەوئمي ناسرابیتن. بەلی ئەلی ئەم تیرانە لە هەندی رەوشتو شیوەی قسەکردندا لیک جوی ئـەبنەوە وەکو سەیر ئەکری کە یەکیکی سولەیمانی ناتوانی بە تەواوی لەگەل بادینیکدا قسەبکاو بەتەواوی لیک بگەن، هەر وەها لە بەینی کوردەکانی ئیستەدا گەلی ئەرمەن و رەگەزی سامي و

ئاری‌تر هه‌یه وه‌کو به‌لگه تاریخیه‌کان ئه‌مه‌مان پیشان ئه‌ده‌ن . جا له‌به‌ر ئه‌مه ناتوانین بلین قه‌وی کورد هه‌مو له‌ریشه‌یه‌کی ته‌نهاو سه‌ربه‌خووه هاتون ! . بی‌ناوی بلین دانیشتوه ئه‌سلیه‌کانی کوردوستان له گه‌لی له قه‌ومه‌کان پیك هاتوه چونکه شتیکی ئاشکرایه ، ئاشکراییه‌کشی له‌به‌ر ئه‌وه‌یه که له‌ده‌وری سه‌ره‌تای تاریخدا ئه‌مانه له گه‌ل هه‌ندی له کوچه‌ریه‌کانی ئاشورو ئارامی پیکه‌وه له کیوه‌کانا رایان ئه‌بوارد . له پاشا که ئاریه‌کان ده‌سه‌لاتیان به‌سه‌ر ئه‌م ولاته‌دا په‌یدا کرد هه‌ندی ره‌گه‌زی ئیرانیش هاتن له گه‌ل دانیشتوی ولاته‌کدا تیکلاو بون و بون به‌یه‌ك .

له گه‌ل ئه‌مه‌شدا ئینکار نا کری که هه‌ندی له ره‌گه‌زی کونی قه‌ومه‌کانی زاگروس ئیسته‌ش له ناو کورده‌کانا هه‌ر هه‌یه . له‌مه‌وه و له سه‌ر سه‌رکردنی لوغه‌ته‌وه ده‌ر ئه‌که‌وی که قه‌ومی کورد به‌شیکن له‌به‌شه‌کانی زاگروس ، ئه‌مانه هه‌رچه‌نده گه‌لی جار توشی تالان و چه‌پاوی بیگانه بون به‌لام هه‌موده‌م ئاگاداری سه‌ربه‌خوی ته‌بیعی و ئازادی و پاراستنی عه‌شره‌تی خویانیان هه‌ر کرده و هه‌ر وه‌خت که‌ترمی په‌لاماری بیگانه‌یان بوبیت چونه‌ته کیوه‌کان ، که ئه‌و لافاوه به‌سه‌ر چو بیت هاتونه‌ته‌وه خواره‌وه و شارو گونده‌کانی خویانیان ئاوه‌دان کردونه‌وه وه‌کو ئیسته‌ش ئه‌و ره‌وشته‌یان هه‌ر هه‌یه . »

٣ ـ (کاسای ـ کومی ـ کوشو ) ئه‌مانه‌ش یکیکن له قه‌ومه‌کانی زاگروس ، سه‌ره‌تا له ناوچه‌ی « کرماشان ـ قرمسین » نیشته‌جی بون به‌لام تاریخی‌هاتنیان نازانری ، ئه‌وه‌نده هه‌یه وه‌کو قه‌ومه‌کانی‌تری زاگروس هه‌ر دانیشتوی‌راستی ولاته‌که بون وه‌نه‌بی وه‌کو سامی وحامیه‌کان کوچیان بوکردبیت . ئاکادیه‌کان به‌مانه‌یان ئه‌وت (کاشو) . ئه‌م کاشوانه ئه‌وانه‌ن که کتیبی پیروز به ( گوش) یان ناو ئه‌با . له ناوه‌راستی سه‌ده‌ی هه‌ژده‌هه‌می پیش میلاد دا ئه‌م کاسیانه ولاتی

بابلیان گرتو لەولاتی سوس و تا کاد دا حکومەتیکیان بە ناوی (کاردونیاش)ەوە دامەزراند کە نزیکەی شەش سەد سال ژیا ، لە پاش تیکچونی حکومەتەکەیان دیسان گەررانەوە بو کیوەکانی زاگروس ( لوررستانی ئیستە ) . لە دەوری حکومەتی ئەخمینیەکانا پرایەتیەکی باش لە بەین ئەم ئاسیانە وە حکومەتی ئیران (ئەخمینی )دا پەیدا بو ، هەر وەها ئەسکەندەریش شەرریکی زوری لە گەل کردن . ( انتیغونوس ) سەرداری بەناوبانگی رومانی لە ( پردی تەنگە گەلی ) بەوە کە کەوتبوە ولاتی ئەمان بەناویانا تیپەرری . کەوابو رون بوەوە کە قەومی کاسی لە سەرەتای میلاد دا لە لوررستانی ئیستەدا هەبورن ، دور نیە ریشەی لوررەکانی ئیستەش بن .

٤ ـ ( خالدی ـ ئورارتو ) وا ئەچیتەدلەوە کە ئەم قەومە لە سەردەمیکا لە روژەلاتی ئاسیای بچوکەوە هاتونەتە هەریمی دەریای ( وان ) . لە کیررانەـ وەی ئاشوری بە تایبەتی لە بەلگەی شەررەکانی ( سەرگون ) ی دوهەم پادشای ئاشوردا دەرئەکەوی کە سنوری دەولەتی ( خلدی ) سەردەمیک لە شیمالەوە پالی ئەدا بە دەریای ( گوکچە ) و ( الـکسندرپول ) لە قەوقاس ، لە جنوبەوە بە ( رواندز ) وسەرچاوەکانی روباری ( زاب ) . لە روژاواوە بە روباری ( فورات ) ولە روژەلاتەوە بە دەریای ( ورمي ) بەوە . سەردەمکیش فەرمانیان بە سەر شیمالي سوریەدا ئەکرد وپایتەختیان شاری ( توسپاسی ـ وان ) بو کەوا گومان ئەکری ( ساردوریس ) ی یەکەم پادشای خلدی لە ( ٨٤٠ ) ی پیش میلاد دروستی کردبی . لە ئاخرو ئوخری سەدەی حەوتەمي پیش میلاد بەهوی دەسەلاتی میدیەکانەوە و بەهوی نیشتەجی بونی ئەرمەن لە روژەلاتی ولاتی خالدیەوە ئەمانە پررانەوە و تیاچون ( کامبریک : تاریخی کون . بەرگی ٣ ) .

٥ ـ ( سوباری ) یەکەم جار کە ئەم ناوە بینراوەتەوە لە روی پارچە لەوحیکی

کونەوە بووە کەدەوری حکومەتی ( لوگال ـ ئانی ـ موندو ) پیشان ئەداکە لە چەرخی (٣٠) هەمی پیش میلاد فەرمانڕەوایی‌یان کردوە وە زیاتر لەسەر شیوەی وشەی ( سوپیر ) کەوتوتە بەرچاو . ئەم بەلگانە کە بو دەوری ( نارام صین ) ئەگەڕرینەوە لەسەر شکلی ( سوپارتیم ) پیشانی ئەدەن وە ئەم وشەیەش مانعایەکی جەغرافی بووە بو ئەو ولاتە کە لە شیمالی غەربی عیلامەوە دەست‌پی‌ئەکا تا وَلاتی (ئامانوس) لەپاشا بو بە ناو بو هەندی قەوم وەکو وشەی ( حامورابی ) چون بو بەناو بو قەومیکی سەربەخوی ئازاد . ئەم صوباریانە دەوریکی زوریان بە شەڕر لەگەل ئاشوریەکانا کیرا . بەلام لە ئاخر دەوری ئاشوریەکانا ناوی ئـــەم صوباریانە ون بو و ناوی ( نایری ) شوین ئەمانی گرتەوە کە ئەم نایریانەش قەومیکی‌تر بون .

« ب » <u>دەستەی دوهەم</u> : میدیەکان و بەر دەستەکانیان :

( هوفی رونبص ) و ( هنری پریستید ) دومیژونوسی بەناوبانـگن ئەلین : ئەو قەومە دراوسیانە کە جنسەکەیان گەلیك‌لیك‌نزیکە هەندی جار بە (ئاری) ناو ئەبرین . ئەمانە بەلیکن لە قەومەکانی ( هیندو ـ ئاوروپی ) کە لە دەورو بەری ( ٢٥٠٠ ) سال پیش میلاد لە ولاتەکانی روژەلات و شیمالی روژەلاتی دەریای قەزوین دائەنیشتن . ئەمانە هەندیکیان بەکشت‌وکالەوە خەریك ئەبون بەلام بەتیکورا هـــەر وەکو لە دەوری بەردین‌دا بن وانە مـەگەر هەندیکی کەمیان نەبی کە گەیشتونەتە دەوری (کانی ـ معدنی) . بیجگە لەوە کە مەڕرو مالاتیان بەخیو ئەکرد لە باری‌تریشدا کەمەکیك هـــەر پیش کەوتبون . لەمالاتا ئەسپیان زور پی خوش‌بو ، بەلام نوسین هەر فیر نەبون ( برستید . لاپەرەە ١٧١ و پاش ئەوەش ) . هەندی لەم ئاریانە چون بو هیند لەویدا کتیبیکی پیروزیان بە زمانی ( سانسکریتی ) پیکەوە ناو ناویانـ نا (ڤیداس) . ئەم کتیبە لە لایەن ژیانی سەرەتایی ئەمانەوە ئاگاداری باشی تیدا

هەیە . هەر وەها هەندیکی تر لەم ئاری‌یانە رویان کردە روژاوای جنوبی و دەشتی ( رافدین ) و لەویدا مانەوە ، دوشەعبەکەی ( ماد ـ میدـ) و « پارس ـ پارسای » لە هەرە بەهیزی ئەم دەستەی دوهەمەن . هەر وەها « پرلسقید » ئەلی : ناونانی « هیندو ـ ئاوروپی » بەئاری‌هەلەیەکی زلە کە تائیستە بلاو بونەوە ، راستیەکەی ئـەوەیە ئەو وشەیە کە « ئیران ـ ئیرانی » لی وەرگیراوە بەسەر عەشایری شاخەکانی ئیراندا بوتری ، ئەو عەشایرانە کەبەشیکن لەو قەومانە کە هیندو ئاوروپی‌یان بەسەرا برراوە .

١ـ « میدـ » : ئەم قەومە لە قـەومەکانی « هیندو ـ ئاوربی » ن ، واتە « ئاری » . لەسەدەی نوهەمی پیش میلاد لە روژەلاتی دەریای قەزوین ( ولاتی باختریانە ) وە چونەتە روژاوای شیمالی کیوەکانی ئیران ، واتە ولاتی ( میدیا ) وردە وردە دەسەلاتیان بەسەر دراوسیکانیشیانا پەیدا کردوە ، لە دوایی هاتنی سـەدەی هەشتەمی پیش میلاد دا حکومەتیکی سەربەخویان دامەزراندو قەومی ( پارسای ) شیان خستە ژیر دەست خویان و شاری ( هکتان ) ( هەمەدانی کون ) یان دروست کردو کردیان بە پایتەخت .

ماموستا ( سایس ) ئـەلی : میدیەکان ئەو عەشایرە کوردانە بون کە لە روژەلاتی ولاتی ئاشور دائەنیشتن و سنوری خاکەکەیان تا جنوبی دەریای قەزوین ئەررویشت . زورتر ئەم قەومە لە لایەن لوغەتو زمانەوە ئەچونەوە سەر ( هیند ـ ئاوروپی ) و لە لایەن رەگەزەوە ئەچونەوە سەر ( ئاری ) . وەکو هەندی لە روژەلاتی ناسەکان ئەلین ، زمانی میدی ئەم زمانی کوردی ئیستەیە بروە . وە یا ئەم لوغەتی کوردی‌یە بناغە بروە بو ئەو ( ئیران قدیم ) .

هەندیکی تر لە زاناکانی میژو ئەلین : لەپاش بررانەوەی دەولەتی میدی هەندیکیان بە تەواوی وەرگەررانە سـەر قەومی « پارس ـ فارس » هندیکیشیان لەبەر دراوسیتی لە گەل قەومی کوردا بون بە کورد . بەپی ئەم قسەیە شەعبی ( پارتی ) یش لەبەر ئەوە تیکلاوی دو شەعبەی کوردو فارس

بون ئـەوانیش لە ناو ئەوانا تیاچون . ئەم نزیکیەش کەئیستە لە مەعبەینی کوردی وفارسیدا ئەبینری ئـەوە سوراخیکە لە تیکلاو بونی ئەو دو شەعبە ئاری یە کە ( میدی ) و ( پارثی ) ن . ( القضیة الـکردستانیـە والترك لاپەرە ٢١ ) .

« سیرولسن » یش ئەلی : « کوردەکان لەنەتەوەی میدیەکانن » بەپی ئەمانە شەعبی میدی سەرچاوەیەکی زور نزیکە لەم دەستەی دوهـەمەدا بو قەوی کـورد .

٢ ـ « نایری ـ نەهری » ئەم قەومە لەپیش ئاخر کوچەکیانا لە کوردوستان دائەنیشتن ، راستە بەلـگە کونەکان شتیك لەمانەوە نالین . بیجگە لەهی دەوری ئاشوریەکان کە گویا ئەمانەی مەبەستە . وا دەرئەکەوی ئەم عەشرەتە لە دەوری گەلی کونەوە دو قەومەکەی ( سوبارو ) و ( گوتو ) ی دروست کردوە . ئەو گوند و عەشرەتانە کە ئیستە لە ناوچەی ( نیری ـ نەهری ) دان لە ولاتی ( شەمدینانـ ) دور نیە لە پاشماوەی ئەم ( نایری ) یانە بن . ( مینورسکی ) وەکو ( توروودانـگین ) ی روژەلاتی ناس ئەلی : ناوچەی ( نایری ) یا ( هوبشکیا ) ئەمە شیوو دولەکانی « بوتان » ە و ئـــەم بەشی روژەلاتی نایریە لە وەختی خویا دەولەتیکی سەر بەخویان دروست کردوە .

( میجەرسون ) ئەلی : « ئەگەر تەماشایەکی دەوری ( گوتی ) یەکان بکەین کە لە بەینی سەدەکانی « ١٥ و ١٢ » ی پیش میلاد دا ئـەژیان ئەبینین ئـەم نایریانە ـ کەپیش میدیەکان کەوتبون ـ لە کوردوستانی ناوەراستدا ژیانیکی باشیان ئەکرد و دەسەلاتیکی واشیان هـەبو کەترسو لەرزیان خستبوە دلی دراوسیکانیانەوە . هەر ئەم قەومـــە بو لەپاشا ناوەکەی گورراو بو بە ( کورد ) . ئەم ولاتی نایریە لەو دەورەدا لە حەوزی ناوەراست لە روباری زابی گەورەوە دەستی پی ئەکرد تا سەرچاوەی روبارەکە . میدیەکان کـەکە

حکومەتەکەیان تیاچو بەرە بەرە رویان کردە ئەم شوینە و ئەوەیان ئاوەدان کردەوە » .

٣ ـ ( کارد خوی ) : لیرەدا دو بیرو باوەرر بەرامبەر بەم قەومە ـ کە ( گەزەنەفون ) لە گەررانەوەی ( ١٠ ) هەزار کەسەکەیدا لە ( ٤٠١ ) پیش میلاد توشیان بووە ـ هەیە . یەکەم وشەی ( کارد خوی ) وشەی ( گونی ) کونە وە بەهوی دور کەوتنـەوەی زەمانەوە تیکچوە بووە بە کارد خوی ، نەنات بەهوی ئەم دور کەوتنەوە لە دەوري ( توکولتی ـ نیراری ) پادشای ئاشور بە ( کونی ) و ( کورتی ) ناو ئەبرا . لە لیکدانەوەکەی روژەلاتی ناس ( درایفر ) وادەر ئـەکەوي ئەم هەمو وشەو ناوانە چە ( کورتی ) چە ( کاردا ) ـ کە دو قەوم بوون لە دەوری ( ئاراد ـ نانار ) پادشای (لاگاش)ـ هەمو هـەر ناو بوون بو ئەم شەعبی کوردی ئیستەیە و زەمانی گورریونی . ئەگـەر ئەم قسـەیە وابی ئەوەمان بودەر ئەکەوی کە کاردخویەکان پاشماوەی گوتیەکانی کونن وهیچی تر .

دوهەم ئەم شەعبی کاردخویە دور نیە ئەو وەختە هاتبیتنە کوردوستان کە میدی و فارسەکان کەوتونەتە شوینەکانی خویان وتیایانا نیشتەجی بوون وە یا لەپاش ئەم وەختەبووە کەناوەرراستی سەدەی حەوتەمی پیش میلاد ئەگریتەوە ، کە هاتویشن وردە وردە دەسەلاتیان بەسەر عەشایرەکانی کوردوستاندا پەیدا کردوە و لەپاشا بوون بەیەک . ئەم قسەشە ئەچیتە دلەوە زور نزیکە ئەمانە رویان کردبیتە کیوەکانی ئیران و تیایا نیشتەجی بوبیتن ، بویەش نزیکە چونکە عەشایریکیزوری کورد لە دەوری ساسانیە ـ کانا لە ئیراندا هەبوون وەکو (سیر سیدنیسمیث) یش ئەلی : کە ئەم عەشایرانە لوغەتی تایبەتی خویانیان هەبووە و هەربەخوبوە ، هیچ پەیوەندیکی بەسەر لوغەتی فارسیەوە نەبووە ، چونـکە ئەم کونترە لە فارس .

لە سەر باوەرری یەکەم ئەم کاردخوی یانە لە نەتەوەی ئەو گوتی یانەن کە ولاتی سومەرو تاکادیان داگیر کرد و لە قەومەکانی زاگروسەوە سەرو ـ خوار بونەتەوە . لە سەر باوەرری دوەمم لە رەگەزی (هیندو ـ ئاوروپی) داگەرین هەروەکو میدی وفارسەکان ، بیجگە لەمەش لەمەعبەیی ئەو عەشرەتانەدا کە شەعبی کوردییان پیک هیناوە هەندی هوزیان تیدا هەیە کە بەلگەکانی کون باسیان ئەکا وەکو ئەوەی ماموستا ( اولمستید ) ئەلی : تیرەیەک هەبون پیان ئەوتن ( موسری ) ئەمانە ریشەی ئەم عەشرەتی ( موسری ـ مزوری ) ئیستەیەن ، هەنوکەش وەکو دەورەی ( سناخریب ) لە لیواری روباری ( خازر ) داەنیش .

خولاسە کورد لەنەتەوەی دەستەی یەکەم بی ، واتە ، قەومەکانی زاگروس بن کەسەرچاوەکەیان قەوقاسیە و لەپاشا بەهوی لافاوی کوچ کردنەوە لە دو سەدەی هەشتەم و نوهەمی پیش میلاد بورن بەئاری ؟ وەیا هەر راستەوخو لە نەتەوەی دەستەی دوهەم بن ، واتە ، ئاریەکی بی خەوەش ( هیندو ـ ئاوروپی ) وەکو زورتر لە میژو نوسەکان هەر وا ئەلین ئەوی گومانی تیدا نەبی ئەوەیە: بیرو باوەررەکەی دەستەی یەکەم کە:( کورد قەومیکی زور کونە) ئەمایان باوەرریکی بەهیزە لەگەل ئەوەش هیشتا هەر بە تەواوی ساغ نەبوتەوە پیوستە بەهەندی لی کولینەوەی تر ا .

( امین زکی بەگ ) ئەلی : ( لە گەل ئەو باوەررەشدا : کە ئەلی کورد لە ناوەررابستی سەدەی حەوتەمی پیش میلادەوە هاتونەتە کوردوستان من لام وایە باوەرریکی قایم نیسە ، بەپیچەوانەی قسەکەی ماموستا ( سپایزر) و خەلکی تریش کەئەلین سەرچاوەی کورد ئەو دانیشتوە ئەسلیانەن کە لە کیوەکانی زاگروس وە یا هەر ئەو دانیشتوە کونانەن کە لە کوردوستاندا دانیشتبون ، ئەم باوەررە بەهیزەو زورتر ئەچیتە دلەوە ) .

دیسان « امین زکی بەگ » قسەی روژهەلاتی ناسەکان و « سپایزر » یش ئەخاتە ناواخنی باوەرری خوی و ئەلی : « ئەمەراستە کە کورد لە سەر زمانی قەومەکانی تر گەلی ناوی هەیە بەلام ئەمە ئەوە نا گەیەنی کە هەریەکە ناوی قەومیک بووە جیابووە لەویتر بەلکو لەوانەیە بەپی زەمان هەر قەومە کە هاتوە ناوی « کورد »ی بە شتیک بردوە ، وەکو ئەوە کە سومریەکان پیان ئەوتن : « گوتی ، جوتی ، جودی » . ئاشوری وئارامیەکان ئەیانوت : « گوتی ، کوتی ، کورتی ، کارتی ، کاردو ، کارداکا ، کاردان ، کارکتان ، کارداکە » ئیرانیەکان ئەیانوت : « کورتیو ، سیرتی ، کوردراها » . یونان و رومان پیان ئەوتن : « کاردوسوی ، کاردخوی ، کاردوك ، کردوکی ، کردوخی ، کاردویکای » . ئەرمەن ئەیانوت : « کوردوئین ، کورچیخ ، کورنیخ ، کرخی ، کورخی » . عەرەبیش ئەیانوت : کردی ، کاردوی ، باکاردا ، کارتاویە ، جوردی ، جودی » .

* * *

سەیر ئەکەی ئەم هەمو ناو و گوررانە لە پاشەروکی تەنیمەتی شیوەی قەومەکانەوە بووە نەوەکو لە بەر ئەوە کەئەمانە چەند قەومیکی جیا جیا و عەشایری تیکلاو پیکلاو بوبیتن . تەنانەت ئەم ناو گوررانە ئیستەش هەر هەیە وەکو ئەوە کە عەرەب ئەلی « بندقیە » ، لاتین ئەلی « ڤنیسیا » ، تورك ئەلی « وەندیك » . هەر وەها وشەی « ماد » پارسیەکان «مادا » ، ئاشوری « ئامادا » ، یونان « مد »ی پی ئەلین .

هەروەها هەندیکی تر لە روژهەلاتی ناسەکان ئەلین : «ئەم هەمو ناوەکە بو کورد هەیە وەنەبی هیچیان لە هیچیانەوە دوربن بەلکو هەمویان لیکەوە نزیك و پیکەوە بەستراون ، جا یا هەمو بەسەر هەمو قەومی کوردا وتراوە وە یا هەر یەکە بو عەشرەتیك وتراوە ، چونکە کورد گشتی عەشایر بوە و زور زوریش بوون » .

هەندیکی تر لە روژهەلاتی ناسەکان ئەلین : شەعبی کوردی لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی پیش میلادەوە هاتونەتە کوردوستان . ئەگەر ئەم قسەیە راست بیت دو خرابە روی تی ئەکا ! ، یەکەم ئەمانە کە کوچیان کردو هاتنە کوردوستان چون جی‌نشین بون ؟ . دوهەم چون توانیان قەومی نیشتەجی شوینەکە بخەنە ژیردەست خویان ؟ لە کاتیکا کە ئەم ولاتی کوردوستانـە ریی نەکەوتوە چول بیت هەتا وەکو قەومیکی لابەلابی بیت و بە ئاسانی بتوانی‌تیایا دانیشی ! .

« امین زکی بەگ » ئەلی : لە سـەر باوەرری من ئەتوانین خرابەی یەکەم بەوە لابەرین بلین ئەمانە کە لەو تاریخەدا هاتونەتە کوردوستانەوە پاشماوەی ئەوانە بوون کە زوتر هاتبون ، ئەمان کە هاتن لەبەر ئەوەکە لەگەل هینەکانی پیشودا خزمایەتیان هەبو بە سوکی و ئاسانی ریی کەوتن.ئەگەر ئەم باوەررە وەربگرین خیرا ئەوەمان ئەچیتە دلەوە کە سەرچاوەی قەومی کورد « گوتی ، لوللو ، کاسای ، مید ، نایری » بووە . بەلام لابردنی خرابەی دوهەم نەختی گرانە چونکە نەخشەی « اتنوگرافی » قەومە کونەکان کە لە کتیبی روژهەلاتی ناس و پسپوررەکانا بەرچاومان ئەکەوی شوینی « کوردوئین » یا « کاردویکای » یەکانمان پیشان ئەدا کە گویا ئەوانە قەومیکی تازەهاتوون و لە ناوچەیەکی بچوکدان . لەمانەش وەکو نەخشەکەی «سیرمارک سایکس» ـ کە سەدەی شەشەمی پیش میلاد پیشان ئەدا ـ ئەلی: ئەم ناوچەیە لە بەین « دیاربەکر » و سەرچاوەکانی زابی گەورەدایە کە پانی و دریژیەکەی تا « ١٨٨ » پیش . م . هەر وەکو خوی مابووەوە ! .

نەخشەی بەرگی ٣ کتیبەکەی « کامبریک : تاریخی کون » چونیەتی سەدەی شەشەمی پیش میلاد دەرئەخا ئەلی : ناوچەی « کوردوئین » لە روباری « بطمان » ەوە بو تاجنوبی دەریاچەی « ورمی » ـ کە ئەمە ولاتی بوتان و شیمالی کیوی جودی ئەگریتەوە ـ کەچی ئـەو ناوچەیە کەپی‌ئـەلین

« كوردوئين » دەبەکێ ئەو ولاتە نابێ کە قەومە کونەکانی کوردوستان دا گیریان کردبو ! . خو ئەگەر بلێین قەومی « کوردوئین » زور بچوك بوون جا قەومێك ئەوەندە بچوك بوبێت چون ئـەتوانی لماوەی دو چەرخ و نیودا زال بی بەسەر ئەو هەمو قەومانەدا کە لە خاکی کەردوستانابون ؟ لەگەل ئەوەش ئەبینین دەولەتیکی وەکو ئاشور چەندجاز لەگەل ئەم قەومانەدا جەنـگی کردوە و هیچی بە هیچ نەکردوە ! .

دیسان « گەزەنەفون » خوی ئەلی : « لەو کاتەدا کە لە ئاشوربە گەرامەوە بو تەرابزون توشی پەلاماری کردوئینەکان بوم » . ئەم قسەیە ئەوەمان بو دەر ئەخا کە قەومی کورد لە ئاخری سەدەی پینجەمی پیش میلاد وەنەبی تەنها هەر ئەو ناوچە بچوکەی داگیر کردبی کەکەوتوتە جنوبی « وان » ەوە . بەلـکو هـەر لە سەرچاوەی زابی گەورەوە داگیري کردوە تا ئـەگاتە لیواري دەریای رەش . دیارە ئەمەش بەلـگەیەکی ترە بو ئـەوە کە شەعبی کوردي وەنەبی شەعبیکی تازە بو بیتن و هاتبیتنە کوردوستانەوە بەلـکو لە پیش سەدەی حەوتەمی پیش میلادیشەوە هەر لەوی بوون بەلام بە ناویکی تر ناویان بردون[1] » .



تا ئەم شوینە بیرو باوەرری هەندی لە روژهەلاتی ناس و میژنوسەکان بو بەرامبەر بەکورد و بە ریشەی کورد ، ئینجا هەندیکی تر بە جوریکی تر بوی چوون هەر چەندە هەر یەك ئەگریتەوە بەلام بو ئەوە باسەکە بگا بە ئەنجام

---

( ١ ) بیجگە لەوە کە خوم تەماشای زورتر لە قسەی روژهەلاتی ناسەکانیشم کردوە لە سەرەتای قسەکەی مینورسکیەوە کە لە دائرة المعارفی ئیسلامیدا باسی کردوە تا ئەم شوینە لە « خولاسەی تاریخی کوردو کوردوستان » ی امین زکی بەگەوە وەرگیراوە .

ناچارین قسەی ئەوانیتریش بخەینە بەرچاو چونکە هیچیان خالی نین لە قژانج :

دوکتور « کونتناو » ی فەرەنسزي ئەلی : « لەدەورو بەري هـەزارەی چوارەمی پیش میلاد سەرەتا بەکەم لیشاویکی کوچ کردوەکان کە هاتونەتە کیوەکانی زاگروشەوە سەرەتای لافاوەکەیان وادەر ئەکەوی لە جنوبي دەشتی « سیبریەو روسیە » وە بوبیت . زاناکان ناوي ئەم قەومەیان بە « ئازیانیک ـ ئاسیایی » داناوە بو ئەوە لە کوچ کردوەکانیتریان جیا بکەنەوە . لە هەزارەیسەیەمی پیش میلاد دیسان دەستەیەکیتر هەر لەوشوینە کوچیان کردو هاتنە کیوەکاني زاگروس وبەناوي ( ئاري ) یا ( هیندو ـ ئاوروپی ) ناوبانگیان دەرکرد . ئەمانەی تازە لەگەل دانیشتوەکانی پیشودا لە پاش شەررو شوررێکی زور ریکەوتن وئینجا ولاتی ( بین النهرین ) یشیان داگیر کرد . ئەم پەلامارەی ئەمان ئەوەیە کە لە بەلگەکانی ( بین النهرین ) دا بە پەلاماري ( گوتی ) و ( کاسی ) ناوی ئەبا .

ـ لەلایەن کوچکردنی دەستەی دوهەم کە ( ئاری ) یا ( هیندو ـ ئاوروپی ) یی دیسان دوکتور ( کونتناو ) ئەلی : (لەناوەندی مەرکەزیەوە«دو»هاتن می دو دەستە دەستی پی کرد ؛ یکیکی روی کردە روژاواو چوە ئاوروپاوە ، دەستەکەی کەش ناوچەی جنوبی بالقانی گرتەوەو وچوە ( یونان ) ەوە ) .

جائیستە ئەگەر شوین قسەی ئەو زانایانە بکەوین کە ئەلین ( ماد ) و ( پارس ) ەکان لە هەزارەی دوهەمی پیش میلادەوە هاتونەتە روژاوای ئیران ـ کە زاگروسە ـ ناچارین کە بلین لەپیش ئەوانیشا دیسان ئاریەکانی هیند ـ ئاوروپی کوچیکیتریان بو ئەم ولاتە هەر کردوە ، چونکە لە زمانی کاسیەکانا رەگەزی هیندو ئاوروپي ئەبینري وەکو لە ناوی خواکان و پادشاکانیانا دەر ئەکەوي . گەلیکیتر لەوزانایانە کە لە شتیان کولیوەتەوە ئەلین : هاتنی ئەم هیندو ئاوروپیانە بو ئاسیای بچوک لە گوشەی شمالی

روژەلاتەوە بووە ، واتە لە دەربەندی قەفقازەوە ـ کە کورتتر ریگەیەکە لە بەینی ئاسیای بچوکو ولانەکەی ئەوانا ـ . دەستە زانایەکی تر ئەلین: «خیر ئەمانە بە « بسفور » دا ھاتونەتە ئاسیای بچوکەوە ، ئەمە ئەو ریگەیەیە کە لە پاشا « گالات »ەکان پیایا ھاتن » .

ئەوشتانە کەقسە لە قەومی زاگروسەوە بکا لە ھەمویان کونتر بەلگەی « سارگون » پادشای ( ئاکاد )ە ـ کەلە (٥٣٠ تا ٤٧٥) پیش میلاد پادشایەتی ( ئاکاد ) ـ جنوبی بین النھرینی ـ کردو چوبو جەنگی زاگروس . لە پاش داگیر کردنی ولاتی ( کازالو ) کە لە روژەلاتی دجلەوەبو ـ چوبو ناوچەی (بەدرە) ـ کەئەو سەردەمە (در) یان پی ئەوت ـ . گرتنی بەدرە ری بو کردەوە بو ئەوە بچیت بو ( ئیلام ، لوررستان و کوردوستان ) . لە نوسراوەکەی سارگوندا ناوی ئەم شوینانە و ناوی ( لوبدو ) کە لە ولانی کەرکوکدا بوەو ھی ولانی ( لولوبیوم ) و ( گوتیوم ) ھەموی ھەیە . کە سارگون بەسەرچو لەم ئاکادانە چەند پادشایەکی تر ھاتنە ناوەوە بەلام لە ئاخرا ئەرکی ولاتەکەیان پی بەری نەبرا تا گەیشتە ( نارام سین) . لیرەدا زاگروسیەکان ویستیان سەر لە ژیر فەرمانی بپیچیننەوە ، نارام‌سین ھەستا لە پیشا ولاتی ( کازالو ) و ( بەدرە )ی داگیر کرد و چوبو دەوروبەری ( ئالتون کوپری ) بو گرتنی دەولەتی(شیموروم) ناوی ئەم دەولەتەش لەپارچە لەوحی پادشاکانی (ئوور)دا بینراوە .

( لولوبی ) یا (لولو) کە بە باپیرە گەورەی (لورر) دائەنرین ، ئەمانە قەومیک بون کە لە « زەھاو ، شارەزور و سولەیمانی » دائەنیشتن ، کونتر شتیک لە لایەن ئەمانەوە کە بەرچاو کەویت نوسراوەکەی ( نارام سین )ە کە لە دەوروبەری( ٢٥٠٠ ) سال پیش میلاد نوسراوەتەوە . بەپی قسەی ( ژ . دومرگان) ( شونروک ناحونتە ) پادشای ھەرە بەدەستی ئەمانە لە ( ١٢٠٠ ) ی پیش

میلاد بەردە کونەکەی لە شاری « سیپ ـ پاری » ەوە بردە « شوش »و باسی سەرکەوتني خوی بەزمانی ئیلامي تیدا نوسیوە کە چون بەسەر لولوبیە کانا زال بوەو تایفەی نریشي خستوتە ژیر دەست خوی ؟ . لولوبیەکان لە زەهاو و شارەزورو سولەیمانیەوە هەمودەم ئەچون ریبازی کارواني بابلیە کانیان ئەگرت و ریگەی بەینی کفری ، کەرکوک وئالتون کوپریش هەر بە دەست خویانەوە بو .

ناوي کوني زەهاو ( پادیر ) بووە ، ئەم شوینە جیگەی هەلکەندني نەخشەی بەناوبانگ ( انوبانيني ) بوە . حاکەکاني ( لولوبی ) لە دەوری ( نارام سین) دا لە گەروی قەرەداغ جەنگیکیان لەگەل لە شکرەکەی کردو نارام سین شکاندنی ، سەرگوزەشتي ئەم سەرکەوتنەی خوی لە داوینی گەروەکەوە لە سەر بەردیک هەلکەندوە . شوینی ئەم دەربەندي ( گەور ـ گاور ) ە لە گەلي قەرەداغە نزیک بە گوندی ( سیوسینان ) .

« گوتي » ـ نارام سین لە گەل گوتی یەکانا ـ کە ئەمانیش یکیکی ترن لە قەومەکانی زا گروس ـ کەوتە شەررەوە و لە دەست ئەمانەوە شکستي هینا ، ئەم گوتيیانە لە شیمالو روژەلاتی شارەزوردا بون . کە نارامسینیان شکاند پەلاماری لولوبیەکانیشیان دا ، هەرچەندە ئەوانیشیان شکاند بەلام لەبەر ئەوە لە خویان بابي بوبون لە ئاخردا هەر لە شارەزورا بەهوی یەکێلە نەوەکاني نارام سینەوە شکانیکی پیسیان بەسەراهات .

کە ئەم گوتيیانە کەوتنە ( بین النهرین ) خەلکی شوینەکە زوریان بیز لی ئەهاتنەوە ، لەمانەش ئیجگار بابلیەکان چونکە ئەوان خویان بە قانونزان و شارستاني ئەزاني ئەیانوت ئەم گوتيیانە دەشتەکین ! . دورنیە چوني ئەم گوتيیانە . ( بین النهرین ) لەبەر ئەوە بوبیت کە هیندو ئاوروپیەکان لە شیمالو روژەلاتەوە پالیان پیوە نابن . گوتيیەکان لە پاش(١٢٥) سال دەستیان لە بابل

بەرەلا بو لە پاشا لە ناوچەی زاگروسدا بون بەدەرەبەگی و هەرکە بو خوی؛ وەکو ئەوە لە شیمالەوە لە نزیک زاگروس ( ئوربیلوم ) هەولیری ئیستە بو بە دەولەتیک ، لە جنوبی هەولیر دەولەتی ( شیموروم ) ئالتون کوپری پەیدا بو، لە جنوب ئەویشەوە دەولەتیکی‌تر هەبو بەناوی ( هارش ) کە توزخورماتوی ئیستەیە ! .

« کاسی » یکیکی‌تر لە قەومەکانی زاگروس کاسیەکانن کە لە شیمالی ئیلامەوە چونەتە (بین النهرین) ، لە دەورو بەری ( ٢٤٠٠ ) سال پیش میلاد بەلـگەیان لەم شیمالی ئیلامەوە بەجی هیشتوە . زاناکان زمانی ئەم کاسیانەیان بە یەکی لە زمانەکانی قەوقاسی‌داناوە . مەبەست بە قەوقاسیش‌زمانی دانیشتوی کیوەکانی زاگروسە ؛ هی ئەو دەورەیان کە گومانیک لە ئاري بونیانا نی‌یە . لەگەلی شتدا ئەم کاسیانە ئاشنایەتي فیکری‌یان لەگەل قەومەکانی هیندو ئاوروپی‌دا بووە ؛ وەکو ئەوە کە ( ئەسپ ) یان پەرستوەو بەنیشکی خوایان زانیوە . ئەم بڕوایە بڕوای‌قەومەکانی هیندو ئاوروپی‌بووە ، بەپیچەوانەی بابلیەکان ئەمان گوییان بەم جورە فیکرانە نەداوە .

یەکیک لە سوراخی دەسەلاتي هیندو ئاوروپی بەسەر کاسیەکانا وشەی ( بوگاش ـ بوغاش )ە کە بەمانا خوایە ئەم وشەیە لە زمانی ئەسلاوەکانا ( بوگو ـ بغو ) ، لە هی ( فروگی ـ فریژی ) یەکانا ( باگایو ) ، لە فارسی کوندا ( بوغ ) بووە ، کە ئەم بناغەیە لەوشەی « بەغداد ) و ( بغپور ) و ( ئاذەر فروغ بوغ ) دا هـــەر دیارەوماوەتەوە . لە لەقەبي پادشاکانی ساسانیدا بەمانا خواو خواوەندگار هاتووە . یەکی لە پادشاکانی (کاسی ) ناوی ( اندابوگاش ) بووەکە بەشی یەکەمی ئەم وشـــەیە زاگروسی وبەشی دوهەمەکەشی ( بوگاش )ە کە بەمانا خوایە .

لە سەرەتای باسەکەی ( دوکتور کونتناو )ەوە تا ئەم شوینە مەبەستمان

هەر ئەوە بو کە بەپێ ئەو شتانەکە لە بەلـگەکانی بابل و ئیلام و ئاکاددا دەست ئەکەوی چونیــەتی دانیشتوانی کیوەکانی زا گروسمان بو دەرکەوی . ئەوەندەمان بو دەرکەوت کە لە هــەزارەی سەیەی پیش میلاد و بەلـکو پیشتریش قەومیک لەم کیوانەدا ژیاون کە زمان وئایین و رەوشتیکی سەیریان بووە ، بەلام کەس بناغەی رەچەلەکە کەیان تی نەگەیشتوە . ئەوەندە هەیە بەپێ ئەم زمانانەکە ئیستە هەیە دەرکەوتوە کە ( سامی ) نەبوون ، ئیتر ئایا کی ؟ وە لە بەرچی لەو شوینە دورە دەستی ئاسیاوە هاتونەتە ئەم کیوانە ؟ ئەمەیان توزی ونە . هەندی لە زاناکان بە ( ئازیانیک ) یان داناون ، هەندیکی تر بە ( ئاری ) ، لەپاشا لەبەر ئەوە کە هیشتا بەلـگەیەکی ریکو ویپکیان لە بارەیانا چنگ نەکەوتوە پیان وتوە ( قەوقاسی ) ، وانە دانیشتوانی ئەو کیوانە کە سەرەکانیان ئەگەنەوە قەوقاس ، بەلام چاکتر ئەوەیە کە هــەر ناوبنرین بە قەومی زنجیرە کیوەکانی زا گروس . واتە : مەردمی دانیشتوانی ئەم کیوانە .

* * *

ئەوانەی لە میژوی کونیان کولیوەتەوە بویان دەرکەوتوە کە یەکی لە هوی هەرە بەهیزی کوچکردنی قەومیک لە شوینیکەوە بو شوینیکی تر ئەوە بووە کە لە پشتەوە پالەپەستو نراون وناچار بوون بە کوچکردن و بو پیشەوە رویشتن . بەتایبەتی لە باسی کاسیەکانا ئەم تەخمینە زورتر ئــەخریتەکار ، چونکە لە دەورەی ئەوانا قەومیکی تازە لە زا گروس پەیدا بون پیان ئەوتن ( هیندو ـ ئاوروپی ) . ئەمانە لە سەرەتای هەزارەی دوهەمی پیش میلاد لە دەشتەکانی تورکستان و شیوو دولەکانی شمالی قەوقاس و دەریای حەزەرەوە هەستان و هاتنە زا گروسەوە و بون بە دو بەشەوە .

بەشیکیان رویان نا بو جنوبی روژەلات و چونە ( هیند ) ەوە و دانیشتوەکانی ئــەوی یان خستە ژیر دەست خویان و زمانیکی تازەیان بلاو

کردەوە و ناویان نا ( سانسکریتی ) بەشەکەی تریان ـ کە توزی بچوکتر بون ـ ریگەی روژاوای زاگروسیان گرت و لە هەوارگەی کاسیەکان نزیک بونەوەو لەگەڵ ئەوانا بەجوریک تیکلاو بون کە پەرستنی ( سوریا ـ خوای هەتاو ) و ( ماروت ـ خوای تاعون ) و ( بوریا ـ خوای توفان ) لیانەوە فیربون . هەر وەها ئەوەشیان لە زاگروسیەکانەوە وەرگرت کە لە باتی ( گا ) و ( گەز ) گەلێک لە ( ئەسپ ) ببینن ، چونکە ئەم بو جەنگ بەکەلکترە(١) . »



روژهەلاتی ناسی بەناوبانگ (میجەرسون ) یش لە سەر باسی ئەم چونیەتی کوردە بیرو باوەریکی هەیە ، لەبەر ئەوە خالی لە کەلک لیوەر گرتن نیــە بەکورتی و کورتــکراوەی قسەکانی ئەویش ئەخەینە پیش چاو کە ئەلی :

« مەبەست بەولاتی (نایری) تەنیا شیمالی روباری زابی سەرو نیە ، بەلکو ئەوەیە کە (تیگلات پلیسر ) و نەتەوەکانی ناویان بو داناوبون ئەیانوت : نایری ئەو قەومەن کە لە دەورو بەری سەرچاوەکانی دجلە و فوراتدا دائەنیشن و لە شیمالی (نیفانس) واتە ( دیار بەکر ، خەرپوت ، درسم ) و کیوەکانی ( بتلیس)و ( توروس ) دا راتەبوبرن کە ئـەم ولاتانە لە ( ٤٠١ ) ی پیش میلاد ( کوردوئی ) یەکانی تیدا بینراوە وتیایانا دانیشتبون .

لەو تاریخەوە ئیتر کوردوستان بووە بە نیشتمانی قەومیکی کونی دەست لی نەدراو و خاوەن زمانیکی سەر بەخو . بەلـگەی ئەم قسەیەشمان ئەوەیە : ئەو سەردەمە کە قەومـە ئاریەکان کوچیان کردو شوینەکانی خویانیان بەجی هیشت و رویان کردە (فارس) و ( میدیا ) و هەندی شوینی ئاوروپا ،

---

(١) تا ئەم شوینە ناو بەناو لە کتیبی ( کورد ) ی ماموستا (رشید یاسمی)ەوە وەرگیراوە .

قـــەومي كورديش شوينەكەی خوی بەجی‌هیشت و روی كردە كیوەكاني كوردوستان و كردیان بەشوینی خویان . تەنانەت ئیستە ئیمە ـ كە قەومي ئینگلیزین و لەنەتەوەی ســـەكسونین ـ لە باو باپیرمانا لەگەل كورددا یەكث ئەگرینەوەو ئەبین بە خزم . خوینی قەومي كورد تیكلاوی خوینی هیچ قەومیكی‌تر نەبوە ، رەگەزو خوینی خوی لە هـەمو دەوریكا پاراستوە و هەمو دەم هوشي بە زمانەكەی خویەوە بوە ، نەیهیشتوە هیچی‌تری تیكلاو ببیت . كە دو حكومەتەی ( میدی ) و ( فورس ) دوایی‌یان هـات و فارس كەوتە ژیر دەست(پرث ـ ئەشكانی) بەكانەوە میدیەكان بەنایان بردە كیوەكان و بەناوی ( كوردوئی ) واتە ( كوردی ) ناونران ، ئیتر تاریخیان بەم ناوەوە ناسرا .

كە تەماشایەكی لاپەرەی شیمالی روژاوای ئاسیا بكەین ئەبینین هەمو دەم لەبەر ئاشوری ، فارس ، یونان ، رومان ، عەرەب ، مەغول و تورك شوینی ئاژاوەو خوین رشتن بوە . وە ئەبینین كە وەستان و بەربەرەكانی كردنی قەومي كورد بو ئەمانە لە بەربەرەكانی كردنی هەمو شەعبیكی‌تر زیاتر بوە و هەمو دەم كوششی ئەوەیان كردوە كە خوین و رەگەز و زمانەكەیان بە پاك و پوختی بهیلنەوە ، لە راستیشدا ئەم وەوشتەكە كورد هەیبوە كەس ناتوانی ئینكاری بكا . » . هەر وەها میجەرسون ئەلی :

« ئەم كیوو دەشتانەكە كەوتونەتە شیمالی ریگەی ( رەها ـ موصل ) ەوە لە بەرەبەیانی تاریخەوە شوینی ئادەمیزادبون ، سنوریكی تەبیعی و سیاسي بون كە شیمالی ( بین النهرین )ی لە جنوبي جیا كردوتەوە . ئەمەش بەوەدا ئەیزانین كە لە ( ١١٠٠ ) لە دەوری پادشایەتی( تیگلات پلیسر )دا كیوی (تورعابدین) كە لەو وەختە پیان ئەوت ( نیفات ) بوبو بە سنوری شیمالی ولاتی ئاشور . لە پشت ئـــەم سنورەوە ولاتی ( نایری ) بو كە هەمو جار تیگلات پلیسر

کوششي داگیر کردنی ئەکرد . لە پاشا ناوی ولاتی ( ناری ) بو بە ( کوردوئی ) کە ئەمە راست ( کوردین ) یا ( کورد ) ئەگریتەوە . لەمەوە بومان دەرئەکەوی کە قەومی کورد لە بەرەبەیانی میژووەوە رەگەزەکەی ئاری بەو هاتونەتە ئەم ولاتە .

دیسان وەکو لاپەرری تاریخ پیشانمان ئەدا لە شکری گەلی لە قەومــە گەورەکان وەکو یونان ، رومان ورث هەمو دەم ناچار بون بەوە کە لەبەر دەم ئەم کیوانەوە و لەبەر سەربزیوی دانیشتوەکانی روبکەنە دەشتەکانی جنوب ، چونکە هەر ئەم کیوانە پیشانمان ئەدەن کە لوتی گەلی لە قەومەکانی روژەلاتیان شکاندوە لەو کاتەدا کە ویستویانە شالاویان بو بەرن . تەنها قەومي ئاشوری یەکەم قــــەوم بوە کە توانیبیتی بچیتە ولاتی ( ناری ) یا ( کوردوئین ) ئەمەش ئەوە نا گەیەنی کە دانیشتوانی ئەم شوینە لە قەومي ئیستەی کورد باشکەوتوتر بوون بو ئارەزوکردني سەربەخویي و ئازادی . قەومە بەهیزە داگیرکەرەکان لە رەورەوی تاریخدا گەلیکیان کوشش کردوە بو ئەوە کە ئــەم قەومي کوردە بخەنە ژیر رکیفی خویانەوە . بەراستي چون تەقەلاکەی ئەوان بو ئەم ئامانجە پیاو ئەخاتە بەلاجەوی‌یەوە مل نەدانو بەر بەرکانیەکەی ئەمان گەلی گەلی پیاو سەرسامتر ئەکا . بیجگە لەمەش هەر ئەم کوردە لە روبەررەی روزگاردا زورشتی وایانبەجی‌هیشتوەکەروژەلاتی‌ـ ناسو میژو نوسەکانیان هەمو جار بە خویانەوە خەریک کردوە ! .

کورد سەر بو کەس دانانەوینی و مل کەچی کەس نابی ، هەمو دەم حەز بە بەرزبونەوەو پیشکەوتن ئەکا ، بستە زەویەکی بە خوررایی نادوررینی ، زور زور بیزی لە رەوشتی ئەو قەومانە هاتوتەوە کە ویستویانە داگیریان کەن ، بو ئەوە کە ئاگاداری کەیانی قەومي‌و زمانی ئاری خاوینی خویان بکەن گەررانو سوررانەوەیان لە شاخ و چیای ولاتەکەی خویانا پی‌خوش بووە . جا ، قەومی وادوایي نایەتو دوایي پی ناهینریت . »

* * *

تا ئەم شوینەکە ئیمە دریژەمان بەم باسەدا هەمو قسەی ئەو میژو نوسانە، یا ئەو روژەلاتی ناسانە بو کە لەبەر چونیەتی سەرچاوەی کورد ناچار بوبون بە باسکردنی غەیری کوردیش ، کەم و زوریک قسەکانمان هینان و نوسیانن ، هەر یەکە لە ریگەیەکەوە بوی چوون و هەر یەکە قسەیەکیان لیوە کردوە وە لە هەندی شوینا کە گویا زور رونا کیان کردبیتەوە ئەو کوردانە کە ئیمروژو ئەو روژەش هەر بە کورد ئەناسرین و ناسراون ئەوان جیایانیان کردوتەوە و بەناوی ( گوران ) لە کوردیانیان داپچریبون ! . هەر وەها هەندیکی تری وەکو ماموستا «رشید یاسەمی» لەبەر ئەوەکە خویان کورد بوون زور بە دلسوزی قسەیان لیوە کردوە و خویانیان پیوە خەریک کردوە ، بەلام لەبەر ئەوە کە ئارەزویان لی بوە کورد بکەن بە نەتەوەی ئیرانی ـ یا هەر بە ئیرانی ـ هیناویانە بەقسەی روالەت رەنگین باسەکەی خویانیان رازاندوتەوەو لە ناوەندی باسەکەدا ئەلین : ( چە دوژمنایەتیەکی لەمە گەورەترە کە کورد لە نەتەوەی جەمشیدو فەریدون و زەردەشت و کورش و داریوش لابدەن و بیانکەن بە روڵەی (لا سیراب) و ( ئانری داپیزیر ) ی گونی ، یا ( تیگلات پلیسر ) و ( سارگون ) ی ئاشوری و ... هتد . )

ئیمە نازانین جەمشیدو لاسیراب یا کورش و سارگون ـ کە هەر یەک لەمانە لاپەرەی خویانیان پر کردوتەوە و رویشتون ـ چی یان بو ئیمەبەجی هیشت ؟ . چە شارستانی وبناغەیەکیان بو بەجی هیشتین کە ئیمروژ ئیمە لە ناویا رابویرین ؟ . چەداریکیان بو ناشتین کە ئیستە لە سیبەریا بحەسینەوە؟. ئەم بی یائەو بو ئیمروژی ئیمە هیچ جیاوازیەکی نیە . قسەیەکی کوردی هەیە ئەلی . « نان ئەو نانە ئیمررو لە خوانە . » جا ، نا چارین بلین ئا ئەو کەسانە کەوابو کوششەکەیان بو ئەوە بووە کە کورد بکەن بە نەتەوەی ئیرانی و هیچی تر ئەوەندەیە ئیمە ـ وەکو لەمەودوا باسی ئەکەین ـ ئەتوانین ئەوە

بچیتە دڵانەوە کە (پارس) لە نەتەوەی کوردە ، نەوەک کورد لە هی پارس ، دیارە ئەم دو قسەیە جیاییکی زور لە بەینیانا هەیە .

دیسان هەر ئەو کەسانە ئەڵێن : ( هەندی کەس لە سەر زەوی ئیراندا قەومیک دروست ئەکەن و کورد ئەبەنەوە سەر ئەو قەومە ) . ئیمەش ئەڵێین : ئەو قەومە کە ئەولای وایە دروست ئەکریت! چار نیە ئەبی پارسیش هەر بریتەوە سەر ئەو قەومە. کە ئەمەمان وت لام وایە ئەوانە ئیتر دان بەوەدا ئەنین بڵین ( ئەو قەومە کە تا ئیستە ئیمە ئەمانوت فەرز کراون وانیە ، بەڵکو هەرلە راستیدا هەبوون و هیچ دروست کراونین) . ئەمە ئەمان ، ئینجا قسەیەکیش لە روژهەڵاتی ناسەکانەوە بکەین :

بەڵی راستە روژهەڵاتی ناسەکان خزمەتیکی زوری مەردمیان کردوە بە تایبەتی خزمەتیان بەرامبەر بە ئیمە لەلایەن رەگەزو زمانەوە شایانی سوپاسە ، ئیمە ئەمەمان لە بیر ناچی ، بەلام لەگەل ئەوەش زور گرانە پیاو لە زمانیکی غەیری زمانەکەی خویدا هەر چەندە شارەزابی و بی بە وەستا تیایا هەر وەکو کوردی ئەو زمانەی لی نایە ، چونکە گەلی نهینی هەیە مەگەر بە زەوقی خاوەن زمان و بە بەروەردە کردنی زەمانی مندالی ئاشکرابی و بزانری ئەگینە بو یەکیکی تر نەوەک زور گرانە بەلکو هەر هەڵناهینریت .

جائەو کەسانەی کە بیگانە بوون و لە کوردیان کولیوەتەوە یا گەروکیکی روالەت دەرویش بوون و لە بابەت کاروانەکەی خویانەوە شتیکیان نوسیوە و ناوی کوردیشیان تی خستوە ، یا روژهەڵاتی ناسیک بوون کە ویستویانە ناوی شوینان لە باری عیلمی و ئابوریەکی هیمندا بکەن بو ئەوە کە دەست بدا پاشەروژ قەومەکەی خویان لە باری ئابوریدا کەلک لە قسەکانیان وەربگرن ، یا خود کابرا نە گەروکیکی هەردە گەرد و نەعالمیکی پایە بەرز بوە بەلکو خوی لە خویەوە بو جەرهتە و بو هەر شوینە شتیکی روبازاری پینیوەولە

سەری رویشتوە وئیتر نەیتوانیوە بە تەواوی لی بکولیتەوە . جا ئیمەسەیری هەرکام لەم سەکەسە بکەین ئەبینین ئەو شتەی‌و تویانە ، یا نوسیویانە ـ بەتایبەتی کابرای یەکەم وسەهەم ـ وەنەبی سەرەنجامیك بدەن بە دەستەوە وە یا شەوریکی صاف بەرامبەر بەو شوینە بنوینن . ئەوەندە هەیە دەستەی دوهەم ـ کە روژەلاتی ناسەکانن ـ لەبەر ئەوە ئامانجیکی عیلمی‌یان لەگەلا هەبوە قسە کانیان زیاترجی باوەررە و خالی لەکەلك لی وەرگرتن نی‌یە . کەوابو قسەی ئەمانەیان ـ یا لەسەدا دەیشي شوینی‌خوی بی ـ پیاو ئەتوانی شتی‌لی‌دەربینی ، بەو بونەوە ئیمەش هاتین لە باسکردنی سەر چاوەی کورددا ئەو روژەلاتی ناسانەکە قسەیان لیوە کردوە زورتر قسەکانیانمان هیناو نوسیمانن ، بەلام هیشتا بە بوختی نەگەیشتینە مەبەست . ئینجا منیش ئەمەوی بیروباوەرری خوم بە ئاشکراو بەبی لایەنگری لە باری کوردو سەرچاوەی کورددا دەر بررم بو ئەوە ئەم گەنجینەیە هەروا بە قوفل لی دراوی نەمینیتەوە .

من نالیم بیرو باوەررەکەم لە سەدا سەد راستە ، بویە نالیم چونکە ئادەمیزاد خالی نی‌یە لە هەلە ولەکەم فیکری، قسەکانی منیش فیکرەیکە لە روی بەراوردی هەندەی فیکری‌ترەوە دەرم برریوە ، زور نزیکە چەوتی تیدا هەبی ، ئامادەم بو بەرەنگار بون ، بەلام بەنوسین نەوەك بەقسەی روتی گوی ئاگردان ، چونکە شت کە نوسرا لە ئاخرا راستەکە دەر ئەکەوی ، لە پاش خویشم هیوادارم رولەکانی کورد ئەگەر ئەوەیان بو دەرکەوت کەمن لە بیروباوەررەکانما بە هەلەدا چووم بەچاوی لی بوردن لیم ئەبورن و راستیەکی راستتر ئەخەنە بەرچاو نەتەوەکەیان .

* * *

لە پیش کردنەوەی باسەکەدا پیویستە ئەوە بلین کە هەندی کەس ئەلین : کونتر خاکیک کە ئادەمیزادی تیدا کو بوەتەوە ( خوزستان ـ ئیلام ) و ( بين النهرين ) ە . جاری ( زاگروس ) ـ کە شوین و مەلبەندی کوردە ـ

وئیمروژ کەوتونە روژاوای ئیران و روژەلاتی تورکیاو شیمالی عراقەوە لەبەر ئەوە لە وەختی خویدا شوێنیکی بەپیت بووە دانیشتوانی ولاتی بابل‌و ئاکادو سومر چونکە ولاتەکەی خویان بی خیرو بیر بوە ویستویانە زاگروسیەکان بخەنە ژێر چنگی خویان بو ئەوە لە پیتی ولاتەکەیان کەلك وەرگرن ، بەم بونەوە هەمو دەمیك لە چنگەبرچیدا بوون گەلی جار ناوی دانیشتوەکانی زاگروس وەکو ( گوتی ،کاسی،ئامادا و پارسوا ) لە نوسراوەکانی ئەوانا بەرچاو ئەکەویت

لە لایەن بناغەی نەژادی ئەمانەوە زاناکان ئەبن بە دو بەشەوە ، بەشیکیان ئەلین هەندی لەمانە وەکو ( ئامادا وپارسوا ) بەبی قسە ( ئاری )ن بەشیکیان ئەلین ئاری بونی هەندی لەمانە وەکو ( گوتی وکاسی ) توزی دبونەوەی ئەوی . جا لەبەر ئەوە کە ئەم دو برروایە لە بەینیانا پەیدا بوە ناوی ئەمانەیان هەمو ناوە ( قەوقاسی ) ، گویا لە زەمانیکی زور کونەوە لە کیوەکانی قەوقاس و زاگروس ماوبەنەوە و ژیاون دیسان دەستەیەکی‌تر لە زاناکان ناوی ئەم قەومانەیان بە تایفەی زنجیرە کیوەکانی زاگروس ناو ناوە . دەستەیەکی‌تر پیان ئەلین ( ئازیانیك ) . مەبەست لەم هەمو قسانەش هەر ئەو قەومەیەکە لە زەمانی پیش تاریخ و پیش پەیدا بونی ئاری‌یەوە لە یەکی لە شوینەکانی ئاسیاوە کوچیان کردوەو چونەتە کیوەکانی زاگروس . سەررای ئەوە کە ئەگونجی ئاریش بن بەلام تا بەلگەیەکی قایم نەبیت ئیستە هەر لە ژێر ناوی ( قەوقاسی ) یا ( ئازیانیك ) یا ( قەومەکانی زاگروس ) ناوی ئەبەین .

سەرچاوەی میژوی تیکرای ئادەمیزاد زور تاریکە ، بەبی ئەو بەردو شتومەکە کە دو هەزار سالیك پیش میلاد کەوتونەتە بەرچاو و لە دەوری شارستانی بەکەمی ئادەمیزاد دا تاقی کراوەنەتەوە گویا دوسەد هەزار ساڵە

ئادەمیزاد لەسەر زەوی پەیدابووە ، وەبگرە هەندیک ئەلین نیو ملیون ساله. رەگەزی کە ئەوەندە سال لە توپیکی وەکو زەویدا پەیدا بوبی ئایا چە ئەقل و زمانیک ئەتوانی‌دان بەوەدا بنی کە سەرچاوەی رون بکاتەوە ؟. یا ئەم خاکەتو گیستانەلیک بکاتەوە کە هەمو بستە زەویەکت دور نیە بە میشکی هەزاران کەس پربوبیتەوەو لەگەلیا تیکلاو بوبیت ؟ ! لە گەل ئەوەش خویندن و خویندنەوە لە ناویانا زیاتر لە « ٦ » هەزار سال نیە .

کەوابو هەر قەومیک یا هەر نەژادیک بیەوی شوینی زور کونی باو باپیری خوی یا قەومیکی تر رون بکاتەوە بیجگە لە تەخین و بەراوردیکی ئەقلی ناتوانی بە بەلگەیەکی ئاشکرا بەم ئامانجەی خوی بگا ، بەلکو هەر دەمیکی بو بەری لە ناراستیەوە گەلی‌نزیکترە لە راستی ! . بەم بونەوە ئیمەو غەیری ئیمە لە بابەت رەگەزو نەژادی کوردەوە ـ وەبگرە غەیری کوردیشەوە ـ ناتوانین لە « ٣٥٠٠ » سال پیش میلاد بەولاترەوە بروین . دیسان دور نیە ئەم ژمارەشە هەر خالی نەبی لە تەخین .

* * *

بە نەژاد و خوین و رەوشت و عەنعەنات ساغ بوەتەوە کە ( کورد ) قەومیکی (ئاری) یەو (سامی) نیە ـ ( ئاری ، لە ئاریاسەوە هاتوە . بەمانا برادەرە ) ـ عالمە نەژاد شناسەکانی ئاوروپا وەکو ( ئوژن پیتار ) و ( سولاکت ) و ( ڤون لوشان ) گەلیک بەم باسەوە خویان خەریک کردوەو لیان کولیوەتەوە . ئەمیننەوە سەر ئەوە ئایا سەرچاوەی ئەم ئاری یانە سەرەتا لە کویدا بووە و لە کوی‌وە هاتوە ؟ . بو ئەم باسە وردبونەوەیەکی وردو قولی ئەوی . جا بەوە بونەوە لە پاش موتالایەکی زور و پشکنینی گەلین و قوژبنی گەلی شوین ئەوەمان بودەرکەوت کە :

ئاریەکان لە « ٣٥٠٠ » سال پیش میلادەوە لە جنوبی روسیاوە بە هەتز

شیالی‌قەوقاس‌و دەریای رەشدا بەرەو خوار بونەتەوە و هاتون بۆ دەورو بەری رۆژاوای ئاسیا . دور نیە ئەم کوچکردنەیان لەبەر بی لەوەرری بۆ مالاتیان‌و زور بونی ژمارەی خویان بوبیت کە ئیتر لەویدا جیٔیان نەبوبیتەوە . هەرکە بزوتون و هاتون بوون بە دو بەشەوە ؛ بەشیکیان رویان کردە ئاوروپاو قەومەکانی ئەوی‌یان لی دروست بو ، بەشیکیان هەر لە دەشتەکانی جنوبی روسیاوە هاتونەتە رۆژاوای ناوەراست‌و رۆژاوای نزیکیەوە تا جنوبی هیند چون . . ئەم بەشەیان کە بەرەو ئاسیا بونەوە لە تورکستانی ئیمروی روسیادا خویان گرتەوەو ماوەی هەزار سالیک مانەوەو لەپاشا رویان کردە جنوبی ئیران ، ماوەیەکی باشیش لیرەدا مانەوە ئینجا بون بە دو ریچکەوە ؛ ریچکەیەکیان بەسەر هیمالایادا چون بۆ هیند و لە ( پەنجاب )ی ئیستە گیرسانەوەو نەتەوەی هیندی‌یان دروست کرد ، ریچکەکەی تریان بەناوبانی ئیراندا بلاو بونەوەو بە ئیرانی ناویان دەرکرد . دور نیە هاتنی ئەمانە بۆ ئیران « ٢٥٠٠ » سالیک پیش میلاد بگریتەوە⁽¹⁾ .

ئەم ریچکەی دوهەمە بەرەی سەندو زور بون هەندیکیان لە دەشتەکانی ئیراندا جی‌گیر بون و بە ( پارس )ی ناسران ، هەندیکیشیان بە رەوشتی کوچەرایەتی کەوتنە شاخەکانی زاگروس و وەکو ئەو شاخانە پەل پەل بونەوە و ( لولو ، گوتی ، کاسی ، مانای ، کاردوش ، خالدی ، کاردوهاو ماد ) یان لی پیک هات و هەر یەکە بۆ خویان دەوریکیان گیررا ، هەرچەندە بە ژیانی کوچەرایەتی مابونەوە بەلام دەوری حکومەتایەتیان باش هەلتە سورران ، نەتانەت گەلی جاریش پەلاماری دەشتەکانی ئیران و ولاتی ئاشور ـ

---

( ١ ) لە سەرەتای بزوتنەوەی ئەم ئاریانەوە تا ئیرە معالی ماموستا ( توفیق وهبی ) بەگ کە زانایەکی کوردەو ئیستە لە بەغدادایە ئەویش لەسەر ئەم باوەررەیە .

یعیان ئەدا . دور نیە ئەم تیرەی (لولو) بەسەرتا بە (لولو) ناویان دەر کردبێت و لە پاشا بەرە بەرە ناوەکەیان گورابێ تا هاتوتە سەر (ملد) . مەبەست بە کوچەری لێرەدا تەنیا ئەوەیە کە دانیشتوی کێوەکان بوون ، چونکە ئەوانەی لە دەشتەکانی ئێرانا مانەوە وردە وردە نیشتەجێ بون و لە شارو لادێکانا دامەزران . وەکو بەرچاومان ئەکەوێ ئەم ڕیچکەی دوهەمەش بوون بە دو بەشەوە ، قەومەکانی زاگروس ، دانیشتوی دەشتەکانی ئێران . لە ناوهینەکانی دەشتی ئێرانا (پارس) هەلکەوت ـ کە هەخامەنشیەکان ئەچنەوە سەر ئەوان ـ لە ناوهینەکەی زاگروسیشدا (ملد) هەلکەوت ـ کە کوردەکان ئەچنەوە سەر ئەوان(١) .

---

(١) تا ئێستە علمای نەژادشناس لە سەر ئەوەبون کە ئەم قسانە لێرەدا هیناماننن ئاخر لێکولینەوەیەکە بوە کە پێ گەیشتون، کەچی کوتوپرد لە ملوتی ١٩٥١ دا لاپەڕەی تاریخ بە جوریکی تر گوردا ، کوتوپرد روژەلاتی ناس پروفیسور (کارلتون کن) ماموستای دانشگای (پەنسیلوانیا) لە ئەمەریکا ـ کەبوگەڕان و لێکولینەوە چوبوە ناوباتی ئێران ـ لە ئەشکەوتی (کەمەربەند) لە (بەشەهر) لە شیمالی ئێران ئیسکوپروسکی کەلە سەری ئادەمیزادیکی دوزیەوە وەوای بو دەرکەوت کە ئەمە هی ئادەمیزادی سەد هەزار سال لەمەوپیشترە ! .

ئەم کەلە سەرە هەر لاشەو پلەکەیەکی بە ئەندازەی کەلە سەری ئادەمیزادیکی ئیستە ئەبو وە هەر ددانیکی دو ئینج ئەبو .

بێ گومان ئادەمیزاد هیشتا زوری ماوە بگا بەسەرچاوەی حەقیقەت وەیا بگا بە سەرچاوەی تاریخی خوی ! . چون ئەگا ؟ علما بویان دەرکەوتوە کە ئەو هیزی نەشونماو راکیشان وکارەباییە کە لە روژدایەو ئەرزی راگرتوە و بە خیوی ئەکا وەبویان دەرکەوتوە کە گەلی ملیون سالە ئەرز هەیە هیشتا ئەو هیزی روژە نەگەیشتوتە نیوەی ! ...

(ماد)ەکان دەولەتێکی زور بە دەستەلاتیان هەبوە ، تەنانەت لە دەوری (هوەخشەترە ) دوهەم پادشـای بەهێزی ماد پارسەکان بە تەواوی کەوتنە ژێرچنگی ئەمانەوە ، بەلام کە هەخامەنشیەکان هاتنە کایەوە ئیتر دەولەتی ماد ئەوە دەسەلاتەیان نەما و رویان کردە کزی .

• • •

ئیستە مەبەست ئەوە نیە حکومەت هەبوە یا نەبوە ، بەلـکو مەبەست ئەوەیە لە پاش لەناو چونی حکومەتی ماد وەنەبە شەعبـەکە لە ناو چوبێت ، بەلـکو ئـەو شەعبە بەرە بە بەرە هـەر مایەوەو خوی پاراست و بە دەور و بەری کیوەکانی زاگروسدا بلاو بووەوە تا گەیشتە سەر کوردی ئیمروژ . کەوابو دەرکەوت کە « کورد » لە نەتەوەی (ماد) ە و (ماد) یش قەومیکی ئاری بوون . ئەگەر لەم ریگەوە بوی بچین ئەوا قـــەومی کورد لە باپیرە گەورەیانەوە لەگەل قەومی فارسدا یەکیانـ گرتەوە وەکو لە گـەل هی هینددا بون بەیەکـ ، خو ئەگەر لە ریگەیەکی ترەوە بوی بچین ئەلین :

سەرەتا کە ئاریەکان لە کلـکەی شاخەکانی قەوقاسەوە هاتن بەم دیوا ئەو بەشەیان کە روی کردە هیند ئەوان لەوی بون بە هیندی ، بەشەکەی تریان کە لە کیوەکانی زاگروس مانەوە لە پاش ئـــەوە ـــکە ماوەیەکـ بە ژیانی کوچەرایەتی رایانبوارد وردە وردە هەندیکیان رویان کردە دەشتەکانی ئیران و لەویدا نیشتەجی بون و دەستیان کرد بە شاردروست کردن و بون بەشاری و بەرەبەرە ، رەورەوەی تاریخ رەنـگی ژیانی کوردین و قـەومی فارسی لی پیکـ هات. لە سەر ئەم قسەیە کورد بناغەیە بو فارس و فارس لەسلەکەی کوردە ، جاایتر تیرە تیرە بونەوەو لەمان لولو وکاسی وماد پیکهات و لەوان پارس و هەخامەنشی و ساسانی دروست بو ئەمە شتیکی ترە . ئەوەندە هەیە فارسەکان بەهوی نیشتەجی بونیانـ لە لادی و شارەکانا و هـەلسو کەوتنو قسە تیکلاو کردنیان بە غەیری قەومی خویانەوە ـ ـکە ئەمە لە پیویستی

تەبیعەتی شارنشینیە ـ زمانە راستەقینەکەی خویانیان گەلی تیک داوەو ئیستە بە جوری قسەئەکەن بە دەگەن ئەچیتەوە سەرشیوەی پارسی و میدی کون ـ کە ئەمانە ریشەی هەر دوزمانەکەن ـ . بەلام کوردەکان لە بەر ریی کەوتی مەلبەندیو کوچەرایەتیو شاخ نشینی دورتر بوون لە قەومی بیگانەوە، کەمتر تیکلاویان بووە بە تیکلاو بونیکی وەها کە کاربکەنە سەر تیکدانی زمانەکەیان ـ مەگەر لە دەوری ئیسلامیدا نەبی کە هەندی وشەی عەرەبی بەهوی ئاشنایەتی ئایینەوە تی کەوت ـ بەم جورە بەبی تیکدان و دەست لیدان زمانەکەی خویانیان پاراستوهیشتەوە ، ئەوانە کە سەر روشتەو زانیاری ـ یان لە لایەن زمان ناسینەوە هەیە بە ئاشکرایەکی زور ئاشکرا ئەزانن کەزمانی کوردی چاکترو پوختەتر ئەکونجی لەگەل زمانی باپیرە گەورەکانیانا کە مادو پارسە ، بەتایبەتی لەگەل سانسکریتی و کتیبەکەی زەردەشتدا .

ئەمیلیتەوە سەر ئەوە هەندی کەس لەزاناکانی روژاوا کە لە قەومی کوردیان کولیوەتەوە باوەریکی تریان دەر بریوەو وتویانە : « لە ولاتی کوردەکان هەندیک هەن وەکو لورر ، هەوراي و .. هتد . ئەمانە لە رەگەزی کورد نین ویان نالین کورد ، بەلکو ئەمانە (گوران) ن ! »

ئەم قسەیە ئەوەندەی تر پیاو لە باوەری ئەو زانایانە ئەخاتە سەر سامیەوە ! چونکە ئایا بەچی ؟ وەلە کوی ئەمەیان بو دەرکەوت . ئایا بەچی قسەکەی خویانیان بردەسەر کە ئەمانە قەومیکی غەیری ئاری و میدی بوون و لە دەوریکی زور کونەرە هاتون لە ولاتی کوردەکانا نیشتەجی بوون ؟؟ . بی گومان لە وەلامی ئەم پرسیارە لام وایە یابی دەنگی یابی هیزی وەلام ئەبی بە وەلامیان ! . جا بو ئەوە چە ئەوان و چە ئەو کەسانەش کە ئەکەونە شوین ئەم فیکرەی ئەوان بە تەواوي ئەم باوەرەیان لەدل دەرچیو لی پەشیمان بینەوە ئەلین :

بیجگە لەوە ئەگەر ئەو کەسانە کە پسپورن لە نەژاد شناسیدا بین و

بەتەواوی لە خوێن و ئەندام و جگەوچاووموی ئەمانە ـ کە ئەوان پیان ئەلێن گوران و بە غەیری کوردیان دەر ئەکەن ـ وردبینەوە وسەریان بکەن ـ وەکو کردویانە — لەروی یاسایەکی علمیەوە ئەوهاوارە ئەکەن کە ئەمانە کوردن ولەگەل رەگەزی کوردا چە لە کون و چە لەتازەدا هیچ جیاواز پیکیان نیە و زمان و ریشەی زمانەکەشیان هەر یەکە ، دیسان بیجگەلەم قسەیەش من خوم لەم باوەررەدام وئەلیم :

ئەمانە کە ئەوان پیان ئەلین ( گوران ) و لە کوردیان جیا ئەکەنەوە هەر کوردن و هیچ جیاوازیەکی لە بەینیانا نی یە ، ئەوەندە هەیە پەیدا بونی ئەم ناوە بویان هەر کوردەکان خویان لەبەرە بەیانی ژیانی کوچەرایەتیانەوە بویان داناون و تا ئیستە ماوەتەوە . ئەمەش بەم جورە :

لە ناو قەومي کورددا بە تیکررا ئەم رەوشتە بوەو هەیە : کە « کورد » بەو کوردانە ئەلین کە دەوار نشین و کوچەرین وە « گوران » یش بەو کوردانە ئەلین کە شارنشین و لادێ نشینن . لە سەردەمیکا کە نیشتەجیێی لە کورد دا نەبوە ئەم ناوەش نەبووە ، لەپاشا وردە وردە ئەو بەشەیان کە دەستیان دایە دانیشتن لە شارو لادێ‌کانا بەشە کوچەریەکان ناوی( گوران ) یان بو دانان ، وە ئەم وشەیە من لام وایە بناغەکەی وشەی « گورران »ە ، لەبەر ئەوە زور کەوتوتە سەر زمانەوە بوە بە « گوران » . گویا بەشی کوچەریەکە لەبەر ئەوە بەشەکەی‌تر پشتیان لەژیانی کوچەرایەتی هەلکرد پیان وتن « گورران » یانی لەسەر ری و شوینی ئیمە لایاندا . ئەم باوە کە تیکرای کورد بە کوچەري ئەلی « کورد » تەنانەت لەلای عەرەبیش هەر باوە کە تیکرای عەرەب بە عەرەبە کوچەریەکانیان ئەلین عەرەب . ئەگەر بەپی قسەی ئەو زانایانە بی وشەی « عەرەب » بو ئەو عەربە دەشتەکیانە ئەو مەعنا کە لەوشەکە وەر ئەگیریت ئەبوایە نەیدایە بە دەستەوە ومیا بە لادێ نشین و شارنشینەکانیان نەوتایە « عەرەب » لە گەل ئەوەش وا نی یە .

مەسەلەی جیاوازي هەندی لە شیوەی قسەکردنی ئەم کورد و گورانانەش ئەمە وەنەبی ئەوە پیشان بدا کە رەگەزەکەیان جیایە ، بەلکو ئەمە پەیوەندی دانیشتن و کوچەرایەتی و ناوچەی قسەکردنە کە ئەمە لە هەمو قەومیکدا ئەم جیاوازیە ئەمە لەبەین شیوەی قسەکردنی دانیشتوەکانیانا ئەبینری ، نەوەک هەر لە بەین کوچەري ونیشتەجی‌دا ، بەلکو لەبەین شیوەی قسەکردنی دو گوند بەتەنشت یەکەوە یا دو شار ، بگرە لەهەندی شوینا لە بەین دو گەرەک لە شاریکدا و لە قەومیکدا ئەبینری . دەی ئایا ئەگری ئەم جیاوازی شیوەیە لەبەین ئەو دوگەرەکە یا ئەو دوگوندە دا بکریتە هوی جیاوازی رەگەزەکەیان ؟ !

• • •

دیسان بو زیادە ئاگاداری بیر و باوەرری چەندکەسیکی تر لە میژو نوسەکان لە لایەن ئەوەوە کە « کورد » لە نەتەوەی « ماد » ەکانن بەکورتی ئەنوسین :

١ ـ « أ ـ سون » لەبەرئەوە ئاشنایەتیەکی زور هەیە لەبەین زمانی ئیستەی کورد و زمانی میدیەکانا ـ ئەو زمانەیان کە زەردەشت کتیبەکەی خوی پی نوسیەوە ـ لای وایە میدیەکان کورد بوون .

٢ ـ ماموستا « سایس » ئەلی میدیەکان کورد بون و لەقەومە ئاریەکانن چەبە رەگەز چە بەزمان ، ولاتەکەیان کەوتبوە روژهلاتی ولاتی ئاشور و تا جنوبي دەریای قەزوین ئەررویشت .

٣ ـ «حسن پیرنیا ـ مشیرالدولة » لە کتیبەکەیا ( ئیرانی کون ) ئەلی : لەهەندی میدی ئەگەر زمانی کوردی ئیستە نەبی بناغەیەتی .

٤ ـ «دائرة المعارفی بریتانی‌سالی ١٩٢٩» ئەلی: مادەکان کە دەولەتەکەیان تیاچو تیکلاوی کوردەکان بوزو بون بەکورد .

٥ ـ کتیبیک لە باری قەومەکانی هیندو جرمانی ئاسیەویەوە لە ١٩٣٤ لە

لایەن د هامس کرتەمەوە دەرچوە ئەلی : ( کوردەکان لە مادەکانن وە ئەمانە هەندیکیشیان فارس بون و هەر بون بە کورد ) هەر لە سەر چاوەی ئەم کتیبەوە دانراویکی فەرەنسی هەیە کە هی ( زیوروفسکی ) یەو ناوی کتیبە کە (قەوقاسو قەوقاسیەکان ) ە . لە ویدا ئەلی : ( کوردەکان لە نەتەوەی میدیەکانن ) .

٦ ـ « لوشان » ئەلی : ( کوردەکان لە جلەی سپی پیستەکانن ؛ میدی و فارسەکانی ئەوەل پیشان ئەمەن ولە ئاوروپای شیمالیەوە هاتون سەختی ولاتەکەیان پاراستونی و هەمو نیشانەیەکی ئاریەتیان تیاماوە وەبە خویانیان ئەوت ( ئاریر ) . کە لەگەل فارسەکان بون بەیەک ، واتە کە ( کورش ) ولاتەکەیانی گرت ئەو وەختە هەستیان ئەکرد بە شوری قەومی و ئەطای کەیانیکی ئازادیان ئەکرد ) .

# وشەی کورد

ئەوە بو لە لاپەرە « ٢٣ » دا وترا وشەی (کاردخوی ) وشەی ( گوتی ) کۆنەو دور کەوتنەوەی زەمان وای لی کردوە ، تەنانەت سەر دەمیک بەم (کاردوخوی )یانە ئەوترا ( گوتی ) و ( کورتی ) ئەمەشمان بو دەرکەوت کە(گوتی) یەکان یەکیک بون لە قەومەکانی زاگروس ( استرابون ) ی یونانی کە لە باسی (ئاتروپات ـ ماد ) کاتا قسە لە ولاتەکەیانەوە ئەکا ئەلی : ( شمالی ولاتەکەیان ولاتیکی کویستانەو هەندی قەومی کویستانی تیدایە وەکو (کادوسی، ئەمەردەکان ، تاپورەکان و کورتەکان) . مەبەست بەم ( کورت)انە (کارد خوی ) یە .

دیهانی یونانیەکان هەمو دەم بەدانیشتوی ولاتی ( بوتان ) و ( دوورگەی ابن عمر )یان ئەوت ( کردوخوی ) ، گویا وشەی ( خوی ) بەلای ئەرمەنیەکانەوە بو « جمع » بوو وشەکە بەتەنیا ( کردو ) ە بەپی قسەی

(مینورسکی) لە ئینسکلوپیدیای ئیسلامدا میژو نوسەکانی یونانی ئەم ناوەیان لە کابرایەکی ئەرمەنی بیستوە لەو وەختەدا کە (تیگران) ی دوهەم پادشای ئەرمەنستان لە سەدەی یەکەمی پیش میلاد دا ولاتی (کردوخوی) گرت و پادشاکەی کوشت ، وە لە (١١٥) ی پاش میلاد ئەمیریک لە (کردوئن) راست بوەوە . ئەوەندە هەیە سەر کەوتنی ئەرمەنیەکان لەم ناوچەیەدا شتیکی وا نەبوە کە کاربکانە سەر قەومیەتەکەیان .

(گەزەنەفون) شاگردی سوقراتی یونانی لە گەررانەوی دەهەزار کەسەکەیا لە « ٤٠١ » ی پیش میلاد ئەلی : بە ولاتی « کردوکێ » ە کانانی پەررین گویا ئەم ناوەی لە ئەرمەنیەک بیستوە ، وە (کێ) لە ئەرمەنیدا بو « جمع » ەولە شوین « خ » دانیشتوە . کە « کێ » کەلابەین (کردو) ئەمینیتەوە .

میژو نوسەکانی عەرەب وشەی کورد لە (بقردی) یا (بقردا) وە ئەزانن . وەیا ئەلین : (کوردی کورری مردی کورری صەعصەعەی کورری هەوازن) وە یا (کوردی کورری عمری کورری مزیقیاء) وەیا (کوردی کورری عامری کورری ماء السماء) . طبری ویاقوتی و ابن اثیر وا ئەلین . مسعودیش هەندی جار ئەلی : (کورد لەنەتەوەی کوردی کورری ئەسفەندیاری کورری مەنوچهری پیشدادی یە .) . هەندیکیش ئەلین : (کورد) لە (گورد) ە ، گورد بەمانا پالەوانە .

ئیتر هەر کەسە بە جوریک قسەی لە وشەی (کورد) ەوە کردوە ، ئاخرلی کولینەوەیەک کە ئیمە لە بارەی وشەی (کورد) دا کردمان پیرو باوەررمان هاتە سەر ئەمە :-

وشەی (کورد) هەر ئەو (کردوکێ) و (کردوئن) و (کردوخوی) یا (کاردخوی) یە کە گەزەنەفون و استرابون نوشیان بوون ، ئەمە رەوشتیکە لە کونەوە هاتوە هەر قەومیک ویسابیتی ناوی قەوم یاشوینیکی تر

بینیت بەپی زەوقی زمانەکەی خوی ناوەکەی وتوە ، واتە زمانەکەی ئـەو ئەیە بە چە جوریک بەلاوە سوک بوبیت بەوجورە وتویەتی : یونانیەکان ەوەکە لە ئەرمەنیان بیستوە « کردوخوی » ـ جا ئایا راست بوبی یا درو ـ هەر بەو جورە لە سەری رویشتون ، دیسان گەزەنەفون کە کوبی لە « کردوک » بوە هەروابیوە چوە ، دەردەکەی استرابون کە لەسەر « کردوئن » رویشتوە . تاریخ ساغی کردوتەوەو ئەیلێی کانەوە کە مـەبەست بەم هەمو وشانە قەومی « کورد » بوە بەلام لە وتنەکەیدا بەهەلەدا چوون .

وشەی « کورد » لە بناغەدا لە « گوت » ەوە هاتوە ، گوتەکان ئەوەبو یەکی بون لە قـەومەکانی زاگروس وپیش « ماد » ەکان کەوتبون . کەکەوتـە دەوری پادشایەتی ( توکولتی ـ نیراری ) ـ پادشای ئاشور ـ ناوی ( گوت ـ گوتی ) بو بە ( کوتی ـ کوتی ) و ( کورت ـ کورتی ) ، ئەم تیکدانەش هەمودوو کەوتنەوەی زەمان وای لی کرد . دیسان لە پیش ئیسلامدا بە ( کورد ) ئەوترا ( کورت ) بە تایبەتی لە ( کارنامەی ئەردەشیری بابەکان ) دا کە باسی جەنگی ئەردەشیرو کورد ئەکا لە مەعبەینی سەدەی شەشەم و حەوتەمی پیش میلاد دا وشەی ( کورد ) ی بەرمان و بەخەتی پەهلەوی بە ( کورت ) نوسیوە ، وە ئەم ( کورد ) بە ( کورت ) کردنەش لەبەر نزیکی شوینی دەنـگی ( ت ) و ( د ) ە وەکو ئەو نزیکیە ئیستەش لە کوردیدا هەر ماوەتەوە بەجوریکی وا کە گەلی جار ( ت ) ئەکری بە ( د ) و ( د ) یش ئەکری بە ( ت ) وەکو ئەلی : ( تیم ، دیم ) وە یا ئەلی ( گرتی ، گردی ) تەنانەت ئیستە مەسەلیك لە کوردیدا هەیە کە کوردەکان دائەنیشن لە بەین یەکداو باسی کورد دیتە پیشەوە بە توررە ـ ییەوە ئەلین : « کورد کورتە » هەرچەندە ئەوان لەوکانەدا مەبەستیان ئەوەیە کە کورد لەبەر ئـەوە زور فیکر لەشت نا کانەوە تیایا سەر ناکەوی و کورتی ئەهینی ، بەلام ئەهلی عیلمو فیکر مەعنای والی ئەدەنەوە ئەلین : ( کورد ) کە لە ( کورت ) وەر گیرابی وە ( کورت ) یش بەزمانی کوردی یانی دریژنیەو بی

پەوە ئیشەکەی لە مەچاتر نابێ . ) . ئەمەش بەلگەیەکە بو بو ئەوە ــکە وشەی ( کورد ) لە ( کورت )ەوە وەرگیراوە ، وە ( کورت) یعنی لە ( گوت ) وەگوت ناوی ئەو قەومەی زاگروس بووە . ئەمەش پیچەوانەی ئەوە نیە کە وترا ( کورد ) لە (ماد )ە ، چونکە مادەکان کە سەرکەوتن ئەچنەوە سەر (گوت ـ گوتی ) .

ئەمیلیتەوە سەر ( کردوخوی ) کە وشەی ( خوی ) نیشانەی « جمع » بو ، ئەم نیشانەیە کە لابرا ( کردو ) ی ئەمیلیتەوە لەگەل ( کردوک )ە کەی گەزەنەفوندا یەکە ئەگریتەوە ئەمیش ( ک ) کە بو ( جمــــع ) . (کاردخوی ) ش هــەر ( کردو خوی ) ە ( بور ) ی کافەکەیان بە ( سەر ) خوینــدونەوە . وردە وردە ئەم ( سەر )ە بوە بە ( أ ) و ئیتر بەو جورە هــاتوتە خوارەوە تاوای لی هــاتوە ( أ ) ەکە بوە بە ناواخنی وشەکە لەگەل ئەوەش وانیە .

کەوابو ئەو ( و ) وەکەلە ئاخری ( کردو ) دا هەیە ئەسلیەو لە نوسیندا کە خرایە پال وشەی ( ستان ) واتە ( جی ) ئەبی بنوسری ، یانی بنوسری ( کوردوستان ) .

## شوینی کورد

بەپی قسەی « دائرة المعارفی ئیسلامی » ئەبی ولاتی کوردوستان پارچە زەویەکی بچوک بیت جنوبی روژەلاتی لە لوررستانەوە دەست پی بکا تا ( مالتیە ) بەلای شیمالی روژاواوە . دریژاییەکەی « ٦٠٠ » میل و پانایی لە « ١٢٠ تا ١٥٠ » میل بیت ( میجەر فەردریک میلیچین ) ئەلی : ( وشەی کوردوستان لە زەمانی کوندا بە شوینی کاردوکیەکان ئەوترا لە ولاتی حەکاری . لە جوغرافیای تاریخیدا وادەر ئەکەوی کەولاتی ( وان ) لە ناو

حكومەتی ( ئەرمەن ) دا بوە . کوردوستانی ناوەراستو جنوبی بە ولاتی ئاشور و هەندی لە جزیرەی بەینی ( بین النهرین ) ئەوترا ، وەکو چون بەگران سنوریک بو ئەرمەنستان دائەنریت بو کوردوستانیش هەر وەهایە ، چونکە هەر یەک لە مانە بەهوی ئارەزوی دا گیرکەرەوە سنورەکانیان ؛ دەستکاری کراوە . ئەرمەنیای کون لە شیمالەوە پالی دابو بە روباری ( کورر)و کیوی ( لازستان )ەوە ، لە جنوبەوە بەکیوەکانی ( توروس ) ، لە روژەلاتەوە بە ( میدیا ) ، لە روژاواوە بە ناوچەکانی ( سیواس ، ئاماسیە و قەیسەری ) بەوە . ئیستە ،کە وشەی ( کورد ) لە شوینی ئەرمەن دانیشتوە چار نیە ئەبی بلین شوینی ئەرمەنە کونەکان ئیستە بوەبەهی کورد ) .

کوردوستانی عوسمانی لە شیمالەوە کیوکانی ئارارات و ولاتی کورج بو ، لە جنوبەوە بەغداو دەوروبەری ، لە روژەلاتەوە ئیران ، لە روژاواوە لازستان و ولاتی ئاسیای بچوک[1] بو . دیارە ئەمە هەمو دەمیک لەوانە بو نیک بچیت .

« امین زکی بەگ » ئەلی : ( بو ئەوە بەراستی لە مەعنای کوردوستان تی بگەین پیویستە ئەو شوینانە بزانین کە کوردی لی دائەنیشی و بەخویان ئەلین کوردو کوردوستان ؛ تەماشا ئەکەین ئەم شوینە لە شیمالەوە کیوەکانی ئارارات و سنوری کورج ئەگریتەوە ، وانە ئەو ناوچەیەکە دریژایی روژەلاتەکەی ( ٤٣/٠٢ ) ئەوەندەیە کە ئەمە ولاتی قارس ئەگریتەوە . ئەگەر خەتیک لە قارسەوە بکیشین و بچیت بەسەر ( ئەرزوروم ، ئەرزنجان ، درسم ، خەرپوت هەتا دیاربەکر لەویوە بەدریژایی روباری دجلە بو کیوی حەمرین ) دا ، ئەم خەتە ئەبیتە سنوریکی روژاوا بو کوردوستانی عوسمانی.

---

( ١ ) ئەو ولاتانەیە کە کەوتونە روژاوای ئەو خەتە خەیالیەوە کە لە تەرابزونەوە دەست پی ئەکاو لە ئەسکەندەرونەوە ئەبریتەوە .

بەلام سنوری جنوبی بو کوردوستان ئەبیتە کیوی حەمرین ، لیرەدا کوردو عەرەب تیکلاو ئەبن . سنوری روژەلات بو کوردوستانی عوسمانی ئەو زنجیرە کیوانەیە کە کەوتونەتە بەینی ئیران وعوسمانی وبوون بە سنور . )

( ئەولیاچەلەبی ) کە گەرروکیکی بەناوبانگی عوسمانیەو لە ( ١٠٦٥ ) ە گەشتیکی بە کوردوستاندا کردوە ئەلی ( سنوری شیمالی بو کوردوستان ولاتی ( ئەرزو روم ) ە لەویوە کوردوستان دەست پی ئەکاو بەسەر ( وان ، حەکاری ، جزیرە ، عمادیە و دەرتەنگدا تا ئەگاتە بەسرە ) .

لە سەر قسەی روژەلاتی ناسەکانی وەکو ( مینورسکی ، دوکتور روسو ، میرگون مالکولم ، هاسل ، گوانین ) و ئەمیر شرف الدینی بتلیسیش هەمو ولاتی لوررستان ، کرماشان ، ئەردەلان ، موکری ، جنوبی روژەلات ونیوەی بەشی جنوبی ئازربایجان هەمو کوردە ، هەر وەها هەریمی ( خوی ، سەلماس ورمی و ماکو ) یش . ( کوردو کوردوستانی امین زکی بەگ ) .



بە جوریکی تر : تیکرا ولاتی کوردوستان ئەم شوینانەی داگیر کردوە :

لە روژەلاتەوە پال ئەدا بە ئیرانەوە ، یانی لە خوزستانەوە دەست پی ئەکا بو عراقی عەجەم وهەمەدان وزەنگان وتەوریز تا ئەگاتە روباری ( ئاراکس ) لە قەوقاسی جنوبی ..لە روژاواوە ئەگاتە ئایەنە و سیواس وپال ئەدا بە ئاناتاـ دولەوە . لە شیمالەوە ئەگاتە قەوقاس و لوای ( لازستان ) . لە جنوبی شەرقی و جنوبەوە ریزەخەتیکە لە خوزستانەوە دیت ئەگاتە کیوی حەمرین و بو کیوی سەنجار لە دەشتی شام و لەونوە بو گرداغ تا ئەچیتە سنوری ئەسکەندەرونە . ئەم کوردوستانەکە بەم جورە باس کرا ئەبی بە سە بەشی گەورەوە :

( ١ ) ـ کوردوستانی روژەلات کە ئازربایجانی روژاواو ولاتی ( سنە ) و لوررستانی گەورەو بچوکە

(٢) کوردوستانی شیمالی که ولاتی خەرپوت ، دیاربەکر ، وان ، بتلیس ، ئەرزوروم ، بەشی لە ولاتی سیواس وناوچە شاخاوبەکان لە ولاتی قارس و ئەردەهان ، وە قەرەباغ لە قەوقاسی جنوبی .

(٣) کوردوستانی جنوبی کە ولاتی سولەیمانی ، کەرکوک ، هەولێر ، موصل تا ، بەدرەو مەندەلی و هەندی لە لوای دیالەیە بە تەواوی خانەقیەوە . لە کتیبی لە (عەمانەوە بۆ عمادیە) .

پانایی ئەم کوردوستانە بەپی یادداشتی کە بەدەستەوەیە (٥٣٠،٠٠٠) کیلومەتری چوار گوشەیی یە .

شارەکانی کوردوستان : لە ئیران ، هەمەدان ، کرماشان ، سنە ، سەلماس ، خوی ، سابلاخ ، سەقز ، بانە ، سەردەشت ، شنو ، بیجار ، ورمی ، میاندواو ، کرند ، سونقور .



دیمەنە جوانەکەی شاری «بتلیس» ئەو شارە کە مەلبەندی ئەمیر شرف خانە ، ئەو ئەمیر شرفخانە کە لە (١٠٠٥) هجری بە دانانی «شەرەفنامە» دەنگی تاریخی کوردی گەیاندە عالەم . لە ١٩٣٩ دا ئەم وینەیە وەرگیراوە .

له عراق ، سوله‌یمانی ، کەرکوک ، هەولێر ، ئامیدی ، زاخو ، دوهوک ، ئا کری ، رواندز ، کویه ، پینجوین ، هەله‌بجه ، خانەقین ، کفری ، زرباتیه ، بەدره ، مەندەلی .

له تورکیا ، ماکو ، بایەزید ، دیاربەکر ، قارس ، ئەرزوروم ، وان ، بتلیس ، ئەرزنجان ، درسم ، جزیرەی ابن عمر « العزیز » ، مالته ، مەرعش ، ئورفه ، ئەخلات ، موش ، ماردین ، خوزات ، معدن ، باشقەلا . له هەر سیکیانا بیجگه لەمانه شوینی تریش هەیه .

کوردوستان ولاتیکی شاخاویه ، هەتا بەرەو شیمال و روژهەلات بچیت هەر بەرز ئەبیتەوه تا ئەگاته کیوی « ئارارات » که نزیکەی پینج هەزار بەرزه ؛ ورده ورده که رو بکاته جنوب و جنوبی روژاوا نزم ئەبیتەوه ، کیوه کانی شیمال هەمو جەنگەلستان و شیو و دوله و پرییەتی له کانی و ئاوو



شاری «هەولێر» ، ئەو شاره کونەی کوردەواریی که « گەزەنەفون»ی یونانی له گەررانەوەی ده هەزار کەسه کەیدا له «٤٠١» ی پیش میلاد کردویه بەریباز . ئەم وینەیەی له ١٩٤٧ دا وەرگیراوه .

دیهات . کیوەکانی روژاوای — زیاتر ئەوانەی بەسەر سنوری ئیران و تورکیادایە ـ بی دارستان و بەردەلانن ، ئینجا هەتا بەرەو کوردوستانی روژەلات بروا دەست ئەکاتەوە بە دارستان . کیوەکان بە زستان هەمو سەر پوشی بەفر ئەدەن بەسەرا ، تەنانەت دەشتەکانی روژئاوا و روژەلانیش ئەگریتەوە ، لە زور شوینا شەش مانگ بەفر لەزەویدایە . بەهوی باران و بەفرەوە زورتر روبارەکانی روژەلانی ناوەراست و خواروو لەوپیک دیت ، سەرچاوەی « دجلە » و « فورات » و روخانەکانی تریان لە کیوەکانی شمالیەوە هەلئە ـ قولیت ، سەرچاوەی « قزلوەزان » و « سیروان » و « ئەلوەند » و « قەرەسو » و « کەرخە » و « ئاودیز » لە کیوەکانی روژەلاتیەوەیە . ئەمانە هەمو ئەرژینە خەلیجی فارسیەوە تەنیا (ئاراس) و (قزلوەزان ـ سفیدرود) نەبی ئەچنە دەریای قەزوینەوە . هەمو ولاتی کوردوستان — چ کیو چ دەشت – پربەتی لە (کان) هی ؛ نەوت ، ئاسن ، ئالتون ، زیو ، گوگرد ، خەلوزی بەرد ، قەلایی ، چیمەنتو ، پولا ، لەحیم ، گەچ ، قسل ، دەرماناوی هەموجورە و گەلی شتی تریش .

کوردوستان لەگەل ئەوەش کە شاخ و داخە لەپیش هەمو شتیکدا شوین کشت وکال و مالاتە . بەتایبەتی ئەو شوینانەی کە هەواکەی سازگارە باخ و بیستان و هەمو جورە داری بە بەری تیدا هەیە .

لە کشت وکالا ئەمانەی هەیە : گەنم ، جو ، برنج ، پەرشە ، گەنمەشامی ، زوررات ، هەرزن ، نوک ، نیسک ، ماش ، کونجی ، فاسولیا ، لوبیا ، توتن ، لوکە ، پەتاتە ، چەوەندەر ، پیاز ، سیر ، تەماتە وگەلی شتی تر .

لە میوەدا ئەمانەی هەیە : تری بە هەمو چەشنەکەیەوە ، گویز ، سیو ، بەهی ، هەنجیر ، هەنار ، هەرمی ، قەیسی ، قوخ ، تو ، چوالە ، فنق ، زەیتون ، هەلوژە ، گیلاس ، بلالوک ، میوژ ، سرینچک ، خورما ، باسوق و گەلی شتی تر .

لەمالاتا ئەمانە بە خیو ئەکەن : ئەسپ ، ئیستر ، کەر ، گا ، گامیش ، مەرو ، بزن .

ئەوشتانە کە ئەینیرنە دەرەوە : توتن ، لوکە ، خوری ، مەرەز ، مازو ، بەررو ، گزگل ، گەزو ، هەنگوین ، گویز ، میویژ ، چوالە ، رون ، پەنیر ، هەمو جورەپیستیک ، کەتیرە ، دوشاو ، موم ، گیا سالم ، مالات وگەلی شتی تریش .

لەپەلەوەرا مریشک ، مراوی ، عەلی‌شیش ، قاز بەخیو ئەکەن . بوراوا - ردنیش کوتر ، تاوس ، باز ، کەو .

لە ئیش وکارا جـولایی ، قالی و بەررە کردن ، بوزو ، زەررنـگەری ، تفـەنـگسازی ، خنجەرسازی ، دارتاشی ، سەرراجی و گەلی‌شتی‌تریش ئەکەن لەگەل جوتو گاو گەلەداریدا .

# ژیانی کومەلایەتی کورد

کورد دوبەشن ، کوچەری ، دیهاتی و شاری ، کوچەریەکان بەرە بەرە هەرکەم ئەبنەوە ئەبن بەنیشتەجی . وەکو « میجەرسون »یش ئەلی : یا سای دەرە بەگی هەرباوی هەیە ، ئاغا وبەگ‌و سـەید - شیخ - لەگەل شیخی تەریقەت ئەمانە زورن ، زەوی و بەراوهی بەگ وئاغایە ، جوتیارەکان « مسکین » یان پی ئەلین ، خویان زەوی‌یان نیە مەگەر لە هەندی شوینی کەما نەبی .

کورد زور ئازان بو جەنـگ کردن ، ئارەزوی تەواویان لە تفەنگچیتی و راو و شکار هەیە ، لەبەر ئەوە هەوای سافیازیی خوشەو حەز بە دەشت‌و دەر ئەکەن ، رقیانەلە ژیردەستەیی ، تەبیعەتیان سەر بەخویی ئەوی ، کە قسە - یەکیان کرد هەر ئەو قسەیە ، تەنانەت مەسەلیك هەیە ئەلی: « کورد وتی تەواو ،

هەر ئەو نەبە . » کوچەریەکان گەرمیان و کویستان ئەکەن .

گەورەی کورد سە جورە : خان، بەگ ، ئاغا . خان ئەوەیە کە دەسەلاتی لە ناوچەکەی خوی ئی پەررکاو شوینی تریش بگریتەوە . بەگ دەسەلاتی بەسەر ناوچەکەی خویاو توزی زیاتر ، ئاغا هەر لە ناوچەکەی خویا . شیخیش هەیە کە ئەمە دەسەلاتی بەسەر رەمەکی مەردما ئیجگار زورە .

کورد هەموی مسلمانە هەندی یەزیدی نەبی کە لەسەر ئایینی کونی کورد ماوەنەتەوە ، مسلمانەکان هەموی شافعی مەزهەبن بیجگە لە هەندی شیعە نەبی، تیکرا کورد پایەی قەومی بەلاوە لە هەموشت گەورەترە . سەید کە ئەگەر حسابی بکەیت ئەبی لە ئەولادی رسول بیت و عەرەب بی کەچی عەنعەناتی قەومی هەموشتیکی لە بیر ئەباتەوە هەر کورد ئەزانی ، کوردایەتی لە ناو کورددا لە راستیدا لە پیش هەمو شتیکەوەیە ، هەرایەک لە بەین دوتیرە یا دو کەسدا پەیدابی سەروکەکان ئەیبرنەوە ، کە دوژمنی خویانیان بەزەبونی دی ئیتر لی ئەگەرین .

کورد ئیشی سوکی زور رق لی ئەبیتەوە ، نەفسی بەرزە ، بەقنیات و بوردەبارە ، بوپایەی دنیا زەبونی وەرنا گریت ، تیکرا کورد زیرەک و بە قابلیـــەتن ، زو فیری زمان و پیشە ئەبیت ، ولاتی خوی زور خوش ئەویت ؛ تەنانەت خوی لە سەر ئەدا بەکوشت ، برریاریکیدا لە ســەری ئەرروا ، یا نەیشیبی هەر حەز بەنازبدەیی و بەخشندەیی ئەکا ، خزم دوستە ، چەند بەلایەوە خوشە کە ئەلی : ( من کوردم ) . عاشقی ئەدەب و شعرو دەنـگە ، موزیقای زور خوش لی دیت ، کە بەکیکیان مرد ئەیلاوینەوە ، لەوەختی گیان دەرچونەکەیا ئەو کەسە ئیشی چی بوە شتومەکی ئیشەکەی لەلای سەریەوە دائەنین ، ئەگەر تفەنـگچی بوبیت تفەنـگ ، ئەگەر گەللە دار بوبیت گالوک ، ئەگەر کشت وکالی کردبیت داس ، ئەگەر میرزا بوبیت قەلەمودوبت . خویندەواری لە ناو کورددا زور کەمە ، ئـەم نەخویندەواریە

شورەییکی زلی لی پەیدا کردون کە هەندی جار تاکی تا کیکی ئەبن بەخوخور ، لەگەل ئەم نەخویندەوارییەش زو فیری شت ئەبن ، زوریش بەتەنگی شورەیی یەوەن . بیگانە پەروەریشن ـ غەریب دوست ـ ، سەگ رائەگرن .

ژن لەناو کورددا بەتیکرایی پایەیکی کومەلایەتی هەیە ، خاوەنی مالە ، مال بەخیوکەرە ، میوان پەروەرە ، کەپیاو لە مالا نەبو بەدەم میوانەوە ئەچیت و خزمەتی ئەکا ، ئیش کەرو کوچ وبار بەریی کەرە ، شان بەشانی میردەکەی کوشش ئەکا : لە کوچ کردن ، لەجوت ، لەکیشە ، لە توتن ، لە باخ و رەزبەخیو کردن ، ژنی کوچەرولادیی شوررە سوارو تفەنگچیشن . ژن لە ناو کورددا داوین پاکە ، ئەگەر ئیشی خراپەی لی رویدا ئەیکوژن ، لە هەندی شوینا نەبی ژن سەربەخوییکی تەواوی هەیە لە شوکردنا ، دلداری ئەکا بو ئەوەوە میردی پی بکا ، رەشبەلەک ئەکەن ، وشەی ( زنا ) لە زمانی کوردیدانیە ، ئەمە ئەوەپیشان ئەدا کە داوین پیسی یا لە ناوا نیە .

## ژمارەی کورد

ئیستە ئیمە بەسەرەتەی ئەو روژهەلاتی ناس و میژونوسانە ئەنوسین کەلایەن ژمارەی کوردەوە دوواون. لە پاشا بیرو باوەرری خویشمان دەر ئەبرین .

کورد لە ئیران : ـ ( دائرة المعارف ئیسلامی ) ئەلی : ( کوردی ئیران هەر نیو ملیون ئەبی ) لە گەل ئەوەدا لیژنەی کومەلی قەومەکان ـ عصبة الامم ـ کەچونە موسل بوقسە لەکوردەکانی ئیرانەوە بە حەوسەد هەزار کەسیان دانان . هەر نوسینەکەی ئەوان لە شوینیکی تر لە باسی « سابلاخ »دا ئەلی ( ئەم ولاتە دوسەد هەزار کەسە ) « بەرگ ۳ . لاپەررە ( ۱۸۸ ) » . لەباسی کرماشاندا ئەلی: «دانیشتوی ئەم ولاتە ـ کە بەشی زوری کوردە ـ سە سەدهەزار کەسە» (بەرگ ۲. لاپەرە «۱۰۳۵»). بەشی روژاواوجنوبی،وە جنوبی روژهەلاتی

دەریاچەی ( ورمی ) لە ئازربایجان کە دوملیونــ دانیشتوی هەیە هەموی شوینی کورد بوە . ناوچەی ( سەلماس ) « ١٣٠٠٠ » کوردی لی‌یە . ناوچەی ( خوی ) و ( ماکو ) یش هەر وەها کوردن . هەریمی ( سندوس ، شنو و لاجان ) ئەوە هەموی هەر کوردە .

« کرزون » لە پاش ئەمانە ئەلیت : ( ژمارەی کوردی سابلاخ ٢٥٩ هەزارە . هی کرماشان ٢٣٠ هەزار . هی ئەردەلان ١٣٠ هەزار . ) لە سەر ئەم قسانە ژمارەی کوردی ئازربایجانــ ـ بیجگە لە هی ولاتی سابلاخ ـ بەلانی کەمەوە ئەگانە دوسەد هەزار کەس . ولاتی ئەردەلانــ کە پایتەختەکەی « سنە » یە و هەمویان کوردن ژمارەی نیشتەجی‌کانی ١٥٠ هەزار کەسە ؛ کە کوچەریەکانی بخریتە سەر ئـەگانە ٢٥٠ هـەزار کەس . ( دائرة المعارفی ئیسلامی . بەرگ ٤ لاپەرە ( ٢٢٦ )

لەمەوە ئەوە دەر ئەکەوی کە کوردی ئەم چوار شوینە نزیکەی ملیونیکە ئەبی . ئەگەر کوردەکانی خوراسان . کرمان ؛ فارس و تاران و قەزوین و هەمەدانی بخینە سەر لەگەل هەمو لوورستان ـ کەهی ئەم لوورستانە لە سەر باوەری ( کرزون ) لە سالی ١٨٨١ دا هی ( پشتکو ) و ( پیشکو ) کەپشتر تە « ٤٢١ » هەزار کەس « ٢١٠ » هـەزاری فەیلیە ، وە لەسـەر قـسەی روژەلاتی ناس ( رابینو ) لە سالی ١٩٠٤ دا هەمو فەیلی « ١٨٠ » هەزارە « ١٣٠ » هەزار لە پیشکو ، « ٥٠ » هەزار لە پشتکو . ـ زیاتر لە دو ملیون کورد دەر ئەچی لەئیراندا . لە راستیدا تا ئیستە بیجگە لە تەخمینی روژەلاتی ناسەکان ژمارەیەکی راستی لە ئیراندا نەدراوە بە دەستەوە . ( کوردو کوردوستان . ب أ . ل ٢٠،٢١ ) .

<u>کورد لە تورکیا</u> ـ « دائرة المعارفی ئیسلامی » ئەلی : ( ژمارەی کورد لە تورکیا بەپی ئەو ئامارە کەسالی ١٩٢٥ لە موسکو بلاو کرابەوە کەپشتر تە ملیون و نیویک . ) بەلام بەلـگەکانی تورکی ئەلین ژمارەی کوچەریەکانی کورد لە تورکیادا ( ٩٦ ) هەزار کەسە) . ( امین زکی بەگ ) ئەلی : ( دانانی

کورد لە تورکیادا بە ملیون و نیویک من ناچیتە دلەوە چونکە هەر لە دائرة المعارفی ئیسلامیدا ئەلی : ژمارەی دانیشتوانی ولاتی ( ئەرزوروم ) و ( وان ) و ( بتلیس ) و ( خەرپوت ) لە پیش شەرری ٩١٤ — ٩١٨ دا گەیشتبوە ( ٢،٦٤٢،٠٠٠ ) کەس ، لەمانــە ( ١،٨٢٨،٠٠٠ ) کەسیان موسولمان بون ، هەروەها نیوەی دانیشتوانی ( ئەرزو روم ) کوردن لە گەل چەند شوینیکی تر بەناوبانگدا . کەوابو ناچیتەدلەوە کە کورد لەو چوار شوینەدا لە ملیون و نیویک کەمتر بیت ) ! ..

دبسان ( سیرمارک سایکس ) و ( دوکتور فریک ) ئەلین : بیجگە لەمانە گەلیکی تر کورد لە تورکیادا هەیە ، وەکو ئەوە کە لە حەوزی روباری ( قزل ئیرمان ) و لە ناوەوەی ( قونیە ) و ( ئەنقەرە ) دا هەژدە عەشرەتی کورد هەیە کە نزیکەی حەڤدە هەزار خیزانن ، لە ( سیواس ) و روژەلاتی و لە ( زازا ) عەشرەتی ( قوچگیری ) گەورەش هەیە . ئەمە بیجگە لەو پینج تیرەیە کە کەوتونەتە ناوەندی ناوچەی ( ئەرزنجان ) و ( زازا )وە و دوانزە هەزار خیزان ئەبن . لە شیمالی خەلیجی ئەسکەندەرونەشەوە چواردە عەشرەتی تر هەن زیاتر لە ( ١٢ ) هەزار خیزان ئەبن . عەشرەتی ( بەرازی ) کە لە دەوروبەری ( ئورفە ) ن حەڤدە هەزار خیزانن و بون بە ( ١٢ ) تیرەوە . تیکرا ئەم عەشایرانە کە ( ٥٨ ) هەزار خیزان دەبن چون نزیکەی ( ٣٠٠ ) هەزار کەس ئەبن ، کە کوردەکانی فارس و ئەردەلانی بخرینە پالیان تەنیا کوردی تورکیای ئیستە زیاتر ئەبی لە دو ملیون .

حکومەتی فەرەنسی لە کتیبی زەرددا کە سالی ١٨٩٢ دەری کرد ئــەو کوردانەی کەوتونە تورکیاوە بە « ٣،٠١٢،٨٩٧ » کەسی داناون . جەنەرال ( زلانسکی )ی روسی کوردی تورکیای لە پیش شەرری ٩١٤ ـ ٩١٨ دا بە ( ٢،٨٠٠،٤٧٥ ) کەس داناوە . حکومەتی عوسمانی خوی لە سالی ١٩٢٤دا تەنیا کوردی تورکیای داناوە بە ( ٢،٥٢٧،٨٤٠ ) کەس ، ئەمە بیجگە لە دانیشتوەکانی دەیرزور و موسل .

هەر جور بوبیت لەبەر ئەم شەررانەو لەبەر کوچ کردنیان و توش بونیان بەگرانی و تالانەوە ئەو ژمارەیانە نەماوە .

کورد لە عراقدا ـ لە عراقدا گویا بەپێ قسەی ئەو لیژنەیەکە حکومەی قەومەکان ناردبویان بو عراق لەسالی ۱۹۲۵دا بو پرسیار کردن (٤٩٦،٠٥٠) کورد هەیە ، وانە تەنیا لە هەولیر ، موسل ، کەرکوک وسولەیمانی . بەلام بی گومان ئەمەشتیکی راست نیە چونکە تائیستە ئاماری تەواو نەکراوە تاوەکو ئەوان ئەمەیان بودەرکەوی . هەر وەها کوردەکانی لوای (دیالە) و (کوت)یشی نەخراونەتە سەری . بەلای منەوە کوردی عراق زیاترە لە (٦٠٠،٠٠٠) کس ، ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی عراق «۳» ملیون بیت نیسبەتی کورد لەگەلیا پینج یەکە . (کوردو کوردوستان) بەکورتی .

کورد لە روسیا ـ : لەسالی ۱۹۱۰ کوردی (ئەریڤان) و (قارس) لە قەوقاس ژمارەی گەیشتبوە (١٢٥،٠٠٠) کس ، لەگەل ئەمەدا حکومەتی روسی کوردی ناوچەکانی (زەنگەزور ، جوانشیر ، جبرائیل وئاراس)ی نەنوسیبو . بەراستی ژمارەی ئەو کوردانەکە وان لە قەوقاساو کەوتونەتە کومارەکانی ـ جمهوریانی ـ ئەرمەن و ئازربایجان و گورجستانەوە هیچ دیار نیە . بەلی (مفصل جغرافیای عراق) دایانی ناوە بە (٥٠،٠٠٠) کس بەلام ئەمە وانیە ، چونکە تەنیا (قارس) کە لەو ولانە بەر تورک کەوت ۲٥ تا ۳۰ هەزار کوردی تیدایە . ئەمەش بەپێ ئەو ئاماری دوایی یە کە ژمارەی قارسی گەیاندە (٦٣،١٠٧) کس . لەگەل ئەوە ئەو کوردانە کە لە قەوقاس مانەوە بەپێ ئماری سالی ۱۹۰۰ لە (١٥٠،٠٠٠) کس کەمتر نەبون . (کوردو کوردوستان) بەکورتی .

کوردی بلوچستان ، هیندستان و ئەفغانستان ـ کوردی بلوچستان (٣٠٠،٠٠٠) کسیک ئەبی ، لە هیندستانیش لە ناوچەی (سند) لە حشرمتی

( براخوی ) ـ کە دور نیە ئەمە لە براخویەکانی بلوچستان بن و چو بیتنە ئەوی ـ (٤٨،١٠٨) کەس هەیە . لە ( دائرة المعارفی ئیسلامی ) یەوە بەکورتی « ب ـ أ . ل ٦٣٠ » . ( مورگنستیرن ) ی روژهەلاتی ناسیش وەکو دائرة المعارفی ئیسلامي قسە لەکوردی ئەوغانەوە ئەکات بەلام هیچیان ژمارە نادەن بەدەستەوە .

کورد لە سوریا ـ (امین زکی بەگ) لە زمانی ( مسیو ژیرمان ) قونسولی روسیەوە ئەیگیریتەوە کە گویا حەفتا تا هەشتا هەزار کورد لەسوریادا هەیە ، ماموستاعەلی سەیدو گورانی ئەلی : کوردی سوریا « ١١٥،٥٠٠ » کەسە.

ئەو ژمارەیە کە ( أمین زکی بەگ ) بو هەمو کوردي داناوە بەم جورەیە : ئیران « ٢ » ملیون . تورکیا ملیون ونیویك . عراق شەش سەد هەزار . روسیاوسوریا دوسەدوسی هەزار . بلوچستان و هیندستان « ٣٥٠،٠٠٠ » . هەموی « ٤،٦٨٠،٠٠٠ » کەسە .

لە ( القضیـــة الـكردیه )ی دوکتور بلەج شیرکو کەلە ١٩٣٠ دا دایناوە ئەلی : ژمارەی کورد ئەگاتە هەشت ملیون و شتیك . دیسان خارەنی کتیبي (المسألة الـكردیة بتركیا) ل ٤٦ ئەلی : کوردەکان خویان ئەلین ژمارەی هەمو کورد لە پیش شەرری ٩١٤ ـ ٩١٨ دا ( ٥،٣٨٧،٢٨٠ ) کەســــە . واتە لە تورکیا (٢،٩٨٧،٩٦٠) . لە عراق (٧٤٩.٣٨٠) . لە ئیران ( ١،٣٠٠،٠٠٠) لە سوریا ( ٢٨٩،٩٤٠ ) لە ئەرمەنیادا ( ٦٠،٠٠٠ ) .



تا ئەم شوینە لە بابەت ژمارەی کوردەوە ئـەو قسانەمان کرد کە زورتر روژهەلاتی ناس و میژو نوسەکان لەگەلی خەریك بون ، ئـــەوە بو هەندی جاریش ئەو حکومەتانەکە کوردیان تیکەلاوە توزیك لیوە دواون . ئەمیلینەوە سەر ئەوە کە بزانین ئایا لە راستیدا ژمارەی کورد ئەوەندەیە یان نە ؟!.

لیرەدا باسەکە وای هینا کە قسەکەم بی بە باسیکی تاریخی روت ، لە بەر ئەوە

ناچارم لەوی ئەمانەی تاریخی وعیلمیە بپاریزم و خوم لا بدەم لەو دەمارە کە کوردم و گویا قسە لە باسیکی کوردەوە ئەکەم ، بەلکو ـ وەکو بە فیکری خوم وام کردوە ـ خوم بە پیاویکی بیگانەی بی لایەنگر داناوەو ویستومە لەم باسە بکولمەوە و ئەوی زەوق وعیلم وەری نەگری نەیلیم . جابەو بونەوە ئەلیم :

کورد لە نەتەوەی ئاری و لە پاشماوەی ئەو کەیانە بەرزەی ( ماد )ە کەزمانو قەلەمی هەموقەومیک دان بە بونی (ماد)دا ئەني . لام وایە ئەگەر برروا بەوە نەکا کە کورد لە نەتەوەی ئەوانە بە شتیکە رقەبەری لە گەل دەمارا ئەکا ! . . شانازي بەوەوە ناکەم کە کورد خاوەنی کەیانی ماد و دەوریکی بوە ، یاگەلی جار لە لاپەرەی میژودا حکومەت و ئەمارەتی هەلسووراندوە ، بویە نایکەم چونکە « نان ئەو نانە ئیمرو لە خوانە » لە گەل ئەوەشی ( تلك الایام نداولها بین الناس ! ) . ئادەمیزاد مادام بەستراوە بە یاسای گورانەوە ئەبی هەمو دەوریک ببینیت . بەلام ئەوەندە ئەلیم هەر لە دەوری رقەبەری رومان و فارسدا تا ئەگاتە دەوری حکومەتی عوسمانی ، تا ئەگاتە جنگی هاویشتنی روژاوای‌یەکان لە جەرگی روژهەلاتدا کورد بەردیکی قوچەقاني ( قەلماسک ) بوە بەم و بەودا دراوە . ئەمە لە لایەکەوە لەلایەکی تریشەوە دیسان هەمو جار کراوە بە دو بەردی هەلات هەر بە یەکا دراو ! نە تاریخ و نە بەلگە هیچیان ئینکاری ئەمە ناکەن ! . دەی قەومیک لە بەرەبەیانی تاریخەوە ئەمە بەشی بوبی ئایا چون ئەبی نەتویتەوە ؟ . بی گومان تەنیا کوردە خوی لەبەر ئەم هەمو بلارانەدا راگرتوەو لە ناو ئەو شاخ و داخانەدا بەبی کەس زمان و قەومیەت و هەنمەنانی خوی پاراستوە .

تا ئاخرو ئوخری سەدەکانی ناوەرراست نەوەک کورد بەلکو هیچ قەومیک ژمارەیەکی ریکوپیکی نەبوە ، ئەو پەرری ئەوە بوە بەکیک جیویکی ئەگرت بە دەستەوەو وەکو مەرر سەربازەکانی ئەژمارد ! . ژمارە تەنیا بو سەرباز

بوه . تیکرای مەردم بەجوریکی راستی ژمارەیان نەکراوه . کە ئەو دەورە بەسەرچو لەم روژەلاتەدا فارس وعوسمانی - کە زوربەی کوردیان تی کەوتبو - جاری بیجگە لەوە کە سەر ژماری تەواوی خویشیان بوریک نەئەکەوت لەبەر ئەوە کە بوونی راستی کورد پیشان نەدەن هیچ وەخت حەقیقەتیان دەر نەبرریوه ، سەرڕای ئەمەش بە هوی راونان وبرسیتی و چەوسانەوەو ئژاوەشەوە خویشیان روژ بە روژ هەر لە کورتی یان ئەدا ، چوارەم ئەوەیە کە ئیستەش هیشتا بە جوریکی راستي و بی گیرو گرفتی نە لە ئیران نە لە تورکیا سەر ژماری راستەقینە نەکەوتوتە دەست ، عراقیش دیارە توشي ئەو دەردە هەر بووە . - بەلکو ئەم ئامار دەست نەکەوتنە بەلایەکەو توشي هەمو روژەلات بوە - پینجەم ئەو سەر ژمارانە کە کراوە بیجگە لەوە کە راستي پیشان درابی یا نەدرابی ئەو ئەندازەیە کەوەرگیراوە دیسان هەر دور بوە لە حقیقەتەوە : ئەمەیان ئوبال ناچیتە ئەستوی کەس تەنیا هەر هی کورد خوی ئەبیت ! .

لە پیش داهاتنی سەربازی اجباریدا سەر ژمار بەتیکرا ئەوەندە گوی نەئەدرایە ، کەیاسای سەربازی داهات توزی دەستیان لی بزواندەوە ، بەلام لیرەدا هەرچی عەشایر هەبو چە تورک ، چە فارس ، چە عەرەب خویان لی ئەدزیەوە بە تایبەتی کورد . رەمەکی کورد یا دەوارنشینە یا دیهات نشین ، لە کاتی نوسینا جاری دەوارنشینەکان بەهوی گەرمیان و کویستان کردنەو ئەوە زورتر هەر ناوي نەئەهاتە دەفتەرەوە ، ئەویشی بهاتایە نیوە و نیوەچل بو . لادیکانیش لە سەدی شەستی زیاتر خوی پیشان نەئەدا . من خوم کوردم وکەم شوین ماوە لە کوردەواری چ لە کوچەري ، چە لە لادیي نەگەرابیتم و ئەو کارەساتەم نەبینبي ، نەوەک هەروا بە بینینیکی رواڵەتي بەلکو بەبینینی کەسیک کەبیەوی لە ئیش تی بگا .

جا ئەم هەمو شتانە هوی ئەوەن کە کورد تائیستە بەراستی سەرژماری

نەخراوەتە پیش چاو .؟ بەلام کورد ئەگەر لە خوی بپرسیت سەر ژمارت چەندە ؟ ـ نەوەکێ کوردیکی خوین گەرم بەلکو یەکی لەرەمەکی مەردم ـ ئەمەدیت بەزمانیا کە ئەلی : « دە دوانزە ملیونە » . . ئایا ئەمەی لەکوی وەرگرتوە ؟ لەگەل ئەوە کە سەرژماری راستەقینــــە نەکراوە و بەهوی نەخویندەواری و کوچەرایەتیشەوە ئاگای لەم حساب و ژماردنە نەبوە ؟!.

وەلامی ئەم قسەیەی ئەو هەر ئەوەیە کە لە باوکی، یا لە سەرکومار، یا لە ئاغاکەی، یا لەسەرعەشرەتەکەی بیستوە کە خیل،یا گوندەکەیان، یا فلانعەشرت ئەوەندە کەسن . ئەم عەشرت بو ئەو عەشرەت ، ئەم دێ بو ئەو دێ و ئەم شار بو ئەو شار گیرداویانەتەوە . کەلیکیان داوە نزیکی ئەو ژمارەیە کردوتەوە ، ئیتر بەم جورە پابەندی ئەم مەفکورەیە بوون . ئەمـــەش توزیک ئەچیتە دلەوە چونکە کورد کە زورتری کوچەری ولادێی بێ و گەرمیان و کویستانی کردبێ و هەمودەم هەراو بگرەیان لەبەین یەکدا بوبیت ناچار بوون بەوە کە بزانن خویان چەندن و بەرامبەرەکەشیان چەندە ، نەوەکێ لەبەر ئەوە نیکرەی ژماردنی تیکرایی کوردیان بوبیت بەلکو تەنیا هەر لەبەر عەشرەتەکەی خویان و بەرامبەریان . کارەسات هـــەر جور بوبیت مەفکورەی دە دوانزە ملیونی لەمەوە هاتوە . بەلام ئیمە لەمە بگەرریـن بچینەسەر حەقیقەت:

عراق : سالی ١٩٤٧ م . حکومەتی عراق بو ئەوە دانیشتوەکانی عراقی بە تەواوی بو دەرکەوی کوششیکی زوری کرد بو ئەم مەبەستە ؛ بەجوریکی وەها کە بلاوی کردەوە روژی «١٩ / ١١ / ٩٤٧» چە لە شارەکانا ، چە لە لادێیەکانا ، چە دەوارنشینەکان نابێ کەس لەمال دەرچیت بو ئەوە بیان نوسن . لە راستیدا کوششیکی باش کرا ، ئەو روژە بەپێی ژمارەیەکی رەسمی هەموکەسی عراق نوسرا ، لە دوایدا بەپینج ملیونیک دەرچو . بەلام لە پاداشی ئەم هەمو کوششەدا ئایا هەمو دانیشتوانی عراق نوسرا ؟ . نە أ . ئەمە نەوەکێ تەنیا من ئەیلیم بەلکو زور کەس ئەزانیت ! . نەنوسرانەکەش هەندیکی لەبەر

ئەوە بو مەردمەکە خویان لی دزیــەوە ، هەندیکیشی لە فیـکر ئەچونەوە .
من خوم یەکیک بوم لەوکەسانە کە نەنوسران ، لەگەل ئەوەش لە بەغدا بوم
- کەپایتەختە - وەهیچ پیچەوانەی یاسایشم نەکردبیانی لەمال دەرنەچوم، کەچی
کەس نەهات ، لە پاشا هەر لە بەغدا زور کەسی تر بەو جورە نەنوسرابون ا .
ئەمە حالی بەغدا کە مەرکەزی حوکە ! . ئایا ئەبی حالی لادیکان ، چە شیمال و
چە ، جنوب بەتایبەتی کوچەرەکان چون بوبیت ؟. لە پاشا کە چومە بنچ و
بناوانیەوە زیاتر لەنیو ملیونیک لەهەمو عراقدا نەنوسراوەو سەری کردوە .
وەبەپی ئاماری رەسمی نسبەتی کورد لە عراقدا لە « ٢٠٪ » ە . بەم بونەوە
کوردی عراق ملیونیکە . ئیتر بیجگەلەوانەکە نەنوسراون .

<u>تورکیا :</u> مەسەلەی ئامار لە تورکیا و لە ئیراندا وەنەبی لە هی عراق ریکو
پیکتربیت لە لایەن رەسمیاتەوە بەلام لە لایەنی ترەوە شکنیە کە عراق
باشترەو کردەوەی عراق لەسەر خوترە .

نسبەتی کورد لەتورکیا لە « ٢٥٪ » ە ، ئەگەر دەفتەری حکومەتی تورکی، یا
پیاوەکانی تورک دان بە کوردی تورکیادا ئەنین ئەو شوینە پانو دریژە کە
کوردی لی دائەنیشی و ئیستە کەوتونە بەر حکومەتی تورکیا دانی پیا ئــەنی ،
وانە : لە ماکو و بایەزیدەوە تا ئەگاتە ئـەسکەندەرونەو تاپی حەلەب دانی پیا
ئەنی . جا کەوابو ئەگەر دانیشتوانی تورکیا بەپی ئاماری سالی ١٩٥٠ نوزدە
ملیون بیت کوردی تورکیا چوار ملیون وحەوسەد وپەنجا هەزارە ، ئەمە
بیجگە لەو هوبانە کە چون هاتونەتە ریی عراق بو نەنوسینی تیکرایی هاتونەتە
ریی تورکیاش . ئەم کارەسانی بی ریکو پیکی نوسینەکارەساتیکە بو هەمو
هــەمو روژەلات ، شەعبی کە نەزانو نەخویندەوار بو لەم روەوە حکومەت
هیچی لەگەل پی نا کری . . ئەگەر یەکیک تەماشای ولاتی کوردەکان بکا لە
تورکیادا و تەماشای ئەو کوردانە بکا کە ئیستە تیایا دانیشتون ئیتر ئەو قسەیە
نرخیکی نابی کە تورکەکان ئەلین « کورد لە تورکیادا نیە ! ».

ئیران ـ هەرچەندە لەم دەوری دواییەدا هەر ژماریکی تازە لە ئیران نەکراوە بو ئەوە بزانری ژمارەی دانیشتوەکانی چەندە ، بەلام بەپی ئاماری سالی ١٩٣٩ ژمارەی دانیشتوانی ئیران گەیشتونە « ١٧ » ملیون .

نسبەتی کورد لە ئیراندا لە«٢٣٪»یە . بی گومان دەفتەری ئیران رەنگبی وا نەلیت بەلام دریژایی بەپی روخی خەلیجی فارسی و ورمی و میاندواو تا ئەگاتە «خو و سەلماس» وپرریی ئەم ناوچانە ئەمەمان بو دەر ئەخا کە چەندە کورد لەم شوینەدا دانیشتوە ، ئیتر ئەمە بیجگە لەو کوردانە کە لەشارەکانی وەکو تاران وشیراز و کرمان وخوراسان[1] دانیشتون . جا لەبەر ئەمە « ٣،٩١٠،٠٠٠ » کورد لە ئیراندا هەیە .

ئینجا شوینەکانی تر وەکو سوریە ، روسیا ، بلوچستان و هیندستان .

کەوابو ژمارەی کورد بەم جورەیە :

| | | |
|---|---|---|
| کوردی عراق | ١٠٠٠٠ر١ | |
| « تورکیا | ٠٠٠ر٧٥٠ر٤ | |
| « ئیران | ٠٠٠ر٩١٠ر٣ | |
| « روسیا (قەوقاس) | ٠٠٠ر٢٥٠ | لەسەر قسەی ماموستا محمدعلی عونی |
| « بلوچستان | ٠٠٠ر٣٠٠ | لەسەرقسەی دائرة المعارفی ئیسلامی . ب أ ، ل ٦٣٠ |
| « هیندستان | ١٠٨ر٤٨ | لەسەرقسەی دائرة المعارفی ئیسلامی . ب أ ، ل ٦٣٠ |
| « سوریا | ٥٠٠ر١١٥ | |
| هەموی | ٦٠٨ر٣٧٣ر١٠ | |

(١) لەسەر قسەی « روضة الصفا » لە ١٢١٠ هجری پەنجا هەزار خیزانی کورد لە خوراسان هەبوە

ئەمە بیجگە لەو عەشایرە کوردانە کە کەوتونەتە ئەفغانستان و شاخەکانی جنوبی دەریای قەزوین. وبیجگە لەوانەش کە لەنەفسی ئانادول وقاهرە و شارە ـ کانی تری عالەمدا هەن کە بە دەربەدەری کەوتونەتە ئەو شوینانە . دیسان بیجگە لەوە کە ناررێکوپێکی سـەر ژمار گەلیکی لە دانیشتوەکانی روژهەلات کردوە بەژیر لیوەوە . ئەگەر هەر بە نیوە چاویکەوە سەیری ئەوانە بکریت هیچ شکی تیدا نامینیتەوە کە « ١١ » ملیون ونیو تا « ١٢ » ملیون کورد هەیە .

ئەم قسانە لە بابەت ژمارەی کوردەوە کە کردمان مەبەستمان تەنها ئەو کوردانەیە کە ئیستە بەزمانی کوردی قسەئەکەن . ئەگینە ئەگەر ئەو خیزانانە بخرینە ژمارەوە کە رەچەلەکیان کوردەو خویان نازانن بە زمانی کوردی قسە بکەنو بەم داخەوە ئەتلینەوە ؛ گومانت نەبی ، کەلەمانە زیاتر لە دو ملیون بوون بەژیر لیوەوە



# مێژوی ئەدەب

تا ئەم شوێنە ئەوی شایان بی وقەلەم بیگانی لە باری کورد وبناغەی کوردو وشەی کورد ومێژوی کورد دا قسەی لیوە کرا ، ئیستە ئەمانەوی لە مێژوی ئەدەب ، لە تازانجی مێژوی ئەدەب لە ئەدەبی زمان ، لە مێژوی ئەدەبی کوردەوە قسەبکەین هەر وەها ئەمانەوی ئەوە بزانین کە ئەدەبی کوردي چە کردەوەیەکی بوە بەرامبەر بەقەومي کورد ؟ وچە گوررانیکی بەسەرا هاتوە، وە هەر بەرەبابیک چە کەلکیکی لە شاعري دەوري خوی وەر گرتوە ؟ . یا ئەدەبي ئەو شاعرە چەکارەسانیکی نواندوە بەرامبەر بەو ناوچەیە کەتیایا ژیاوە ؟ وە مەردمي دەوري ئەو چە عەقلیەتورەوشتیکیان بوەکەوا لەمیشکی ئەو شاعرەدا دەنگي داوەتەوە ؟ وە لەگەل ئەمانەشا بەراورد کردنی ئەدەبی کوردی لە گەل ئەدبی غەیری کوردا جاری :

## ئەدەبی زمان

مەبەست بەم ئەدەبە ئەو گەوهەر و قسە جوانانەیە کە لە دولیوی شاعرو ئەدیبو نوسەری ئەو قەومە دیتە دەرەوەو تەعبیر لە خەیالی نازکی عاتفـەیەکی بیرو باوەریان ئەدانەوە .ئەمان زمانی زمانەکەیانن،بولبولی باغي ئەدەبیانیانن، بویە وانە چونکە ئەو شتەی ئەوان ئەیلێن شعور ئەبزوینی ، گیان ئەلەغزینی . کەوابو ئەمان زمانەکە رایەنن و بەرزی ئەکەنەوە . دیسان ئەدەب وەکو چون ئەمە ئەگریتەوە ئەوەش ئەگریتەوە کە هەرشتیک لە هەر زمانیکاو لەهەر زەمانیکا لە باری عیلمي ، یا دەستکردی جوان ، یا پیشەیەکی نایابا وترابی ..لە سەر ئەم قسەیە هەر شتیک شابەرری خەیالی شاعریک ، یا دەست نەخشینی دەست رەنگینیک ، یا پیشەگەري پیشە سازیکی گەیشتبیتی ئەدەبەو بە ئەدەب دائەنری .

میژوی ئەدەب ـ گوترا میژوی ئەدەب مەبەست عیلم وزانینکە کە باس لە چونیەتی لوغەت و زمان وشتی جوان و ئەو شعرو نوسینە نەخشینانە ئەکا کە روڵەی ئەو زمانە لە لاپەرەی میژودا بو پاش خوی هیشتوتەوە و باسی ئەو بەرزی و نزمیانەی ئەکا کە کارەساتی دەوران بە سەریا هیناوە . وەکو ئەمە ئەگریتەوە ئەوەش ئەگریتەوە کە دوانو قسەکردنە لە ئەحوالی هەڵکەوتوانی ئاشنایانی قەڵەم و شعرو زمانو هەڵبەنگاندنی دانراو وبیروباوەرەکانیان لەگەڵ کار کردنی هەندیکیان لە هەندیکیانا لە باری فیکرو پیشەدا...جا میژوی ئەدەب ئا بەم مەعنایە شتیکی تازەیەو ئیتالیایەکان لە سەدەی هەژدەهەمی میلادیدا ئەم ناوەیان بودانا ، کە روژهەلاتو روژاوا خویان لیک هەڵسو ئەم ناوەش کەوتە ناوەوە .

هەر یەک لەم تاریفانە کە پیاو سەیری ئەکا لەوانەیە مانایەکی تایبەتی بی بو میژوی ئەدەب . ئەگینە بەجوریکی تیکرایی ، تاریفی میژوی ئەدەب : زنجیرە باسکردنیکە کە لەگەڵ زەمان و زمانا هاتبیت ، باسی ئەو شتانە بکاکلە کتیبەکانا نوسراوەتەوە ، لە سەر بەردەکان هەڵکەنراون ، لە لاپەرەی روژنامەکانا خراونەتە بەرچاو ـ کە دیارە ئەمانە تەعبیر لەعاتفەو لە فیکر ئەدەنەوە ـ ، وە یا عیلم و هونەریک بەپیاو پیشان ئەدەن، وە یا بەریزمجاردی کارەساتیکن . هەر وەها هەر لە ژیر ئەم مانایەدا ئەوەشی تیدایە کەباس لە زاناو حەکیم و کتیبدانەرەکانیش بکاو ریگەو پایەی هونەر وعیلمەکیانیان بو دەرخا. مەبەست لەمانەش هەمو هەر بو ئەوەیەکە پیاو بزانی لە رەورەوەی روژگاری پیشودا لە چەومختیکا عیلم ، یا پیشە ، یا هونەر بەرزی ونزمی بەسەرا هاتوە .

گەڵکی میژوی ئەدەب : ـ ئەمە ئاشکرایە کە میژوی ئەدەب ئاشنایەتیەکی زوری بە زبانی قەومەوە هەیە ؛ چونکە ئا گاداری پەیدا کردن بەسەر زمان و لوغەتو ئەو شتانەدا کە لە کردەوەی عەقل و دلە یەکیکە لەو

بناغه هــــره تاغانه که قەومیک بەکیەتی وشەرەفومانەی شانازی خوی لەسەر دائەمەزرینی . ئەگەر قەومیکت بی بەش کرد لەو ئەدەب و عیلمانەی کە لە باو باپیریەوە بوی ماوەتەوەو ناهومیدت کرد لەبەیرەوی کردنی مەنمەنانی قەومیو ئەدەبی خوی، ئەوە هیچت لەگەل نەکردوە تەنیا ئەوەنەبی کە مەهارت کردومو رائیەکیشی بولای دیلیەتی هوشو فیکر کە ئەمـــە گەلی خرابترە لە دیلیـــەتی سیاسی ، چونـکە نەخوش کەوتن و بە سوخرەگرتنی لەش دورنیە بەداو دەرمان چاک ببیتەوە ، بەلام می فیکرو هوش سەدنیکە بو ئـــەو قەومە کە هیچ پزیشکیک ناتوانی دەرمانی بکا .

بەش کردنی میژوی ئەدەب : - میژوی ئـــەدەبی رایەکی بردبردە پشتەی میژوی سیاسی و کومەلایەتی هەمو قەومیکەو بەبی یەک نایانـکریت ، بگرە میژوی ئەدەبی لە چاو میژوی سیاسیدا بە نرخترو بەکەلکترە و مەسەلەکانی وەکو مەسەلەی فیکرو ـــکردەوە و باوەررو هیز وایە ؛ هەر بزوتنەوەیەکی کومەلایەتی و سیاسی گومانی تیدانیە کە لەئازاوەی فیکریەوە سەر هەلئەدا ، ئەمەش بەکەم جار لەسەر زمانی شاعرو لە نوکی قەلەمی ئەدیب و عالمەکانەوە دیتە بەرهەم ، لەمانەوە وردە وردە بەهوی نوسینەوەی نوسەرەکانـــ و خویندنەوەی خەتیبەکانەوە ئەتەنیتەوە بو مەردمی‌تر و ئینجا بزوتنەوە سەر هەلئەدا . جا لەبەر ئەمە ئیمەش ویستمان میژوی ئەدەبی قەومی خومانـ کە « میژوی ئەدەبی کوردی » بە بە گوررانی زەمانـــ و هالو هەوالی کومە ـ لایەتی‌و سیاسی بکەین بەسە بەشەوە :

یەکەم : ئەدەبیکی زور کونی چیروکی و رازونیاز تا ئەگاتە سەد سالیک پاش سەرەتای سەدکانی ناوەراست و توزی پاش سەرەتای ئیسلامەتی .

دوهەم : لەسەرەتای سەدەی حەوتەمی پاش میلادەوە تا ئەگاتە سەدەی حەڤدەهـــەمی میلادی، کە دوسەد سالیک دوای دوایی هاتنی ســــەدەکانی ناوەراست ئەکەوی .

سیهەم : لەسەدەی حەڤدەهەمی میلادەوە تا ئیمرروز .

# سەرەتای داهاتنی ئەدەب

ئیمە کە قسە لە ئەدەب و ئەدەبیاتەوە ئەکەین لە پیش هەمو شتیکدا پیویستە بزانین ئەدەب چون داهاتوە ؟ .

بی گومان دەوریکی زور زور بەسەر ئادەمیزاددا تی پەرریوەو ئاگای لە هیچ جورە کەین وبەینیکی نوسینو خویندنەوە نەبوە ، ئاگای لەوە نەبوە دەوریکی بەسەرادیت کە رولەکانی چاو ئەبررنە ئەو هەواو خاکە و ئاوانە کە باو باپیریان تیایا ژیاون بو ئەوە بەلگەیەکی روحی‌یان لیانەوە دەست کەوی و بیکەن بە ئاوررشینی دلیان ، کەچی هیچیان بەرچاو ناکەویت ! .. راستە ئەم بەلگەیە دست ناکەوی بەلام نابی ئیمەش بکەوینە سەر ئەو باوررەو بلین : ئەو دەورە کە نوسینو خویندنەوە نەبوە ئەدەبیش نەبوە ، چونکە بەبی شک ئادەمیزاد لەپیش نوسینا قسەی کردوە وە ئەم قسەیە خالی نەبوە لە ئەدەب و لەبیروباوەرر کە ئەمەیان «تان» ی ئەدەبە . . ئەو ئادەمیزادانە کەباو باپیری ئیمەنو لە ئەشکەوت و چولو بیابانەکانا رایانئەبوارد کە ئەکەوتنە ئیوارەو لە گوی ئاگردانەکانیانا کو ئەبونەوە قسەو دەنگو باسی ئەوەیان ئەگیرایەوە کە ئەو روژە چون بەرەنگاری دررندیەک بوون ؟ و چون خویانیان لی پاراستوە ؟ و چون لە ئاو و روبار پەرریونەتەوە ؟ و چون لەو چورتە خویانیان رزگار کردوە ؟ .. ئەم جورە شتانە هەتا زەمان هاتە پیشەوە ئەمانیش هاتنە پیشەوە ، لەمەوە پلەیەک سەرکەوت بو پیاهەلوتن بە خوایەکانی شەو و روژو چاکەو خراپە . وای لی‌هات کوررەکان داستانی باوکەکانی خویانیان ئەگیرایەوە بو زاررولەکانی خویان . بەم کردەوەیە بناغەیەکیان دانا بو ئەدەب ، نەوەک هەر بو ئەدەب بەلکو بو یاسا ، بو رەوشت ، بو ئایین .

ئەم قسەیە کە ئەیلێین وەنەبێ هەوا پیوان بێ ، بەڵکو لە روی بەڵگەو سوراخەوە ئەیلێین ، چونکە کونتر چیروکێك کە گەیشتوتە ئێمە وەکو تەماشا ئەکرێ پریەتی لە ئاموژگاریو تاقی کردنەوەوشتی بەکەلك دەی ئەمە پیاوێکی ساویلکە ناتوانی ئەمە دابنێ ، بەڵکو گەلێ دەورو گەلێ تاقی کردنەوەی دیوە تا گەیشتوتە ئەو شتە کە ئیستە ئێمە گویمان لێ ئەبێ .

دوهەم ئیستەش لە زور شوێنی سەر زەویدا گەلیکی تر لەو ئادەمیزادە سادانەی دەوری ئەوەل هەر ماونەتەوە . داستان و ئەفسانەی ئەمانە کە لەناو خویانا ئەیگرنەوە داستان و ئەفسانەی رابواردنی ئادەمیزادی دەوری ئەوەلمان پیشان ئەدەن .

لەمەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئەدەب زەمانێکی زور دور و دریژ هەر بەسەر زمانەوە بو ، ئەم ئەیگیرایەوە بو ئەو و ئەو بو ئەو ، ئیتر نە قەڵەمی دیبو نەکاغەز . وەکو ئیستە کە سەدەی بیستەمەو دنیـــا پەردەیەکی تری وەرگرتوە کەچی ئەدەبی چیروکیو خەیالی کورد هیشتا هەر نەکەوتوتە سەر کاغەز ، ئەمەیان چاکتر بەلگەیەکە بو ئێمە کە سەرەتا ئەدەب لە قەومیکەوە سەری هەلداوە هیچ ئاگایان لە نوسین و خویندنەوە نەبووە کەوابو ژیانی ئادەمیزاد لە سەرەتاوە تا ئیستە هیچ دەوریکی نەبوە کە خالی بێ لە ئەدەب .

ئەوەندە هەیە شعری لەپیش ئەوەدا وتوە کە نوسین ـ نثری فنی ـ پەیدابێ ، چونکە شعر زمانی وجدانە و نوسین هی ئەقل ، پیاو هەست بە وجدانی خوی ئەکا لە پیش ئەوەدا کە ئەقل بکا بە ئالەتی فیکر کردنەوە .

ئادەمیزادە سەرەتاییەکانی پیش تاریخ کە بەدارەکانا هەڵئەزنان و لەم لق بازدیان ئەدایە ئەولق هاواریان ئەکرد: «را ، را ، را . بو، بو، بو» ئا ئەم دەنگەی ئەوان بو بە بناغەی ئەو ئەدەبە کە ئیستە ئێمە پێ ئەڵێن « شعر » ؛ ئا ئەم دەنگە کە ئەوان کەمەکەمیان پێ ئەکرد لە هەلپەرکیدا ، زیررە زیرریان پێ ئەکرد لە توورەییدا ، نرکەنرکیان پێ ئەکرد لە شەرردا بو بەم

ئالبه که ئیمه ئیسته وشه‌ی جوانی قافیه‌داری پێدا ئەررێژین و بەو وشانه تەعبیر له خه‌یالاتی زور بەرز ئەده‌ینەوه . کەوابو شعر یەکەمین پایەی ئەدەبە هەر هات‌و سەرکەوت هەتا وای لی‌هات له وجدانەوه بەلاماری دا بو ئەقل که « نوسین - نثری‌فنی »یه .

شعر له هەمو دەوریکاو له هەمو قەومیکا گوڕران و هەلسوکەوتی بەسەرا هاتوه ، سەرەتا بەجوریکی سادە پەیدا بوه و تەعبیری له عاتفه داوەتەوه ، له پاشا خزمەتی جوان‌کردنی وشەی کردوه ، لەپاشا لەم قاپیەوه ئەوەندە چوەتە زورەوه هەتا عاتفەی لەژیر جوانی وشەدا پلیشاندوتەوه ، هەر ئامانجی جوان بونی وشه که بوه . لەپاشا مەردم بەرگیکی تریان له بەر کرد کەچی شاعر هەر له قافیه‌ی خوی نه‌کەوت . لەپاش ئەمانه جاریکی‌تر شعر گەرراوەتەوه بو ئەوه تەعبیریکی نازک له عاتفه بداتەوه .

که زانیمان شعر یەکەم پایەی ئەدەب بوه ، ئەبی ئەوەش بزانین که یەکەم جار کاهن‌و پیاوه ئاینییەکان قاپی ئەدەبیان کردوتەوه ، هاتون مرودی جەنگ‌و چیروکی پالەوانان‌و بیروباوەرری ئاینییان خستوتە قالبی شعروه بو ئەوه چاک له بەر بکری ، له پاشا لەبەر ئەوه که ئەدەب سیبەری کومەله بەپی گوررانی چونیەتی کومەلایەتی و سیاسی ئەدەبەکەش گورراوه ، هەتا کومەل بەهوی بناغەی مادەوه پیشتر کەوتبی ئەمیش پیش کەوتوه ، ئەبینین له سەرەتادا لەبەر ئەوه یاسای کومەل ریکوپیک نەبوه و هەر له شاخ وکیو پیویستی ژیانی بە راوکردن و جانەوەر کوشتن پیکهیناوه ئەدەبەکەشی هەر لەو پایەدا بوه ، که ئالاوه بەلیواری ئەفکاری پرو پوچدا و خی داوەتە هیزەکانی تەبیعەت ئەدەبەکەشی هەر ئەو پەردەیە وەرگرتوه ، که پلەیەکی‌تر هاتوتە پیشەوه ئەدەبەکه بوه بە جوریکی‌تر . ئەم ژیانه که ئەم ئەدەبەی گوررایوه هەموی له بەندو باوی ئابوریەوه سەر هەلئەدا . لەم قسەیه ئەوەمان بو دەرئەکەوی که هەندی کەس له پیناوی ئابوریەکەیدا زوری پەیدا کردوه و

ئازوخەی خستوەو بەهوی ئەو ئازوخەوە بوە بەگەورەی هەندیکی‌تر ، کە ئەم یاسایە داهات کردیەکاری کە یاسای سیاسی پەیدابییت ، کە ئــەم دوە پەیدا بون کارەساتی ئەدەب کەوت بە باریکی‌تردا ، کەوتە ئەو بارەکە بە شعری جوان تەعبیر لە عاتفەیەکی خوین بزوین بدریتەوە و بخوینریتەوەو مەردمەکە هەلخرینی بو ئەوە دەستە دەستوبوەستی‌وشاعری‌هەر دەستە بە شعر بەرەی خوی بکا بەگژ ئەویترا ، یا بیت بەشانو بالی خیلەکەی خویدا و تانوت بدا لە خیلەکەی بەرامبەری . ئەمانە هەمو کردیانەکاری کە شەخسیەتی تاکــ ـفەرد ـ توزی دەرکەوی بەلام نەوەکــ زور . .

* * *

لەپاش ئەمانەوە یاسای «ئوتوکراتی ـ حکمی مطلق» لە قەوي دەوروبەري روبارەکانا داهات، ئەمانە بەهوی نزیکــ بونیان لەئاوەوە خیروخیراتی کشت‌و کالیان زور بو ، بە تەبیعەت خواردەمــەنی لە جاران گەلي زورتر بو ، لە مەعنادا ئەم خواردەمەنیە زیاتر ئەکەویتە دەست ئەو کەسانە کە گەورەتر و بەهیزترن ، لیرەدا یاسای پادشایەتی هاتە پیشەوەو بەرەبەرە بەرەی سەند ، وردە سەروکــ و ئاغا ـ کەجاران هەر خیلە بو خوی سەروکیکی ســەربەخوی‌هەبو ـ هەمو کەوتنە ژیر فەرمانی‌ئەو پادشایەوە ، وای لی‌هات پادشاو دەستو پیوندەکەی بون بە بەرەیەکــ ، رەمەکي مەردمەکەش بەرەیەکــ ، بە تەبیعەت ئەو کەسانە کە خواپیداوی شعری چیروکی و ئەدەبی عاتفي بون کەوتنە بەرزکردنەوەی پادشاو دەستو پیوەندەکانی‌هاتن بەشبانو بالی خواـ کانو ئەو کەسانەدا کە بەردي بناغەی « ئوتوکراتی »یان داناوە . جا ئەمە ئەوە بە ئیمە پیشان ئــەدا ئــەو ئەدەبە ئوتوکراتیەکە چوەتە پیستي شعری چیروکی‌وشەررو شوررەوە هیچی‌تری پی نەگەیاندوە تەنیا کارەساتیکي مادّی نەبی گەبو بە ظاهرەیەکي کومەلایەتی . . لەم گورراني ئوتوکراتیەدا کومەل نە تەماشای یەکیەتي خوینی خوی ئەکا ، نە یەکیەتی نەژادی ، بەلــکو هیزی

پادشا هەمویانی کردوە بە یەکێو بەرامبەر بەمە سەرانە لە وردە سەروکەکان ئەستێنی و گویا ئەیانپاریزی لە دوژمن ، لەمانە وایە پادشا راست ئەکا ئەیانپاریزیو بو ئەوانەەزیەتئەکیشی بەلام لەراستیدا وا نیە ، بەلکولەبەر ئەوەیە کە ئەم سەرانەیە لە دەست دەرنەچیت . جا لەبەرکارەساتی ئوتوکرانی پادشا ، وردە سەروکێو رەمەکی مەردم خویانیان لە نیکر ئەچیتەوەوهیچ شتێکیان بەدلا نایە تەنیا گەورەیی پادشاو هیزی پادشانەبی .

کارەساتی ئوتوکرانی گەلی قەومی لەژیر تاقە یاسایەکدا کوکردەوە ، ئەم قەومانە هەر یەکە لە تەلیکێلیان داوەو لە ئاوازیکێ خویندویانە ، تەبیعەتی کوبونەوەکەیان لە ژیر ئەم خیوتەی ئوتوکرانیەدا ئەکانەکاری کە بەعەلمەنانی یەکێ ئشنابین و لە رەوشت و عادەتی یەکێ وەرگرنو لە ئاخردا نیکریکێ لە حالی خویان بکەنەوە ، ئەمە سەر ئەکیشی بولای شارستانیوشت داهینان ، سەر ئەکیشی بولای ئەوەکە بازرگانی بیگانە بخریتە برەو . سەرکیشانەکەشی لەبەر ئەوەیە تاوەکو ئوتوکرانی بتوانی بازارزی پیشەسازی و کمت وکالەکەی خوی پیش خا . ئەمەش دیارە : هەر وەخت کە پیویستی مەردم زور بو ئارەزویان زور ئەبی ، کە ئارەزویان زور بو بە تەبیعەت ئەدەبیش پەلپەل ئەبیتەوە ، چونکە کابرا کە گوررانی بەسەراهات ئاسوی خەیالی بلاو ئەبیتەوە ، ئەدەب لە قسەوە ئەبی بە نوسینو روەو پیشەوە ئەرروا ، ئیجگار بویەش روەو پیشەوە ئەرروا چونکە نوسینەکە وردە وردە لە قەدەیە ئوتوکرانیە کە ئەدزیت و ئەیکا بە ئەدەبی دیوکرانی .

لەم دەوری ئوتوکرانیەدا قەومە شارستانیە کونەکان ئاگادار بونەوەو ئاشنا بون بە ( تمثیل ـ لاسایی) کردنەوە و خییان دایە باسو خواسی ئاینیو ئەفسانەی پررو پوچ ، لەمەوە روحی ئەدەبی لەچاو دەوری کومارلشینیو دەرەبەگیدا گەلی پیشترکەوت ، وەکو ئەبینین لە « بابل » دا پادشاو کاهنەکان ئەچونە کوبونەوە ئاینیەکانەوە و پەرستاگاکان رەنگیکی شانوی وەر.

ئەگرت ، هەروەها میسری کۆنیش هەلپەرکێو موزیقای لەپەردەی شانۆیەکی ئاینیندا گێراوە ،وەکو چون«کورد»ە کونەکان گەلی جار رەوشتی ئاینیان لە شیوەی هەلپەرکێو سەمادا نواندوە ، یونانی کۆن ـ کە هومیروس شاعر باسی ئەکا ـ جەژنە پیروزەکانیان بەکوبونەوەی ســـەماو گورانی و لاسای دروست ئەکرد . ئەمانە هەمو گەلی گەلی بەرزتر بون لەو دەورەکە ئادەمیزاد دەشتــەکیو کیوی بو ، چونکە بە ئاشکرا لەم دەورەدا ئەبینین کە شعر ـ چەهی گورانی چەهی شـــەررو شورر ـ پلە پلە سەرکەوتوەو گەیشتونە چلەپوپەی بەرزی ، لە فیکری درزندەکوشتنەوە بوە بەو فیکرە کە شاعر باسی ژیانی ئینسانی پوشراوو روالەتی بکا ـ کە ژیانی عاتفەو رەوشت وعادەتە ـ بەتایبەتی‌خو شعری چیروکی هەر قسەی لیوە ناکری ، بویەش وا بەرز بو بوەوە چونــکە گەورەی راستەقینە ـ کە پادشایە ـ پەیدا بو ، بو بە خاوەن سامانیکی‌وەها نە لە وزەی‌سەرکومارا بیت ـ لە دەوری‌عەشرەتیدا ـ وە نە لە وزەی سەروکێدا بیت ـ لە دەوری دیموکراتیدا ـ ، تەنانەت زور کەس لە مەردمەکە ئەیانوت پادشا راستەو راست لە خواوە فەرمان وەر ئەگریت و نمایندەی ئەوە ، ئەگەر ئەو لەپشتی نەبی وا بەم جورە زل نابی، خو ئەگەر ئەو پادشایە پالەوان بوایەو لە فرروفیلی شەررو مەیدانداری شتیکی بزانیایە ئەوە ئیتر چیکی‌لە خوار خواوە بو ا . جا سامانەکەی پادشاو بەخوا زانینەکەی کردیانەکاری‌کە شاعر بەو جورە ئاگری تی‌بەربی بو بەرزکردنەوەی شعری چیروکی .

نوسین ـ تتری‌فنی لەم دەورەی ئوتوکراتیەدا پایەی هەر لەوەدا بو کەبە دەور ئاموژگاری ئاینیو رازو نیازی جادوگەری‌وباسو خواسـی جنوکەو کاغەزنوسیندا هەلیئەخستەوە ، لەگەل ئەمەش ئەگەر تەماشا بکەین لەچاو دەوری کومارنشینیو عەشرەتیدا هەر پیش‌کەوتوە ، وەکو لە چیروکەکانی بابلو ئەفسانەی کوبی ئاگردانی کوردو داستانی هیندو رازی میسریەکانا

ئەبینین ، ئـەوەندە هەیە نثری ئوتوکراتی گەلێ گرانترە لە شعرەکەی ، ئەمانەوەی نثرو مانەوەی شعر ئەمەمان پیشان ئەدا ، بەلام بەپیچەوانەی هی کوردی ، ئەمیان نثرەکەی ماوەتەوە و شعرەکەی تیا چوە ، لەلایەکی تریشەوە ئەبینین کە بەسەرهاتی موزیقای نثری‌فنی بە تەواوی وەرنەگیراوە ، تەوەکو هەر ئەو وەختە بەلـکو ئیستەش دیسان ریچکەیەکی ریکوپیک بو نثری‌فنی هەر نیە .

* * *

ماوەیەکی باش بەم جورە رویشت ، کونوپرر «دیموکراتی» لە ئاسوی عالەمەوە دەرکەوت و ئاکردیەکاری کە ئارەزوی باوەرری ئابوری بەرز بیتەوە ، دوزەرەوەکان ـ مستکشف ـ کەوتنە هەلسوورران بوچی بەجی کردنی ناو و ژیان و بو زور کردنی مال‌وسامان ، لەمەوە هەندی پیاوی‌تر پەیدابون و هوشیان دایە سەربەستی تاکی ـ فەرد ـ وپشتیان لە ئوتوکراتی هەلـکرد ، بە دنیادا گەرران‌و لە سەرچاوەی باوەررو خویندەواری و ئارەزوی هەمو قەومیکی ئاویان خواردەوە ، بە تەبیعەت ئەمانە ئیتر لەوانە نابن کە خویان بیەستن بە یاسای ئوتوکراتی و دیکتاتوری تاقە پادشایەکەوە ـ کە قسەی ئەو لەسەر قسەی گەورەو بچوکی شەعبەوە بیت ـ بەلـکو کوششی ویران کردنی دارو پەردوی ئەو بناغەیە ئەکەن‌و خەریکی پەیدا کردنی پشتیوان ئەبن بوئەوە ئەو یاسایە بە تەواوی هەلـگرن‌و یاسای دیموکراتی لە شوین دانین . ئامانجی ئەم‌یاسا تازەیەش ریزنانە لە شەخستی تاکو بەشدار کردنیەتی لەسەربەخویی زاتی . دیارە ئەم ئامانجەی هـەیە بویە باوەرری تازەو داهینراو و پیشەـ گەری تازە داهات و بەبی پشو بوپیشەوە هەنگاوی هاویشت . جا ئەمانە هـەمو بون بە هوی ئەوە کە ئـەدەب پەردەیەکی‌تری بەسەرا بیت و بکەویتە عالەمیکی‌ترەوە .

ئەگەر سنوری ئەدەبی عەشرەتی و خیلەکی تاقە هەواریکی بو ـ چونـکە

بو بو بە ئەدەبی تیرەیەکێ ولایان وابو تەنیا رەگەزو خوینیکێ کویان ئەکاتەوە ، وەیا ئەگەر ئەدەبی ئوتوکراتی پابەندی تاقە پادشایەکێ بو چونکە لایان وابو بەگەورەزانینی یکیکی‌تر لە دەسەلاتی ئەقلدا نیە — ئەدەبی دیمو کراتی بو بە ئەدەبی عالەمیکێ و یاسای خیلەکي و ئوتوکراتی وەکو تومار پیچایەوە ، سەربەستي و ئازادي دا بە هەمو تاکیکێ ، گەورەو بچوکی جیا نەکردەوە ، ئاغەو جوتیاری بەلاوە یەکێ بو ، ئەوسەربەخوبی تاکیەو شەخسیەتی زاتیە کە ئەیدا بە گەورەتر پیاویکێ هەر ئەوەشی ئەدا بە بچوکتر کەسیکێ . دیارە ئەم سەرکەوتنی ئەدەبە بو تەقدیری فەرد لەدوانەی سەرکەوتنی کومەلەکەیەو هەریەکە لەم کومەل و ئەدەبە ئەبن بە ئاوینە بو ئەویتریان .

ئەدەبی دیمو کراتی راستەقینە مانعا لە لی‌بوردن.و بەزەیي ئەداتەوەو مەیل بەلای ئەوەوە ئەکا کە تاکێ بەریوە بەریت . جا ئەم جورە ئەدەبە ئەگەر لە سەرەتاوە یاسای ئوتوکراتی بالي نەکیشایە بەسەریاو مەردي نەخستایەتە ژیر ئەشکەنجەوە ئەو کومەلە ئەدیب.و بەفیکرانەی تیا هەنەئەکەوت کەوا بانگی ئازادی بدەن و داوای شتیکی چاکتر بکەن . ئەمەش دیارە کە جیاییکی زور هەیە لە بەین ئەدەبی ئوتوکراتی و دیموکراتیدا ؛ چونکە ئوتوکراتیەکە هەر بو بەرزبونەوەی تاقە تاقە کەسیکێ بوە ، بەلام ئەم دیموکراتیەکە بەپیچەوانەی ئەو کوشش ئەکا بو بەرزبونەوەی ئەدەبی لاسایی ـ تمثیلی ـ کە ئەمە ژیانی رەمەکی مەردم پیشان ئەدا . ئەمە خوی ئەم کردەوەیە ئەنوینی لە لایەکی‌تریشەوە کوبونەوەی مەردم لە شارەکانا و چاوبرڕینیان لە سەرەنجامي روژانەو خەلکێ تاقي کردنەوەیانیش پشتیواني ئەکا . . بەلی رەنگی ئەدەبی لاسایي دیموکراتی وەکو ئەدەبی شانوی ئوتوکراتی لایەنگری بارەگای پادشاکان و ژیانی ئابینی شەعب نەگریت بەلام لەبەر ئەوە کە هەر لەگەل ئەوشتانەدا خەریکە کە ئاشنایەتی

خەریزەو بەیمەنی ئادمیزادی هەیە گەلی گەلی لە ئوتوکراتیەکە بەرزترە . .
سەرەتا یەکەم کەس کە شانوی رابواردن و پێگەیاندنی بو تیکرای مەردم دانا کومارەکانی « ئەسینا » بو ، بەراستی ئەمان ئەدەبی لاسایی یان گەیاندە چلەپوپە . کە ئاوروپا باوەشی کردبە دیموکراتیدا ئەویش هەر شوین ئەسینا کەوت .

شعریش لەم سە دەورەیەدا شان بەشانی گورانی ئەوان گوراوە ؛ سەیر ئەکەی شعری دەوری عەشرەتی و خیلەکی کابرا خوی ون کردوەو تەنیا روحی خیلەکەی نەبی هیچ عاتفەیەکی زاتی تری لیوە دەر ناکەوی . شعری دەوری ئوتوکراتی هەر خەریکی بەرز کردنەوەی پادشاو دەستو پیوەندەکانی و خوا کانەو هیچی تر . بەلام شعری دەوری دیموکراتی شاعر هەست بە بونی خوی ئەکا وعاتفەی زاتی خوی بە پوختی دەرئەبری ؛ ئەوەندە هەیە لە شعری چیروکیدا پیچەوانە ئەبیتەوە ؛ چونکە هی دەوری ئوتوکراتیەکە بەرزترە ، هوەکەش ئەوەیە هەر کە کەبنو بەبنی کومەلایەتی تیکچو ئەو ریچکەیەش تیکچو ، نەنانەت ئەگەر یکیک بیویستایە عاتفەیەکی قەومی بە باسی رابواردنی رابوردوان بنوینی پەنای ئەبردە بەر نوسراوی تاریخی و ئەوەندە گوی بە شعرو چیروک نەئەدا هەندی لە شاعرە تازەکان وەکو « ملتن »ی ئینگلیزی و « خانەی قوبادی » ویستیان شەررو شورر لە شیوەی ئوتوکراتیدا زیندو بکەنەوە بەلام هەر پیان نەکرا . ئەوەندە هەیە ئەگەر پیاو بیتە سەر نوسین ئەبینی لە هیچ دەوریکا جوانی و بەرزی دەوری دیموکراتی نەبوە کە ئەمە تەلیسمیکی سەیرە ؟ چونکە ئادەمیزاد بە هەزاران سال قسەی کردوە لە پیش ئەوەدا کە ( هیرودوت ) و مەردی تر بینەکایەوە ، کەچی وەکو بلیت ئەو هەزاران سالە چاوەریی دەوری هیرودوت و ئەوانی کردوە ! .

لەلایەکی تریشەوە دیسان تەماشا ئەکەی ، ئوتوکراتی وورکی گرتبو لەسەر

ئەوە ئەیوت : « تا کێ ـ فەرد ـ بۆ دەوڵەت و فەرمانداره» کەچی بەپێچەوانەی ئەوە دیمو کراتی ئەیوت : « نەأ دەوڵەت و فەرماندار دروست کراوە بو تا کێ» جا لەبەر ئەم بانگەی دیمو کراتی وا ئەیێژی هـــەمو سوچێکێ بزوتنەوەیەکی کوتوپرری بەسەراهات و بو پێشەوە تەکانی دا چە لە داهێنان، چە لە ئەدەب . هەر لەبەر ئەمەش بو کە نوسین بە هەمو چەشنەکەیەوە وا بە خێرایی پێش کەوت چە لە بابەت مێژومەوە ، چە کاغەز و وتاری ئەدەبی ، چە نوسینی گەپ و گاڵتەو فەلسەفی کە ئەمانە هەمو کردیانەکاری کە روژنامەو گوڤار بێتەکایەوە .

# ئەدەب لە روژ ولاتی کوندا

لە باسی پێشودا بومان دەرکەوت کە سەرەتای مێژوی ئەدەب پێش نوسین کەوتوە،بو یەش وا بو چونکە بەشەوکو ئەبونەوەو لە گوێی ئاگردانەکانا سەمایان ئەکردو بەسەرهاتی روژەکەشیان ئەگێرایەوە ، لەپاشا کە دنیا پێشتر کەوت توزێ فیکری خواناسی پەیدا بو ، گورانی و هەڵپەرڕلیکەیان خستە پێصنی نوێژ و نزا کردنەوە و دەنگیان بەرز ئەکردەوە و هاواریان پێ ئەکرد. بەتایبەتی کە ئەچون بو شەڕرکاهنەکان لەپێشیانەوە بە سرود خوێندن موزیکی تریان پێ ئەدان ، بەرە بەرە هەر ئەوەیەکێ کە ئەهات شتێکی تری لی زیاد ئەکرد ، تا کەوتە دەورێک کە ئادەمیزادەکە کەوتە سەر ئەو باوەڕرە : ئەگەر بێتو هەر بەم جورە بمێنێتەوە ئەم داستانانەی لە ئاخرا هەر لە فیکر ئەچێتەوە . ئەم پێویستیە خستیە ســەر ئەوە کە خەت نوسین دابنێ . سەرەتا فێری نوسینی وێنەی شتەکە بو ، لەپاشا هەڵکەندن ، لەپاشا بزماری. کونتر شتێکێ کە لەم روەوە دوزرابێتەوە ـ چەند هەزار ساڵێکیش پێش قسەی نوسینەوەی « تەورات » کەوتبێت ـ چەند پارچە قوررە وشکێکە

بۆیە کە لە « کەلدە »دا بینراوەتەوە و لەپاشماوەی کەلدانیەکان بەسەرهاتی تۆفانی تیا هەڵکەنراوە .

وادەرئەکەوی نوسەر لە دەوری کەلدانیەکانا کری گرتەی پادشا بوە ، بۆ هەر لایەکێ چوبێت ئەویشی لەگەڵ بوە و کارەساتی شەڕو شوڕری پادشای لەسەر ئەو پارچە قوڕرانە بە قالب هەڵکەندوە . هەر ئەم کەلدانیانە دو دەستە نوسەری تریان بوە ؛ یەکێ کاهنەکان کە نوشتەو نزای نویژیان لەو قالبانە هەڵکەندوە ، یەکی جونیەتی کشتوکاڵ و سیاسەت و ئەستێرە ژمێرییان هەڵکەندوە .



# ئەدەبی کوردی

ئائێستە باسی چونیەتی سەرەتای مێژوی ئـەدەب و توزی لە پەیدابونی ئەدەب لە روژهەلاتی کوردستان کرد، ئینجا ئەمانەوی لە هەر یەکێ لەم پارچە زەمینانەدا کە کەوتونەتە ئەو روژهەلاتەوەو خاوەنی ئەدەبو ئەدەبیات بوون بە ئەندازەی دەسەلات قسەیەکیان لێوە بکەین، بو ئەوە لە پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە پایەی هەمویان بە جورێکی تێکرایی دەرکەوی وە بە تایبەتی ئەوە بچێتە دلمانەوە کە ئەدەبی کوردی وەنەبی ئەوەندە تەریک بێت لە عالەم کە مێژوی ئەدەب بڕی لێ بێتەوە . بەلکو بە تەواوی ئەوەمان بو دەرئەکەوی کە ئەدەبی کوردی ئەتوانی تاکی تەرازوی خوی راست کاتەوە .

کورد یەکێکە لەو قەومانە کە لە روژهەلاتی کونو تازەدا شوێن هەوارو شوێن ئاگردانێکی لەو سەر زەمینەدا بو خوی داگیر کردوەو تیایا ستاری گرتوە ، کارەساتی روزگار وەکو ئەدەبی قەومەکانی تری دروست کردوە لەگەل ئەمیشدا ئەو ئامانجەی هەر نواندوە ، ئەمە نەوەکێ تەنیا دلسوزیی بی بەلکو یاسای تەبیعەت وگوڕرانی ئەم ئاوە ئەربڕی .

وەکو باس کرا ، بەرەبەیانی مێژو چون تاریکە هی ئەدەبەکەشی ئاوا تاریکە، ئەوەندە هەیە هەر قەومە بەپی دەسەلاتی خویان کوششێکیان کردوە بو زیندوبونەوەی ئەو ئەدەبیاتەیان کە بیرو باوەڕو رەوشتو خوی باو باپیرەکانیان بوە ، هیناویانە لە پاش دەماو دەم خستویانەتە سەر بەرد و کاغەز تا گەیشتوە بە ئیمە ، بەلام هی کورد هەندێکی هەر وەکو لە دەوری سەرەتادا بی وایە ، هەر ئەو دەورەیە کە دەماودەم شت ئەگیڕرێتەوەو کردەوەی رابوردوانیان ئەهونرێتەوە . ئەگەر ئەو شتانە کە هوی پێشکەوتنی بەسەر ئەدەبی قەومەکانی تردا هاتون بەسەر ئەدەبی کوردیدا بهاتنایە هیچ قەلەمڕ

زمانیک گومانی لەوەدا نەئەما کە ئەمیش تائیستە یەکی لە ئەدەبە بەرزەکانی عالەم ئەبو ، لەگەل ئەوەش ئیستە کە سەیری ال و بوبەکانی بکری کەلکی ئەوە ئەگری کە ناوی بهینریتە ناوانەوە ، چونکە ئەدەب بە کورتی کە عبارەتە لە: داستانی رابوردوان؛ لە پەندی پیشینان: لە شعری شاعران، لە دەست کردی دەست رەنگینان و لە پیشەی پیشەگەران ـ کە هەریەکێ لەمانە بەردەیەکی ئەو قەومە پیشان ئەدەن ـ لە کوردیدا هەن و شوینیکیان بو خویان گرتوە ، کونەکردنەوەیەوەیەک نەخستنەکەیان ئەوەیە ناگەیەنی کە روت بوون لە هەمو شتێک ، بەلکو ئەوە ئەگەیەنی کە بەردەی روزگار یازوری ستەمکار ماوەی ئەوەی نەداون کە بیرلە کو کردنەوەیان بکەنەوە ، ئەگینە وەنەبی ئەمانیش لە ئاکانی ئەدەبدا ئەستیرەیەکیان نەبوبیت ؛ هەیانبوە بوبە ئیستە من کەوتمە سەر ئەوە کە باسیکی ـ بەپی دەسەلات ـ دورو دریژی لیوە بکەم و بلیم : ـ

ئەدەبی کوردی «سەریچکەی گرتوە ؛ ئەفسانەو داستان ، قسەی نەستەق و پەندی پیشینان ، هونراوی نازکی خەیالی شاعران .

لە کوردیدا هەندی رازو نیاز هەیە کە بەچاویکی وەنەبی بەرزەوە سەیر بکریت، بەلکو هەروا بەشتیکی خەم رەوینی ئەزانن ، بەشەو لە دیواخانان یەکیک دائەنیشی و ئەیگریتەوە؛یا لەکاتی نوستندا ئەیگیرنەوە بو ئەوە ئاغە یا خانم خەوی لی بکەوی ، وە یا پیریژنان لەگوی ئاگردانان دائەنیشن و منالی مال دەورەی لی ئەدەن ئەویش بویان ئەگیریتەوە . ئەم جورە شتانە لە کوردیدا پی ئەلین : « راز ، چیروک ، حەقایەت » تائیستە هەروا ماونەـ تەوەو دەماو دەم ئەیانگیرنەوە ..

## داستان

« داستان » و « ئەفسون »یش هەیە ؛ داستان زورتر بو نەبەردی پالەوانان

بەکار ئەهینریت . وشەکە لە بنەرەتا «داواستان»ە ؛ واتە شوینی جەنگ و
شەررو شورر ، وە یا « دادستان » ە ؛ واتە شوینی عەدل ، لە هەر دوبارا
وەکو عیلمی بەلاغە ئەلی « تسمیەی حالە بە اسمی محل » . دریژبونەوەی
زەمان وشەکە زمان کورتی کردوتەوەو بوە بە « داستان » . « ئەفسون » بو
جادو و جادوگەر ئەوتری . ئەفسوز زمانی فارسی بە « ئەفسانە »ي ناو ئەباو
مەبەستی حەقایەت و چیروکي کونە . پیاوانی عیلمي لە کوردیشدا وشەی ئەفسانە
بو کارەسانی زور کون بەکار ئەهینن ، جا بەو بونەوە ئیمەش کە وتمان ئەفسانە
مەبەست ئەو چیروک و رازە کوردیانەیەکە دەماو دەم بورا بواردن ئەیگیرنەوە .

عالەمە بیگانەکان وەکو رەمەکي مەردمەکەلی لە ئەفسانە ورد بونەتەوەو
کردویانە بە عیلمیکي سەربەخو ، ئیستەش لە ناو کوردەواریدا کە بوتری
چیروک هەر وا بەشتیکي خەم رەوینی ئەزانن نەوەک بە شتیک کە بناغەی
ئەدەبیات و بناغەی کردەوەی باو باپیریانە ، بەلام بیگانە وانین ؛ بەتەواوی
تیایا روچوون و گەلی قسەیان لیوە کردوە . ئیمە بو ئەوە پایەی سەرچاوەی
ئەفسانە و چونیەتیەکەیان بو دەرکەوی لەگەل ئەو خەریک بونەدا کەزانا ـ
کانی بیگانە لەگەلی خەریک بوون هەندی لەو قسانە کە دەربارەی کراوە
لیرەدا ئەینوسین بو ئەوە کە کوردیش وەکو بیگانەیەک بوی دەرکەوي کە
چیروک عیلم و بەندە نەوەک تەنیا رازی گوی ئاگردان : ـ

## ئەفسانە

ئەفسانە، کە «میثولوژیا»یشی پی ئەلین ، هەر چەند ئەم وشەیە بەو ئەفسانانە
ئەوتری کە ئاشنایەتیان لەگەل خواکانا هەیەو بە بالای ئەوانا وتراون بەلام
لەبەر ئەوە کەزاناکان قسەیان لە پەیدا بوزو چونیەتي و رموزی ئەفسانەوە
کردوە بە عیلمەکەش هەر ئەلین « میثولوژیا » . ئەم عیلمە زوری لەسەر
رویشتون بەتایبەتي لە یونانا سەرچاوەی ئیلهامي فەیلەسوفەکان بوە . فەیلە ـ

سەفەکانی «ئەیونا» ئەلێن : «ئەفسانە رموزو نیشانەیەکە بۆ ئەو شتە نەفسیو ئەخلاقیانە کە لە ئادەمیزادا هـــەیە» . بیروباوەرری فەیلەسوفەکانی «ئەسکەندەریە»ش وەکو «ئەفلوتین»و «فەرفەریس» لە بارەی ئەفسانەدا وەنەبێ دوربێ لە هینـــەکانی «ئەیونا»وە . لە سەدەی چوارەمی پیش میلاددا هەر لەبابەت ئەفسانەوە باوەرریکی تر بەناوی باوەرری «بوهیمیری»یەوە ـ کە هی فەیلەسوفی یونان «بوهیمیروس» بو ـ پەیدا بو . ئەو ئەلی : «ئەفسانە تەنیا هەندی قسەی خەیالیە بۆ ئەو کارەساتانە کە لە میژودا روی داوە» . هەر وەها ئەلێ : «ئەو خوایانە کە لە ئەفسانەدا باس ئەکرین یا ئەو پیاوانە کە لە ئەفسانەکەدا ئەوترین ئەوە ئەو پادشاو پالەوانانەن کە مردون و زەمانیکی زور بەسەریانا تێپەرریوە و لە پاشا بە ناوی «خوا» ناو ئەبرین» . تەنانەت پیاوەکانی کلیسە لە میژوی کون و سەدەکانی ناوەراستدا بۆ ئەوە بەر بەردەکانی بوتپەرستەکان بگەن ئەم باوەرری «بوهیمیروس»یان گرت بە دەستەوە . مەسەلا لە چیروکی «زیوس»ی یونانیدا «بوهیمیروس» ئەلی : «ئەوە پالەوانیک بوەو گەلێ شوینی گرتوەو لە پاشا لە دوورگەی «کریت» مردوەو نیژراوەو دوای ئەوە بوە بە «خوا»» . جا ئەم جورە شتانە بۆ پیاوەکانی کلیسە دەستی داوە .

بەلام لەم دەورەی دواییەدا واتە — لە وەختی راپەرینی ئاوروپادا — فیکرەی ئەفسانە پەردەیەکی تری بە سەراهات . لە دۆزینەوەی ئەمەریکاو ئەفەریقاو دوورگەکانی ئوقیانوسیەدا عالمەکان هەندی ئەفسانەی ساویلکەیان لەمانەوە دەست کەوت کە بتوانن بیکەن بە نمونە بۆ دەربرینی چونیەتی ئەفسانەی کونیش . ئەم زانایانە هـەندیکیان ئەلین : «ئەفسانە تەعبیر لەو رەوشتە ئاینیانە ئەداتەوە کە قەومەکانی دەوری ئەوەل هەروا بە جوریکی بێ سەرەوبەی وەریان گرتوە بەبێ ئەوە شتیک لە بناغەکەیەوە بزانن ، گویا لەبەر ئەوە شتیک لە ئاینەکەوە بزانن ئەم قسەو حەقایەتانەیان بۆ هەلبەستون» .

هەندیکی تر ئەلین : ( ئەفسانە لە قەومە سەرەتاییەکانەوە بو ئەوە داماتوە کە شانو بالی بوتەکانیانی پی برازینەوە ) . هەندیکی تر بەم جورە مەعنایان لیداوەتەوە کە : گویا ئادەمیزادی زور کون نەیتوانیوە لە حەقیقەتی شتیکی وەکو روژ یا هیزیکی تری تەبیعی بگا لەترسانا پەرستویەتی و هیناویە بە چیروک و ئەفسانە رازاندویەتەوە .. هەرکام لەمانەبیت یا لە هەریەکە توزیک بیت وە یا هیچیان نەبیت لە مەزەندە زیاتر هیچی تر بەدەستەوە نیە ، مەزەندەش پیاو ناخاتە سەر باوەرری راستەقینە ... )

تەماشا ئەکەیت قەومیکی وەکو یونان لەسەرەتادا وە وەکو ئاوروپیەکان لەم دەورەی دواییەدا بە هەموجور خەریکی ئەوە بون کە لە حەقیقەتی داهاتنی چیروک بگەن و زانای زور بەرزیان قسەی لیوە کردە تا گەیشتوتە پایەک کە بوەبە عیلمیکی سەربەخو وە ئیستەش لە ئاوروپاو ئەو شوینانەدا کە پابەندی خویندەوارین زور زور گوی بەچیروک ئەدەن و گەلی شتی ئەخلاقی و کومەلایەتی و سیاسی لە ژیرداستانی چیروکدا دەر ئەبرن .

ئینجا هی کورد ، پیاو ئەو شکەی نامینیتەوە ئەم شتانە کە ئیستە ماوەتەوەو دەماودەم ئەگیرریتەوە لویچیکە لە سەرچاوەی زور کون ، لە هی ئەو سەردەمە کە تەگەر بە روژ کارەسات و بەسەرهاتیکیان بەسەر هاتبی یە شەو کە کوبونەتەوە گیرراویانەتەوە . ئەگەر شتیکی زور بەلاجەوی بوبیت دەماو دەم کەوتوەو لە شوین هەوارگەی خوی پەرریوە بو شوینیکی ترو زیادو کەمیشی پیوە نراوە .

ئەو جورە مانمایەکە یونان یا ئاوروپا لە بابەت چیروکەوە لی ئەداتەوە من بەرامبەر بە چیروکی کوردی ناتوانم ئەو مانمایە لی بدەمەوە ؛ ناتوانم بلیم سەرەتا لەروی شعوریکی ئاینیەوە بو خواکان یا بو بوتەکانیان داناوە ، بەلکو هەر لە سەر ئەوەم کە کارەساتی ئەشکەوتەکان و ژیانی ساویلکەی روژانەکەی خویان بوە گیرراویانەتەوە ، لە پاشا بەپی دریژبونەوەی زەمانو

گۆڕانی ژیان چیرۆکی تری واهاتوتە پێشەوە کە هێنەکانی پێشوی لە فیکر بردوتەوەو قالبی ئەم لەگەڵ زەوقی ئەو ژیانەیانا چاکتر ڕێی کەوتوە، کە دەوری ئیسلامیش هاتوتە پێشەوە ناوە کۆنەکان گۆڕراونەتەوە بە ناوی ئیسلامی و لەپاش ئەویش هی تری هاتوتە سەر . ئەم قسەشە پێچەوانەی ئەوە نیە کە چیرۆکی ئایینیان نەبوە ، هێزەکانی تەبیعی و چاکەو خراپەو تاریکی و ڕوناکی گەلی چیرۆکی بو خستونەتە ناوەوە بەلام مەبەستەکەی ئیمە پێش ئەم تاریخەشە .

# چیرۆک

لە چیرۆکی کوردیدا لەبەر ئەوە کە لە ئاخردەوریانا وەکو ژیانی سەرەتا ـییان هەر لەسەر کوچەرایەتی ماونەتەوە زورتر ئەو شتانە بەرچاو ئەکەوی کە لەگەڵ ژیانی ڕەوندا ئاشنایەتی هەیە ، لە شەڕو شوڕ ، لە تیکلاوی ژنو پیاو . ـ کەکار ئەکەنە سەر غەریزەو عاتفەی یەک ـ هیچ چیرۆکێک لە کوردیدا دەست نا کەوی کەخالی بی لەیەکی لەم دوشتە ، ئەمە بەچاوپیا خشاندنیکی تیکرایی . لە باریکی تایبەتیشدا ، لەبەر ئەوە چیرۆک شان بەشانی ئەو قەومە دیتەخوارەوە پەردەی ژیری و ژیانی کومەلایەتی و ئەخلاقی و بەرزی و نزمیان لە مەیدانی تەفیکری شارستانیتیدا دەرئەبری .

کەوابو ئەگەر چیرۆکی قەومیک بخوینریتەوە و بەچاویکی وردەوە پیاو لی بکولیتەوە گورج بوی دەر ئەکەوی کە ئەو قەومە تاچە پایەیەک پلەی بەرز بوەو چی لە ناویا باو بوە ؟. وەکو چون ئەگەر ئیستە چیرۆک نوسیک چیرۆکیکی نوسی خیرا ناتەواویەکی کومەلایەتی ، یا بەرزو نزمیەکی ئەخلاقی، یا ڕەوشت و خویەکی ئەو قەومە دەر ئەکەوی ، هینەکانی پیشویش

یا ئەو دەستەیە کە ئەو چیروکەیان داناوە یا بویان دانراوە هەر ئەو پەردەیە بە پیاو پیشان ئەدەن؟.

کورد لە چیروک و ئەفسانەی کوندا زور دەولەمەندە بەلام کو نەکراوەتەوەو نەنوسراوە هەر شتیک هەبوە هەر دەماودەم گیراوەتەوە و خویشی ئەوەندە بە تەنگیەوە نەبوە کەنەکاتە کاری تیابچیت و شتە بەنرخەکانی بمریت . لە هەر ناوچەیە لە ناوچەکانی کوردەواری بە هەزاران چیروکی وای تیایەکە هەموی پرریەتی لە داستانی رابوردوان و لەچونیەتی ژیان و کومەلایەتیان و پرریەتی لەپەندو ئاموژگاری. ئیمە لیرەدا ئەم چیروکەی خوارەوە ئەخەینە بەرچاو بەلام نازانری لەکەی وە لە چەوەختیکا کارەسانی چیروکەکە قەوماوە ، ئەوەندە هەیە لە باری ئەفسانەدا گەلی شتی لی وەر ئەگیریت . ئەفسانەش یا - وەکو زاناکان ئەیلین - خەیالیش بیت هەرپایەی ژیری قەومەکە دەر ئەکەوی کە تا چە ئەندازەیەک خەیالیان رویشتوەو چیان بەسەر هاتوە ؟..

« دوبرا هەبون یکیکیان ناوی ( بالی) بو ، یکیکیان ناوی ( بارام ) بو ، لە بەر هەژاری وبی‌نەوایی هەستان سەری خویانیان هەلگرت و کەوتنە ولاتان ، هەتا چونە شاریکەوە سەیریان کرد ئەم شارە هەموی بەرگی ماتەمی پوشیوەو کزو مەلولن . پرسیان ئەوە بو چ وا خەلکی ئەم شارە رەشپوش بوون ؟. وتیان : بەلی دوینی پادشای ئەم شارە مردوەو کەسیشی لە شوین بەجی نەماوە . لە زەمانیکی زور کونەوە لەم شارەدا بودانانی پادشا بازگەردان بوە ، باز نیشتبیتە سەر هەر کەسیکەوە کردویانە بە پادشا ، ئیستەش ناچار ئەبی سەر لەنوی دەست بکەنەوە بەبازگەردان . لەپاش چل روژی‌تر دیسان باز ئەگیرنەوە بو ئەوە یەکیک بکەن بەپادشا . ئەمانیش هەروا بو خویان لەویدا مانەوە بو ئەوە ئەو روژی بازگەردانە ببینن کە چون باز ئەسوورریتەوەو ئەنیشیتەوە بەسەر یەکیکەوە ؟...

چل روژەیان لەویدا رابوارد ، لە روژی سیو نوەدا سەیریان کرد وا قەراخ شاریا ک کرایەوەو رایەخی لی راخراو هەموشت لە شوینی خوی دانراو ئەوشەوە یاساول بەلایەوە مایەوە ، داروغەش بەملاو بەولادا هاتوجوی ئەکردو خەلـکی شاریش هەمو کەوتنە خویان ، وسبەینی . ئەو شەوە هەرکە نوست ، نوست ، هەر کەسەش نەنوست خەریکی وتوویردی ،ز گەردانی بەیانی بو کە ئاخو باز بەسەرکی وە ئەنیشیتەوەو کی ئەبی بە پادشای ئـەم شارە ؟؟ بەیانی لەگەل روژهەلاتا ورده ورده دەستە دەستە خەلك لە شار دەرجونورویان کردە ئەو دەشتە ، گەورەو بچوک کەس لە ناوشارا نەماو بازاررو دوکان هەمو نەختەکرا .. بالی و بارامیش بو سـەیران لیاندا رویشتن و لەو پەرری خەلـکەکەوە بو خویان وەستان . سەیریان کرد : وا پیاویک سوار ئەسپیک بووەو سەرتا پای جلی ئاوریشمی رەشە ، دەستکیشیکی قایشیشی لە دەستایە تائەنیشکی هاتووەو دەستی وەکو دار راگرتووەو بازیکی وا بەسەر دەستیەوە لە ناوشار دەرچوو ئەویش هات بو ناو خەلـکەکە . خەلـکەکە هەموکەوتنە مقو مقوو دەنـگە دەنگ وەکو پورەی هەنگ . کابرای سوارە هاتو لە ناوەراستی خەلـکەکەدا وەستاو هەر بە ولاغەکەیەوە روی کردە بازەکەو وتی:

( ئەی بازی جوانی خوش بەرواز ، ئەی هیلانەی رازونیاز ، باو باپیرت هەر لیرەدا گەلی جار ، هەلفرریوزو کردویانە سەیری دیار ، بینیویانە یکیکی ئەهلو ماقول ، نیشتونەوە سەر سەری بەبی جرموجول ، کردویانە ئەو کەسە بە پادشای شار ، کەوتوتە ژیر دەستی پیاو بەهەزار روگەنج بەبار . ئیستەش وا نورە گەیشتە تو بچو هەلفررە، ببینە پادشایەک بو ئەمشارە بەبیفررە . )

کە بازەوان ئەمەی وت باز چاویکی بە خەلـکەکەدا گیرراو کەوتە ئاسمانو لە سەر سەریانەوە دەستی کرد بەسوررانەوە ، ئەهاتو ئەچو ، دیسان ئەهاتو ئەچو ، هەمو خەلـکەکە چاویان تی برریبو ، هەر کە بو خوی ئاواتەوازبو کە لە سەر سەریەوە بنیشیتەوە . بازەش هەر لە ئاسمانەوە هاتو چو ئەکا ، لە

پاش‌سوررانه‌وه‌یه‌کی‌زۆرورده ورده‌نزم بووه‌وه‌و رووی کرده قه‌راخ‌خه‌ڵکه‌که‌، ئه‌و به‌ره‌یه هه‌موکه‌وتنه نزاو باررانه‌وه‌، کوتوپرر له ناکاو بازه که چونیشت به‌سه‌ر « بالی »یه‌وه‌و وه‌کو سنگێ له‌سه‌ر سه‌ریه‌وه چه‌قی ! . که‌مه‌ردنه‌که‌ ئه‌مه‌یان زانی لیان کرد به‌هه‌راو وتیان نابی ئه‌مه‌بی به‌پادشامان که‌س نازانی له کوبوه هاتوه‌و چه‌که‌سیکه ؟! . بازه‌وان هات‌و و بازه‌که‌ی هه‌ڵگرته‌وه‌و سه‌ر له نوی هه‌ڵیساندەوه ، دیسان ئه‌و جاره‌ش هه‌ر هات به‌سه‌ر ئه‌وه‌وه نیشته‌وه . خه‌ڵکه‌که هه‌ندیکیان وتیان دیاره ئه‌مه خوا له چاره‌یا نوسیوه که‌بی به پادشای ئیمه ، هه‌ندیکیشیان وتیان نابی جاریکی‌تریش با باز هه‌ڵسیته‌وه ئه‌گه‌ر ئه‌م جاره‌ش هه‌ر نیشت به‌سه‌ر ئه‌وه‌وه ئه‌وا دیاره به بی چه‌ندو چون پادشامانه . بازه‌وان ئه‌م جاره‌ش بازی هه‌ڵساندەوه، باز دیسان نیشته‌وه به‌سه‌ر سه‌ری « بالی »یه‌وه ! . خه‌ڵکه‌که تیکرا دایان له چه‌پله‌و وتیان : « پادشامان ! پادشایه‌تیت لی پیروزبیت » . ده‌ستیان گرت‌و به ده‌ستوری گه‌وره‌یی بردیانه‌وه بو ناوشار وتاجی پادشایه‌تیان له سه‌رناو نایانه سه‌ر ته‌خته‌وه ، له هه‌مو شارا بو به شایلوغان ، ده‌سته ده‌سته پیاو ماقول‌و گه‌وره‌کانی شار هاتن بو پیروزبایی پادشا . هه‌تا حه‌فته‌یه‌ک ئه‌م دیده‌نیه بررایه‌وه ، له پاشا « بالی‌شا » هینای « بارام »ی بران کرد به وه‌زیری خوی وبه ئاسایش‌و داده‌روه‌ری رایانبوارد .

ماوه‌یه‌کی زور به‌سه‌ر ئه‌م رابواردنه‌دا تی په‌رری ، ( بالی‌شا ) سه‌یری کرد ئه‌م‌هه‌مو ماڵ‌و سامانه‌ی هه‌یه‌و هیچ جگه‌رگوشه‌یه‌کی نیه شوینی بگریته‌وه و عومریش‌وا روبه‌رووی پیری ئه‌بیته‌وه ، به‌م بونه‌وه زور دلته‌نگ بو . هیچ شه‌خس‌و قسنیک نه‌ما په‌نای‌بی‌نه‌با ، هیچ نزاو نوشته‌یه‌ک نه‌ما نه‌یکا که‌ڵکی نه‌بو . شاو شازن ئیجگار که‌وتنه په‌روشه‌وه‌و ئارامیان لی هه‌ڵگیرا .

روژی له روژان ده‌رویشیک رووی کرده ئه‌نده‌رونی پادشا ، ته‌وه‌رزینیکی به ده‌سته‌وه‌یه ، که شکولیکی به‌شانه‌وه‌یه ، نه‌زیبحیکی ده‌نگ گه‌وره‌ی سه

چوار قەف کردوەو کردویەتەملی ، بەیاهو یاهو چوە ژورەوە ، کەنیزەکێ و کارەکەر دەوریان لیداو ویستیان بیکێرنەوە . وتی تاشاژن نەبینم ناگەـ ڕیمەوە ، هەر چەندیان کرد بویان نەگەڕرایەوە . شاژن لەم هەراو بگرەبە لەسەر تەلارەکەوە سەری هینایە دەرەوە پرسی ئەوە چیە؟. وتیان دەوریشکە چوە بەقینا ئەلی تا شاژن نەبینم ناگەڕریمەوە ! شاژنیش وتی لی گەڕرین بابیت . چو ، چو هەتا لە تەلارەکە سەرکەوت و چوە لای شاژن وتی : « هو یاهو مرازت چیە ؟ بیلی ! » . شاژن وتی : ( ئەی دەوریش ! دیوی ، درنجی بەریت هەرشتیکێ هەیت پادشای ئەم شارە ئەم هەمو سامازو دەسەلاتەی هەیە منداڵیکی نیە کە لە شوینی دانیشی و شوینی بگریتەوە ، لەبەر ئەوە زور پەریشانەو منیش لەگەلیا ئارام لیهەلـگیراوە ) .. دەرویش کە ئەمەی بیست دەستي برد لەکەشکولەکەی سیویکي دەرهیناو وتی ئەم سیوە بکەن بەدو کەرتەوە کەرتیکي تو بیخو کەرتیکی پادشای میردت ولیداروپشت ! تاشاژن هات ئاورری لی بداتەوە دەرویش ون بو ! . .

ئیوارە پادشا هاتەوە بو ئەندەرون شاژن حەقایەتەکەی بو گیررایەوەو سیوەکەی نایە بەردەمي . . پادشا توزی سەری داخست و نەختی وتوویرەی دلی خوی کردو لە پاشا قەلەم برریکی ئالتوني لە گیرفاني دەرهیناو سیوەکەی کرد بە دو کەرتەوە ، کەرتیکی خوی خواردی کەرتیکیشی دا بە شاژن و نوستن ، بەیاني هەستان پادشا چو بو بارەگاو شاژنیش لە ناو کەنیزەکێ و بانوانا دانیشت و هەر لە بەزارەی سەرگوزەشتی ئەم دەرویشەدا بو .. چەند روژیکیان وا رابورد . شاژن روژی هەستی کرد بەخوی کەزکیپرە ، نەیدرکاندو برروای نەکرد . چل روژی پیچو خیر زکێ گەورە بو ، ئیتر کەوتنە خوشی و ئاهەنـگ و هەمو ئەهلی مەملەکەت کەوتنە ئاوات خواستن بو ئەوە ئـەم پادشا خوشەویستەیان منالیکی بي . . نومانـگەو نورروژەی شاژن بەسەرچو کوررێکی بو ، لە بارەگای پادشاو ئەهلی شاردا چل شەو و

چل ڕوژ بو بە شایلوغانو زەماوەنـد . کورریان ناو نانە « شاروخ » و بە نازو نازداري بەخیو کرا تابو بە پینج سالان ، لەو تەمەنەدا ( بارام )ی مامیشی کچیکي بو ناویان نا ( کولروخ )و ناو کێ برریان کرد بو (شاروخ)

شاروخ کە گەیشتە سیرەی دوانزە سالی باوکي مردو ئەهلی شــارکو بونەوە ئەویان کرد بە پادشای خویان بەلام لەبەر ئەوە مندال بو ( بارام )ی مامیان کرد بەچاویری کەری ئیشوکاری مەملەکەت . . شاروخ و گولروخ لە مالیکا گەورە بون تا گەیشتنە تەمەنی دلداري . ئینجا داوای کرد لە مامي کە لی مارەکا ، مامي کورری هەبو حەزی نەئەکرد شاروخ بی بگاو بی بە پادشای مەملەکەتەکە ا . دەستی کرد بە برروبیانو هینانەوەو کردەوەی وا کە شاروخ وەرز بی . شاروخ هەرچەند کوششو ئەملاو ئەولای کرد هیـچ کەلـکي نەبو لەگەل گولروخیشا بەبی یەک نەیانئەکرا . کەزانی مامي‌وا لی‌چوە بەقیناو ئەمیش‌هیشتا نەگەیشتوتە سیرەی پادشایەتی لەداخا مالو ملـکي بەجی‌هیشتو سەري خوی هەلـگرت و رویشت ا .

رویشت ، رویشت هەتا سەری لە بیابانیکی کریکای کریکەوە دەرچو ، تەماشای کرد بیجگە لە ئاسمانو لەزەوی هیچی‌تر دیارنیە ، گەلیکی‌تر رویشت ســـەیری کرد وا لە دورەوە کوشکیکی گەورە دیارە . روی نا بو کوشکەکە،بە دەوریا گەررا دەرگای بەرچاو نەکەوت،شەش‌جار سورر‌ایەوە هیچی نەدی ، لە جاري حەوتەما تاپیەکي بچکولەی بەرچاو کەوت ، چوە بەر تاپیەکە هات دەستي پیوە بنیت لەتەنیشت تاپیەکەوە دەنـگیکی بەر گوی‌کەوت وتی : ( لە دورت گەرریم شاروخ رزگارم کە ا . ) کە تەماشای کرد ئەمــە دەلاقەیەکەو پیربژنیکێ لەویدا توند توند شەتەکێ دراوە و کەوتوە ، زوری بەزەی پیاهاتەوە ، چو بەلایەوە کە رزگاری بکا . کوتوپرر دەنـگیکي‌تری بیست کە : ( شــاروخ نەکەی بەرەلای بکەی، ئەگەر بیتو رزگاری کەی جاریکی کە چاوت بەخوت ناکەویتەوە ا ) . هەرچەند تەماشای کرد خاوەنی

ئەم دەنگەی بەرچاو نەکەوت، زور سەری سرما ، پیریژنەکەش هەر لێ ئەپاڕیتەوە . دیسان چوەوە بەلایەوەو دەستی بو دریژ کردیسانەوەدەنگەکەی بەر گوێ کەوتەوە ، ئەمجارە بەتەواوی سەری لێ تێکچو نەیزانی چی بکا هەندی لەدل خویا لێکی دایەوە و لەپاشا شیرەکەی دەرهێنا دای لەملی پیریژنەکە بەرراندی ! زریکەیەکی کردو تەم ومژیک بەیدا بولە پاش توزیک سەیری کرد وا تاپیەکە کراوەتەوەو توزی خوینیش رژاوە ئیتر لەشی پیریژنەکەی بەر چاو نەکەوت ! .

لە تاپیەکەچوە ژورەوە ئەبینی وا هەتا چاوکار ئەکا باغ وبیستانو گولو گوڵزاروکانیاویکە دلی هەزاردل حەیرانیەتی لە دوریشەوە کوشکیکی گەورە دیارە . دەستی کرد بەگەڕان هەتا شەو داهات ئینجا روی کردە کوشکەکە تەماشای کرد هەمو شتیکی تیدا ئامادەیە ، لە نوین ، لە خواردن لە خواردنەوەو چراش لەهەمو ژورەکانا داگیرساوە ، بەلام کە سیان تیا نیە . لە ژوریکیانا دانیشتو لە بەر خویەوە کەوتە فیکر کردنەوە لە حالی خویو دلی زورتەنگ بو ، کوتوپرر وا ( ریوی ) یەک کردی بە ژورا ! . هاتنی ریویک لەم وختەداو لەم ناکاوەدا توزی شلەژاندی . دەستی دایە شیرەکەیو بەلاماری ریوەکەیداوهات بیکوژی ، ریوەکەهاتە قسەو وتی : (شاروخ شامەمکوژە بەکەلکت دیم ، کەس ریی نەکەوتوتە ئەم شوینە ئەوا تو هاتویت دیارە بە ئیشیکی گەورەوە هینراویت بویە ئەم تاپیەت بو کراوەتەوەو ئەم تەلیسمەت بو شکینراوە ) شاروخ کە ئەمەی بیست شیرەکەی کردەوە بەکالانەکەیاو دانیشتەوە و لەگەل ریوی دەستیان کرد بەقسەکردن ، کە وەختی نوستنهات لیدا نوستو بەیانی کەهەستا ریوەکەنانو بەرقلیانی نایە بەردەمی خواردیوچو بو راو وگەشت وگوزار .

چەند روژیک بەم جورە رایبوارد ، ئیوارەیەکیان هاتەوە دانیشتبو خەیالی گولروخ دای لە کەلەی ، دلی تەنگ بوو ، خورر خورر ئاو بەچاویا هاتە

خوارەوە ، ریوی کە لەوکانەدا هات بە سەراو لی پرسی ئەوە بو چ ئەگریت ؟ هیچ دەنگی نەکرد ، ریوی گەلیکی زری لەگەل خەریک بو تا راستی پی دەرخست کە کوڕوخی ئاموزای دەزگیرانیەتی و ئیستە ماچی نابداتی و وا بەم جورە دەربەدەری کردوە ! . . مام ریویش وتی جا ئەمە شتیکی ئاسانە من بەیانی بوت چار ئەکەم ! . شاروخیش وتی چونم بو چار ئەکەیت و ئەم دەردە چون بەتو دەرمان ئەکریت؟.. مام ریوی وتی ئاسانەمن بەیانی نان و چیشتیکی زور دروست ئەکەم و هەمو دررندەو پەرندەی ئەم ولاتە ـ کە لەژیر فەرمانی تودان ـ بانگیان ئەکەم تو پیان بلی نانم بو دروست کردون ئەبی نان بخون، جا ئەو وەختە من ئەزانم چی ئەکەم ! . شاروخیش وتی جا ئەمە چون ئەبی و ئەمانە چون بە قسەی من ئەکەن و لە قسەم نی ئەگەن ؟ . ریویش وتی تو هەر ئەوەندە من ســەر بەست بکە ئیتر کارت نەبی ! . ئەویش وتی باشە وا سەر بەستم کردیت .

بەیانی مام ریوی نان و چیشتیکی زوری دروست کردو کەوتە دەمە دەمی نیوەررو ، شاروخ لە ســەر کوشکەکەوە دانیشتبو تەماشای کرد وا دەستە دەستە جانەوەرو باڵەوەر لە شیر ، لە پلنگ ، لە وورچ ، لە گورگ ، لە قاز ، لە باز ، لە هەلو ، لە هەموشت کو بونەوەو ئەو دەشتە پرربو ، نان دانرا نانیان خواردو ئینجا ریوی هەستایە سەرپی روی کردە سیمورغ وتی : ئــەی سیمورغ ئەمانە هەمو لەگەلت دین تا ئەچنە شاری « گومەتە » لەوی رو ئەکەنە ناو شار خەلکی شار هەمو ئەشلەژین و ئەبی بە هەروا غەلبە غەلب ، کچی پادشا لە سەر تەلارەوە سەر دەردینی کە سەیری ئەم کارەساتە بکا هەلی ـ بگرە بیخەرە سەرشاپەرری خوت و بیهینە بو ئیرە و ئەمانیش هەمو بگەررینەوە لەگەلتا . سیمورغ سەریکی دانەواندو کەوتە ئاسمان ، هەمو باڵەورەکان کەوتنە شوینی ، لە خواریشەوە شیر پیش کەوت و هەمو دررندەکان بەدوایەوە . ئەم لەشکرە جانەوەرە بەم جورە رویان کردە شاری ( گومەتە )

که نزیکێ بونەوە خەلکی شار ئەمەیان چاوپێ کەوت هەمو وەخت بو زالەترەکێ بێن و هەرا کەوتە شارەوە و دەنگە دەنگێ گەیشتە بارەگای پادشایێ . . گولروخی کچی پادشا لە پەنجەرەی تەلارەکەوە سەری هینایە دەروەکە سەیری ئەم کارەساتە بکا سیمورغ پەلاماری دایە هەلیگرت و خستیە سەر شاپەرری خویو هیناى ، کە ئەو گەررایەوە . هەمو جانەوەرەکانیش گەررانەوە و بو عەسر گەیشتنەوەجی ، ریوی چو بەپیریانەوە گولروخی لە سیمورغ وەرگرت و بردی لە ژوری شاروخ داینا و بـەو سیمورغی وت ئیتر ئیوە بررون . سیمورغ و جانەوەران بلاوەیان لی کرد .

گولروخ لەم کارەساتە هەروا سەری سررماو لە ترسانا نیوە گیانیکی تیدا مابو ، ریویش هـەر دلی ئەدایەوەو پی ئەوت مەترسە ئیستە ئەوەندە دلت خوش ئەبی هەمو شتیکێ لە بیر ئەچیتەوە . بەم قسانە ئەیخلافاند تا بوبە دەمە دەمی خوراوا . شاروخ لە راو هاتەوەو کردی بەژورا، کە چاوی کەوت بەگولروخ وەکو گول گەشایەوە ، گولروخیش کەلەو ناکاوەدا شارروخی دیی وەکو گولوکی بەری بەیان دەمی کردەوە ، هەر دوکیان باوەشیان کرد بە یەکاو تیرو پرر یەکتریان ماچ کردو کەوتنە قسەکردن و رازونیاز گیررانەوە. ئەمان لیرەوا .

بلاوجوب

لەولاوە ئەهلی شار کە ئەم کارەساتە بەلاجەوبەیان چاوپی کەوت و وا بە ئاشکرا دییان کە سیمورغ گولروخی رفاند بارەگای پادشاو هەمو مەردم کەوتنە گەرران و بەملاو بەولادا حەولدان بو گولروخ ، هیچ ریی بە دییکیان نەکرد . پادشا جاررچی خستە ناوشار کە هـەرکە سوراخیکی گولروخ بینی بو پادشا دوجار ئەیکیشی بە ئالتونا . چل روژ بەم جورە جارردرا کە سیکێ دیارنەبو کەناوونیشانیکێ بینیت . لە پاش چل روژە روژیکێ پیرەژنیکی پوپسپی،لەبەرپیری پشتی کوماوەتەوە،وا دەستی خستوتە پشتی و هات و روی کردە بارەگای پادشاو وتی پادشام ئەوی ! . . یاساول و

ئاپەوان لی دەرپەڕین و دەستیان کرد بەقسە پێوتن پێ . وتیان پیرەژنە تو وا سەرت لە لیوی قەبر ئەلەرزێ ئەبی چە ئیشیکت بە پادشا بی ؟ .. پیرەژن سنگی داکوتا وتی بم کوژن و بم بڕن تا نەچمە لای پادشا نا گەڕێمەوە ، بە ناچاری ڕیان بو چول کرد و چوە بەردەم پادشا . وتی : ( پادشام بی وەی بێ ، ئەگەر ئەو شتەی من داوای ئەکەم بمدانێ تا سە ڕوژی تر گوارەخی بو دینمەوە ئەم شوینە ! . ) پادشا کە ئەم قسەیە بیست واقی وڕما وتی پیرەژنە ئەم هەمو پیاوە زیر و پالەوان و کارزانانە نەیانتوانیوە سوراخێک لە گوارەخەوە بینن بو من ئیستە تو چون ئەلیت تا سە ڕوژیتر گوارەخت بو دینمەوە ؟ ! .. ئەویش وتی : پادشام پایەدار بێ ئەگەر لە پاش سە ڕوژە نەم هینایەوە لە سەرم بدە . وەزیر و پیاو ماقولانی دیواخان وتیان پادشام ئیستە ئیوە چە خراپەیەک لە ئیشی ئەم پیرەژنەدا ئەبینن؟ پێ بلێن باشە . ئەمیلیتەوە سەر ئەو شتە کە ئەو داوای ئەکا ئەگەر گەنجی پادشاهی بەشی نەکرد ئیمە هەیچ زیو و ئالتونیک لە مەملەکەتا هەیە بوی کو ئەکەینەوە و ئەیدەینێ . پادشا سەریکی داخست و لە پاشا سەری بەرز کردەوە وتی باشە بەلام ئەترسم ئەو شتە کە ئەو داوای ئەکا لە وزەی سامانی هەمو مەملەکەتەکەدا نەبێت . وتیان ئەو وەختە ئیتر ئەمیلیتەوە خوی بو شیری .

ئینجا پادشا ڕوی کردە پیرەژن و وتی : ئی ! پیرەژن باشە بلی بزانم چیت ئەوی ؟ . پیرەژنیش وتی « پادشام هەر سەر بەرز بیت تەنیا جاری ئەکیشی بە بەتنکا گوارەخی کچی تا سە ڕوژیتر بو دینمەوە !! . » پادشاو دانیشتوانی بارەگا لەم داخوازیەی پیرەژن سەریان سوڕما . پادشا وتی باشە پیرەژن حەز ئەکەی لە باتی جاری دە جارت ئەکیشم بە پەتنکا ! . پیرەژن وتی ئەی لە دەورت گەڕێم و هاتە دەرەوە . چوەوە ، بو کولیتەکەی خوی چەرخ و فەلەکەکەی هینایە دەرەوە پاکی کردەوە توزو شتەکەی لی تەکاند و چوە ناوی و دەستی برد دەسکەکەی بەلای ڕاستدا بادا و کەوتە عاسمانو دەستی کرد بە سوڕ خواردن

ئەو روژە هیچی بەرچاو نەکەوت ، روژی دوایيش هەر گەررا تا لە دورەوە کوشکیکی بەدي کرد،چولە ناو باخی کوشکەکەدا نیشتەوە چەرخو فەلەکەکەی لە ژیر گیاکانا شاردەوەو خوی روی کردە ژوری کوشکەکە . کە چوە ژورەوە تەماشای کرد وا گولروخ بەتەنیا بو خوی دانیشتوە و چاوی لە ناپیەکەیە کە شاروخ لە راو بیتەوە . کە پیرەژنی بەرچاو کەوت پی‌خوش بو ، بویەش پی‌خوش بو وتی بە روژ کە شاروخ ئەچی بوراو ئەم پیرەژنـە بو هـاو دەنگیم باشە .

پیرەژن هات بە دەورو بەري گولروخا ، لە دەورت گەررێم ، بەلا گەرداني بالاتبم ، پەریەکي وەکو تو بەم جواني و ناسکەو نازداریە ئاخر چون بی‌هاودەنگ لیرە هەلئەکەیت وکەست بەلاوە نەبیت چون وەختت لی ئەرروا ؟ . من بیستم کە تو لیرەیت ئوقرەم نەگرت هاتم بو هاو دەنگیت . گولروخیش وتی باشـە داپیرە گیان دانیشەبەخیر بیت ئیستە شاروخ لەروا دیتەوەو پی ئەلیم هەر لیرە بتهیلیتەوە بو هاو دەنگي من...

زوری پی نەچو ریویەکە کردی بە ژورا ، کە چاوی بە پیرەژن کەوت هەر دو چاوی پەرریە تەوق سەری ! . وتی‌ئـەی پیرەژني فەرا گوژ چی توی گەیاندوتە ئیرە ؟ ئیستە چون بە دەست منەوە رزگارت ئەبیت ؟ و پەلاما ـ ری دا ، گولروخ پیرەژني دایە پال خوی و وتي مام ریوی گیـان داپیرە میواني منە لی گەرری . مام ریوی وتی بانوی کوردوستان چاو ودلي ئەم پیرەژنە پریەتی لە ناپاکي تو نایزانیت ! . گولروخیش وتی پیرەژنیکي هەژاری وا ئـەبی ناپاکي لە کوی بی ،لی گەرری کەساسە ریی‌کەوتوتە لای ئیمەبا دلی نەرەنجینین . مام ریوی بە ناچاری ئیتر هیچ قسەی نەکرد . کەوتە ئیواری شاروخ هاتەوە و گولروخ چو بە پیریەوە دەستی کردە ملي و هینای پیکەوە دانیشتن . شاروخ چاوی بەپیرەژنیک کەوت ، پرسي ئەمە چیە ؟ . گولروخ وتي میوانە هاتوە بو هاودەنگی من باشە . شاروخ کە چاوی بە

پیرێژن کەوت دلی دا خورپا بەلام لە بەردلی گولروخ هیچ دەکی نەکرد. مام ریوی هاتەوە دیسان بە شاروخی وت کە ئەم پیریژ ە دەرکات زور بەنا پاکت ئەبینیت، گولروخ سەر لەنوی بوی گەرتەوە پاررانەوە، شاروخ دلي گولروخي پي نەشکینرا..

ئەو شەوەیان روژ کردەوە، بەیانی شاروخ چو بو راو، کەوتە جیشتەنگاو پیرێژن چوە بن دەست گولروخەوە وتی: لە دەورت گەرریم ئەوە هەر شەوو روژ لەم کوشکەدا دائەنیشیت ئاخر بی‌تاقەت ئەبیت ودلت تەنگ ئەبی ئەوا ئیستە دایکی خوتت لەگەلە هەستە با بچینەناو ئەو باخ و باخچەیە توزی بو خومان بگەررین و توزی دلت بکریتەوە و ئەگەرریینەوە. گولروخیش‌وتی باشە دایپرە، بەپی پلیکانەکانا چونە خوارەوە و دەستیان کرد بە گەرران لە ناو باخەکەدا، پیرێژن هیچ شتیکی ئەبینی ئەیوت بە گولروخ لە دەورت گەرریم تەماشاکە تەماشا کە ئەم شتە چەند جوانە؟! . بەقسەو بەزمان لوسي وا گولروخی رام کرد هەر شتیکي پي بوتایە لە قسەی دەرنەئەچو.. وردە وردە بەدەم روەیشتنەوە چون بو ئەو شوینە کە چەرخ و فەلەکەکەی لی بو. چەرخ و فەلەکەکە لە ژیر بافەگیایەکدا بو بەرز بوبروەوە، پیرێژن وتي ئای ئەو گیایە ئەوە بو چ لیرەدا بەرز بوتەوە! گویا چی تیدایە؟. گولروخ خیرا چو بەلایەوەو بەرزی کردەوە سەیری کرد شتیکت لە ژیریا دەر کەوت، بانگي کرد ئەیررو دایپیرە ئەمە چیە؟. دایپیرەش بەسەرساميو بەلە بەلیکەوە وتی کامە؟ لە دەورت گەرریم! . ئەویش وتی ئا ئەمە، ئەلي بژنگە!..

پیرێژن چو بەلایەوەو توزیئەم دیو و ئەو دیوی کردو لە پاشا وتی لە دەورت گەرریم بە خوا باش بو ئەمەت بو دوزیەوە. ئەمە خەررەکە، ئەمە بومن زور باشە، کانی کەتوو شاروخ بو خوتان دائەنیشن‌و ویستناز کەستان لە لانەبی من بو خوم ئەچمە گوشەیەکت و بەم خەررەکە بەتنکت ئەرریسم ! . گولروخ وتي دایپیرە چون بەمە بەتنکت ئەرریسریت؟ خو ئەمەوەکو

یژنگە وایە هیچی دیار نیە ، داپیرەش دەستی برد دەسکەکەی کە بە ناوەوە نوچابوەوە راستی کردەوە و لەولاشەوە پارچە تەختەکەی کە کەوتبوە سەر لیواری تەختەکەی ژیری ئەویشی بەرز کردەوە وەکو یژنگە ناوەکەی چال مایەوە ! وتی لە دەورت گەرریم ئەوە خوم لە ناو ئەو چالەدا دائەنیشم و بەتنگەکە لەدەرەوە دائەسەنیم و ئەیخەمە بەر لوتی دەسکەکەی ، دەسکەکە با ئەدەم ئیتر ئەبرریسی ! گولروخیش وتی توخوا داپیرەگیان ئەگەر فیرم نەکەیت ! . ئەویش وتی ئاخر لە دەورت گەرریم ئیستە پەتنگ نیە بەلام قەینا کا تو بچورەناری خویشم لە تەنشیتەوە دائەنیشم بو ئەوە قژەکەم بکەویتە بەر لوتەکەی. بی بە پەتنگ بوی، بە دەستیشم دەسکەکەی با ئەدەم تا بیرریسی ! . گولروخیش وتی باشەو چوە ناویەوە دانیشت ، پیریژنیش چوە تەنشتیەوە سەری توزی لار کردەوە بوئەوە گویاییخاتە بەردەسکەکەی ئینجا بەلای چەپدا دەسکەکەی با دا ، هەر کەبای‌دا چەرخ وفەلەک کەوتە ئاسمان ، هەر چەند گولروخ هاواری کرد هیچ تازە ئیش تی پەرری !! ..

ماوەیەکی زوری پی نەچو ، چو لە کوشکی پادشادا نیشتەوەو گولروخی لەبەردەم پادشادا دانا. کە پادشا چاوی کەوت بەگولروخ وەکو گول گەشایەوەو ئەم لاو ئەولای ماچ کردو ناردیەوە بو لای دایکی ، دایکیشی بە دیداری کچی شادبو . . ئیںجا پادشا فەرمانی‌دا کە پیریژن دوجار بە پەتنگا هەلکیشن و بیدەنی پیریژنیش بە پەتنگی خوی گەیشت و چو بە ریی خویەوە.

لەولاوە ئیواری شاروخ کە لە راو گەررایەوە تەماشای کرد گولروخ دیار نیە هەر چەند چاوەرریی کرد هیچ کەلکی نەبو ، مام ریوی بانگی کردو لی پرسی ئەویش وتی نازانم ، نابی پیریژن کەتی خوی نەکردبی و گولروخی نەفرراندبی ؟ ! . چو گەلی گەررا نەگولروخ نەپیریژن هیچیانی بەرچاو نەکەوت ، هاتەوە بە شاروخی وت : ئاخر نەمرت من ناوچەوانی ئەم پیریژنە بەپاک نازانم ؟ . دەری بکەن تاکە تنیکی نەگیرراوە ، ئەوا ئاخری

ئەم ئیشەی کردکە ئیتر چار ناکری !! . شاروخ کە ئەم کارەسانەی دی لە سەر ئەسپ لی کەوت خوی دا بە زەویدا ، جار جار شیرەکەی هەلئەگرت و وەکو شیت بەو ناو باخەدا ئەسوررایەوە هیچ سورراخیکی نەئەکردو نەیئەزانی چی بکا ! . دنیای لی تاریک بوو ئارامی لی هەلگیرا . .

لەولاشەوە گولروخ چاوی کەزتەوە بە باوکو دایکی بەلام لەبەر دور کەوتنەوەی لە شاروخ کاروفرمانی شەوو روژ هاتە سەرگریان و جار جار ئەچوە سەرکوشکەکەو هیچی تر ، هەرچەندە دلیان ئەدایەوەو کەنیزەکو کارەکەر لی کو ئەبونەوە هیچ دەردیکیان دەرمان نەئەکرد ، روژ بە روژ هەتا ئەهات لاوازترو بی تینتر ئەبو ، خواردن و نوستنی نەما . لەم لاشەوە شاروخ گەلی لەو خراپتر . هەتا روژیک مام ریوی وتی : شاروخ شا ئادەمیزاد هەر شتیکیان لەگەل بکەی بە خواردنی ئەرروا چونکە شتیان لەبەرچاونیەو کە کەوتن بە سەر ئیشی خویانا ئیتر هیچیان لەبەرچاو نامینی . ئەوا ئەمجارەش گولروخت بو دینمەوە بەلام دەمیکە ئەو ترسەم هەیە کە دوا جار ئەبی لەباتی هەمو چاکەیەکم فرریم بدەنە ناو کولان !! . شاروخ کە گوی لەهینانەوەی گولروخ بو وەکو گول گەشایەوەو سەری بەرز کردەوەو وتی: مام ریوی ئەوی تو لەگەل منت کردوە ناتوانم بە هیچ جور تولەیت بدەمەوە مەگەر بەوە کە گیانی خوم بکەم بە ریبازی بەچولەکانت . ئیستەش هەر فەرمانیکم پی بکەیت بەدلو بەگیان ئامادەم بوجی بەجی کردنی . مام ریوی وتی : ئابزانین دنیا زوری بە بەرەوەیە ! ... سبەینی بانگیشتنیکی تر ئەکەم بو درروندەو پەرروندەکان لە پاشا توبلی : ئەی گیانلەبەرینە ریوی چیتان پی ئەلی لە قسەی دەر مەچن . ئەویش وتی باشە .

کەوتە بەیانی مام ریوی نانیکی زوری دروست کردو هەمو جانەوەرو پەلەوەرەکانی کو کردەوە و هەمویان نانیان خوارد ، لە پاشا شاروخ روی تی کردن وتی : گیانلەبەرینە قسەی مام ریوی قسەی منە ، لە ئیستەبەدواوە

هەر شتێکیان پێ ئەڵێ نابێ لە قسەی دەرچن . هەمو سەریان دانەواند . ئینجا مام ڕیوی وتی : «ئەمەوی وەکوجاری پێشو بچنەوە بو شاری «گرمەتە» و بکەونە ناو شار ، کە کچی پاشا لە سەر تەلارەوە سەری دەرهێنا ئەی سیمورغ هەڵیگرێت بیخەیتە سەر باڵت و بیهێڵیتەوە و ئێوەش هەمو بگەڕرێنەوە و عەزیەتی کەس نەدەن »ئەوانیش تێگرا سەریان دانەواندو پەلەوەر کەوتنە هەواو سیمورغ لە پێشیانەوە ، جانەوەر لە سەر زەوی و شێر لە پێشیانەوە ! بە فرزکانی چونە ناوشاری «گرمەتە» . مەردمی شارکە ئەمەیان چاویان کەوت کەوتنە خو شاردنەوەو هاوار هاوار ، گولروخ کە سەیری کرد ئەمە کارەساتەکەی پێشوە زانی چە باسە خێرا چوە سەر بانی تەلارەکە ، کە سیمورغ چاوی پێ کەوت هەڵیگرت و خستیە سەر باڵی و گەڕرایەوە ، گیانلەبەرەکانی تر هەمو بە شوێنیا گەڕرانەوەو هاتنەوە تا گەیشتنەوەجێ . شاروخ هەرچاوەرێی بو ، کو تو پڕ لە دورەوە لەشکری گەڕراوەی بە فەیروزی بەدی کرد چوە پێشوازیان ، سیمورغ گولروخی داناو ئیتر چون بەرێ خویانا گەڕرانەوە ، گولروخ و شاروخ دیسان بە یەکە شاد بونەوە . .

لەولاوە بارام شای باوکی گولروخ کە ئەم کارەساتەی دی زور تێکچو هەستا لە پاش ئەوەکە راوێژی لەگەڵ وەزیرو پیاو ماقولەکانیا کرد بەشارەزایی پیریژنەکە پەیامی نارد بولای شاروخ کە : «ئەی شاروخ ئەگەر گولروخ ئەنێریتەوەو دەست لەم کردەوانە هەڵئەگریت ئەوا باشە ئەگینە ئامادەبە هەچ سوپایەک لە قەڵەمڕەوما هەیە خوم پێشیان ئەکەوم و ئەیهێنم بو سەرت خوتو کوشکەو بارەگات هەپروز بە هەپرون ئەکەم ! .» کە شاروخ ئەم پەیامەی بیست زور تێکچو و کەوتە دەلیای فیکرو خەیاڵەوە . لەو کاتەدا مام ڕیوی کردی بە زورا وتی : ها ، ئەوە چیە ؟ بو چوا کەوتویتە بەژارەوە ؟ . ئەویش وتی داستانێکی وایە . مام ڕیویش وتی تویش پەیامێ بو

بنیره‌وه چی له ده‌ست دیت دریغی نه‌کاو زیانی بکا . ئه‌میش وتی مام ریوی ئیمه چیان هه‌یه ؟ . ئه‌و له‌شکرو سوپایه‌کي زورو زه‌به‌نده‌ی هه‌یه له ، کوی له داوی ده‌رده‌بن ؟ . مام ریوی وتي راسپیره‌وکارت نه‌بی ، ئه‌میش به‌و جوره ئه‌و پیوت به‌راسپیره‌که‌ی‌وت و راسپیر رویشته‌وه . .

که بارام‌شا ئه‌م قسه‌یه بیست به‌جاری گرژبوو فه‌رمانی‌دا هه‌رکه ده‌نکه جویه‌کی مالی پادشای خواردوه ئاماده بی بو ئه‌م شه‌ره ! . به‌جاری گه‌وره‌و بچوک چه‌کیان پوشي‌و له‌ژیر سه‌رکرده‌یی بارام شادا به‌ری که‌وتن و پیریژ-نه‌که‌یان کرد به شاره‌زا . له‌شکر وه‌کو خول ره‌وو کوشکی شاروخ روی تاو رویشتن ، ده‌وروبه‌ری کوشکیان به جوری ته‌نی که میروله ریی ده‌ر چونی نه‌بی ! . ئه‌وا شاروخ و گولروخیش له سه‌ربانی کوشکه‌که‌وه سه‌یری ئه‌م سوپای له‌شکره ئه‌که‌ن که نه‌سه‌ری هه‌یه‌وه نه‌سامان هه‌روا واقیان وورماوه که‌چی بکه‌ن ! .

ئیواری داهات بارام‌شا پیاویکی‌نارد بولای‌شاروخ که به‌یانی له‌گه‌ل گزنگي هه‌تاوا قولی‌خوی ببه‌ستي‌و بیت بکه‌وی به‌سه‌رسمی ئه‌سپه‌که‌ما ، به‌م جوره لی خوش ئه‌بم ئه‌گه‌ر وانه‌کا چاری به خوی ئه‌که‌وی ! . شاروخ ئه‌م راسپیره‌ی بیست به‌جاری وره‌ی به‌ردا چونکه تاقه زه‌لامیکیشی لانیه به‌چی وه چون چاری ئه‌م به‌لا گه‌وره‌یه‌بکا که‌وا هاتوه به‌سه‌ریا ؟ . . تاریک داهات و زور په‌روش بو له‌و وه‌خته‌دا مام ریوی گردی به ژورا . وتی : ها شاروخ شا زور دلته‌نگیت ؟ . ئه‌ویش وتی مام ریوی ئه‌م کاره‌سانه ئه‌بینم چونکا دلته‌نگ نه‌بم ؟ . مام ریوی وتی هیچ خه‌مت نه‌بی به‌یانی له‌گه‌ل گزنگي هه‌تاوا شیرو تیر بده له‌خوت‌و سواربه‌و بچوره مه‌یدان‌و رمبازی بکه‌و داوای مه‌یدا-نداربکه ، شاروخ به‌تو به‌دلي وتی باشه .

دوبه‌شی‌شه‌و رویشت و نه‌رویشت‌مام ریوی‌چو له‌وبه‌رزی باخی کوشکه‌که‌وه شاخیکي گرت به ده‌مه‌وه‌و فوی پیا کرد ، هه‌چ مشک‌و کوله‌و کرمیک له‌و

دەشتەدا هەبو هەموپان کو بونەوە ! . وتی: ئەمەوی ئیمەو تایەبانی پیش هەتاوکەوتن بچنە ئەو لەشکرەی بارامشا تەنیا لەشە روتەکەی خویانو ولاغە- کانیان نەبی هەر شتیکی تریان پی بە لە شیر، لە تیر ، لە مەتال ، لە تایشو قروش هەموی بخونو دایبرزینن . ئەوانیش وتیان بەلی . چون ئەوەندەی کفرە کونی هەج شتیکیان هەبورو نەبو خواردیانو دایانرزاندو گەررانەوە بولای مام ریوی و پیبان وت کە ئیشی خومانمان کرد . ئەویش وتی باشە ئیتر بچنەوە بو جیگاو ریگای خوتان .

بەیانی لەگەل گزنگی هەتاوا شاروخ هەستا تیروکەمانو گورز و گوپالو قەلغانی دا لە خوی و سوار بوو چوە مەیدانو دەستی کرد بەمەیدانداری و داوای مەیدانداری کرد . پادشاو سوپای پادشا کە تەماشای خویان ئەکەن لە لەشیکی روتو قوت بەولاوە هیچی تریان بو نەماوتەوە تەنانەت دەرپی - شیان لە پیدا نەماوە ! . هەر وا لەم کارەسانە بەجاری سەریان سررما . بارامشا هیچی پی نەما بانگی کرد . «شاروخ شا من کردم تو نەبکەیت ! هانام هینایە بەرت چون دلت ئەیەوی من وا ئەکەم ، گولروخ و تاج و تەخت هی تویە ، داد ، شاروخشا داد !. » مام ریوی هات بەلای شاروخ شاوە وتی پی بلی : مامە پەشیمان بویتەوە لەو کردەوانەی دەربارەت کردوم ؟. ئەویش پیوت . بارامشا دیسان هەلیدایە « شاروخ شا داد ! » .

ئینجا مام ریوی چو پیشیان کەوت و پادشاو هەمو سوپا کەی هینایە ناوکوشکەکەوە، خیرا چو جلو بەرگی بو هینانو هەموی پوشتە کردنەوەو نانی بو داتان نانیان خوارد ، لە پاشا بارام شا هەستا باوەشی کرد بە شاروخ شادا و ماچی کردەوەو دەستی گولروخی گرتو دای بە دەستیەوەو هەر لەویدا لی مارەکرد و دەستی برد تاجی پادشایەتیە کەشی نایە سەریو هەمو بەکامەرانی گەررانەوە بو ناو شاری و گومەتە . چل شەو وچل روژ

شایی و ئاهەنگ بو دەستە دەستە مەردم ئەهاتن بو پیروزبایی پادشای تازەو بو سەر زەماوەندی پادشایان .

لیرەدا مام ریوی وتی توخوا بزانم من ئەم هەمو ئیشەم بو ئەمانە کرد ئایا چون تولەم ئەدەنەوە ؟ وخوی‌دا بەزەویدا ها ئیستە مردوە، ها سەد سال لەمەوبەر ! . لەو وەختەدا گورلوخ بەویدا تی پەرری‌وسەیری کرد وا مام ریوی مردوە ، وتی ئو ! مام ریوی هەزار ئەوە مردیت؟ ئا کچی ورە بنەوە لە قاچی‌و بیخەرە سەر ئەو سەرەنوبلکەیا .کارەکەریک هات‌وقاچی گرت‌و رایکیشا . مام ریوی لەژیر دەستیا هەلبلوقایەوەو هەستایەوەو روی کردە گورلوخ وتی : ئەمە بو تولەی ئەم هەمو پیاوەتیەم کەداتاەوە ؟! راستەکە ئەلین ئادەمیزاد و ژنی ئادەمیزاد وەفایان نیە ! . لەوکاتەدا شاروخ هاتەوەو چو بەلای مام ریویەوە هەرچەند لی پاررایەوە کەلکی نەبو . وتی : « ئەی شاروخ بزانە من کچی شابالشای پەری بوم کەوتبومە ئەو تەلیسمی مەرمەرری جادوەوە کەتوشکاندت، ئەم بەینە ئەم هەمو خزمەتم کردیت لە باداشی ئەو پیاوتیەتا کە لەو زنجیرە رزگارت کردم و ئیتر بە دوعا . » بو بە کوتریک‌و دای لە شەقەی بال‌و کەوتە ئاسمان و ئەو رویشتنە رویشت ئیتر نەگەررایەوە ! . . .

• • •

ئەم چیروکە ئایا ئەفسانەیەکی خەیالی بی‌و دەماودەم کەوتبی ؟ . وەیا شتیکی راستەقینە بیت‌و مابوبیتەوە چەندشتیک لە رەوشتی کونی کورد بو ئیمە دەرئەخا . یەکەم مەسەلەی بازگەردانی کە جمهوریەتی ئیمروژ نمونەیەکە لەو خەیالە یا لەو رەوشتە کونەی کورد ـ کە ئەمە ئەقلیەت وکەیانیکی زور کونی کوردمان پیشان ئەدا ـ دوهەم مەسەلەی چەرخ و فەلەک کەبی‌گومان ئەم چەرخ و فەلەکە لە ناو کوردا هەبوە چونکە کەم چیروک هەیەکەباسی چەرخ‌و فەلەکی تیدانەبی وە فرروکە تەیارەی ئیمروژ نمونەیەکە لەو چەرخ‌و

خەڵەکەی کونی کوردە. ئەمەش پایەی شارەستانی و پیشەسازی یان پیشان ئەدا" وە بگرە گەلی گەلی بەرزتر بوون لە قەومەکانی چاخی خویانیش چونکە چەرخ و فەلەک لە ناو ئەمانا نەبیت لە ناو قەومەکانی تردا نەبوە .. سێهەم راکیشانی شت ـ جرالانتقال ـ لە گەل کیمیا کە بە رموز سیمورغ و درزندە لەهیلیتە ناوەوە بو هینانی گورلوخ و دارزاندنی شتومەکی لەشکری پادشا ، لەم ئەفسانەیەدا کە عیلمی ئیمروز بەنەواوی ری بەدبی راکیشانی شت و کیمیای نەکردوە کورد لەو سەردەمەدا ئەگەر نەیبوبی چون ئەقلی بوری کردوەو دەم بو قسەی وا بەریت ؟ . دیارە دەوریکی وای پیشەسازی و زانیاری ئەبی بەخویەوە دیبیت بویە قسەی لیوە کردوە . . چوارەم پەندو ئاموژگاریە کە لە لایەن ژیانی خیزانیـــەوە گویا پایەی ژیری ئافرەت ـ با گەلی گەلی بەرزیش بیت ـ هەر خالی نابی لەوە کە کەم و کورریەکی ئەقلی تیدا دەرکەوی برامبەر بەژیان یا بە تەفـکیرا وەکو گورلوخ لە گەل ریویەکەدا نواندی چە لە سەرەتاوە چە لە ئاخر هەناسەیا . فەرەنسەی ئیمروز ـ لە گەل ئەوەش کە پایەی خویندەواری یان زور زور بەرز بوەتەوە ـ لەبارەی ئافرەتدا چونکە لایاندا لە رەوشتی ئەوەل ئەوا هەرچەندە ئەگەن بویان بەربەست ناکری !! .

ئەمە نمونەیەک بو لە چیروکی کوردی کە مێژوی ئەدەبی کوردی کەلکی لی وەر ئەگریت وە لەمەزیاتر بو ئەم شوینەو بو ئەم بەرگە دەست نادا . ئینجا پەندی پیشینان و قسەی نەستەق :

# پەندی پیشینان

کورد لە لایەن پەندی پیشیناناوە ئەدەبیکی بەرزی هـــەبە ؛ پەندی پیشینان عبارەتن لە چەند قسەیەکی کورتی کوردی پیکەوە نوسینراون مەعنایەکی بەرزیان تیدایە . لە زەمانیکی زور کونەوە کەوتونەتەسەر زمانی

کوردی ، چونیەتی ژیان و رەوشت و بیروباوەڕیان ـ چە لە باری سیاسی و کومەلایەتی، چە لە باری رەوشتی خێزانی وکەینوبەینی ژیانی تیکرایی، چە لە باری دەولەمەندی و هەژاری و پایەی دنیایی‌دا ـ پیشان ئەدەن .

لە پەندی پیشینانی کوردی‌دا وەنەبی حکمەت و ئەدەب لە کوشکیکی گەورەدا دابرریژیت و ئینجا وردە وردە سەربکا بە ژورەکانی کوشکەکەدا ، واتە: وەنەبی حکمەت لە قاعدەیەکی عامەدا باس بکاو ئینجا جزئیات دابگریتەوە بەلکو چاکیەکەی ئەوەیە کە شتیکی بچوک ئەلیت بەلام ئەتوانری گەلی شتی زل وگەلی کارەساتی پی بشبهینریت . هەر وەها کە سەیری ئەم پەندانە ئەکری پیاو وای بەرچاو ئەکەوی کە لە کوخیکی تەریک لە ئاوەدانیەوە سەری هەلداوە و هیچ شارستانیکی نەدیوە کەچی بو چونیەتی شارەکەش زور بە بوختی ئەگونجی . لیرەدا توزی لە گەل پەندی پیشینانی ئەدەبی هیبری‌دا لیک نزیک ئەبنەوە .

داهاتنی پەندی پیشینان لە وەختی خوی‌دا سەر چاوەکەی ئەمە بوە کە : کابرایەک کارەساتیکی چاوپی کەوتوە قسەیەکی بەپی ئەو کارەساتە کردوە ، قسەکەی دەماو دەم کەوتوە، مارەتەوە و بوە بە پەندی پیشینان ، لە پاش ئەوە هەر شتیکی تر رویدابی ـ کە لە گەل سەرچاوەی پەندەکەدا توزی ئاشنایەتیان ببیت ـ خیرا ئەو پەندەی بو ئەوتری . مەسەلا لە وەختی خوی‌دا کابرایەکی دەولەمەند کورریکی بوە زوری خوش ویستوە ، ئەم کوررە تالی و سویری دنیای نەچیشتبو ، بەم لاو بەولادا ئەم مالی باوکەی خوی بلاو ئەکردەوە . باوکەکەش بیجگەلە ئاموژگاری کردنی دلی نە ئەهات هیچی تری لە گەل بکا . یەکی لەو ئاموژگاریانەی کە کردی بیوت رولە لە خوررایی ئەم مالە بە داروبەردداا مەدە «روژان روژی لە دوایە». واتە : هەمو روژیک تو لە سەر ئەم خەزنەیە نابیت ، پشت بە دنیا نابەستری ، گەلی روژی ناخوشی لە شوینە . قسەکەی بو بە پەندی پیشینان‌وبلاو بوەوە . ئیتر هەر شتیک

وەکو ئەم کارەسانەبی ئەم پەندەی بو ئەوتری .

زەوقی کوردی لە پەندی پیشینانا پیویستی بەوە نیە کە سەرچاوەی پاس و خواسی هەمو پەندەکان بزانیت کەچی بوە و چی نەبوە ، هەرکە ، سەرەی قسەیەکی هات ، قسەکە ئەکاو پەندیک کە ئاشنایەتی لەگەل ئەو قسەدا هەبی لەگەلی دینیتەوە .

دیسان ئەمە شتیکە لەوشتە تایبەتیانەکە هەر لە کورددا هەیە ، کورد زور پابەندە بە پەندی پیشینانی خویەوە ، هەر کوردیکی رەمەکی یا شاری ، خویندەوار یا نەخویندەوارت بەرچاو ئەکەوی هەر کە چوار قسەی کرد خیرا لە بەینیا پەندیکی پیشینان دینیتەوە بو ئەوە بیکا بە پشتیوانی قسەکەی خوی . ئەلی « پیشینان وایان وتوە . » .

لە کورددا نەخویندەوارەکانیان زورتر پابەندن بە پەندی پیشینانیانەوە تا خویندەوارەکانیان . ئەمەش سوراخیکە بو ئەوە کە پەندی پیشینان جەوهەرو بناغەی زمانەکەیانە بویە زەوقی کوردی پەتی چاکتر لەگەلیا ریی ئەکەوی . کورد لەگەل ئەم پەندی پیشینانەیانا هەندی قسەی نەستەقیشیان هەیە لە باسی « کوردو فەلسەفە » دا باسی ئەو ئەکریت .

پەندی پیشینانی کوردی – وەکو شتەکانی تریان – لەژیر پەردەی گوییی نەدانا ماونەتەوەو دەستی چاپ نەیانگەیشتوتی ، تەنیا دو نامیلکەی لی چاپ کراوە ، یەکی لەژیر ناوی « قسەی پیشینان گوستاو لوبون » ی ماموستا اسماعیل حقی شاوەیس کە لە چاپخانەی ئەیتام لە بەغدا سالی ١٩٣٣ بو جاری یەکەم لە چاپی داوە کە « ٦١٣ » پەندە . دوهەمیان لەژیر ناوی « هەزار بیژوبەند » لە لایەن ماموستا معروف جیاووگەوە کو کراوەتەوەو لە چاپخانەی « نجاح » لە بەغدا سالی ١٩٣٨ بو جاری یەکەم لە چاپی داوە ئەمیش هەزار پەندە . لە گوڤاری (گەلاویژ) یشدا بەرە بەرە « ٣٩٢ » پەند چاپ کراوە ، هەر وەها لە گوڤاری دەنگی گیتی تازەو دیاری کوردوستانو

دیاری لاوانیشدا نزیکەی « ١٥٠ » یەکی لێ چاپ کراوە . ئەوەندە هەیە ئەمانە لە یەکیان وەرگیراوە وەنەبێ هەموویان جیا بن ، وا هەیە پەندیکو ئەـ هەمووانا نوسراوە . دیسان « پیرەمێرد » یش « ٦٤٤٨ » پەندی هەر یەکە بە شعریک لە رۆژنامەی « ژیان » و « ژین » دا بلاو کردوتەوە .

لەبەر ئەوە گوترا : پەندی پێشینانی کوردی یەکێکە لە بناغەی بەهێزی ئەدەبیاتی کوردی چەند پەندیک دێلینەوە لەگەل باسکردنی مەبەستەکەیاندا بۆ ئەوە کە یەکێ چاوی بەمێژوی ئەدەبی کوردیدا خشاند لەم رووەشەوە بوی دەرکەوی کە زەوقی کورد تا چە پایەیک ژیری خوی دەر بریوەو گەیشتوەتە چە شوێنیکی ئەدەب :

(١) « دەستێک نەتوانم بیبرم ماچی ئەکەم » مەبەست ئەوەیە پیاو نابێ هەمو جار کە لەرەق بنوێنی . (٢) « بە قسەی خوش مار لە کون دیتەدەر » واتە پیاو بەزمانی شیرین ئەتوانی بەسەر هەمو کوسپێکدا زال بێ . (٣) « بانیکەو دو هەوا ! . » . ئەمە بەسەرسامیەکەیە لە شوێنێکا ئەوتری کە جیابێ لە بەینا نەبیت کەچی جیاش بکرێتەوە . . سەرچاوەی ئەم پەندە ئەوەیە کە ژنیک کوریک و کچیکی بوە ، ژنی بو کورەکەی هیناوەو کچەکەشی داوە بەشو . شەویکی هاوین هەموویان لەسەر تاقە بانیک نوستون لە نیوەشەوا هەستاوە چوەتە سەر جیگەی کچ و زاواکەی لیفەکەی داوەتەوە بەسەریاناو داپوشیون وتویە : رۆلە ساردە سەرمانان ئەبێ . ئینجا چوەتە ئەولاوە بو سەرجیگەی بوک و کوڕەکەی، سەیری کردیە پیکەوە نوساون لیکیانی کردوتەوە و لیفەکەی لە سەر لاداون وتویە : رۆلە گەرمە لە گەرمانا ئەپیشێن ئەمە چیە وا خوتان نوساندوە پیکەوە ؟ ! . بوکەکەی ئاگای لە هەردو کارەساتەکە بوە وتویە هەی هەی « بانیکە و دو هەوا ! . »

(٤) « کوتەک ئەزانی قوناغ لە کوێیە » مەبەست ئەوەیە ئیشیکی کردوە هەر چەند بەخورشە لەگەلی خەریک ئەبن راستی نالی لە پاشا دەست

ئەکەن بەلدانی لـەو وەختە بەناچاری دمری ئەبردی !. (٥) « کە زور بو قەواله بەتالە » . قەواله کاغەزیکە تیایا ئەنوسری ئەو ملـکە یا ئەو زەویە هی فلان کەسە ، کە ئەمـــــەی هەلـگرت ئیتر ئەو ملـکە بەهی ئەو ئەناسری . مەبەست ئەوەیە زور لە سەر هەمو شتیکەوەیە، کە زور بو قەوالەوشتە هیچ ناکا . (٦) « بو ریش چو سمیلیشی نایەسەری » مەبەست ئەوەیە یکیک دەستبو ئیشیک ئەبا کەچی لە باتی ئەوە قازانجی تیا بکا زیانی تیا ئەکا، ئەمەی بو ئەوتری . (٧) « زورەملی مل شکانی لە دوایە » مەبەست ئەوەیە پیاو ئەبی ئیش بە پعوو هیمنی بکا . (٨) « گیا ئەوەیە بەدەمی بزن خوش بی » مەبەست ئەوەیە بە هەمو ئیشیک نالین چاکە . (٩) « شوینی شیرەو ریوی گیرەی تیا ئەکا . » ئەمە بەداخەوە لە شوینیکا ئەوتری کە لە پیشا پیاوی بەکار خەریکی ئیشیک بوبیت و ئیستە ئەو نەمابیت و یکیکی بیکارە دەست بدا بەو ئیشەوە . (١٠) « دار بە پوازی خوی نەبی ناقەلشی » مەبەست ئەوەیە ئەگەر قەومیک خویان بنچینەی یەکە دەرنەهینن کەس پیان ناویری . (١١) « گیا لەسەر بنجی خوی ئەرزویتـــەوە » مەبەست ئەوەیە هەموشت ئەچیتەوە سەر رەگەزی خوی . (١٢) « قەدری مانگ نیە تا نەگانەشەو » واتە : پیاوی زانا وەختی دەرئەکەوی کە لە شوینیک بی نرخی زانینەکەی بزانری . (١٣) « چی بچینی ئەوە ئەدرویتـــــەوە » واتە : لە کردەوەی چاکە چاکت دەست ئەکەوی و لەهی خراپ خرابە . (١٤) « نان بو نانەواو گوشت بو قەساب » واتە : ئەبی هەر کە بەئیشی خویەوە خەریک بیت ، ئەگەر یکیک دەستی دایە ئیشیک کە سەر روشتەی تیا نەبو لە کەلکی ئەخاو ئیش تیک ئەچی . (١٥) « کەشیرت وەشان ئەبی قەلغانت پی بی » مەبەست ئەوەیە پیاو نابی هـەر وا بزانی کە دەست ئەوەشینی ئەبی ئەوەشی ئاگالی بی کە دەستیشی لی ئەوە شینن ، جا ئەبی بە ئامادەیی بچیتە مەیدانی ئیشەوە نەوەک لە نیوەی ریگەدا بەکی بکەوی . (١٦) « سوار هەتا نەکلی

نابی بە سوار» مەبەست ئەوەیە پیاو بیەوی بکا بە شلیک ئەبی نەنگو چەلمەشی بیتە ری . (١٧) «شەرو لە شیفەو ئاشتی لە خەرمان» (شیف) ومردە . واتە : ئیش ئەبی لە سەرەتاوە یەکی لایی بکریتەوە . (١٨) «چەم بی چەقەل نابی» مەبەست ئەوەیە هەر قەومی لو بیگری خرابی هەر تیدا هەیە . (١٩) «چەپلە بە دەستیک لی نادری» مەبەست ئەوەیە یارمەتی لە بەینا نەبی ئیش ناچیتە سەر . (٢٠) «ئاسنی سارد بەفو گەرم نابی» مەبەست ئەوەیە هەر ئیشی کە دەستی درایە ئەبی پیاو خوی بو ئامادەکا و چی بو ئەوئیشە پیویستە بیکا . (٢١) «کیویک ئەرروخی کەندەلانیک پڕ ئەبیتەوە» ئەمە بە ئاخەوە ئەوتری . مەبەست ئەوەیە یکیکی گەورە لە ناو ئەچیت بو ئەوە یکیکی هیچو پوچ سەر هەلدا . (٢٢) «هەر دەوەنەو ئەبی بەدار» مەبەست ئەوەیە پیاو نابی دوژمنی بچوک بەهیچ بزانی . (٢٣) «لە حەزی جوتیارە گا گاویژنەکا» مەبەست ئەوەیە ئەگەر سەرداری ئیش سەرداری دەستو پیوەند ناتوانن خرابە بکەن . (٢٤) «بویەپیت ئەلیم کاکە چولەکم بو بگریت» مەبەست ئەوەیە وختی ئەتوانی مەردم بخەیتە ژیرا بارو بیانکەیت بە ئاشنای خوت کە چاکت بویان ببیت . (٢٥) «سال بەسال خوزگە بەپار» مەبەست ئەوەیە ئیش هەتا ئەرروا بەلای خراپیەوە ئەرروا . (٢٦) «قسە کەوتەزاری ئەکەویتە شاری» (زار) دەمە . مەبەست ئەوەیە کە پیاو نابی نهینی دەر برری . (٢٧) «سوار ئەسپی خەلک بیت هەر پیادەیت» مەبەست ئەوەیە پیاوناپی چاوی لەمالی مەردم بی . (٢٨) «بەرخ هەر لە ناو کوزدا نامینی» مەبەست ئەوەیە پیاو پابەندی گوررانە . (٢٩) «قەل بە قەلی ئەوت رورەش» مەبەست ئەوەیە پیاو ئەبی لە پیشا تەماشای خرابەی خوی بکا ئینجا هی مەردم . (٣٠) «ئەوی لە مفک بی جەوال ئەدرری» مەبەست ئەوەیە وەچەی خراپ هەر ئەگیشتەوە سەر خرابە .

ئەمانە هەروا نمونەیەک بون لە پەندی پیشینانی کوردی . پیاو کە

خەیزیان ئەکاخیرا بوی دەر ئەکەوی کە لە بەبن چوار دیواری شیر رەوە سەریان
هەلداوە ، بەلام لە لایەن مانماوە هەمو کەس دانی پیدا ئەنی کە چەندە
بەرزو چون بەسەر هەمو شتیکدا ـ کە هەر توزی ئاشنایەتی لە بەینیا نابی ـ
سەرەو نخون ئەکرینەوە ؟ وەچون ئەو وشانە کە بەکاریان هیناوە هەمو بە
جوریکی سادە خستویانەتە یەک و هیچ گیرو گرفتی تیدا نابینری ؟..

# کورد و فەلسەفە

میژوی ئەدەبی کوردی بی گومان ئەبی ئاشنایەتیەکی لەگەل فەلسەفەدا
هەبی ، بویە هەبەتی چونکە ئەدەب بەتیکرا یەکیکە لەو لقانە کەلە فەلسەفە
بونەتەوە . بەلام ئەمە ئەگونجی کە ئیمە بینین ناوی فەلسەفە لە کوردیدا بهیلینە
ناوەوە لەگەل ئەوەدا کە رەخنە گرئەلی کورد تا ئیستە ئەدەبیکی ئاشکرای
نەبوە ئیتر فەلسەفە چون ئەبی دەمی بو ببری ؟! .

ئەمە ئەلی بەلام ئیمەش ئەلین فەلسەفە عبارەتە لە بین دریژی و روچون
لە خەیالاتی مادی‌دا ، کوردیش ئەمەی هەبوە ، جا ئەگەر ئەو روچونەو ئەو
تەفکیرە بە خیو نەکرابی ئەمە ئەوە ناگەیەنی کە فەلسەفەی نەبوە . سەر
چاوەی فەلسەفە شەرت نیە کە لەسەر شعوریکی علمیەوە سەری هەلدابی
بەلام شەرتە کە قول بیت و خەیالاتی بەرز هەلگری . کە علمیەت تیا
شەرت نەبو قسە ساویلکەیەک کە پیاویکی دەشتەکی لەروی شعوریکی
سادەوە کردویەتی ئەگەر تو لە باریکی علمیدا لە بنج و بناوانی قسەکەی
بکولیتەوە تەماشا ئەکەی سەرچاوەکەی ئەچیتەوە سەر فەلسەفەو کەچی
کابرا خویشی نەزانیویە فەلسەفە بەری بە کویەوەیە وە نەزانیویەتی
علم چیە ؟ .

لە پیش ئەوەدا کە باس لە فەلسەفەی کوردیەوە بکەین پیویستە توزیلی
بکولینەوە بو ئەوە لە ئاخرا بومان دەرکەوی ئەو تەوەرەکرانە کە

کوردنە دەشتەکیەکە کردونی خلق نەبوون لە فەلسەفە . .

سەرچاوەی فەلسەفە یونانە ، ئەمەش لە پاش ئەوە کە لە ئەفسانە بونەوە خۆیان دایە ئەوە بە دەور ئەو خەیالە ورد و تەفیکرانەدا بسوڕرینەوە لە گەل ( ظواهر)ی وەکو هەواو ئاسمان و رۆژو ئەوشتانەدا ئاشنایەتیان هەیە ، تەنانەت وایان لی هات ئەگەر لە بازارر ، یا ناو کولان توشی یەک ببونایە قسە هەر قسەی فەلسەفە بو . ئەو بیروباوەڕرانە کەیکیکی وەکو ئەفلاتون یا ئەرەستو دەریان بڕیبو نەوەک لەو وەختەوە تائیستە بەلکو لە ئیستەوە تا گەلی وەختی تر عیلم خزمەتی فەلسەفە بکا – وەکو کردویەتی — ناگاتەوە بەوان لە گەل ئەوەش هەرشتیک بکات هەر خزمەتی فەلسەکەی ئەوان ئەکا . . سەیر ئەکەی سوقرات دائەنیشت و مەردم بە دەوریا کو ئەبونەوە یەکی پرسیاری ئەکرد ، یەکی وەلامي وەر ئەگرتەوە ، یەکی بەربە-رەکانی ئەکردو یەکی ریی بو رون ئەبوەوە . لە مانە هیچ توررە نەئەبو بەلکو لە سەری ئەررویشت تا ئەیگەیاندە ئەو شوینە کە بەدانیشتوانی ئەسەلمان : ئەو کەسانە داوای عیلم ئەکەن هیچی لی نازانن ، ئەیگەیاندە ئەو شوینە کە گەنج ئەبی خوی فیکر بکاتەوە بو ئەوە شت بزانی نەوەک هەر وەکو کویر بکەویتە شوین خەلکی ! . هەروەها ئەوەشی پی ئەوتن کە ئەم خوي هیچ نازانی بەلکو ئەم شتانە کە ئەیلیت حکمەتیکەو دەنگیکی نهینی پی ئەلیت وە دورنیە ئەو دەنگە لەلایەن خواوە بیت . جا هەر کەس لەقسەکانی تی گەیشتایە ئەوا سوقراتی زور خوش ئەویست ، ئەو کەسەش کە پایەیەکی عیلمي ببوایە لە ناو مەردما لە قسەکانی بگەیشتایە یانە گەیشتایە ئەیوت ئەمە زندیق وکافرە . تا لە ئاخرا سە کەس لەو گەورانە لە بەردەم قازیدا بوختا-نیان کرد بە سوقراتا کە ئەمە ئەقلی گەنج تیک ئەدا و ئینکاری خوا ئەکا و پەلاماری یاسای حکومەت ئەدا . ئیش وای لی هات حوکمي بەسەرا درا بە کوشتن بە زەهر خواردنەوەلەسەرئەم حالەشلەوکاتەدا کە زەهرەکەی

خواردەوە هەر لە سوقراتی فەیلەسوف نەکەوت ، هەر لەوە نەکەت کەقسە لە نەفس و لە مانەوەی نەفس بکا .

قسەو باسەکەی سوقرات و ئەفلاتونی شاگردی ـ کە شاگرد بەربەرەکانیەکەی خۆی لە گەل ماموساياو پرسیارلی کردنیو وەلام وەرگرتنەوەی هەموی نوسیبوەوەو بە (ئەسینا) دا ئەیگیرا ـ پارچەیەکە لە ئەدەبی هەرە بەرزی ناەی،هیچ سوچیکی خەیالیا ـ نەهیشتوتەوە کە فیکری وردی ئینسانی بو چوبیتو نەچوبیت ئەوان قسەیان لیوە نەکردبیت . تەنانەت ( بنیامین گوفیت ) ئەدیبی گەورەی ئنگلیز کە قسەو باسەکانی سوقرات و ئەفلاتونی کردوەبە ئنگلیزی ئەلی : (بیجگە لە فیکرەی گاوري هیچ فیکریکی کونو تازەی ئیسانی نیە کە لەودا نەبیت) هەندی لەم باس و خواسەش لەلایەن (حناخباز)و(زکی نجیب محمود) ەوە کراوە بەعەرەبی ، بە کەمیان (الجمهوریه) دو هەمیان ( المحاورات ) . دو فیکرەی بەرزی تیدا هەیەکە شایانی باس کردنو کەلک لی وەرگرتن بی ، ئیمە بە کورتی لیرەدا ئەیلین ، یەکەم :

باوەرری سوقرات کە ئەلی : (فەزیلەت عیلمەو رەزیلە جهلە ) واتە ئینسان خراپە ناکا مەگەر لەروی نەزانینەوە نەبی،ئەگەر شت بزانی هەرگیز توخنی ئەو خراپەیە ناکەوی . تەنانەت لەوکاتەدا کە پیاوت فلانو فلان ئەوادین زمهرەکەت بودین و ئەتکوژن ! هەروتی : ( گوییان مەدەنی چونکە ئەوشتەی ئەیکەن نایزانن ! ) فیکرەی بەرزي دوهەم لە ( محاورات ) دیسان فیکرەی سوقراتە کە ئەلی : « ئەم شتانەو ئەم عالەمە کە ئیمە ئەیبینین ئەمە شیوەی عالەمیکی تر پیشان ئەدا کە هیزو قوای ئەو عالەمە بیروباوەرری عەقلیەیە . هەر شتیک کە ئیمە ئەیبینین لیرەدا ئەوە تاپوی فیکرەیەکە لەوی ، ئەگەر تو ئینسانیکی جوان یا گولیکی جوانت خوش ویست ئەوە لە راستیدا وەنەبی ئەو فەسالەی ئەوانت خوش بوی بەلکو ئەوە فیکرەی جوانیەکت خوش ئەوی کە چوەتە پیستی ئینسانو گولەوە .

ئەویش ئەوە کە لەو تاقە ئینسانە یا لەو تاقە گولەدا بەلکو لە جنسەکەدا » .
جا ئائەمە توزێکی زور کورت بو لە خوشەویستی ئەفلاتونی ـ الحب الافلاطونی.
بەلام ئەوی کە توزێ درێژتر بێ لە باری فەلسەفەی ئەوانەدا سە شتە :
( قسەی جمهوری ، قسەی دفاع ، قسەی مأدبە . ) لە جمهوریەتدا باسی ئەوە ئەکا کە حکومەتی بەرز ئەوەیە فەیلەسوفێکی فیکر تیژ هەلیسوررێنی و بیخاتە ژێر دەست خوی وەکو چون ئەقل لەش هەلئەسوررێنی ئەویش ئەبێ وابێ .
لە دفاعدا ئەو قسانەیە کە سوقرات لە بەردەم تازیدا بە فەلسەفە دفاعی لە نەفسی خوی ئەکرد . لە مأدەبەدا داستانێکی دور و درێژە لە خوشەویستی ئەفلاتونی کە لە ئەوپەرری جوانی و نازکی تەعبیردا شت ئەخاتە بەرچاو .

لە پاش ئەمان « ئەرەستو » هات و لقوپوپی فەلسەفەی بەجورێ بلاو کردەوە کە تا سەدەی حەڤدەهەمیش لە ناو فەیلەسوفەکانا ناوی ئەرەستو هەر فەیلەسوفی روت بو ئیتر ناوەکەی خوی لە فیکر چو بو بوەوە . بە جورێ دەستی کیشا بە سەر باوەرری مەردما کە هیچ فەیلەسوفێکی تر ئەو پایەیە نەبو . هەتا لە پیاوانی رابەرری ـ نهضە ـ پەیدا بون ، لە فەرەنسە وەکو ( دیکارت ) و لە ئنگلیز وەکو ( بیکون ) لە ئیسلامیش وەکو (غەزالی) کردیان بە هەرا لە ئەرەستو وتیان ( هەمو کەس هەقی ئەوەی هەیە کە فیکر بکاتەوە و فیکر کردنەوە سنوری بو نیە) . لەگەل ئەوە ئەرەستویش وەنەبێ ئەم ریگەیە لە مەردم گرتبیت ! . چون ئەیگریت ؟ ! ئەوی کە ئەو پیاوە بیت و خاوەنی ئەقلێکی تەواو عالمێکی وابیت لە هەمو شت بکولیتەوە تا ئەیباتەوە سەر رەچەلەکەکەی ، ئیتر چون رێی لە خەلک ئەگریت ، بەلام پەیرەوی کەرەکانی بە درێژایی ئەو سالانە وایان لە مەردم گەیاند کە ئەرەستو ماموستای یەکەمەو هەر شتێک ئەو وتی گێررانەوەی بو نیە، ئەم باوەررەی ئەوان توزێ ئەسلی فیکرەکەی ئەوی تیکدا .

ئەرەستو لەسەرەتادا دەرزیلە ئەفلاتون وەرئەگرت بەلام لە دوایدا لی

جیا بووه . زیاتر ئەوهتە کەگیایا جیابونەوه ( عالەمی عەقل ) بو . ئەفلاتون ئەلی : عالەمی عەقلی یا ( فیکرەی مثل ) هەیە وەشت لە سەر نمونەی ئــەو دروست ئەبیتەوه . واتە وەکو گیا چون لەسەر بنجی خوی ئەرروێت شتیش لە سەر تووی خوی پەیدا ئەبیتەوه ... ئەفلاتون بەخەیاڵە بەرزەکەی پەردەی (مادّە) ئەدرری‌و لای ئەبا بو ئەوه لە پشت ئەوەوه ئەفـکاریکی روت ببینیت کە ئەم ئەفـکارە بەلای ئەوەوه بوشت وەکو بنچینەوایە بو سورەت . بەلام ئەرەستو ئەلی : شت ئەوەیەکە ئەیبنری و بەردەست ئەکەوی ، ئەم شتانە کە ئیمە ئەیانبینین ئەمانە لە زاتی خویانا حەقیقەتیکن‌و لە پشت ئەمانەوه هیچی تر نیە ؛ واتە معانی مجردە هیچ وجودیکیان نیە ئەمە تەنیا ئەقلیکی ئینسانیەو هیچی تر ...

جا ئایا میژوی ئەدەبی کوردی چی ئەوی لە فەلسەفە و چە ئاشنایەتیەکی لەگەل فـەلسەفەدا هەیـە بە تایبەتی فەلسەفەی ئەفلاتون‌و ئەرەستو ؟ ! ...

وەکو وترا : لەبەر ئەوەکە فەلسەفە بە مەعنا روچونە لەمەسائلی وردو زانینی سەرچاوەی شتە لەگەل خەیالبازی کردندا ئەبیتە لقیک لە لقو پوپی ئەدەب وە بویەش قسە لە ئەرەستوو ئەفلاتون‌و سوقراتەوه کرا چونـکە ئەوان داهینەری فەلسەفە بون و ئەوان بون‌کە ئەو عیلمەیان هینایە ناوەوه پیویست بو توزی لە سەرچاوەی ئەفـکارەکەیان بزانریت ... ئیستە من یا ئیمە ئەوە نالین کە کابرایەکی کوردی دەشتەکی نەخویندەوار بەربەرەکانی یکیکی وەکو سوقرات یا ئەرەستوی کردوه لەفیکرو باوەرردا چونـکە ئەوکابرایە نەناوی ئەرەستوی بیستوه وە نەزانیویەتی عیلم چیە، بەتایبەتی عیلمی‌فەلسەفە ، بەلام ئەتوانین ئەوه بلین کە ناوچـەی کوردەواری خاک و ئاوەکەی لەوانەبوه پیـاوی وا بی بگەیەنی کە قسـەکانی ـ ئەو قسە ساویلـکانە کە ئـەیکا ـ بونی فەلسەفەی لیوه بیت باخوینی هیچی لی تی نەگا .

کابرا ، کە وتویەتی ( گیا لە سەر بنجی خوی ئەرروێتەوه ) ، بەلی ئەو

حەروا بەبێ ئەقلی خوی لە دەشتدا چاوی پی کەوتوە کە گیا ناررویتەوە تا لە پیشا ریشەو توو بنجیکی نەبی لە پاشا قسەکەی کراوە بەمەسەل بو ئەوە کە هەموشت ئەبی بچیتەوە سەر رەگەزی خوی .. بەلام ئەم قسە ساویلکەیە ئەگەر بیتو بەراوردی لەگەل قسەکەی ئەفلاتوندا بکریت کە ئەلی : (عالەمی عەقلی هەیەو شت لە سەر نمونەی ئەو دروست ئەبیتەوە ) واتە هەموشت وینەیەکی هەیە ، وەکو چون ئاوینە وینە ئەداتەوە ، مەوجوداتیش ئاوایە ئەم ئەچیتەوە سەر ئەو و ئەوز ئەچیتەوە سەر ئەو تا لە دوایی‌دا ئەگاتەوە سەر فیکرەیەکی روت کەئەم فکرەیەش لە زاتی خویدا موجودە، مەبەستەکەی ئەوەیەکە ( مادّە ) کونە . مەسەلەی بنجە گیا کەش هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەل فیکرەکەی ئەفلاتوندا چونکەکە وتت گیا لەسەربنجی خوی ئەررویتەوە ئەبی بنجەکەش لە سەر بنجیکی‌تر و هەر بەوجورە برروا تا ئەگاتەوە ئەو شوینەکە ( مادّە ) یەو لیرەدا حوکم بەکونی مادە ئەکریت . کەوا بو ئەو گیایەکە ئیستە تو بەرچاوت ئەکەوی ئەوە وینەیەکە لە مادّەی حەقیقی کە مەلایین سالە بە ملیون ملیون بنجی گوردیوە تا گەیشتوتە ئیستەو هەر بنجە دەوری کردوتەوە بو بنجیکی‌تر . بەلام لە سەر قسەکەی ئەرەستو وانیە ئەلی ئەو گیایە کەتو ئیستە ئەیبینی هەر ئەوەیەو ئەبرریتەوە . قسە هەر قسەیەکە بییت فەلسەفەی ئەم کوردە دەشتەکیە لەم مەسەلەیدا شانی ئەدا لە شانی فەلسەفەکەی یونان ،

دیسان ئەلی : ( ئەوی جوان لە ئاوینەدا ئەیبینی پیرلە خشتی کالدا ئەیبینی) . راستە ئەوکەسەی ئەم قسەی کردوە ئەقلی هەر ئەوەندە بە ساویلکەیی بردی کردوە پیرو جوان لیک بکاتەوە بەوەداکە پیاوی پیر دنیای زور دیوە وشتی زور تاقی کردوتەوە ئەگەر ئیشیک هاتە پیشەوە با زور تاریکیش بیت لەبەر دنیا دیدەیەکەی هەر ئەیزانیت ، بەلام پیاوی جوان لەبەر ئەوە گەرمو ساردیەکی لە دنیادا نەدیوە لەشت ناگا تا وەکو وینەی ناو ئاوینە بوی رون

ئەبیتەوە . هاتوە ئــــەو شتەی پیرە کە ئەیبینی کردویە بە شتێکی نادیاری و تاریکەوە کو خشتی کاڵ،خشت هیچ وێنەیەکێ ناداتەوە دواوە ؛ وەهی جوانەکەشی کردوە بە شتێکی دیاري کەوینەی تا ئاوێنەیەو بە بوختی دەر ئەکەوی .
بەلام ئەگەر لی کولینەوەیەکی عیلمي بکریت بەرزي ئەم قسەیە گەلی گەلی لە زۆر ئەو ئارەزوەوەیە کە ئەو کردویەتی :

گویا ئەگەر مانای لی بدەینەوە لە سەر باوەرري ئەم ( مادّە ) کون نیە بەلام شتێکیشی لە کون نە گەرراوەتەوە . هەر کارەسات و کردەوەیەکێ کە رو ئەدا لەم کەونەدا وێنەی کارەساتێکی ترە وەکو خوی ، تاوەکەی لە هەوادایە ، ئەویش وێنەی یکێکی ترەو ئەویش هی یکێکی تر تا ئەچێتەوە سەر رەگەزی ئەسلی کە ئەقلی دەیەمینە ، ئەقلی دەیەمینیش بەلای ئەمەوە حادثە ؛ ئەم پیاوە پیرە ئەوەندەی شت بینیوە کە هەر یەکە وێنەی یکێکی تر بوە تا گەیاندویەتەوە سەر ئەقلی دەیەمین . ئیستە ئەگەر کوتوپرر شتێکی تری چاوی کەوت پیوست بەوە نیە چاوەرري ئەوە بکا تا وێنەکەی ببینی،بەلکو خیرا ئەیبانەوە سەر رەگەزی خوی هیچ پەردەیەکێ لە بەینیا نا ناهیلیتەوە . بەلام جوانەکە پابەندی پەردەیە ، لە بەر ئــەوە کارەساتی نەدیوە لە حــەقیقەت نی ناگا ، شت لە بەر چاو ئەوەوە هەمو وێنەیە بو شتی تر . کەوابو لە سەر ئەم قسانە ئەوە دەر کەوت کە ( مادّە ) حادثە بەلای هەندی کەسەوە کە پیاوە پیرەکەیە ، کونە بەلای هەندیکی ترەوە کە جوانەکەیە . . جا ئەمینیتەوە سەر ئەوە کەکابرا لەروی ئەم شعورە عیلمیەوە قسەی نەکردوە ئەمە شتێکی ترە بەمەبستە کە ئەوەیە ئەفکاری کوردي ئەفکاریکی فەلسەفیە . .

جاریکێ کابرایەکێ ئاموزگاری کورریکی خوی ئەکا پی ئەلی : ( روله! قسە بی گێژە ، بی بیژە ، بیویژە ) . ئەم کابرایە کابرایەکی کوچەری بوە ، نەدیواخانانی دیوە نە قوتابخانان وە نە عیلمو داستانی رابوردوان ، ئایا ئەم قسە بەرزەی لە کوی دەرهیناوە ؟ کە ئەلی ، روله ئەگەر ویستت قسە بکەیت

لە پێشا قسەکە وەکو چۆن گەنم ئەیکەن بە « کەو ـ سەرەن » داو ئەیکێڕنەوە لە پاشا ئەیکەن بە ( بێژنگ ) داو ئەیبێژنەوە و پوختە ئەبێ توش قسەکەت ئاوا پوختەکەو ئەو وەختە بیڵێ .. دەی ئەمە بێجگە لەوەکە پیاو بڵێت ناوچەو هەواو ئاوو خاکی کوردەواری داوای ئەم جۆرە شتانەو ئەم چەشنە قسە بەرزانە ئەکا هیچی تر بە دەستەوە نیە ... دیسان ئەمە بێجگە لەو عالمانەکە لە کورددا هەڵکەوتون و هەمو لە باریکی عیلمیدا لە فەلسەفەو حکمەت کوڵیو ـ یانەتەوە و بە هەزارانی وایان هەبوە کە خۆیان لە حکمەت و فەلسەفەدا بیروباوەڕیان هەیە و گەلێ کتێبیان لە سەرداناوە . بەڵام ئێمە لەمە نادوین ؛ یەکەم لە بەر ئەوە چونکە بەهۆی خوێندنەوە فەلسەفەکەیان گەیاندوتە ئەو پایەیە ، دوهەم کە کتێبیان لە سەر داناوە و بیروباوەڕیان دەر بڕیوە هەمو بە زمانێک بوە کە غەیری زمانەکەی خۆیان بوە ! .. لەگەڵ ئەمانەشدا قەڵەم هەر بەنازەوە ئەڵێ پیاوانی وەکو ( ئەبو حنیفەی دەینەوەری ، حەسەنی کوڕی نەجای فەیلەسوف ، محی الدین خەلاتی ، احمدی کوڕی حیدەر ، رەسولی زەکی ، عەلی کوڕی زەکی ، محمدی کوڕی رەسوڵ ، مەلا شریفی کوڕی مەولانا یوسف ، شیخ محمد قسیم ، شیخ عبد القادری مهاجر و مەلا عبدالرحمانی روژبەیانی) لە کورددا هەڵکەوتون لە فەلسەفە و حکمەتدا ئەستێرەو دانراوەکانیان ئەدرەوشێنەوە .. ئەمە نمونەیە بۆ ئەگینە ئەگەر ناوی علمای کورد هەڵبدری گەلێ کتێب پڕ ئەکاتەوە لەگەڵ ئەوەش کە بەشی هەرە زۆریان لەبەر نەنوسینیان ناوەکانیان لەگەڵ لەشەکانیانا چونەتە گۆڕەوە !

# کورد و خەتابە

ئەدەب وەکو چۆن سوچێکی فەلسەفەیە سوچێکیشی خەتابەیە جا خەتابە وەختێک ئەبێ بە ئەدەب ئەو وشانەکە خەتیب ئەیانخاتە سەر کاغەز و بەدەنگە

نیزوبی ترسەکەی ئەیانخوبلیتەوە یا وشەکان لە دلیا بچیلیتەوە وەکو چون لە گوپی گوبگرانا دەنگ ئەداتەوە و کار ئەکاتە سەر ئەقلیەتیان ، وەیا ئەوەتە ئەگەر حەبێ ئەو وشانە نەمینیتەوە مەعنا بەرزەکانی جیگەیەکی وای گرتبێ لە دلی ئەو کەسانەدا کە ئەیبیەن وەکو ئاگر کە توخنی بوشو ئەکەوی و شورشیک ئەخاتە بوشوە کەوەئەویش ئەو شورشە بخاتە ئەوان . . بە جوریکی تیکرایی خوتبەی گەلی لە خەتیبەکانی عالەم هەر لە زەمانیکی کونەوە تا ئیستەش وەکو دەنگی گورانی بیژان چون هەوا بردویەتی و ناو ونیشانیکی لیوە نەماوە ئەوانیش بەوجورە تیکلاو بەهەوا بوون و ناو ونیشانیکیان نەماوە ا . چونکە خەتیب ئەو قسەکەرەیە کە ئەوەستی و دەست ئەکا بەقسە کردن و بە هەلرشتنی مەعنای بەرز لە قالبی وشەی جواندا بە سەر ئەو کومەلە کەبوی راوەستاون و گوی‌یان لی گرتوە ... بی گومان ئەم جورە شتانە هەر لە زەمانیکی کونەوە بووە بە تایبەتی لە « ئەسینا » پلەیەکی زور بەرزی وەرگرتبو ، بەلام لە بەر ئەوە نوسین لە دنیادا زور نەبو قسەی خەتیبەکانیش زور نەئەمایەوە . زور بەگرانی ئەو قسانەی ئەوان هەلیان ئەررشت بە سەر خەلکا هەموی لەبەربکرایەو لە پاشا بخرایەتە سەر کاغەز ا . ئەلیم لە پاشا مەبەستم پاش زەمانیکی زور دریژە - . وردە وردە کە شارستانی زوربو لە پیشا دەنگی خەتابە لە ناو ئیسلامەکانا بو ئینجا کەوتەئاوروپایشەوە : لە ویدا جوش‌و خروشیکی پیک‌ئەهینا . کە رەوشتی کوبونەوە - احتفال - لە عالەما پەیدا بو خەتابە هەنگاویکی تری هاویشت ، کە پارلەمانەکان لە ولاتە دیموکراتیەکانا دامەزران خەتابە بەجاری پەلی بلاو کردەوە ، کە چاپخانە بەخوبو روژنامەو گوفارەیەکەوتەناوەوە خەتابەگەیشتە چلە پوپەی بەرزی، بویە گەیشت چونکی خەتیبیک لە کونگریسیکدا خوتبەی بو هەزار یا دە هەزار کەس ئەدا ، تاقە روژنامەیەک بەجاری بەسەر سەد هەزار کەسدا بلاوی ئەکردەوە ، ئەم خوینەرانە ئەگەر هەر لەهەزار وشە تەنیا هوروشی

وشەیەکیان وەر بگرتایە بو بەرزبونەوەی پایەی خەتابە ئالایەکی کەم نەبو .

خوتبە سە جورە ؛ جوریکی ئەوەیە ئەبیسریت بەلام ناخوینریتەوە ، جوریکی ئەخوینریتەوە بەلام نابیسریت ، سەهەمیان ئەوەیە کە کاریگەریەکەی چاوتیر ئەکاو گویچکەش پرر ئەکا . واتە ئـەخوینریتەوە و ئەشبیسریت ... یکیکی وەکو « گلادستون » خوتبەکانی خوی کە ئەخویندەوە ئاگریکی ئەکردەوە ، کە چاپ ئەکرا لە ئاسنی سارد ساردتر ئەبو . « ئەدمەندبیرک » نەیئەزانی خوتبە بدا کە ئەچوە پارلەمانی ئینگلیزەوە کی لە هـەمو کەس بی زمانتر بوایە بە سەریا زال ئەبو کەچی لە کاتیکا کە چاپ ئەکرا ئاگریکی ئەخستە ماڵەوە . « پیرەمیرد »ی شاعرو ئەدیبی کورد هەر بەم جورە کە ئەهاتە قسەکردن دەمی بە یەکا ئەهات بەلام کە ئەدەب و خوتبەکەی چاپ ئەکرا ئاگری لە دلی بەردا ئەکردەوە ا .

ئەمە هەروا سەرپورتیک بو لە باسی خەتابە بە جوریکی تیکرایی بەلام بینە سەر باسیکی تایبەتی بو کورد :

خەتابە لە کورددا میژویەکی نیە ؛ بویە ئیمەش چونکە ئیمە قسە لە خەتابەی کوردی بەتیەوە ئەکەین لەمیژوی ئەدەبی کوردیدا . . کورد تا سەرەتای سەدەی بیستەم هەر مەیدانداری و نەبەردو سوراخیکی بی یا لەژیر چاوبری تورکدا بوە یا هی فارس . ئەنجامی سیاسی ئەمانە ماوەی ئەوەی نەداون کە شعور بەوە بکەن خوتبـــە بە زمانی کوردی ئەگونجی بی . . ئەمینیتەوە سەر ئـەوە کە کومـــەلیکی کوردی پەنی بوبیتن و لە مەیدانیکی شەررا راوەستابن و سەر کردەکەیان هەستابی بو هانە هانەدانیان هەندی قسەی بو کردبیتن . ئەمەش جاری ئەو کەســـە لەروی ئەو شعورەوە ئەم قسانەی نەکردوە کە ئەمە خوتبە ئەدا ، دوهەم لەبەر ئەوە خویندەواری لە ناوا نەبوە ئەو قسەی کردویەتی هـەروا رویشتوە . . هەندی شوینی تریش بوە کە خەتیب خوتبەی تیدا داوە وەکو ئەوە چوون بو غەزا ، ئەو خەتیبە بەلی

قسەی بو کردون بەلام پرری کردوە لە ئایتی قرآنو لە حەدیث و لە قسەی ئەو پیاو چاکانە کە بە زمانی عەرەبی قسەیان کردوە ، ئەوەش لەمەبەستی ئیمە دەرئەچی چونکە ئیمە خوتبەی خەتیبیکیان ئەوی کە بە زمانیکی کوردی بەتی لە شوینیک وەستابی کومەلەیەکی نەخویندەواری بە زمانەکەی خویان تی گەیاندبی . بی گومان ئەمەش کارەساتی روزگار بوی ریک نەخستون ئەگینە کوردیش لەو دەورانەی پیشودا خەتیب بە مەعناکەی ئیمەی تیدا هەر هەلکەوتوە .

بەلام لەم سەرەتای سەدەی بیستەمەدا بە تایبەتی لە پاش شەرری ٩١٤ ـ ٩١٨ کورد لە چاو ئەو هەمو پاشکەوتنیەشیدا هەر ، جورە هەنگاویکی هاویشت بو خوتبەدان وە زیاتر لەو کوردانەشدا کە کەوتبونە خاکی عراقەوە خەتیب لەمانا زیاتر هەلکەوت کە بتوانی لە کومەلیکی گەورەدا دەست بکا بە قسەکردنی ئاگرینی کوردی و بیخاتە سەر کاغەز ، هەروەها لە کوردەکانی موکریانیشدا ئەم سوراخە ئەبینریت . لەم دەوری دواییەدا لە سەرەتای چونی ( میجەر سون ) ی ئیگلیزی بو سولەیمانی بە دواوە لەو شارە بەبی ناوچەکەلی خەتیبی بەرز بەرز هەلکەوتوون . لەبەرگی دوهەمی ئەم کتیبەدا باسی ئەوان و هینەکانی سابلاغ ـ کە ئەم دو شوینە سەرچاوەن ـ ئەکەین .

# ئەدەبیکی روتی کوردی

کە ئەلین ئـەدەبیکی روتی کوردی مەبەست ئەوەیە هیچ شتیکی تری تیکلاو نەبوبیت و نەبیت . ئەدەبی قەومیک وەکو تەماشای جوانی وشەکەی ئەکری تەماشای بەرزی مەعناکەی زورتر ئەکری . نەوەک هەر ئەوەندە بەلکو ئەدەب تەنیا مەعنایە چونکە وشە بو مەعنایە . . گەلی وشەی وا لە

هەمو زمانیکا هەیە لە رواڵەتا سەیر ئەکەی کە پیاو ئەیلیت بەجوانی دیتە بەرچاوی بەلام کە سەیر ئەکەی هیچ مەعنایەکی تا بەخشی و بە پروپوچ دائەنری ... شعر بویە پی ئەلین ئەدەب چونکە مەعنای بەرزو خەیالی وردی تیدایە ، کەواتو هەرشتیک ئەو بەرزیەی تید بو ئەوە ئەدەبە . .

ئەدەبی کوردي لە پیش داهاتنی شعردا لە ریزە قسەیەکدایە کە لە زاری هەندی پیاوی نەخویندەواری دور لە شارستانەوە دەر هاتوە و بە تەواوی لەگەل حەقیقەتدا یەکی بوە ، لە پاشا دەوري شعری بەسەرا هاتوە ـ کە شعر بەلای خەیالدا ئەررِوا ـ ئەمانە هەرکامي بگریت ـ چە ئەدەبي حەقیقی چە ئەدەبي خەیالي ـ هەردولایان مانما لە شعوری خاوەنەکایان ئەدەنەوە کە ئەوانیش بوون بەزەنگي قەومەکەو دەنگی ئەدەنەوە .

ئەم قسەیە ئەوە بە ئیمە پیشان ئەدا کە ئەدەب بە جوریکی تیکرایي تەعبیریکی جوانە لە عاتفەو لە ئارەزو و لە شت . سەررای ئەمانەش ئەو کەسانە کە لە کورد دا پەیدا بوون و پاشماوەکایان بو ئیمە بوە بە ئەدەب و ئەمکریبن بە دەستەوە دو جور بوون ـ جا چە خویندەوار بوبیتن چە نەخویندەوار بە قسەکەیان کەوتبیتە سەر کاغەز یا نەکەوتبی ـ جوریکیان هەر مەیلیان بەلای تەبیعەتەوە بوە ، وانە لەباسي گول‌وزیانی لادی و زەوی‌و زار لەوە بەولاوە نەچوون ، یەکیک لەم کەسانە ئەگەر ویستبیتی بە سەرو بالای شتیکدا بیت چی بەدلاهاتبی کە بە فیکري خوی شایانی ئەو شتە بوبیت وتویەتی‌و تەعبیری لە خەیالەکەی خوی داوەتەوە بەرامبەر بەوشتە وە چە جورە وشەیەکی بوی بەسەند کردبیت ئەوەی وتوە ، ئیتر بە تەنگی ئەوەوە نەبوە کە ئەو کەسە گوی لی ئەگری یا ئەیخوینیتەوە لی تی بگا یاتی‌نەگا ! . ئەو ئەوەندەی مەبەستە جلەو بو خەیال بەرەلابکا با ئەو خەیال‌و وشانە بەرزتریش‌بن لەمەوسوفەکەی هەر بەتەنگەوەنیە ! . ئەگەر سەیری ئەم قسەیە بکری کابرا هیچ شتیکی

لەعاتفەوە نەنوسیوە یا نەوتوە کەچی لەشلی شتەکەم ئەدەبە وە. ئەدەبیش ئالەتیکە بو تەعبیردانەوە لە عاتفە !! . .

جا ئەم جورە کەسانە ئەگە نوسەربن پیان ئەلین « نوسەوری ابتداعي » وە یا بە کوردي بلین « نوسەری سەربەخو » . ـ وەیا داهینەر ـ جورەکەی تریان ئەوەیە هـەر بەلای گەمە و گالتەو بەلای پیا هەلوتنا ـ هیجادا ـ چوە ، ئەیەوی ئەدەبەکەی بی بەئەدەبیکی فیرکەرو خاوین کەرەوە، ئەیەوی باسی ژیاني ناوشاریکا نەوەکێ هي لادیی ، وە باسەکەی لەگەل شتەکەدا زورتر ئاشنایەتی هەیە تا لەگەل دلي خویدا ، وەئەگەر خویندەوار بیت و شتیکێ بنوسیت ئەیەوی شتەکەی بي بە دەرزو ئەقلي تیدا ئەکا بە حاکم . ئەم جورەش دیسان ئەگەر نوسەربن پیان ئەلین « نوسەری اتباعی » وەیا بە کوردی بلین « نوسەری شوین هەلـگر » . . لە سەر ئەم قسەیە زورتر لە کوردیدا ئەو کەسانە کە ئـەدەبەکەیان پەخشانـ ـ نثر ـ بوە جاکەوتبیتە سەر کاغەز یا نەکەوتبی ـ ئەدەبی اتباعی‌یە . ئەو کەسانەش کە شعر بوە ئەدەبي ابتداعی‌یە .

ئینـکار تا کری کە ئەدەبی پەخشان لە دەوریکي کونەوە لە ناو کورددا هەبوە ، بانەش نوسرابیتەوە دەماودەم هەر گیراویانەتەوە . ئەمەش کەئەیلین وەنەبی ئەدەبي‌چیروکي یا پەندی پیشینان بیت ؛ چونـکە چیروکێ داستانیکی مەیلەو ئەفسانەیە ، ئەگونجي بناغەیەکی هەر نەبوبیت و دەست هەلبەست بیت ، پەندی پیشینانیش ریزە ئاموژ گاریەکی کورت کورتن کە هیچیانـ بیست وشە پررنا کەنەوە . بەلام ئەم ئەدەبي پەخشانە شتیکی واقعیە هەم مەعنا کەی بەرزەو هەم‌وشەکانی‌جوانە،هەم پەردەی دەورەکەش‌ئەگیریتەوە . بو نمونە ئیمە لەم شوینەدا ئەدەبیکی پەخشان ـ کە هیچ یەکێ لەوانەی پیشو نەبیت ـ ئەخەینە بەرچاو :

« جاریکێ سەکابرای کورد ئەچن بو شوینیکي دور بو کاسبی ، چەند سالیکیان پی ئەچی و هەر یەکە سی دراوی ئەو دەورە پەیدا ئەکەنـ و

ئەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان . دنیا زستان ئەبێ ، شەوێ ڕێیان لەو کوێستانە ئەکەوێتە گوندێک و ئەبن بە میوانی ماڵێک . . زۆر ماندو ئەبن دویان خەویان لێ ئەکەوێ یکیکیان هەر چەندە ئەکا لەبەر پەژارە خەوی لێ ناکەوێ ، هەڵئەستێ ئەچێتە گوێ ئاگردانەکە ـ کە خاوەن ماڵەکە ریشە سپیەکەی شوڕ کردوتەوە بە سەریا ـ ئەمیش وەکو ئەو کزوڵە ئەکا !. کەلێ دائەنیشێ هیچیان دەنگ ناکەن . دوا جار میوانەکە ئەڵێ : « مامە بۆ چ قسە ناکەی ؟ . ئەویش ئەڵێ : « کەسی مامی ، من قسە بە پارە ئەکەم ! » ئەڵێ قسەیە بە چەند ؟ ئەڵێ بە دەپارە !. کوڕە لە بەری گران ئەبێ ، لە پاشا زۆر نامازوری قسەئەبێ ئەڵێ ها ، مامە ئەوە دەپارەو قسەم بۆ بکە ! . . پارەکەی لێ وەر ئەگرێت وپێ ئەڵێ :

« کەسی مامی ئەگەر دنیا زستان بو ، بەفر لە زەویدا بو ، ریت کەوتە شوێنێک وشەو تیا مایتەوە ، بەیانی کە هەستایت دنیا ساماڵە هیچ هەور بە ئاسمانەوە نیە بەڵام کزەبای دیت ئەگەر دەری شیان کردویت نەکەی لەو ماڵە دەرچیت تا کزە با کەی بە سەر ئەچێت ! . » . ئەمەی وت و بێ دەنگ بو ! . کوڕە وتی مامە قسە بکە . ئەویش وتی کەسی مامی من قسە بەدراو ئەکەم ! دە دراوم بدەری تا قسەت بۆ بکەم . کوڕە چاری نەما، دە دراوی تریشی دایە ، ئینجا وتی :

« کەسی مامی تا قسەیەک لێت نەپرسن خۆت لە خۆتەوە وەڵام مەدەرەوە » و بێ دەنگ بو ! کوڕە وتی مامە قسە بکە . ئەویش وتی کەسی مامی من هیچ قسەیەک بەبێ پارە ناکەم، پارەم بدەری تا قسەت بۆ بکەم !. کوڕەش تەنیا دەپارەی پێ مابو ئەویشی دایە ئینجا وتی :

« کەسی مامی ! کە شتێکت چاوپێ کەوت و بەردڵت نەکەوت لە خۆتەوە ئاگر مەگرە تا ئەچیتە بنج وبناوانیەوە » ئەمەی وت و بێ دەنگ بو ! . کوڕە وتی مامە قسە بکە . ئەویش وتی پارە بدە ! وتی نیمە ، وتی دە هەستە

بچو بنو ! . . هەستاچوە سەر جیگەکەی خوبو نوست . بەیانی لەگەل هاوورێکانیا هەستاو کەوتنە خویان کە چونە دەرەوە کوررە سەیری کرد بەفر لە زەویدایە و بەستویەتی ، دنیا ساماڵە کزەبایەکی تیژیشی دیت . بەهاووریکانی وت من نایەم ئیوەش مەررون ! لیان بو بە سەرومقت ، ئەم ئەلی نەررویین ئەوان ئەلین برروین روژ لەمە خوشتر نابی .. کوررە فیکری کردەوە وتی من ئەم قسەمە بە پارە کرریوە ئیوە کەدانانیشن و ئەررون ئارەزوی خوتانە من نایەم . .

ئەوان لیاندا رویشتن و ئەم مایەوە ، کابرای ریش سپی هات بەلایەوە وتی: روڵە ئەوە بو چ نەرویشتیت ؟ . ئەویش وتی مامە قسەم بە پارە کرریوە ! وتی باشە کەمی مایی . . زوری پی نەچو هەورە چلسکنەیەکی هیناو کردی بە کرریوەو توفیک چاو چاوی نە ئەبینی ! . کوررە حەو روژ لەویدا مایەوەو ریی لی گیرا . روژی هەشتەم دنیا خوشی کرد مالاوایی کردو لیدا رویشت . زور نەرویشت سەیری کرد وا هاووریکانی لەویدا سەرما رەقی کردونەتەوە ! پارەکەیانی لەباخەل دەرهینا وتی با بیبەمەوە بو مال ومنالەکەیان...ئەو روژە تا ئیوارە رویشت،شەوی بەسەرا هات ریی کەوتە کاروانسەرایەک لەویدا مایەوەو نوست . لە نیوەشەودا چرپە چرپودەنگە دەنگ پەیدابو . هەر بەرا- کشانەوە چاوی هەلبرری سەیری کرد وا چەند زەلامیک هەر یەکە کولیکی گرانیان پی‌یەو هاتن ، خانچیەکە خیرا هەستا چوە ئەولاوە دەلاقەیەک لە سوچی ژوری کاروانسەراکەدا بو هەلبرری زەلامەکان بە کولەکانیانەوە چونە ئەوی ئەمیش دەلاقەکەی لە سەر داخستنەوەو هاتەوە سەر جیگەکەی خوی نوستەوە ! .

بەیانی روژ بوەوەو نەبوەوە کوررە سەیری کرد وا لە دوورەوە هەندی سوار بە چەکەوە بە تاو رویان کردە ئەم کاروانسەرایەو دەورەیان داو دو کەسیان هاتنە ژورەوە و رویان کردە خانچیەکەو وتیان : ئیمەو خەزنەی

پادشا برراوە،شوین پیان هەلگرتوە تا ئێرە ، ئیستە.کی هاتوتە ئەم شوینەو کی نەهاتوە ؟ خێرا کابرایەکی تر کاروانچی لەوی بو هەلیدایە وتی : شەوی دەنگە دەنگیک لیرە هات ـ ئەم کابرایەش هەر ئەوەندەی ئاگا لی بو ـ خانچیەکە وتی هیچ نەبوەو کەس نەهاتوتە ئیرە ئەم کابرایە درو ئەکا . سوارە ـ کان گەلی گەرران هیچیان دەست نەکەوت کابرای کاروانچی یان گرت تیرو ـ پرریان لیداوبالیان شەتەکدا وتیان بی ونەبی تو ئاگات لی بە ! هەرچەندە فەریادی کرد هیچ کەلکی نەبو ! . ئینجا کە لەم هەرا هەرایە بونەوە چاویان بە کوررە کەوت وتیان تو ئیمشەو چیت دیو چیت نەدیوە ؟ . ئەویش هاتە قسە هەرچیکی بەرچاو کەوتبو بوی گیررانەوە ، ئەوانیش چون دەلاقەکەیان هەلپچری زەلامەکانیان بەکولەکانیانەوە هینایە دەرەوە و گەلی شتی تریشیان هینا کە هەموی دزیەتی بو وە ئەم خانچیەش دز دەسەک بو بویان ! . بالیان بەست و لەگەل کابرای کاروانچی و دزەکان هەمویان دایەپیش و کوررە شیان لەگەل خویان بردو چون بولای پادشا ، هەمو کارەساتەکەیان بو پادشا گیررایەوە ، پادشا ئەوانی خستە بەندیخانەو پارەیەکی زوریشی دا بەکوررەکەو بەرەلای کرد ! . کوررە چو لەم پارەیە دیاریەکی زوری بو مال‌ومنالی کری و بەرەومال بوەوە .. رویشت رویشت تاچوەوە ئاوایی‌یەکەی خویان. شەوبو گەیشتەجی لە دورەوە سەیری مالەکەی خویانی کرد قوتیلە چرایەکی تیا ئەسوتا ، تەماشای کرد وا کورریکی تازە پی گەیشتو سەری خستوتە سەر رانی ژنەکەی و سەری ئەدوزی جار جاریش ماچیکی ئەکانەوە ! . کابرا بەرچاوی تاریک بو، شیریکی پی بو لەکالانەکەی دەرهیناو برریاری ئەوەی‌دا هەرکەچوە ژورەوە بەبی قسە بە شیریک ژنەکەی وکابرا بکوژیت. . زور بە پەلە چو تانزیک مالەکە بوەوە لەوی هوشیکی پیا هاتەوەو قسەی کابرای ریش سپی فیکر کەوتەوەو پەشیمان بوەوە . شیرەکەی کردەوە بەکالانەکەیاو بە بی کەنینەوە چوە مالەوە .

ژنەکە چاوی بە میردەکەی کەوت سەری کوررەکەی - کەنوستبو - لە سەر رانی داناو هات بە پیشوازی میردەکەیەوە ، داینا و بە دەوریا هات و نازوشتی بو هینا و لە پاشا کەوتنە قسەکردن وپرسی ئەو کوررەکیە ؟ ژنەکەش بەپیکەنینیکەوە وتی نایناسیتەوە ؟ . ئەوە کوررتە ! . پیاوە هەستا چوماچی کردەوە وگەلی شوکری خوای بەجی هینا ، کوررەش خەبەری بوەوە هەستا دەستی کردەملی باوکی و بەیەک شادبونەوە . »

تەماشا ئەکەی ئەم پارچەیە شیوەی جورە ئەدەبیکی پەخشانی کوردی بە لیمە پیشان ئەدا ، چە لە لایەن مەعناوە چە لە لایەن وشەوە جیابیکی زوری هـــەیە لەگەل ئەو ئەدەبی شعری و پەخشانەدا کە لەم دەوری دوابیەدا کەوتونەتە سەر کاغەزو نوسراونەتەوە . ئەو کەسانەی دەماودەم ئەم جورە ئەدەبانەیان گیراوەتەوە هەر چەندە مەعنا کەی دەسکاری نەکراوە بەلام دورنیە وشەکانی زیادو کەمی بەسەرا هاتبی لەگەل ئەوەش سەیر ئەکەی بە ئاشکرا ئەدەبیکی « اتباعی »ت بەرچاو ئەکەوی و بەرزتر ئەدەبیکی پەخشان ئەخوینیتەوە

لەبن دەست ئەمەوە دەورەی ئەدەبی شعری هاتوتە پیشەوە ، ئەدەبی شعری لە سەرەتادا با ، مەعنا کەشی گران بوبیت لەلایەن وشەوە هەر زور سادەبوە ، چوار خشتەکیەکانی « بابە تاهر »و شعرەکانی پیری شالیار ئەمەمان پیشان ئەدەن .

## دووری دووەم لە ئەدەبی کوردی

تا ئەم شوینە قسە لەو ئەدەبانەی کوردیەوە کرا کە بەپی رەوشتی مەعنای ئەدەبەکە میژوی ئەگەرریتەوە بو پیش ســەدەکانی ناوەراست و پیش ئیسلامەتی ، بە تایبەتی لە باسی بەراورد کردنی ئەدەبی کوردی و غەیری

کوردیەکەدا هەر شتێک کە لەویدایە لە ئەدەبە پەخشانەکەی ، ئەوە گومانی تیدا نیە کەبو ئەو میژوە ئەگەڕێتەوە ، بەلام لەبەر هەندی ئامانجی تایبەتی کتیبەکە ئیش واهاتە پیشەوە کەدەوری دوهەم و سیهەمی ئەدەبی کوردی دەوری یەکەمە کە گرتگاو لە نوسینا بیکا بەدو پارچەوە ، ئەمەش وەنەبی زیانیکی زور بە باسەکەمان بگەیەنی چونکە توزی لە دەوری ئەدەبی یەکەم تی گەیشتین و بەر کولیکمان لی خوارد ، لە پارچەکەی تریا بە تەواوی تی ئەگەین .

لەم دەوری دوهەم و سیهەمەدا ئەدەبی شعری هاتە پیشەوە ، لە بن دەست ئەمەوە ئەدەبی پەخشانەکەش لە دەوری سیهەمدا زیاتر باوی سەندو کەوتە ناوەوە ، هەتا دەورەی یەکەم بو ئەدەبی پەخشان وەکو ئەفسانەی لی هاتبو ، لەم دو دەورەدا بەتایبەتی دەورەی سیهەم لەو ئەفسانەوە بو بە روژنامە .

دەورەی دوهەم و سیهەم لەبەر ئەوە تانوپوی یەکن بوون بە تی هەلکیشی یەک لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە چونکە میژوەکانیان دیارە بالەم کتیبەدا تیکلاوی یەکیش بوبیتن هەر ئاشکران و پیاو بەلی وردبونەوە لیان تی ئەگا ، کەوابو ئەگەر لە نوسینیانا بەندیان بو دانەنری وەنەبی زیانیکیان پی بگا یا ئەوە بگەیەنی کەدەورەکەیان تیک دراوە .

* * *

وتمان لە دەوری دوهەما ئەدەبی شعری هاتە پیشەوە ، لە پیش باس کردنی مەعنای شعردا جاری با ئەوە بخەینە بەرچاو کە گویا ئەم زمانی کوردیە لە دەمە دەمی داهــاتنی ئیسلامەتیدا شعری پی وتراوەو شعرەکانیش ماونەتەوە . ئەمەش بەقسە : پارچە چەرمیک لەم سالانەی دواییەدا لە ئەشکوتەکانی « جیشانە » و « هەزارمیرد »ی سولەیمانیدا دوزراوەتەوە چەند شعریکی بەزمانی کوردی تیدا نوسراوەتەوە . گویا لەو سەردەمەدا کە عەرەب ولاتی کوردەواری دا ئەگا و کوردوستان ئەگا بە ئایینی پیروزی ئیسلام ئــەم شعرانە چونیەتیەکی ئەو دەورە ئەگیرینەوە .. ئەمەش پاسایەکی تەبیعیە هەر

قەومیک چوە شوینیکەو ئەو شوینەی گرت دانیشتوانی شوینەکە هەتا یەکی دو نەوە لەوانەیە عەنعەناتی پیشوی خویان هەر لەبیر ناچیتەوە ، چە لە روی رەوشتی ئایینیەوە چە لە روی رەوشتی زمان و کومەلایەتیەوە . جا لەبەر ئەمە ئەو شعرانە وەکو چون بەلـگەیەکە بو زمان و ئەدەبەکەی کوردي هەر وەها روشتەیەکیشە بو ئایینی ئەوە پیشیان !:

ماوەتەوە سەر ئەوە ئەم شعرانە کە من لیرەدا باسی ئەکەم و هیناومە بو بەلـگەی شعر و ئەدەب و زماني کوردی لە دەوری دوەمەی ئەدەبي کوردیدا ناتوانم بچمە ژیری بلیم بونەکەی راستە یا راست نیە ، چونکە نە خوم ئەو پارچە چەرمەم دیوە کە ئەم شعرانەی لی نوسراوەتەوە وەنە لە قسەی روژەلاتي ناسیکیشدا بەر چاوم کەوتوە ، بەلـکو تەنیا قسەیەکە ماموستا ( رشید یاسەمی ) لە لاپەرە (١٢٩) ی کتیبەکەیا ( کورد ) باسی ئەکا ، ئەویش بەبی ئەوە بیگەیەنیتەوە بەکەسیک یا بەسەرچاوەیەک . قسەکە هەر ئەوەندەیە ئەگەر ئەم پارچە چەرمە بوبیت هونراو و زمانیکي زیاتر لە هەزارو دوسەد سالی کورد بە ئیمە پیشان ئەدا . . شعرەکان ئەمەیە :

( هورمزگان رمان ئاتران کژان * ویشان شاردەوە گەورەی گەورەکان
زورکار ئارەب کردنە خاپور * گنای پالەیی هەتا شارەزور
شن و کنیکان وەدیل بشینا * میرد ئازا تلي وە روی هوینـا
رەوشت زەردشترە مانوە بی‌کەس * بزیکا نیکا هورمز وە هیو چ کەس )

واتە : مزگەوتەکان ویران کران و ئاگرەکان کوژینرانەوە ـ مزگەوتی ئەو وەختە مەبەست مزگەوتی ئیستە نیە بەلـکو پەرستشگاو ئاتەشکەدەی زەردەشتي مەبەستە ـ ... خویان شاردەوە گەورە گەورەکان ... زورداري و جەوري عەرەب ویرانیان کرد ... دیهاتی کریکارەکان تا ئەکاتە شارەزور ... ژن و کچەکانیان بەدیل برد ... پیاوی ئازا تلي ئەدا لە ناو خوینا ... رەوشتی زەردەشت بە بی کەس مایەوە ... بەزەیی نایەتەوە ئاهورامزدا بە هیچ کەسیکا .

دیسان هەر بە قسەی ماموستا رشید یاسەمي گویا یەکیک لە مغانەکاني زەردەشت لە هەورامان بوە ناوی «پیری شالیار» بوە . کتیبیکي لە شوین بەجی ماوە ناوی «ماریفەتو پیری شالیار» ە . ئەم کتیبە بەند بەندە، زورتری ئاموزگاري و قسەی نەستەقە . لە بەین هەمو بەندیکا ئەلی :

گوشت جەوانەی پیر شالیار بو * هوشت جەکیاستەی زانای سیمیاربو

واتە (گویت لە قسەکاني پیری شالیار بیت و هوشت بە نوسراوی زانای سیمیارەوەبی ـ کە زەردەشتە ـ ) جا لە بەندەکانا ئەلی :

داران گیان دارن جەرگ و دل بەرگن * گالی پرر بەرگن، گالی بی بەرگن

کرگە جە هیلەن ، هیلی جە کرگن * رواس جەرواس، ورگی جەورگن

واتە (دارەکان گیانیان هەیە جەرگ و دلیان ریشەو بەرگە ... هەندی جار بەرگیان هەیە، هەندی جار بی بەرگن ـ مەبەست بە بەرگ گەلایە ـ ... مریشک لە هیلکەیەو هیلکە لە مریشکە ... ریوی لە ریویەو گورگ لە گورگە . ) ...

لە بەندیکی تریا دیسان ئەلی :

«وەروی وەوارو وەرو وەرینە * وەزیسە برریو چوار سەرینـــە

کرگي سیاوەو هیلیش چەرمنیە * گوشلی مەمریو دوی بەرینە» واتە :

(بەفری ئەباری بەفر خورە . . گوریس کە پیچری جوار سەیری هەیە ... مریشکي رەش هیلکەی سپیە . . دیزە کە بشکی ـ مەبەستی ئەوەیە بنەکەی لی ببیتەوە ـ دو درگای لی پەیدا ئەبی ) ... ئەم پیری شالیارە ئەو پیری شالیارە نیە کە لە ئاخرو ئوخری سەدەی پینجەمی هجریدا بوەو لەگەل عبد القادری گەیلانیدا هاو چەرخ بوون . ئا ئەم پیری شالیارەش هەر لە هەورامان بوەو لەخەوا پیغەمبەری دیوەو مسلمان بوە لەپاشا ناوبانگی مسلماني دەرکردوەو لەگەل عبدالقادردا ئاشنایەتي روحي یان پەیدا کردوە . بەلکو ئەمەی ئیمە ئەیلین گەلی پیش ئەوکەوتوە .

لیرەدا ئەم قسانەی پیری شـــالیار وەکو بو ئەوە ئەشی کە باسی ئاینی پیشوی کورد بکا بو ئەوەش ئەشی کە ئەدەبیکی کوردي لە دەوروبەری هەزار سالی لەمەو پیشتر بو ئیمە ئەگیریتەوە .. مایەوە هەر ئەوەکە بەکیک بلیت : هەورامان بەکیکە لەو شوینانە کە هەندی لە روژەلاتي ناسەکان ناویانـــ بە « گوران » ئەبەن و گویا کورد نین ! . ئیمەش ئەوە بو لە باسی « کورد » دا وتمان ئەم قسەیە هەر لە بناغەدا هیچ بنچینەیەکي نیە چونـکە کوردو گوران هەریەکن و هیچ جیاوازیەکٹ لە بەینیانا نیـــە . ئەتواني سەیری لاپەررە ( ٤٤ ـ ٤٥ ) ی ئەم کتیبە بکەیت .

* * *

ئیمە لە باسي « میژوی ئەدەب » دا ئەوەبو وتمان : « مەبەست عیلم و زانینیکە کە باس لە چونیەتی لوغـەتوزمان وشتی جوانەوە ... بکا » . دەی بەپی ئەم قسەیە ئەگەر راستت ئەوی دەوري ناوەراستی ئەدەبی کوردی زور تاریکە،چونـکە لە دەوری یەکەمدا چیروکٹو ئەفسانەکانمان بو بوبە بەلـگە، کە کەوتە دەوری دوهەم دەوري شعر داهات ، لەم دەورەدا ئەدەبي وشەی کوردي وەکو ئەدەبی وشەو مەعنای ئاوروپا لەسەدەکانی ناوەراستدا پەردەی تاریکي بە سەرا کشا ، بویەش ئەمە رویدا چونـکە وشەی عەرەبي بە هوی ئاینەوە کەوتە ناوەوە و کەوتە شعرەوە ، وشەی شعر زورتری بو بە وشەی عەرەبي ، هەرچەندە مەعنا مایەوە بەلام جەوهەری ئەدەبی زمانەکە تیکدرا ، ئەدەبی بەخشان کەم بوەوە و رەنـگو بویکی نەما ـ کە ئەلیم نەما مەبەستم ئەوەیە لە سەر وشەی ساغی کوردي ئەگینە مەعنا هەبو بەلام بە کوردي بەتی نە ئەهاتە ناوەوە ـ هونراو کە زمانی خەیال بو زال بو بەسەر بەخشانا کە زمانی ئەقلە !

لەگەل ئەمەشدا ئینکاری ئەوە نا کری کە لەبەین زمانەکاني روژەلاتدا ئەوی بە بی‌وەی‌تر مابیتەوە لە دەست زماني عەرەبي لە هەمویان زیاتر زماني

کوردی‌یە ، چونکە سەررای ئەوە کە زمانی قرآن‌نیشت بەسەر زمانەکانەوە وە سەررای ئەوەکە لەم ماوە دریژەدا هەر لەژیر چەپوکدا بوە لە چاو زمانەکانی‌تردا گەلی بەپا کژیتر و خاوینتر ماوەتەوە - دیارە ئەمە شانازیەکی زور گەورەیە بو زمانی کوردی - گەلی لە زمانەکانی روژەلات کە خاوەن کەیان و دەولەتیش بوون لە خوپاراستنا هەر نەگەیشتونەتە زمانی کوردی .

# هونراوە شعر

بەلی‌هونراو دەزگایەکە بو ئەوە پیاو مانەای لەخەیالیکی نازک‌بی بدانەوەو عاتفەی خوینەر وەکو کارەبا راکیشی . بەلام لەگەل ئەمەش لەبەر ئەوە هونراو جور جورە تەعریفیکی‌تری هەیە لەم تاریفە دریژتر ، ئەمەش لەم دوایەدا زیاتر ئاوروپاییەکان ئەمەیان بو دوزیەوە . وەکو ئەوە کە قەرەنسزیەکان هونراو ئەکەن بە سە جور وە هەر یەکە چەند لقوپوپیکی لی ئەبیتەوە ، ئەبکەن بە .

« هونراوی شەررو شورر - مەلاحم ، هونراوی گورانی - غنائی ، هونراوی لاسایی - تمثیلی » . هونراوی شەررو شورر ناوی خوی بەخویەیەیە، لە پیشا کارەساتی خواکانی ئەگیرایەوە لە پاشا کە دەوری ئەو خوایانە بەسەرچو بررا بە سەر نەبەردی پالەوانان و هەرای جەنگیدا .. ئەمەیان لە کوردیدا وینەی زورە ، یەکی لەوانە شەرری « شەمال‌و زەلان » ە . کە لەشکری شەمال و لەشکری زەلان - رەشەبا - لە ئاخروئوخری زستانا کە هیشتا بەفر نەچوەتەوە بەرامبەر بەیەک ئەوەستن و سوارەی خویان برربرر ئەکەنەوەو ئەینیرنە سەر شاخەکان و بەیەکا دین ، لە پاش کارەساتیکی زورو جەنگیکی گەورە زەلان ئەشکی‌و شەمال بەفر ئەتوینیتەوە . ئەمە نمونەیەکە و هونراوانە :

شەماڵ - « تیپێکی هەنارد بۆ کێنی گاوران
ماشەاللە شەماڵ وەک شێر گەینەرران

تیپێکی هەنارد بۆ ملە مرواری * ئافەرین شەماڵ خۆت کرد دیاری
تیپێکی هەنارد بۆ مزگت میرزا * هوشت بێ زەلان نەتگری وەسزا . »

ئەم داستانە کارەسات و ئەفسانەیەکی خەیالیە ، خاوەنەکەی نازانری کێیە وەلە چە وەختێکا دانراوە ؟ هەندیک ئەڵێن هی « میرزا شەفیع » ە بەڵام وانیە چونکە بەگەلێ زەمان لە پێش میرزا شەفیعا بیسراوە . ئەوەندە هەیە نرخیکی تاریخی زور گەورەی لە ئەدەبی شەررو شورری کوردیدا هەیە .

هونراوی گورانی - ئەم هونراوە سەرەتا کە داهاتوە لە گەڵ بلویرو دوزەلەدا ئەوترا ، لە پاشا وای لی هات هەر شعری کە تەعبیری لە عاتفە بدایەتەوە وەکو غەزەل ، مەتح ، لاوانەوە و شانازی پیان ئەوت شعری گورانی . ئەم جورە شعرانە تا ئیستە لە ناو کورددا بەم چەشنە تەعریف نەکراوە ، واتە شعری غەزەلو مەتح بە شعری گورانی نەزانراوە ، بەلکو گورانیان هەر بە شعری بەستە وتوە . . جا ئەگەر بەم مەعنا علمیەی فەرەنسزیە مەعنا لە شعری گورانی بدریتەوە شعری کوردی زورتری بەر شعری گورانی ئەکەوی .

هونراوی لاسایی - ئەم هونراوە لەم ئاخرەدا فەرنسزیەکان ئەم ناوەیان بودانا ئەگینە لەپیشا ئەم ناوە نەبو ، چونکە لاسایی ئەگەر راستت ئەوی شعرەشەررو شوررو گوررانیەکانە بەلام لە بەر ئەوە هونەر- فنیکی- تیدایەو یەکەی یەکەی پیاو ئەگریت لە لایەکەوە لە لایەکی تریشەوە چاری تەنگوچەلەمەی نەفسی و کومەلایەتی و ئایینی و خووروەوشت ئەکا گویا لە مەسالەکیا لەوان جیا ئەبیتەوە ، جا بەم بونەوە ئەم ناوەیان بودانا . هونراوی لاسایی بەم مەعنایە لە ناو کورددا نەبوە مەگەر لەم دواییەدا نەبی کە « بی کەس » و « گوران » ئەم ئاگرەیان هەلگیرسان .

کورد لە شعری شەررو شورر - کە شعری چیروکیشی پێ ئەوترێ - وە لەسەر تەعریفی فەرنسزیەکان لە شعری گورانیشدا بەئەندازەی دەسەلات تیایا دەولەمەندە . مەبەست ئەوەیە باسیکي گرتوەو کردویە بە شعر ، ئیتر ئەوەمان مەبەست نیە کە سەرچاوەی باسەکە لە کورددا بوبیت یا نە بوبیت . من لیرەدا ناوی هەندیکیان دینم بەلام هیشتا خاوەنەکانیانم بوساغ نەبونەتەوە .. ئەمانەش ئەگەر لەسەر تەعریفی ئەوەل بێ ئەوا هەمو شەررو شوررن ، وە ئەگەر لەسەر تەعریفە عیلمیەکەی فەرەنسەبی هەندیکیان شەررو شوررنو هەندیکیان گورانی لەگەل لاسایی‌دا . . ئەمانەش وەکو :

( ١ ) ـ کتیبی « خورشیدوخاوەر » بەپێ هەندی‌شت دورنیە خاوەنەکەی لە نیوەی دوایی سەدەی هەژدەهەما ژیا بیت ( ٢ ) ـ «لەیلی‌و مەجنون » دورنیە ئەمە هی مەلاوەلەو خان شاعری بە ناوبانگی جافان بیت . مەلافرجی واژەیی‌ش بەدەستکاریەوە فارسیەکەی « نظامی » لە ١٩٤٢ دا کردوە بە کوردی . ( ٣ ) « شیرین‌و خەسرەو » ، ( ٤ ) « شیرین وفەرهاد » کە خانای قوبادی وەری گیرراوە . ( ٥ ) « بارام وگولەندام » دورنیە خاوەنەکەی لە سەدەی هەژدەهەما ژیا بیت . (٦) «حەوت خوانی روستەم» (٧) «روستەم‌و زوراو » . ( ٨ ) « جهانگیرو روستەم » ( ٩ ) « خاوەران » باسی هەرای عەلی کوردی ئەبی تالب ئەکا . ( ١٠ ) « حەحەنیفە » لە ١٨١٣ نسخەیەکی لی نوسراوەتەوە ئیتر نازانری خاوەنەکەی لە چە تاریخیکدا داینلوە . ( ١١ ) « نادر و توپال » باسي شەررەکەی نادر شاو توپال پاشای عوسمانی ئەکا لە مارتی ١٧٣٣ دا ئیتر . جا کتیبەکە ، کەی دانراوە نازانری . ؟ ( ١٢ ) « جەنگنامەی شازادە محمد عەلی میرزاو کەهیا پاشا » میرزای کرندی لە ١٨٢١ دا نوسیویەتی‌و باسی سەرکەوتنی محمد عەلی میرزا ئەکا بە سەر کەهیا پاشادا[1] . وادیارە شوینی جەنگەکەش زەهاو بوبیت ( ناوی ئەم کتیبانە

---

( ١ ) کارەساتی ئەم جەنگە لە « ١٧٩٨ » دا رووی داوە .

تا ئیره له قسه‌ی مینورسکی وه‌رگیراوه ) ( ١٣ ) « جه‌نگی کوله‌و عاینه‌مه‌ل » ( ١٤ ) « وه‌ره‌ق و گول » . ( ١٥ ) « درختنامه » . ( ١٦ ) « برزو وفلامرز » ( ١٧ ) « به‌وری بیان نامه » . ( ١٨ ) « مه‌نیجه و بیژه‌ن » . ( ١٩ ) « قاره‌مازو قه‌یته‌ران » . ( ٢٠ ) « خه‌زال و کاکلاس » . ( ٢١ ) « به‌هه‌نه‌سا » . ( ٢٢ ) « روستەمو زه‌رده هه‌نگ » . ( ٢٣ ) « کورد و گوران » . ( ٢٤ ) « عه‌تانامه » ئه‌مه شاعریکی کوردوستانی له‌م سالانه‌ی دواییدا داینا‌وه . ( ٢٥ ) « شیرین و شه‌فی » شه‌فی پیاویکی شاعری ده‌نگ خوش بوه ، شیرین ئافره‌تیکی جوان بوه له دوره‌وه دلی له شه‌فی چوه ، که چوه و چاوی پی که‌وتوه زور ناشیرین بوه گه‌رراوه‌ته‌وه . ئینجا شه‌فی دلی لی‌چوه‌و به شوینیا هاتوه . شیرین‌شعر به ده‌نگی شه‌فیدا ئه‌لی ، شه‌فیش به جوانیه‌که‌ی ئه‌ودا . ( ٢٦ ) « مزگه‌وت ومیرزا » . مزگه‌وت ومیرزا کیویکه له به‌ین خورر خورره و مه‌ریواندا . وه‌ختی خوی یه‌کی له گه‌وره‌کانی ئه‌رده‌لان مه‌لایه‌ک و چل فه‌قی ناردوته ئه‌وی ، زستان به‌سه‌را دیت هه‌مویان سه‌رما ئه‌یانکوژی ته‌نیا فقیه‌ک نه‌بی ئه‌مینیته‌وه ، ئه‌مه‌یان به شعر سه‌ر گوزه‌شتی ئه‌وکاره‌سانی مردنه ئه‌گیریته‌وه ( ٢٧ ) « ئاسمان و زه‌وی » هی میرزا قادری پاوه‌یی‌یه،دور نیه له نیوه‌ی دوایی‌سه‌ده‌ی نوزده‌هه‌ما داینابیت، ئاخر شعره‌که‌ی ئه‌مه‌یه :

( قادر وه فیدای ئه‌بروی تاقت بو * وه‌فیدای گه‌ردنم پای بوراقت بو ا. )

( ٢٨ ) « حه‌وت په‌یکه‌ر » . ( ٢٩ ) « داستانی دوانزه سواره‌ی مه‌ریواز » ئه‌مه‌یان کرده‌وه‌ی پیره‌میردی سوله‌یمانی‌یه . ( ٣٠ ) « به‌یتی جوامیرو دایکی » ( ٣١ ) « ناسرو مال مال » . ( ٣٢ ) « به‌یتی شه‌ریف هه‌مه‌وه‌ن » .

* * *

هه‌لبه‌ست له کورددا ده‌وره‌ی کونی ده‌وره‌یه‌کی زور سه‌یر بوه ، واته‌ جلین توزی له پیش داهاتنی ئیسلامه‌وه تا سه‌د سالیک دوای ئیسلام . ئه‌و

هونرلوانەی هەزار میردو جیشانە کە لەپیشا باسماز کردن ئەگەر راست بن ئەوەملن پیشان ئەدەن کە سەری بە گەلی تاپیدا کردوەو زور شوینی دبوە . ئەگەر ئەو شمرانەشمان بە دەستەوە نەبی دیسان ئیمە لەو برروایە ناخاکە شوین و مەیدانی نەدیوە ! چونکە ئەدەبی بەخشان لە هەر قەومیکا بو ، بی گوملن ئەدەبی هونراویشی تیدا ئەبی . چون نابی ؟ . هەلبەست کە سەر - چاوەکەی خەیال وجوشوخروشی دەرون بیت و ئەدەبی بەخشان یەکی بیت لە جوگەلەکانی ئەبی خوی چون بە گوررتر نەبی ؟ ؟ . . ئەمەو دیسان کورد مادام بە زەوق قسەکردنیان بوبیت لەمەوە پیویست ئـەبی کە شمریشان بوبیت . ئەوەندە جەیە دور نیە بوتری ئەم قسەیە ناچیتە سەر کە ئەلی : کورد لە دەوری کوندا هونراوی بوە ، ئەگەر بیبوایە ئەمایەوە ، بوچی ئەدەبە بەخشانەکەی ماوەتەوە ؟ — وەکو کورد خوی ئەم داوایە ئەکا ! — بوچی ئەدەبە هەلبەستەکەی نەماوەتەوە ؟ ! . .

قسەکە لە روالەتا راستە بەلام ئەگەر لی بکولینەوە ناچیتە سەر . . جاری نەمانەوەی بو ئیستە ئەوە ناگەیەنی کە هەر نەبوە ! . دوهەم هونراوی راستەقینە ئـەوەیە لە زەوقیکەوە دەربچیت کە تیکلاو بە هیچ شتیکی تر نە بوبیت بە تایبەتی بە خویندەوارییەوە . . لە پاش ئەوە کە ئیسلام داهات هەمو شـوریک کەوتە سەر شموری ئایینی ، ئایینیش ئەبوا تیکلاو بە خویندەواری عەرەبیەوە ببوایە — چونـکە زمانی ئایین بو — کە ئەم تیکلاویە پەیدا بو هەلبەست لە زمانی خویندەوارەکانەوە هەمو وەرگەررایە سەر ئایینی ، ئەوانە کە خویندەوار نەبون کەوتبونە سەر ئەو برروایە کە شمر هەر ئەبی بو ئایین بی !. خو ئەوانیش لە ریی و شوینی ئایینی تازە هیچیان لی نەئەزانی بەو بونەوە لایان وابو کە ریگەی شمر گیراوە ! . لەگەل ئەوەش هـەر بەپی زەوقی خویان شمریان وتوە بەلام لەبەر ئەوە هونراوەکان بەئایین ئاشنا نەبورن خویندەوارەکان نەیان نوسیوەتەوەو هانە هانەیەکی واشی لە سەر

نەبوە هەتا ، وەکو ئەدەبە بەخشانەکە لە سنگا بێنێتەوە ! ...

لە پاش ئەم دەورەیە دەوري ئاییني هاتە پیشەوە ، لیرەدا هەمو بە جاری دەستیان دایە . بەلی راستە ئیسلام ئاگریکی وای لە دلي بویژ - شاعرە - کانی دەوري ناوەراستی کورددا کردەوە کە شعریان لە سەر پایەی هونەر ئەوت و عاتفەیاني بە جوری بزواندەوە گەلی گەلی زیاتر بو لەو عاتفانەکە ئەفسانەو ئاییني گاور لە دلی شاعری سەدەکاني ناوەراستی مەسیحیدا کردیەوە بەلام ئەگەر راستیشت ئەوی لەباریکی تردا شعرەکاني هەمویان هەر وەکو تەختەی شەترنج ئەکەویتە بەرچاوکە مادّەی داشەکان یەکیکە - کە ئاپینە - بەلام نەسال و باسەکەیان جیایە ، داشەکان هەر یەکە ناوی گیانلەبەریکی هەیە وەکو ، شا ، وەزیر ، فیل ، ئەسپ ، سەرباز ، ئەوەندە هەیە گیانیان نیە ! . ئەمانیش لەو دەورەدا نەسالی شعرەکانی خویانیان گورربوە بەلام کە سەیری ئەکەی هەمو لەیەک تەمورەیان داوە و بە یەک دەنگ دەنگ ئەدەنەوە .. ئەمە وەنەبی هەر شعری کوردی وابیت بەلکو فارسیش سەردەمیک وابوە و عەرەبي خویشي دو سەردەم !! ..

ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی تریشەوە ئەگەر لە هەلبەستی ئاییني لاپان بدایەو بە - میسال - مەنحیات بوتایە کەس نەبو شتیان بداتی ، شاعرەکانی عەرەب مەنحی کوشکی عەباسیەکانیان ئەکرد وفارسەکان هی بەرمەکیەکان شتیان وەر ئەگرت ئەمان مەنحی کی بکەن ؟! . بە ناچاری پالیان ئەدا بە ئاپینەوە وەلایان وابو دنیاکە خراپ بوە ، کەوتبونە سەر ئەو باوەررە کە دنیا تیکچوە بە ئاپین نەبی رزگاریان نایە ! ..

ئەو شتانە کە لەگەل وردەکاري نەفسي و عاتفەی نهینیدا ئاشنایەتیان هەیە بویژاني کوردی ئەو دەورە و تەنانەت دەوری سیەمیش زور تیایا بەرزبوون . خو ئیجگار لە سەدەی هەژدەهەم بەملاوە جورە باوەرریک روی کردبوە شاعرەکاني کورد کە هینەکاني پیشوو گەلی لیوە دور بون . .

لەم دەورەی سیھەمەدا شعور تا ئەھات نەخشەیەکی‌تری وەر ئەگرت . راستە کورد ھەر چەندە شەعبیکی سیاسی‌نەبوون بەلام لەم تاریخە بەدواوە ـ وەکو ئەدەبی ئنگلیزی‌و فەرەنسی لەم تاریخەدا ـ خوی لە خوبەوە ئەدەبەکە مەیلی بەلای قەومیەتەوە ئەکرد . دیسان ئەمەش راستە کە گەلی لە شاعری ئەم دەورە بەدواوە ھەر نەیانزانیوە قەومیەت و مەعنای قەومیەت چیە . بەلام چونکە شعور بلاو بو بوەوە کە سەیری ئەدەبەکەی بکری دووشتی لی وەر ئەگیری ، یەکی مەیلی قەومیەت ، یەکیکیش ئەوە کە شاعر بەجوریکی غەیر مباشر توشی‌ئەم مەیلە بوە . شاعری واشت ھەر لەم دەورە بەدواوە بەرچاو ئەکەوی کە ئاگری کردوتەوە . ھەروەھا لە ئەدەبی شاعرەکانی دەوری سیھەمی کورددا وەکو ئەدەبی ئەلمان لە سەدەی ھەژدەھەمدا مەیلی سەر ـ بەستی روحی کردوە بو تاک ـ فەرد ، بە نەیسەت ئەدەبی روحی‌ش سەر ئەکیشی بو ئەدەبی سیاسی‌و کومەلایەتی ..

ھەر لەم دەوری سیھەمەدا دیسان لەوانەیە بویژەکان بوون بەسە بەشەوە بەشیکیان ئیجگار خوی بە وشەوە ماندوکردوە بو ئەوە بەدەنگی زەنگی وشەکانی گوی بزرنگینیتەوە ، ئەم بەشەیان «نالی» یەکیکە لەوان ، گویا گەرراوەتەوە بو سەدەی حەڤدەھەم بو « شەمپانیا » لە فەرەنسە بولای « لافونتین » ی شاعر ، یا ئەو ھـاتبیتە « خاکو خول » بولای نالی ! .. بەشیکیان ھەمو ئامانجیکیان دەربرینی مەعنا بوەو ھەمو کوششیکیان خستوتە سەر مەعنا . شاعرە بەرزەکەی کورد « مەولەوی » لەما.. ، تو بلیت گەررابیتەوە بو سەدەی ھەژدەھەم بولای ( ڤولتیر ) شاعری بەرزی پاریس یا ڤولتیر ھاتوە بو تاوەگوز بولای مەولەوی ؟؟ ! بەشیکی‌تریشیان خەریکی روحی‌ئازاوەوبەلاملردانی پیاوەکانی‌مزگەوت بوون،یەکیکە لەم بەشە « بی‌کەس » . نابی ئەمیش گەرابیتەوە بو سـەدەی ھەژدەھەم بولای

(روبرت بیرنز) شاعری (اسکتلەندە) لە(ئەبەر)؟ یا خود ئەو هاتوە بولای بی کەس لە سولەیمانی لە گویژە؟!

* * *

بە جوریکی تیکرایی بویژەکانی کورد ـ هی هەر سە دەورەکە ـ من لەو باوەڕەدام بیجگە لەو شەپولانەکە بەسەریانا هاتوە هەوای ناوچە کاریکی زوری تی کردون . ئەگەر خویندەواری بو شاعر شەرت بیت بویژەکانی کورد بیجگە لە بەشیکی کەمیان هیچیان ئەو خویندەوارە نەبوون ـ نە لە کونا نەلەتازەدا ـ کە بە پشلیوانی خویندەواریە کەیان بگەنە ئەو خەیالانەکە دەریان بڕیوە ـ دیارە مەبەستیشمان بەخویندەواری ئەدەب وخویندنی تازەیە ، لەگەل ئەوە کە زوریکی زوریشیان هەر بەجاری هیچیان نەخویندوە کەچی سەیر ئەکری بەرزی فیکرەکەیان ئەگەر لە شاعری قەومەکانیتر بەرزتر نەبی وەکو ئەوان هەر ئەبی جا با ئەوان سوچیکیان گرتبیت و ئەمان سوچیک ئەمەیان شتیکیترە . . زور لە بویژەکانی کورد لە کویرەدییکدا تەنیا ئاسمانی گوندەکەی خویان نەبی هیچ شوینیکیتریان نەدیوە کەچی بازی خەیالیان گەلی قوژبنی تاقی کردوتەوە . ئەمە بیجگە لەوە کە کارەسانی ئاو و خاک نەبی هیچیتر بە پیاو نیشان نادا ! . وەکو ئەوەژنیکی مەنمی کە بە دریژایی ژیانی تەنیا ناوچەی مەنمی نەبی هیچ شوینیکیتری نەدیوە وەلەوا ـ نەیە هەر نەی بیستبی شعر چیە وە بەچی ئەلین . دبنی بە زمانیکی ساویلکە «عەزیز» و «تەکش»(١) ئەلاوینیتەوە وئەلی :

---

(١) عەزیزو تەکش دوبرابون ، کوڕری محمدی کوڕری میران بون ، خویان مەنمی بون لە ناو عەشرەتەکەدا بە میرانی ناوبانگیان سەندبو ، ئازایەتی ئەم دوبرایە لە هەمو توپی مەنمی و گەلواخی و گەروسدا ناوبانگی دەرکردبو ، لە سالی ١٣٣٩ ی هجریدا هەر دوکیان لە شەڕری عەجەما کوژران ، گوڕرەکەیان لە (یەنگی یەرخ)ە لە نزیک دیواندەرەی سەقزەوە .

« ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ...

دەن لە سە تەپلە وەمل ئەی شاندا * هەرەسی با ، بای وەمل گوراندا

سوارەل مەئمی سەف بوون وەجەم * سەر عەزیزدەرکەن لە لەشکەرعەجەم

عەزیز وەلاکەل ، تەکی وەهەفتیر * ها وەختە بیو حەسەن خو لە شوبر

ماینەکەی تەکی لە وەستان نایی * لەشکەری مەئمی هیچ دوایی نایی

... ... ... ... ... .. ... ... ... ...

بالونی واهـــات لە تارانـــەوە * خول ئەخوارد وەدەورعەزیزخانەوە

بومبـــای بەر بو لەو بالدارەوە * عەزیز زامار بو وە سەد سوارەوە

عەزیز بوچ دەنگت نایت لە مەیدان؟ * سەنگەری سەرپیل پریە لە ئیران

وە گولەی وەرشـــەو دریا لە بالم * عالەم نەشرەفتن ئیمشەو لە حالم

... ... ... ... ... ... ... ... ... ...

کی سواری بوی کویتەی کەفەل پان * کی تالان بیری لە ملك تاران ؟

... ... ... ... ... ... ... ... ... ...

بیژن وە خازی خوی بدا لە تەخت * عەزیزو تەکی چون وە پایتەخت

دەرزیەکەی یەخەی بنیری وەلام * شەوسو ئەم حەلە ئەمکەن وە نەملم

بیژن وەدایکم سەرەکەی رەش کا * لە تەکی برا کەم مالەکەی بەش کا ! »

بەلی ئیمە نالین کە ئەم جورە شعرانە لە هەمو سوچیکەوە بەرزن بەلام ئەتوانین ئەوە بلین کە بو دەمویلی ژنیکی چول گەردی حەرف نەناس لەو بەرری جوانیەوەیە کەوا بەم جورە شریتیکی سینەما بخاتەکار وە لەمەوە زەوقی کوردیکی دەشتەکی پیشان بدا .

# بۆچ هۆنراو بە شێوەی هەورامی وتراوە؟

شتێکی‌تر ماوەتەوە پێویستە لێوە بدوێین، بۆیە قسەی لێوە بکەین چونکە زورتر لە روژەلاتی ناسەکانی خستوتە تەنگو چەلەمەوە وەکو دلی کوردەکە خویشی کرمی کردەوە ! .

لەوە نادوێین کە بلێن کوردو گوران هەر کوردن ، چونکە قسەمان لەمەوە کردوە ، ئەمینێتەوە سەر ئەوە ئایا بوچی زورتر لە سوراخەکانی کورد ـ بە تایبەتی سوراخی ئەدەبی ـ هەر بە شیوەی هەورامی بوەو هەورامی‌یە ؟ . کەچی شتێکی وا بەشیوەی ئەردەلان و شارەزور بەرچاو ناکەوی ؟! . لەم رووەوە باوەرری من ئەمەیە :

کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە لە باری ئەدەبی‌دا تیکلاو بوە یا لەگەل روم و فارسدا وەیا لەم ئاخرەدا لەگەل تورکدا ، هەرچی دەستەی خوێندەوار بوە یا سەربەخو ئاشنا بوون بە بارەگای پادشاکانی تورک و عەجەم ، یا نزیک بوون بە کوشکی ئەو خانەدانە کوردانە کە ئەوان هاتوچوی بارەگاکانیان کردون . بە یاسای تەبیعەت بەو لەو زەمانەدا ئەبێ کە پادشا قسەی پێ ئەکاو پێ کردوە ، ئەو زمانە بە ئەدەب پیهان دراوەو پیهانـ ئەدری کە پادشاو خاوەن ولات قسەی پێ کردەوە و پێ ئەکا .. بە درێژای زەمان ئەم زمانانە لە هەر زمانی کورد سورراونەتەوە ، بە جورێک شعوری داپوشیون تەنانەت ئەوەیان بەدلا نەهاتوە کە زمانی خویشیان ئەگونجی ببی بە زمانێکی ئەدەبی !.

شعری فارسی وتورکی لە دیوانخانی ئەو کوشکانەوە بلاو بوتەوە ، هەر وەها شعرو ئەدەبی عەرەبی‌ش بەهوی ئیسلامەتیەوە لە مزگەوتەکانەوە تەنیوەتەوە .

دیارە شعرو ئەدەب لە هەر زمانێکا کەتو بیگریت ئەبێ ئەو کەسە لێ ئی بگا ئەو وەختە ذەوقی بو بەرێت، ئەوەکە تەنیا تێ‌گەیشتن‌بەلکو هەمو سوچێکی ئەبێ بزانێ . لێرەدا رەمەکی مەردم ـ یەعنی نەخوێندەوارەکان ـ نەیانتوانیوەو

نەیانزانیوە لە کونو قوژبنی زمانیکی وەکو فارسی یا تورکی یا عەرەبی بکەن هیچ دەمیان بو نەبردوە وە بیرلای برلای ئەوەشیان بەدلا نەهاتوە کەبەو زمانەی خویان قسەی پی ئەکەن ئەتوانن شعرو ئەدەب بلین وە ئەگەر بە دلیشیانا هاتبیتو وتبیتیان — وەکو هاتومو وتویانە — بەرەی خویندەوارەکان - کە ئەوان ئەدەبیان بە زمانی بیگانە زانیو چونکە زانیویانە - گالتەیان پی کردونو پیان وتون ئەمانە ( شایەر ) یا ( دەلو ) ن ا . بەم بونەوە ئەدەبی خاوینی ئەسلی زمانەکە پاش کەوتوە .. مەبەست بەم قسەیەمان لە بەینی ئەردەلان ، شارەزور ، موکریاندایە ، واتە کوردی ئەم شوینانە بیجگە لە هەورامان شیفتەی ئەو زمانانە بوون .. مایەوە سەر هەورامان

هەورامان شوینیکی شاخ و داخو وشکە نەفارس خوی بو کوتاوە زور نە روم ، نە عەجەم بەتەنگیەوە بوە نە تورک ، بەم بونەوە پیاوەکانی ئەوی ئەوەندە ئاشنای بارەگای پادشاکان نەبوون بەجوریکی وەها کە زمانی ئەوان سوار زمانەکەیان بیبت . هەر کە دەرونیان هاتبیتە جوش بەزمانەکەی خویان دەریان بریوە ، لەمەوە رەمەکی مەردمەکەش فیر بوون کە هەر لە دەوریکی زور کونەوە شعرو ئەدەبیان بە زمانەکەی خویان وتوە ، کە عەرەبیش لە مزگەوتەکانەوە سەری هەلدا ئەدەبی زمانەکەی خویانیان بە میراتی هەر بو مابووەوە ئیتر خویندەواری مزگەوتەکان بزیان لی نەئەهاتوە ، بویەش بزیان لی نە ئەهاتەوە چونکە کابرا لە پیش ئەوەدا بچیتە مزگەوت گویی لە باوک یا لە مامە نەخویندەوارەکەی بوە کەبە زمانەکەی خوی هەلبەستی بە سەرا هەلداوە ، ئەمە بیجگە لەوە کە دایکی لە بیشکەکەدا هەر بەو شیوەیە لایەلای بو ئەکرد ئەمە لە مالا ، کە ئەچوە دەریشەوە لە سەر هەلپەرکی ، لە سەرکانی ، لەبەر بەربوچکەدا هیچی تری گویی لی نە ئەبو تەنیا هونراوی زمانەکەی خوی نەبی . ئەمانە هەمو کردیانە کاریکانی کە دەستیدا بە خویندنی

فارسي یا عەرەبي یا زمانیکي تریشەوە ئەدەبي زمانەکەی خوی هـەر بە ئەدەب بزانی . . .

ئەمە ئەمان تیکررا بە خویندەوارو نەخویندەوارەوە ئاشنا بوت بە ئەدەبی زمانەکەی خویانو فیری بون ، ئینجا بەرەی خویندەوارەکانیان بەدەم خویندنەوە پەررەوازە ئەبون بو ولاتەکانی ئەردەلان و شارەزور و موکری ، لەوی شمرو ئەدەبی شیوەی قسەکردنی خویانیان ئەخویندەوە بو مەردمی ئەو ولاتانە ، مەردمەکەی ئەوی‌ش تەماشایان ئەکرد ئەم ئەدەب و شمرە جورە شیوەیەکە لە شیوەکەی خویان ناچی،لەبەر ئەوە شموري ئەدەبی بیگانەپەرستی بەجاری کشابو بە سـەر هوشیانا ئەو شیوەیەشیان هەر بە بیگانە ئەزانی چونکە لە هینەکەی ئەوان نەئەچو ئەهاتن وەریان ئەگرتو لە دیواخان و مزگەوتەکانیانا بلاو ئەبوەوە . ئەوانیش ئەگەر بیانویستایە هەتیکە بلین ئەهاتن پەیرەوی ئەو شیوەیانە ئەکرد و بەو شیوەیە ئەدەبی شمری‌یان دائەنا - وەکو وترا لەو باوەررەدا نەبون یا هەر ئەوەیان بەدلا نەئەهات کە بە شیوەکەی خویان شمروتن ئەگونجی ! - . کابرا خەلکی سنەبو ، خەلکی قەلاچوالان بو ، خەلکی بوکانو سابلاخ بو وەلەوشوینانە گوش کراوو کچی ئەگەر برره هـەلبەستیکی دابنایە لەبەر ئەو شتانەی سەرەوە کەوتان ئەچو کوششی ئەکرد بو ئەوە کەشیوەی هەورامي فیر بی‌و بەو شیوەیە هونراوەکەی خوی دابنی ! .

ئەم کارەساتە بەم جورە مایەوە تا « نالی » لە ولاتی شارەزورا پەیدا بو تاپیـەکي زلی خستە سەر گازي پشت بو وتنی شمری شیوەی موکری . بەرەبەرە پەیرەوی شیوەکەی کرا و ئەدەبی شیوەی موکری‌ش بلاو بوەوە بە جوری بلاو بوەوە کە لە ولاتی موکری‌و شارەزوردا بەتەواوي لە باری شمر و تندا شیوەی هەورامي‌یان لە فیکر چوەوە . . مایەوە سەر ولاتی ئەردەلان، شیوەکەی موکری‌ش وەکو شیوەی هەورامیەکە بەهوی چەپەري

مزگەوتەوە بە ئەدەبي شعري كەوتە ئەوی دیسان سەیریان کرد ئەمەش وەکو شیوەکەی خویان نیە شوینی کەوتن و خەریکی ئیربونی ئەبون بو ئەوە شعری پی بلین . دەردەکەی ئەوان گرانتر بو، لە لایەکەوە ئەبوایە خەریکی شیوە هەورامي بونایە ، لە لایەکەوە هي شیوەی موکری !! . ئەم رەوشتە تا ئەم دەورەی دواییە لەویدا هەر ماوەتەوە ، ئەوا تازەیي ئەوانیش هەندیکیان کەوتونەتە سەر ئەو باوەرە کە بە شیوەکەی ئەوانیش ئەگونجی شعر و ئەدەب بوتری چەند سالیکە دەستیان داوەتی .

لیرەدا رەنگبی ئەو پرسیارە بکری کە : ئەگەر عامل بو بلاو بونەوەی شیوەی هەورامي لەو ولاتانەدا بە بیگانە زانینی هەورامي بی بوچی شیوەی « لورر » و « بوتان » یش بلاو نەبوەوە تیایانا خو ئەو بیگانەیەتیە لەویشا هەر هەبو ؟؟. وەلامەکەی بەم جورە ئەدەینەوە ئەلین : ئەو هاتو چوی روحي و ئەدەبیە لە بەین ولاتی هەوراماز و سوراندا هەبوە لە بەین بوتاز و سوران یا لە بەین لورر و سوراتا نەبوە ئەگەر بیوایە بی گومان ئەمانیش بلاو ئەبونەوە .

ئەمینیتەوە سەر ولاتی بوتان ئەوانیش لەو شوینانەیانا کە شاخ و داخەو بە حکمی تەبیعەت زور تیکلاوی بیگانە نەبوون رەمەکي مەردمەکە هەلبەستی شەعبیان هەر لە زەمانیکي کونەوە کردوە بەباو لەبەین خویانا ، خویندەواری مزگەوتەکان لی بیگانە نەبوون شیوەکەی خویانیان پاراستوەو کردوبانە بە ئەدەبیکی بەرز. عەینی کارەسات لە ولاتی لورریشدا روی داوە لەگەل ئەمەش کە ئەملن زیاتر تیکلاو بە عەجەم بوون سەرچاوی ئەدەبەکەی خویانیاز هەر بو ئیمە هیشتوتەوە ، ئەمەومن لام وایە شتیکي تریش هوی مانەوەی بوە ، ئەوەش ئەمەیە : لەبەر ئەوە وشەی ( لورر ) لە روالەتا جیایە لە وشەی ( کورد ) وە لە بەر ئەوە شیوەکەی ئەوان زورتر ئەگونجی لە گەل بەهلەوی کوندا فارسەکان ئەوەندە بو تیاچونی ئەدەبي کوردي خەریک بوون ئەوەندە

خەریکي ئەوان نەبوون ، ئیجگار عاتفەی ئاینیش کردبویە کاری هەتا ئەم دەورەی دوایپەش لورر خوی بە فارس زیاتر ئەزانی تا کورد ! . جا ئەم کارەساتانە ئەوەیان ئامادە کردوە کە ئەدەبی لورر هەر لە زەمانێکی کونەوە بفیتەوە .

بە جوریکي تیکرایی ئیمە ئەبی لەو باوەرەدا بین کە ئەدەبی تیکرای کوردی لە چاو خویا ئەدەبیکی بەرز و بە نرخە ، من ئەم قسەیە لەبەر ئەوە ناکەم کە کوردم ، چونکە نوسینی میژو و نوسینی میژوی ئەدەب یەکی لەو شتانە کە لە نوسەرەکەیا پیویستە بی‌لایەنگریە کەواتو من لایەنگری کورد قسەناکەم بەلام بەلامەوە ئەمە شتیکي حەقیقەتە . کورد ولاتانی نەبوە ، بیروباوەرری بیگانە بەرزەکانی بەرچاو نەکەوتە ، دانشگاکانی عالەی نەبوە لە گەل ئەمانەشدا ئەدەبەکەی کەمتر نیە لە ئەدەبی قەومەکانی‌تر ، هەندی جاری وا توش ئەبی کە کابرایەکی شاعر لە ئاشەکونیکابوە ، لە سەر چاوەیەکی بوە ، لە بن دەواریکا بوەکەچی فیکری وای دەربرریوە کەمتر نیە لە فیکری ئەو کەسە کە لە دەوری راپەرینی ئاوروپادا لە (سوربون) و (اکسفورد) فیکری وەرگرتوە . بەلام ئەوەندە هەیە ئەدەبی کوردي بی خاوەن بوە ، خزمەت نەکراوە ، بە خاپي وکالی ماوەتەوە ، ئەگەر هانەهانە بدرایەت و بە سەرچاوەی خویندەواري راستەقینە ئاو بدرایەو ئاو بدربت پایەی گەلی گەلی لەزور ئەم پایەیەوەیە کە ئیستە هەیەتی .

تا ئەم شوینە بەم جورە هاتین ئینجا ئەمانەوی بە سەرە قسە لە شاعرە هەرە گەورەکانی کوردەوە بکەین لە دەوریکي کونەوە تا ئاخری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، هي ئەوانەکە توانیومانە بیانخەینە دەست . قسە لە ژیانیان ، لە نەفسیەتیان ، لەو هویەکە کردونی بە بویژ ، لەو ریچکانە کە لە هونراوە ـ کانیانا گرتویانە لە ، لی کولینەوەی هونراوەکانیان بکەین .



# بابەتاهر

## ٩٣٥ - ١٠١٠ م

رەندو دیوانە و قەلەندەر ، خواناس‌و پاریزگارو هەردە گەرر . بەسوزی عەشقیکی مەعنەوی کورەی دەرونی لە گردابو ، لە یادی دوستیکی نهینی دەمارەکانی لە خروشدابو . شەیدای بارەگای یەزدان ، هەردە گەرری چول‌و بیابان . هاونیازی روژانی چرستانی «دەماوەند»و هاورازی شەوانی دیعەنی ( مەیعەند ) ! گاهی لالەزاری زەوی بارەگای بوە ، گاهی جریوەی ئەستیرەی ئاسمان شەوچرای بوە . روحی لە لەوەرزاری ئەرواحدا لە هەمو گولیکی مژیوە ؛ دەمی لە دنیا دور بەدور بوە ، دەمی لە ئاهەنگ روبەرو بوە ! . تاویک لە دەشتی تەفکیردا سەرگەردان بوە ، کاتیک لە کورری عەودالانی خواناسیدا مەی گیرری مەعرفەت بوە . . هەندی جار خوی ون کردوە ، هەندی جاریش وزیوی دوزیوەتەوە !. هەناسەیەک دەرویشکی نادان بوە ، بینیکیش شیخیکی مەلەوان بوە . زەمانیک نەزانیکی یەکەوتو بوە ، دەورانیکیش زانایەکی گەوهەرناس‌ودوررناسیکی بی‌وینە بوە ! . .

بابە تاهر شاعریکی کوردی سەدەی سیهەمی هجری بوە . بە پی هەندی بەلگەی تاریخی دەورەی ( صاحبی کوری عباد ) و ( ابن سینا ) ی فەیلەسوفی دیوە کە ئەمانە لە زەمانی حکومەتی ( بویە ) یەکانا ژیاون . ئەم چوار خشتەکیەی کە ئەلی :

مو ، آن بحرم کە در ظرف آمدەستم
مو ، آن نقطە کە در حرف آمدەستم
بە هر الفی الف قدی بەر آیو الف قدم کە در الف آمدەستم

کە مەتەلیکی گرانەو میرزا مهدی خان لە سەر حسابی « ابجد » لیکی داوەتە گویا هاتنە دنیای بابە تاهر دەر ئەخا لە ٣٢٦ هـ ـ ٩٣٥ م . دا . وە لە ٤٠١ هـ ـ ١٠١٠ م . دامردوە وە ئەمەی لە ( المجلة الجمعية الاسيوية ) دا لە بەنگال بلاو کردوتەوە . لیکدانەوەکەشی گویا بەم جورەیە : ـ

وشەی (الف قد) ـ ٢١٥ ـ کە ئەمە لە گەل وشەی ( بحر ـ دەریا ) یەکئ ئەگریتەوە ، وەکو چون لە گەل وشەی (طاهر ) یشدا هەر یەکە . کە (الف قد = ٢١٥ ) بخەینە سەر ( الف = ١١١ ) ئەکاتە ( ٣٢٦ ) وە ئەم ژمارەیە لە گەل وشەی ( الف ـ هەزار ) یەکئ ئەگریتەوە . کە حینجە بکری ئەبی بە ( ها ـ زا ـ الف ـ را ) وەلای وایە تا ٤٠١ ی هجری ژیاوە .

بابە تاهر هەر لە هەمەدان مردوە ، گوررەکەی گومەزیکی بچوک پەرر ـ بوتی بە سەرەوەیە لە سەر تەپولکەیەکە ، کەناوی ( بن بازار )ە ولە شیمالی روژاوای شارەکەوەیە . گورری دلخوازە کەشی ( فاطمه لیره ) لە گەل فاطمه ناویکی ترو میرزا علی نەقی کەوسەری کە ئەمانیش لە دەرویشەکانی بوون لەویدان . لە ( دائرة المعارفی ئیسلامی ب ٣ . ل ٢٣٢ ـ ٢٣٩ ) ەوە .

بابە تاهر شاعریکی کوردو لەبنەمالەی ( لورر )ە . وەکو لەم چوار خشتە ـ کیەدا بە تەواوی شیوەی زمانی خوئمان بو دەر ئەبرەی :

دلی دیرم زعشقت گیج ویجـە مژە بەر هەم زەنەم خونابە ریجە
دلی عاشق بەسانی چوب تەرربی سەری سوجە،سەری خونابە ریجە

واتە : دلیکم هەیە کە لە عشقت گیژو ویژە ، برژانگئ بە یەکا بنیم خوین ئەرریژی .. دلی عاشق وەکو شولی تەررە ، سەریکی ئەسوتی ، سەریکی خویناو هەلئەرریژی ... چون داری تەررکە ئەیخەیتە سەر ئاگر لە سەریکیەوە ئەسوتی لە سەرەکەی تریەوە ئاو و زینچکاو دەر ئەدا دلی منیش وایە ! ... بەلام لەبەر ئەوە کە رەندیکی دیوانە و دەرویشیکی بی پەروا بوە هەمو دەم ئارەزوی ئەوەی کردوە ئەو شعرانە کە ئەیلی تیکلاویان کا بەو

شیوانەوە کە دەنگی ئەیانگانی . وەکو لەم چوار خشتەکیەوە ئەمەمان بو دەر ئەکەوی :

نەوای نالە غەم گەندوە زونو عیار قەلب خالص بوتە زونو
بورە سوتە دلون گرد هەم ئایم کە قەدری سوتە دلیە دل سونە زونو

واتە : دەنگی نالەی خەمخور تو ئەیزانی ، پارسەنگی دلی بی خەوش « بوتە » ئەیزانی . وەرە با هەمو دلسوتاوەکان لەلای یەک کوبینەوە چونکە قەدری دلسوتاو دلسوتاو ئەیزانی ... تەماشا ئەکەی لیرەدا ( نەوا ، فارسی . تە = تو ، بوتانی . زونو ، پشتکوی . بورە لە « بەوە ئەیرە »ی لورری . بوتە ، کرمانجی ) ئەمانەی هەمو لەم دو شعرەیدا کو کردوتەوە . لەمەوە ئەوە بو ئیمە دەر ئەکەوی کە نەفسیەتی بابە تاهر ویستویەتی لە ناو هەمو هوزو تیرەیەکی کورددا پەل بلاو بکاتەوە بو ئەوە بتوانیتەو دەرویشیو بیروباوەرەی ئەوی لە سەر بوە لە ناویانا بنج دا کوتیو هەمویان باوەشی بو بگرنەوەو بەدل بچنە ژیریەوە . . دیسان لەبن دەست ئەمەشەوە شیوەی ئەدەبیاتی فارسی وەنەبی لە دەست بەردابی وەکو لەم دو بەیتەیدا دەر ئەکەوی کە ئەلی :

بە خنجەر گەر دەرئارەند دیدەگانم بە ئاتەش گەر بسوزەند استخوانم
ئەگەر بەر ناخونانم نەی بکوبەند نەگیرەم دل زیار مهرەبانەم

لەم شعرانەوە دەوری سوزی تانی جوانیشی دەر ئەکەوی کە دلخوازی خوشەویستی هەمو شتیکی لەبیر بردوتەوە تەنانەت ئەگەر پارچە پارچەش بکری هەر ئەوەندە دلی لەلای یاری مهرەبانیەوە ئەبیتەوە دەربایسی هیچی تر نیە ! . .

دوکتور سعید خان ئەلی : « پیاویکی گاوری کورد ئەلی : کە بابە تاهر چەند شعریکی بەشیوەی گورانی بەتی داناوە و ناردویە بو « حەق »ەکان بو ئەوە کە لە بیرو باوەری یەک بگەن وە ئەوانیش بخاتە سەر ئەو ریگەیە

کە خوی لە سەری بوە . » داخەکەم ئیمە ئەو شعرانەمان چنگ نەکەوت[1]

بابە تاهر لەسەرەتای ژیانیا دلی بە عەشقی دیمەنی مانگ روەکانی هەمەدان و لوررستان پشکوتوتەوە ، جوانی رەوشتیان و شوخو شەنگی بالا عەررعەرریان سوزیکی دیوانەیی یان خستوتە کەللەیەوە . لە ناو ئەوانەدا « فاتمە » ناویک بە دوچاوی مەستو دو ئەبروی هلالیەوە بەدەنگدانی ئیمروزو سبەی کورەی دلی بابە تایەر دینیتە جوشو ئەبیتە هوی ئەوە کە تاپی شعری لی ئەکریتەوەو ئەلی :

دو چەشمانەت پیالە پرر زومەی بی    خەراج ئەبروانەت ملك رەی بی
هەمی وەعدە کونی ئیمروز و فەردا    خودا دانە ، کی فەردای تو کەی بی؟

ئەم شورشە لە کەللەیا تەم و بوخار ئەکا و بە هەمو لایەکدا ئەیررەتینی ، دیوانەی ئەکا و بە چولو هەردا بەرەلای ئەکاو ئەیخاتە سارای دەربە ـ دەری و بی جیگەیی ، ئیتر وای لی دی کە ئەلی :

مو ، ئان رەندەم کی نامەم بی قەلەندەر
نەخون دیرم ، نە مون دیرم ، نە لەنگەر
چو روز ئایەد بگەردەم گیرد گیتی    چو شەو ئایەد بەخشتی وا نەهەم سەر

واتە : من ئەو رەندە بی پەروایەم کە ناوم قەلەندەرە ، نەخوان ـ سفرە ـ یەکم هەیە نانی لە سەر بخوم، نەشوینیکم هەیە ستاری تیدا بکرم ، نە کەسیکیشم هەیە پشتیوانم بی و لەنگەرم بکریت . کە روژهات بەدەورجیهانا

(١) ئاشنایەتی بابەتایەر لەگەل « حەق » ەکانا ئەوەبوە کە ئەوان بابە تایەریان بە فریشتەی چوارەمی «خشین» داناوە کەلە لوررستان بوە ، چونکە سەرەتای دەرکەوتنی ئایینی حەقە لە پیشا لە لوررستان لە پاشا بو نزیکی سیروان ئینجا لە ئازربایجان بوە . ئەمەش بەلگەیەکی ترە بو ئەوە کە بابە تایەر لورری بوە . من لام وایە ئەم باوەرری « حەقن »ەی « شەدەلە » لقیکە لە حەقەکانی سیروان .

ئەسوورێەوە ، کە شەوهات خشتیک ئەخەمە ژیر سەرم و ئەنوم ... بابەتاهر ماوەیەکێ بەم جورە رای ئەبوری لە پاشا ئەو دلەی کە فریشتەی سەر زەوی هوشی لی سەندبو سەودای عەشقی راستەقینە شا بال ئەکیشی بە سەریا و لە دەست کەمەندی ماەروان رزگاری ئەکا . ئینجا رو ئەکاتە ئەو مەیدانە کە نوری خوای تیدا بلاو بوتەوە ، لەو دەشتەدا بە سوزی عەشقی یەزدان ئەسووریتەوە و لە هەمو سوچیکی ئەم ئەرزو ئاسمانەدا بیجگە لەو کەسیکی تر نابینی وەکو ئەلی :

بەدەریا بنگەرەم دەریا تو وینەم بەسەحرا بنگەرم سەحرا تووینەم
بە هەرجا بنگەرم ، کوەو دەرودەشت
نشانێ ئەز روی زیبای تو وینەم

واتە : لە دەلیاو وشکانید ، لە چول و بیاباندا بیجگە لە تو هیچیتر نابینم ماوەیەکیش لەو هەردە بە هەردەیەدا ئەسووریتەوە ، دەمارو گوشت وپیستی لە زەریای خواناسیدا بە تەواوی نەرم ئەبیتەوە ، لەوبوە ئەکەویتە عالەمیک خوی بە مەلیک دیتە بەرچاو کە هەمو جیهان لە ژیر پیدایە، وەلای وا ئەبی کە زال بوە بە سەر هەمو شتیکدا و بەلام دیار نیە ، وە وا ئەزانی ئەگەر بیتو خوی بنوینی هیچ نیە خوی لەبەر پلاریا بگریت وەکو ئەلی :

موەم ئان ئازەرین مورغی کی دەرحال
بسوجە عالەم ئەر بەرهەم زەنەم ال
مصور گەر کەشد نەقشەم بە دیوار بسوجە عالەم ئەز تأثیر ئمثال

واتە : من ئەو بالندە ئاگرینەم کە دەم و دەست ، بسوتی ئەم جیهانە ئەگەر بال بە یەکابدەم . تەنانەت وینەگر ئەگەر وینەم لە دیوار بکیشی ، هەمو عالەم ئەسوتی لە تاو کاری گەری ئەو وینەیە .. ( موەم = منم . ئازەرین = ئاگرین. بسوجە = ئەسوتی)... لە بەیانی روژیکی نوفدا کەسەر

لە سەر سەربنی نوستویتی بەرز ئەکاتەوە تەماشا ئەکا نوری مەعرفەتی خوا هەمو دەمارەکانی ئەبزوینی ، لە هەمو دەریایەکی خواناسیدا مەلەوانیکی بین دربژە ئەلی: «بەنەزانی نوستم بەزانایی هەستام !» . ئینجا ئەبی بە ئاموژگار-یکەریکی دلسوز ، بە شیخیکی پرسوز . بە فەیلەسوفیکی راستەقینەو بانگ بە دنیادا ئەداو ئەلی :

مەکون کاری کەبەر پا سەنگت آیو جهان با این فراخي تەنگت آیو
چو فەردا نامە خوانان نامە خواهەند
تو نای خود ببینی نەگت آیو !

واتە : ئیشیکی وا مەکە بەرد بیتە بەر پیت ، دنیا بەم فراوانیە لەتو تەنگ بی و لە هیچ لایە جیت نەبیتەوە . ئەگەر سبەینی نامەخوازەکان نامەتیان ویست ، تو ناوی خوت ببینی شەرمەزار ببیت !... ... دیساز بە دەرویشە-کانی ئەلی :

شەبی تاریک و سەحرا پرخەتەر بي دەر این راه روشنایی کەمتەرەک بی
شەبی تارو بیابان دور و مەنزل خوشا ئانان کی بارەش کەمتەرەک بی

« کەمتەرەک = کەمتر » . ئەلین فەلسەفەی نەفسیەتی بابەتایەر گەلی گەلی جیاوازە لەگەل هی « عمر خەیام » ! ، عمر خەیام بە دوچاو سەیری دو عالەم ئەکاو لە هەر دوکیان ئەکولیتەوە و لە عاستی هەر دوکیان ریگەی بی پەروایی گردرتە پیش . بەلام بابە تایەر چەندە لەم عالەمەدا بی پەروایە ئەوەندە لە عالەمەکەی کەدا بە پاریزو زور بە وردبینی روی دلی مەردمي تی ئەکا ، کە چی ئەم دو بەیتەی کە ئەلی :

مو ، ئان رەندەم کی عصیان پیشە دیرم
بە دەستی جام و دەستی شیشە دیرم
ئەگەر تو بي گوناهی رەو مەلەک شەو
مو ئەز « حوا » و « آدم » ریشە دیرم

وانه : « من ئەو رەندەم کە بی فەرمانی پیشەمە ، دەستیکم پیالەکەی تیدایەو دەستیکیشم شوشەکە ، ئەگەر تو هیچ گوناحیکت نیە بچوبیە بە فریشتە . من ئەمە میراتیەکە لە باوە ئادەمو دایە حەواوە بوم مازەتەومو ریشەی لەریوە دا کوتاوە ! » — هەر ئەو بیرو باوەررەیە ! — بەلام وانیە ئەمەش هەر یەکیکە لە فەلسەفە وردەکانی بابەتایەر چونکە ئەلی :

من دیوانەیەکم کەبی فەرمانی لە باوە ئادەمو دایە حەواوەوە بوم بەجی ماوە ؛ چون ئەوان بی فەرمانی خوایان کرد منیش کە لەوان بم بە تەبیعەت هەر ئەبی وا بکەم ! . کەوابو ئەم بی فەرمانیە لە شەراب و بادەدا بەجی دینم . تو ئەگەر خوت بە بی گوناح ئەزانی راستەوراست بچوبیە بە فریشتە ؛ چونکە فریشتە لەو رەگەزە نیە کەمنی لی بوبم !. ئەوەندە هەیە ئەو شەرابو بادەیە کە تو بە بی فەرمانی ئەزانی من بە فەرمانبەری دائەنیم ؛ چونکە شەرابەکەم خواناسیەو لە بادەی حەقپەرستیدا ئەیخومەوە بو ئەوە بچمە ریزی ئەو باوکو دایکەم کە کاتی بی فەرمانی خوایان کرد بە ریازەتی نەفسی خویان گەیاندەوە ئەو لالەزاری بەهەشتەکە هەتا هەتایی تیدا ئەمیننەوە ، ئەگەر ئەو نافەرمانیەیان بە سەرا نەهاتایە ئەو مانەوە هەتا هەتاییەیان چنگ نەئەکەوت ، منیش لەوانم و ئەو شوینەم ئەوی . . تو کە ئەتەوی خوت بە بی گوناح بزانی دیارە ناتوانی ئەو ئەرکی ریازەتە بەریوەبەری ، کە ئەمەت بی نەکرا بچو وەکو فریشتە چون ماوینەکت ئەمینی و لە پاشا بە بی ئەوە لە بەهەشتدا بمینەوەسەریان تیائەچی،تو بلی،وابە کەوابو تو بو بەهەشت دروست نەکراوی تەنیا بو تیاچون دروست کراوی ، یەکی ئەگەر گەنجی بوی ئەبی رەنج بکیشی ...

لە سەر قسەی . ف . مینورسکی حسین وەحید دەستجردی ئەسفەهانی نوسەری گوڤاری ئەرمغانی فارسی دیوانیکی بابەتاهری لە ١٩٢٧ دا بلاو کردوتەوە کە ٣٦٥ چوارخشتەکیە . لە مانە ٣ دو بەیتی روژەلانی نـاس

( هروز الن ) دوزبو بەتەومو وتویە ھی بابەتاھرە وە ٦٢ یشی حسین وەحید خوی لەم‌لاو لەولا کوی کردوتەوە ، ئەوانیتریشی لەپیشا بە دەست مەردمەوە بوە ... جا لە تازەکانا بابەتاھر گەلی جار ناوی خو بو کیوی ئەلوەندو مەیەند دینی ، سوزو خوشەویستي خوی بەرامبەر بەو دو کیوە دەر ئەبرری ... لەمەوە ئەوە دەر ئەکەوی کە بابەتاھر بەبي ئەو دەورەیە لە دوای خواناسي خوشویـستی مەلبەندی لە مەموشت بەلاوە گەورەتر بوە . .

ناوبانگ سەندنی بابەتاھر بەم ناوە لەبەر رەوشتیکەکە لە کوردەواریدا باوە ، لە ناو کوردەکانا یەکیک ئەگەر شیخ بي یا لە بنەماڵەی شیخ بي لەبەر ریزلی گرتن و خوشەویستي پي ئەلین بابە فلان وەکو بابە شیخ ، بابە رەسول ، بابە عەلي . بابە تاھریش وایە .

دوایي بە سەرگوزەشتي بابەتاھر دینین بەم دو بەیتەی کە بە تەواوی زمانەکەی خویان بو دەر ئەبرری و پیشیان ئەلی : من لە پاش تاقي کردنەوەیەکي زور بوم دەرکەوت کە گولو وەنەوشە و ژن پشتیان پي نابەستری چونکە دوژمنیکیان ھەیە کە رومەتي ئالو والایانە و تایەلی لە بوتەی مانەوەدا تال بینەوە تا ببن بەھاورازوجي رازونیاز ! .. :

بەنەوشەی جوکەناران ھەفتەی بي گولاڵەی کوھساران ھەفتەی بي
مونادی مي کەزن شەھرو بە شەھرو وەفاي گولعوزاران ھەفتەی بي !

واتە : وەنەوشەی کوي جوگەکان ھەر حەفتەیەکە . گولاڵەی کویستانەکان ھەر حەفتەیەکە . جاررجي‌شار بە شار بانگ ئەکا ، ئەلی: وەفای رومەت گولان ـ ژن ـ ئەویش ھەر حەفتەیەکە ! ...

═ ০ ═

# مەلای جزیری

## ١٤٠٧ - ١٤٨١

گەوهەرێکی شەوچرا لە سەراوەردی شاخەکانی بەندەنی بەرزی بوتانەوە، سەمەندەرێکی بی پەروا لە بەراوردی خانەکانی عەشقەوەو دور لە سوتانەوە.



شیخی کە پیری بە بیری بەرزی پەری بوبی هەر ئەو بوە، پیری کە شیخی لە بیری چاوی شوخی گەری بوبی هەر ئەو بوە ا. نمونەیەکی بەراستی لە لالەزاری غەرامیاتدا کە ئاوازی دەنگەکەی بولبولی چەمەن بینیتە جوش، عاشقیکی سەربەستی لە بارەگای مەەوەشانا کە سەمتوری شعرەکەی دل و دەماری یاران بینیتە خوروش.. پیغەمبەری سەر دەفتەری شعری تەرری غەرامی لە خاکی پاکی بوتان، دل زیندوی بێن دریژی پەل هاویژی دەریای تصوف لە مەرزی بەرزی کوردان.. فیکری ئاوینەیەکی بی گەردە بو سوفیانی خواپەرست، هەستی شاوینەیەکی سەرهەردە بو فەیلەسوفانی حەق پەرست.

بولبولی سەرچلی ئەم داستانە ناوی شیخ احمد و کورری شیخ محمدە، لە جزیرا بوتان یا «گزرتا دو قردو» هاتوتە دنیاوە و هەر لەویش مردوە... لا پەرەی ژیانی شیخ احمدی جزیری زور تاریکە پیویستە بەلی کولینەوەو وردبونەوەیەکی دور و دریژ ا. جالەبەر ئەوە ئیمە لە پیشا دینین ئەوقسانە کە

له بارەی هاتنه دنیای شیخەوه وتراوه ئەیانهینین ولیکیان ئەدەبن له پاشا باوەرری خویشان دەر ئەبررین لام وایه رەنگی ئەو وەختە ئەو پەردە تاریکه هەلبدریتەوەو دیمەنیکی رونا ک بکەویتە بەرچاو ..

له «القضية الـكردية»ی دوکتور بلچ شیرکو دا ئەلی : «مەلای جزیری ناوی شیخ احمدەو خەلکی بوتانه ، له ١١٦٠ ی میلادی هەر له جزیرەبوتان مردوه ، شعریکی زوری له غەزەل ، الهیات وتصوف هەیه . » . . له تاریخی کوردو کوردوستان ومشاهیری کوردی امین زکی بەگدا ئەلی : « مەلای جزیری ناوی شیخ احمده له جزیرەی ابن عمر له نیوەی دوایی سەدەی شەشەمي هجری له دەوری عمادالدین حاکمی موصلدا ژیاوه . . هەروەها ئەلی : له پاش « جامی » هاتوته دنیاوه و دیوانەکەی خوی به دیاری ناردوه بو خانی خانان که له تەوریزدا بوه .. » ... دیسان هەر له مشاهیردا قسەیەکي ماموستا محمد علی عونی هەیه بەسەر شوینەکەوه ئەلی : « جزیري که باسی شعری سعدی و جامیو حافظی کردوه ئەمە هي ئەو نیەو خراوەنەتە دیوانەـ کەوه . » ... روژەلاتی ناسی روسي « مسیو ئوگست یابا » له کتیبەکەیا : « قسه له کوردەوه » ئەلی : « مەلای جزیری خەلکي جزیرەی ابن عمره له سالانی ( ٥٤٠ ـ ٥٥٦ ه ) له دەوری عمادالدین زەنگیدا ژیاوه . » ... روژەلاتی ناسي ئەلمانی « فون هارتمان » که له ١٩٠٤ دا دیوانەکەی له بەرلین چاپ کردوەو خوی سەرەتایەکي بو داناوه به ئەلمانی وەوینەیەکي شیخیشی خستوته پالی وا دەر ئەکەوی باوەرری هەر وەکو باوەرری ئەوانیتره ...

له بابەت مەلای جزیریەوه ئەم بەلگانه هەیه وه هەر کەس قسەیەکي لیوه کردوه ، ئەمینیتەوەسەر ئەوه که ئیمه لەمانه بکولینەوه بزانین ئەگەینه کوی ؟ وه لەم تاریخانه بەچی دەر ئەچن ؟ . .

جاری مەلا له شعریکی خویدا ئەلی :

گەر لۆلۆ منثور ژ نظمی تە دخوازي
وەر شعری ملی بن تە بەشیراز چە حاجت

ئەمە لیرەدا مەلاباسي ئەوە ئەکا ئەلی ئەگەر شعری نایابی غەرامیانی من بێی تو چیت داوە لەوەکە بچیتە شـــیراز بە شوینی شعری حافظ دا بسوورێتەوە ! ... ئەگەر تەماشای دەوری حافظ بکەین ئەبینین ئەم شاعرە لە ئاخرو ئوخری زەماني پادشایەتي سلطان ابو سعیدی کوړی سلطان محمدی خودابەندە ـ کەلە بنەمالەی هولاکو بو ـ وە لە جوشی پادشایەتی « ئیلـکانی » یەکانا ژیاوە و لە ٧٩٤ هـ ـ ١٣٩١ م . مردوە . لە دەوري ئەمدا بنەمالەی عەباسیەکان لەم‌لاوە لە بەغدا دەمی بو دوایی هاتبو چونـکە ئەو لە ٦٥٦ ـ ١٢٥٧ م . بە دەست هولاکو بڕرابوبوەوە ، لەولاشەوە دەوری سلطان محمدفاتحی دیوەکە لە ٨٥٨ هـ ـ ١٤٥٢ م. شاری قسطنطینیەی گرت .

ئیمە کە سەیری مردني مەلای جزیری و حافظی شیرازي بکەین بە پي ئەو قسانەکە ئەوان و تویانە ،مەلالە « ١١٦٠ »م . مردبیت و حافظ لە « ١٣٩١ »م . تەماشا ئەکەین مەلا ٢٣١ سال لەپیش حافظدا مردوە کەچی لەولاشەوە لە شعرەکانیا باسی حافظت بو ئەکا !! . کەوابو شک لەوەدا نەمایەوە تاریخی ١١٦٠ راست نەبو وە ئەبي مەلا پاش حافظ کەوتبیت ، نەوەکـ هەرپاش کەوتني بەلانی کەمەوە ئەبي « ٣٠ » سالیکـ بەینیان بوبی ، چونـکە تا حافظ لەو دەورەدا شعری لە شیراز وتبیت و ئەم شعرانە گەیشتبیتە کوردەواری و هـــەمو کەس لي ني گەیشتبیت بە جوریکي وەها کە ناوی حافظی بلاو کردبیتەوە کەمتر لە سي سالی ناوی ! ... ماوەتەوە سەر ئەوە کە تو بلیت : بەلـکو ئەو شعری شیرازی یەکەمەلا ئەلیت ،حافظ نەبیت و شاعریکي ترشیرازي بو بیت ! لە وەلامي ئەمەدا ئەلین : نە ئیستە وە نە ئەو دەورەیە شعری هیچ شاعریکي غەرامي شیرازی لە کوردەواریدا بلاو نەبوەتەوەو نەزانراوە . تاقە شاعریکي شیرازي کە ناوی لە کوردەواریدا بو بیت هەر حافظ بوە . .

ئەگەر « سعدی »یش بی ئەویش هەر دیارە پیشتر کەوتوە چونکە ئەو لە دەوری ئەتابکەکانا وەکو سعدی زەنگی و ابوبکری کورری‌دا ژیاوە، کە لە ٦٥٦ هـ ـ ١٢٥٧ م . میلادیدا بوە هەرگەلی پیش مەلا کەوتوە ! ...

ئینجا «جامی» ! . جاری بیجگە لە قسەی مەلا خوی ، جامی لە ٨١٧ هـ ـ ١٤١٣ م . هاتوتە دنیاوە ، لە ٨٧٧ هـ ـ ١٤٧٢ م . لە ریگەی کوردەواریەوە بەسەر « هەولیر »دا چوە بو حج وە لە ٨٩٨ هـ ـ ١٤٩٢ م . مردوە . لە کاروانی حەجەکەیدا لەوکاتەدا کە بە کوردەواریدا تی‌پەرریوە لە باسی شعرو ئەدەبدا ئەلی :

پیرە مەردی بدیدەئەم زجزیر   نیمە مەردی بدیدەئەم ز حەریر

ساغ بوتەوە ئەم پیرەمیردە کە ئەو چاوی پی‌کەوتوە مەلای جزیری بوە، جا ئایا مەلا چوبیتە سەر ریگەی ئەو یا ئەو چوبیتە جزیر ئەمە توزی ونە ـ هەرچەندە ئەوە زورتر ئەچیتـــە دلەوە کە جامی چوبیتە جزیر ـ نیمە میردەکەش علی حەریری بوە .

جاری ئەم شعرەی جامی کە لە ١٤٧٢ دا بوبیت و مردنی مەلا ـ وەکو سەرچاوەکان ئەیلین ـ ١١٦٠ ی . م . بوبیت ٣١٢ سال بەینیە ، واتە ٣١٢ سال مەلا پیش جامی کەوتوە ! . دەی ئەگەر ئەوەندە سال ئەم پیش کەوتبی جامی چون ئەلی پیاویکی وام چاوپی کەوت ؟ ! ... کەوابی ئەبی مەلا لە دەوری جامی‌دا بوبیت و بەلانی کەمیشەوە شەست حەفتا سالیک عومری بوبیت بویە جامی ناوی بەپیرەمیرد بردەوە .زورتر لەرەوشتی‌زمانی فارسی‌و کوردیدا پیاو کەمتر لەم تەمەنە پی نالین پیرەمیرد وە ژنیش لە پەنجا شەست سال کەمتر پی نالین پیریژن...

ماوەتەوە سەر ئەوە لە « مشاهیر الاکراد » دا ئەلی : « مەلا دیوانەکەی بە دیاری ناردوە بو خانی خانان کە لە تەوریز دانیشتوە . » . ئەم باوەررەی لەوەوە وەرگرتوە کە مەلا دو بررە شعری هەیەبکیکیان سەرەتاکەی :

( ئەی شەهەنشاهی معظم حق نگەهداری تە بی
سورەی انا فتحنا دەور مادارێ تـە بی ) یە .

وە ئەویتریشیان :

( خان خانان لامع نجیا تە هـەر پرر نور بی
کەشتیا بەختی تەژی بایی مخالف دور بی ) یە .

وای بو دەرکەوتوە چونکە مەلا ناوی خانیخانانی هیناوە ، خانی خانان حاکیک بوەو لە تەوریز دانیشتوەا ..

بەلام من لەم فیکرەیە دورم : جاری ئەم خانیخانانە ئەگەر بوبیت گەلی گەلی پیش مەلا کەوتوەو لەدەوری عمادالدینی زەنگیدا بوە ، مەلا بە ١٥٠ سالیک لە پاش ئەو هاتوتە دنیاوە . دوەم ئەمە شەرت نیە هەر خانی خانانی وت ئیتر ئەو پادشای تەوریزە بیت . خانی خانان ناویک بوە کە شاعرەکان داویانە بە پادشاکان ، بە تایبەتی خانیخانان بو تورکەکانی عوسمانی بەکار هینراوە ..

کەوابو من لام وایە بەپی عادات و تەقلید ئەو بررە شعرە کەسەرەتاکەی « ئەی شەهەنشاهی معظم حق نگەهداری تەبی ... هتد » مەبەستی پی سلطان حسین بایەقرە کە ئاخر خانەدانی تەیموریەکان و ئەمانە لە ئیران لە ٨٠٧ هـ - ١٤٠٣ م . تا ٩١٢ هـ - ١٥٠٦ م . پادشایەتیان کردوە وە شەهەنشا چەلەو دەورەو چە لە دوای ئەوەش لە بەر عەنعانی کون هەر بو پادشاکانی ئیران وتراوە ... وە ئەو بررە شعرەشی کە سەرەتاکەی « خان خانان لامع نجیا تە هەر پرر نوربی... هتد» یا بەرامبەر با سلطان محمد فاتحی عوسمانی داینراوە کە لە ٨٥٥ هـ - ١٤٥٠ م . تا ٨٨٦ هـ - ١٤٨١ م . ادارەیەکی بەرزی حکومەتی عوسمانی کرد ، وە یا بو سلطان بایەزید خانی دوەم کە لە ٨٨٦ هـ - ١٤٨١ م . تا ٩١٢ هـ - ١٥٠٦ م . ئیشوکاری هەلسورراندوە . . لە شیوەی شعرەکان وادەر ئەکەوی کە پیروزبایی بو بەکیک تازە لە سەر تەخت

دانیشتبێت ، کەوابو ئەبێ هەر بایەزید خان بوبێت . . ئەمەش ئینکار ناکرێت کە پادشاکانی عوسمانی هەمو ناوی « خان » یان بوە . وە ئەگەر دابنێین بڵێین هەر ئەو ساڵەش مردوە (٧٥) ساڵێک عمری بوە ... لێرەدا شەرت نیـــە کە ئەم بڕە شعرەی بۆ ساڵطانی عوسمانیەکان وتبێت بەلام ئەوەندە ئاشکرایەکە لەبەین ئەوازو تەعبوریەکانا دەرنەچوە . هەر لایەکیان بوبێت مەلا (٧٥) ساڵی ژیاوە . . کەوابو مەلا بەجورێکی تەقریبی دور نیە لە ٨١١ هـ - ١٤٠٧ ی م . هاتبێتە دنیاوە وە لە ٨٨٦هـ - ١٤٨١ ی م . مردبێت .

ئەمە و شتێکی تریش : ناوی وشەی « مەلا » لە تاریخی ١١٦٠ ی میلادیەو گەلێ دوای ئەوەش لەولاتی ئیسلامیدا هەر نەبوە ؛ ئەم وشەیە لەلایەن مەغولەکانەوە کەوتە ئەم ولاتە، لە پەلامارەکەی چەنگیزخانەوە بو (بوخارا) کە لە ١٢١٧ ی م . دابو . تا گەیشتە پادشایەتی ابو سعید لە ١٣٣٥ م ئیتر دوایی هات ، لە ماوەی ئەم ١١٨ ساڵەدا وشەی «مەلا» لەولاتەکانی ئیسلامدا -زیاتر لەغەیری عەرەبستاندا - بلاو بوەوە،ئەویش لەبەر ئەوە بو کە مەغولەکان بە سەروکە ئاینیەکانی خویانیان ئەوت « لاما ». ئەم وشەیە دەستکاری کرا بو بە « مەلا » و لەناو ئیسلامدا هەر بو سەروکی ئاینی بەکارهێنرا ، تەنانەت ئیستەش لە چین و لەناو بوزیەکانا هەر بە سەروکی ئاینی خویان ئەلێن « لاما » ... دەی ئەگەر مەلای جزیری لە ١١٦٠ دا بوبێت ناوی « مەلا »ی لە کوێ هیناوە ؟ کە ئەو وەختە ئەم وشەیە لەئیسلاما نەبوە ! . ئەبێ ئەوەش بزانین کە وشەی « مەلا » عەرەبی نیەو ئەو مەعنایانە کە لە عەرەبیدا بوی لێ ئەدەنەوە هەموی هەڵەیە .

بو ئەوش کە هەندێ کەس ئەلێن : « ئەو شعرانە کە لەباری سعدی و حافظو جامیدا لە دیوانەکەی مەلادا هەیە ئەوە نوسەرخستویەتە ناوەوە! » من لام وایە ئـەگەر کەسێک زەوقی ئەدەبی بی و بێنێ ئەو شعرانەو

شعرەکانی تری مەلا بخونیتەوە زور چاک بوی دەر ئەکەوی کە ئەو شعرانە لە دەم مەلاوە دەرچوە و بەشی کەسی تری پیوە نیە[1] ..

یەکەم شتیک کە پشتی ئەدەبیات و میژو و پیاوانی عیلمی کوردی شکاندبیت نەنوسینیان بوە ؛ ئەوە بوە کە هەر کەسە هاتوە بە هەر جور ژیانی رابواردبی کە مردوە ژیان و ناوەکەشی لەگەل خوی بردوتە گوررەوە . جا ئەگەر ناورنیشانیک لە یەکیک بەجی‌مابی هەر ئەوە بوە دەم بەدەم

(١) من لە نوسینی ژیان و بەسەرهاتی بەلا بوبومەوە ، لەپیش ئەوەدا رام سپاردبو بولای ماموستا محمد علي عونی لە قاهرە بو پرسیار کردن لە مەعنای چەند شعریک لە دیوانەکەی مەلا . ئەویش منەتباری کردم و لە ٤/٥/١٩٥١ دا بوی ناردم و زانیاریەکی زوری لەم روەوە دای سوپاسی ئەکەم .. لەگەل ئەوانەشدا گەلی قسەی لە بابەت ژیانەکەی مەلاشەوە کردبو وەکو ئەوانەی کە لەسەر «مشاهیر الاکراد» کردویەتی‌وشتی تریش، لە هەموی تازەتر ئەمەبو کە بوی ناردم وتبوی :

« زورم کوشش کردوە بو ساغ بونەوەی ئەو شعرانە کە ئەلین هی مەلای جزیرەو دەهی ساڵە خەریکی ئەمەم ، هەتا لەم دواییەدا چاوم بە دیوانیکی دەستخەت کەوت کە لە کوردوستانی جنوبی باوی هەیە و لە ١٣٢٢ ی هجریدا لە شاری جزیرە نوسراوەتەوە ، گەلی ئاگاداری لەو دیوانەدا هەبو یکیکیان ئەمەیە کە ئەلی : « مەلای جزیری هاو دەوری سلطان محمد فاتحی عوسمانی بوە » بەپی ئەمە کەوابی مەلا لە پیاوانی ئاخری سەدەی نوهەمی هجریەو ئەو شعرانەی کە ناوی سعدی و حافظ و جامی تیدایە راستە شعری مەلایە . »

ئەم ئاگاداری ماموستایەش دیسان پشتیوانی لی کولینەوەکەی ئیمە ئەکاو قسەکەمان بە تەواوی بوساغ ئەکاتەوە .

گیراویانەتەوە لەمە زیاتر بەلگەیەکی تر بە دەستەوە نەبوە . . جا ئیمەش لە بابەت ژیانی مەلای جزیریەوە تا ئەم شوینە بەراوردیک بو ئە لە کونو قوژبنی مێژوی ترەوە وەرمان گرت ، لە ئیستە بە دواوە بو چونیەتی ئەو ژیانە کەرایبواردوە لە پاش کوششیکی زور بەدەماو دەم ئەمەی خوارەوەمان دەست کەوت وە لە نەتشت ئەمەوە دیوانەکەشی یارمەتیمان ئەدا بو رون کردنەوەی هەندی لە لاپەررەی ژیانی ، بە تایبەتی ئەو دیوانە دەستخەتە کە بە خەتی عبـــدالقادر علی عمادی لە سالی ١٣٣٨ هجری لە شاری عمادیە نوسراوەتەوە و ئیستە لە لامە :

وەکو وترا مەلا ناوی احمدو کورری شیخ محمدە ، لە سالی ١٤٠٧ میلادی لە شاری جزیرە[1] لە عەشرەتی بوختی هاتونە دنیاوە . شیخ محمدی باوکی مەلا لە بنەمالەیەکی شیخی بەرمالی بووە ، بەپی رەوشتی ئەو دەورە حەزی بە خویندەواریش کردوە . لە پیشا خوی دەرزی احمدی کورری دا ئەدا ، لە پاشا بو قوتابخانە ، لەوبوە بو فەقیەتی .

شیخ احمد بو خویندن هەمو ناوچەی جزیرەو هەکاریو دیاربەکر و عمادیە گەرزاوە ، لە خویندندا زور زیرەک وپیش کەوتو بوە ، لە فارسیدا دەستیکی باشی بوە ، لە عیلمە عەرەبیەکانا بە تایبەتی بدیع وبیان واصول سەرامەدی دەوری خوی بوە ، تەنانەت ئەلین لەو ولاتەدا هیچ فەقیەک نەیتوانیوە لە رویا بوەستی . . لە ئاخرا لە تەمەنی ٣٢ سالیدا لە گوندی «ستربأس» لە دیار بەکر لەلای مەلا « طە » ناو لجازەی عیلمی وەر ئەگریتو چەند سالیک لە گوندی « سربا » هەر لە دیاربەکر ئەبی بە مەلا . لە پاشا

---

( ١ ) جزیرە شاریکی زور کونی کوردە لەدەوروبەری خەلافەتی حضرتی عمردا لە سالی ١٧ هـ . کەوتە دەست ئیسلامەکان وە ئیستە کەوتوتە خاکی تورکیاوە .

سەریکێ لە (حەسەنکەیف) ئەدا و ماوەیەکیش لەوێ ئەبێ . . تا لە دیاربەکر بوە تەدریسیکی زوری کردوەو گەلێ اجازەی داوە لە پاشا حاڵەتی عەشقي عەري پێ کیشاوە بەلای تصوفەوە و لە کەلکی تەدریسی ئەخا ، حاڵەتي دیوانەیي ئەگریت و رو ئەکاتەوە بو جزیرە تا لە ساڵي ١٤٨١ دا هەر لە جزیرە لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا ئەمریت و ئەنیژریت ، گوررەکەی ئیستەش مەزاری دلسوتاوانە . .

مەلا وەکو دەملو دەم ئەیگیرنەوە وە یا لە هەندی شتدا وینەیەکی خەیالي هەبێ پیاویکی سور وسپی کە لە کەت بەلای باریکیدا روانیویەتي ، ئەلێن لە تاقی گەنجیدا لە هەمو لایەکێ ناوبانگي دەرکردبو ، چاورەشی گەورەو برژانگێ دریژ ، بروی پرر ، لوتی باریکێ ، دەمو چاوبان ، لە جلو بەرگدا بەرداخ بوە . لە دەوری فەقیەتیدا بوزوی زاخوی ئەکرد بە چوخەو رانکێ و دەستوی ئەو ولاتە نەخشي لێ ئەدراو لە بەری ئەکرد ، جامەدانەی ئەبەست بەسەرەوە ـ رانکي ئەو ولاتە دەستوری رانکی ( سوران ) نیە بەلکو هەر وەکو پانتولی ئیستە وایە بەلام ئەم بە بەنەوخوینە نەوەکێ بە دوگمە . ئەمە جلو بەرگیکی تایبەتي کوردەواریە . دورنیە هەر ئەم رانکو چوخەيولاتی بوتانەبیت و ئاوروپاییەکان دەستکاریان کردبیتو کردبیتیان بەچاکەت و پانتول ! ـ ... مەلا لە دواییدا کە جوانی ئەگورریتەوە بە پیري جلەکانیشی ئەگورریتەوە بەجلیکی تر ، کەوای دریژ ، میزەری سپی ، ریشي رەش بەریشی سپی دریژ تەنگی بەناوکیهەلچنیوە . . لە قسە کردندا زور زور زمان پاراو بوە ، تەبیعەتی ئاچوخ وبێ پەروا بوە ، لە ناو مەردما خوشەویستی هەمو بنەچەیەکێ بوە ، قەلەندەريو هەردە گەرري پێخوش بوە

مەلا لە تەمەنی سي ساڵیدا لە گوندی « دیرهاتی » لە « حەسەنکەیف » ئەبێ . لەو سەردەمەدا یەکیکێ لەفەقیەکان اجازە وەر ئەگریت ، زەماوەندو هەلپەرکی اجازە ئەبێ ( سەلمای ) ی کچی ملك کامل ـ کە ئەم ملك کامله

لەو سەردەمەدا لەلایەن میرزا شاهروخ کوری ئەمیر تەیموری گورکانیەوە ئەمیری ئەو ولاتە بوە ـ لەسەر تەلارەکەوە تەماشای هەلپەرکی فەقیان ئەکا ، مەلاش لە هەلپەرکێکەدا ئەبی چاوی بەکچە ئەکەوی و پابەندی عەشقێکی بێ وینەی ئەبی . ئاگری عەشقی سەلما لە هەمو دەمارێکی مەلادا کار ئەکاو ئەیخاتە عالەمی شعرەوە ، ئەیخاتە عالەمیکەوە کە بەبی اختیار بانگ بدا بە دنیاداو بلی :

( شوخ وشەنگی ، زوهرە رەنگی ، دل ژمن بر ، دل ژمن
ئاورین هەیبەت پلنگی ، دل ژمن بر ، دل ژمن )

دیسان ئەلی :

( ئیرو ژ حوسنا دیم دوری ، دیسا هلاک و سەرخوشین
رەمزی دفی شیرین سوری ، صهتم بە پیتا ئانەشین )

کاری لە کار ئەترازی ، لە عالەمی پەنابەکیەوە ئەکەویتە عالەمی رازو نیازەوە بەناچاری بانگ ئەکاو ئەلی :

( دلبەری ئیرو سەحەر ئافتە جەرگی من دو دوخ
یەک لسینە ، یەک لدلدا لو ژمن تین ئاخ وئوخ )
( خون ژدل جوجو روان تی وەک عەقیقی ئەرغەوان تی
لی ژ دەست سەلوا جوانێ، ئەو شەپالا شەنگ وشوخ )

ئەم ئاگرە کە سەلما لە دلی مەلادا کردیەوە بلیسەی بەتینی تا ئاخر هەناسە مایەوە ، مەلای لە عالەمی غەرامیەوە خستە عالەمی تصوف والهیاتەوە ، مەلای والی کرد کە دەست لە دنیا بشواو ئاوارەی بەیکەری خەیالات ببیت ، وای لی کرد لە ئاخر هەناسەی ئەو ژیانەیا کە ئیتر هیوای چاوپی‌کەوتنی سالمای بورا بە بەریدی سەبادا ئەم شعرەی بو بنیری :

( بالمطلی جان فزانا ، فیمه بینت جارەکی
بالدعا بلغ تحیـــاتی بسلما یا بەرید ! )

گەلی ئەفسانەی سەیر سەیر ئەگیرنـەوە لە عەشقی مەلا بەرامبەر بە سەلما ! . . یەکیك لەوانە ئەلین عەشقی مەلا کاریکی وای کرد هەمو کەس پی زانی ، ناحەز چونە لای ملك کامل و پیان وت چون ئەبی مەلایەکی کەس نەناس بەم جورە دلی بچی لە کچی تو و ناوی تو و کچی تو لە هەمو عالەما بزرنـگینی ؟ ! .. ملك مەلای گرت وحەپسی کردو وبە کوشتن ترساندی ! مەلا لە حەپسا عەشقەکەی هەر زیاتری کرد . لە پاشا بە مەلـکیان وت ئیستە کە ئەلین عەشقی مەلا بەرامبەر بە سەلما عەشقیکی حەقیقیە بینە تاقی بکەرەوە ئەگەروابو هیچ ، ئەگەر واش نەبو بیکوژە . ملك هات سەلمای ناردە کیویك و لە پال تاشە بەردیکی گەورەدا داینا و مەلایشی ناردە ئەوی خوی بو چەند کەسیك لە دورەوە خویانیان لی دا گرتن ! . مەلا کە چاوی بەسەلما کەوت دەستی کرد بەگریان وکەوتە شعر خویندنەوە ، سەلما هەر ئەچوە نەنشتیەوە ئەو هەر لی دور ئەکەوتەوە . سەلما پی‌وت مەلا چەند سالە ئەم دیوانەبیەت بو من بە سەرهاتوە ئەوا من لە تەنشتەوەم !. مەلاوتی تونیتو زریکەیەکی کرد کلپەی سەند ، کە چونە سەری بوە بە قەقنەس ! وسەلماش هەر لەو شوینەدا مرد .

هەندیکی تر ئەلین کارەسات جوریکی تربوە ، هەر چەندە سەلما خوی لی نزیك ئەخستەوە ئەو هەر دور ئەکەوتەوەو سەیری ئەکرد و شعری ئەخویندەوە ، لە پاشا ملك هات ناوچەوانی ماچ کردو وتی سەلمات لی مارە ئەکەم ، مەلا کە ئەمەی بیست دەشتی گرتە بەر و رویشت ، تاما دیوانەبو لە ئاخرا بەوعەشقەوە سوتا و بەو ئاگرەوە لە دنیا دەرچو !! ...

دیسان ئەلین جاریك باوکی سەلما بەمەلا ئەلی ئەوا سەلمات ئەدەمی هەستە بچورە موسل شتومەکی زەماوەندی بو بکررە ، ئـەویش پارەیەکی زور هەلئەگری ئەچیتە موسل وگەلی شاری تریش ئەگەرری و هەروا بە دەست خالی ئەرروانەوە ، ئەلین بوچ هیچت نەکری ؟ ئەلی هەر چەندە گەررام

شتیکی وام دەست نەکەوت کەبو سەلما بشیت !

ئایا ئیمە لەم سەدەی بیستەمەدا ئەبی بە چە چاویک تەماشای مەلاو شعری مەلا بکەین کە لە دەمە دەمي سەدەی پازدەهەمدا هاتونەکایەوە ؟ . . ئایا دەنگی تەلی سوزي سەدەی بیستەم گویمان ئەزرنگینیتەوە بو ئەوە بەروەو پاش ئاورری بدەینەوە ؟ یا کارەبایەکي نیيي لە سەدەی پازدە هەمدا خوی دا گرتوەو هەمو هوشي ئادەمیزادی سەدەکانی پاش خوی رائەکیشیتەوە ؟؟ بو ئەوە بە دەنگي پیانو بە بي بیانو ، لە ژوریکي دور لە بیگانە و نزیک لە یەگانە هەمو دەمارەکانمان وەکو وینەی چل چرای سەر شەپولی ئاو لە شەویکی مانگەشەودا بەبی سزا بکەونە نزا !! . . لام وایە ئەمەی دوابیانە ! . دیارە ئەمەیانە چونکە را کیشاني کارەبای روحي گەلی بەهیزترە لە کارەبای مادّی،چونکە کەمادّەی خوی نمالەویش نامیني،بەلام روحي بەشیکە لە مادّەی عەناصر، نیاچونی بە تیا چونی کەونە ، تا کەون بیبت ئەویش هەیە ، تا گیان ، لە وەچە وەچەی گیانلەبەرا بیبت ئەویش هەیە !. . سەدەی پازدەهەم مادام کارەبای نەفسیەتی مەلای تیدا هەلیکەوتوە بە دەنگي پیانوی شعری نەوەکت دلي زانایانی شعري ئەو لە سەدەی بیستەمدا بەلکو لەسەدەی سیهەم وپاش ئەوەش راثەکیشیتەوە بو ئەوە لەو ژورەدا بەودەنگە سەر خوش و بەو رەنگە روگەش بین !! .. کەوابو مەلا پیغەمبەری سەدەی پازدەهەمي شعر بو لە کوردیدا ، شعری مەلا زەنگیکی دەنگدار بو لە سەدەی پازدەهەمدا وەکو دەنگی بەینی دو شاخ کە ئەم ئەیداتەوە بەو و ئەو بە ئەو ئەمیش هەتا دنیــا پیشتر گوی دەنگي لە بەینی دو لیواری سەدەکانا زیاتر دەنگ ئەداتەوە؟ ئەمەشیان دیسان هەر بو مالەي کوردي .

ئیستا بکەوینە سەر باسی ئەوە بزانین ئایا ئەو شعرانەی مەلای جزیری کە ئەم شورشەیان خستوتەوە چە پایەیەکی لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەیە ؟ وە چە هیز و پیزیکي بە لالەزاری وشەو ومیرغوزاری مەعنا داوە ؟.

مەلا دیی بە باسکردنیک کە سەرتاپای اعجاز و بەلاغەت بی باسی ئەو یارە خۆشەویستەی ئەکا کە سەرچاوەی ئەم ئیلهاماتەیەتی و ئەیکا بە پەردەیەکی ئاوریشم و بە تانو پوی خەیالی خوی ئەیتەنیتەوە و ئەلی :

من دی سەحەر ، شاهی مەجەرر ، لەبسی دبەر ، مەخمور بو
ئەو دیم ، زەرری، سورر ، موشتەری، یارەب پەری یاحور بو؟!

حوری وەشە ، شیرین مەشە ، کاکول رەشە ، خال حەبەشە
خالین دقەر ، مسکی تەتەر ، نازک بەشەر ، کافور بو !

نازک لەتیف ، گەردن خەفیف ، لبسی شەریف . کیخمەوقەدیف
من دی بە وەخت ، ئەونیک بەخت ، ئیرو لە تەخت ، فەغفور بو

فەغفور سورە ، سیما دوررە ، هەیبەت پرە ، پردل گرە
ئەو هاتە مەش ، من چومە هەش ، دل من ژ عشق فور بو !

دل بو گری ، زایا بەری ، لازم هەری ، دی ئەو زەرری
من دی گەلەک ، ئەو سور مەلەک ، وەک مەشعەلەک پر نور بو

دیم فەنەرە ، خال عەنبەرە ، بو ماوەرە ، لەب شەکەرە
ئەو مەی پەرست ، مەشهاو مەست ، جاما د دەست ، فەزفور بو

مەی پەر کەفی ، مەشبەساوەنی ، سوزا دەفی ، دا قەرقەفی
حوسنا لە دیم ، وصفا نەشیم ، هەرجی دەبیم ، ژی دور بو

دامن سروش ، وەرمەی بنوش، زەوقو خوروش، لوچوم ژ هوش
ژی عشوەیا ، یاربو خویا ، ئەو نەژمەیا ، ئەنگور بو

من دی بە خواب، ئەو ماهتاب ، دا دل کەلاب ، جوهنی غوراب
دل شەویشاند، خون لی رشاند، خوش هەررشاند ، تیک هور بو

هور کر جەمەند ، قەوسی صمد ، تیردان کەمەد ؛ دادو مەدەد !
جەرمان ژنو ، خوندایە کو ، عشقا مە لەو مشهور بو

لو یەکێ نەسەق ، من تین سەبەق ، نورا بەحەق ، دا دل شەفەق
شـیرین لەبی ، دیم کەوکەبی ، لی بـەنـدە بی دەســـتور بو
دلبەر سەحەر ، دامن نظر ، خەجلیم زبەر ، لی گەو قـەدەر
زانیم کەوا ، ئـەو مـەهروا ، وەکێ لۆلوئی مەنثور بو
پاش فرقەتی ، زور محبەتی ، مە تەلعەتی ، چوم حەزرەتی
وصلاحبیب ، من بو نصیب ، مەلعون رەقیب رەنجور بو
جاما زەلال ، خـەمرا حـەلال ، یاری شـەپال ، دامن بە حال
عشقا غەدار ،(٠)سوهتی ستار ، ناف مەو یار ،سەد سور بو(٠) (جوهتی)ن
شاهی چەڤین ، غەم زێ رڤین ، ماری شەڤین ، ئیساند ئەڤین
دەردو بلا وبن چون هەلا ، عمرەکێ « مەلا » مەهجور بو
پررمن‌زەجر ، دیتن هەجر ، مابو ئەجر ، سوبحو فەجر
شەمما مەهلبو سـەد مەحـەل ، منت سـەدل مـەسرور بو
احرام مەبەست ، ئەسوەد بە قصد ، یارهاتە مەست ،ئەز چومە دەست
جوهتی حەبەش ، تیردان بەوەش ، حە جا مە خوەش مەبرور بو
یار وەعدەدا ، بەعین خودا ، دەر بامەدا ، چین بەزدەدا
دەسپیدەی ، چوم وەعـدەی کوژبادەی مـەخمور بو
وی کا کولی ، چین دلی ، قەلبی « ملی » داف‌دانەلی
داڤا دلان ، ناف سونبولان ، سەر سور کولان ،مەتقبور بو..
پا کژێ ئەم شعرانە ئەلی :

من لە دەمەدەی بەیانا پادشای مەجەرستان ـ کەیاری خوشەویستمە ـ چاوم پی کەوت لە جلو بەرگی مەخمەلدا ...رومەتی وەکو ئەستیرەی موشتەری ئەدرەوشایەوە . خوایە ! ئەوە پەری بو یا حوری بەهەشت ؟ ... یاری من لەوینەی حوریدایە ، رومەتی چەند جوانە ! کا کولەکانی رەشەو خالی وەکو زەنگی وایە ... خالەکانی میسکێ ئامیزە وەکێ میسکی تەتەر، پیستی جوانی

نازكءو سپیه وەکو کافور ! نازکیکی نازکء ، گەردنیکی باریکء ،
جلوبەرگەکەی جلی پیاو ماقولان بو کە تافتەو قەیفەیە من چاوم پی
کەوت لەوەختا ، ئەو چاکء بەختە ئیمرو لە سەر تەخت بو وەکو فەغفور -
- ناوی پادشای کونی چینە - دوررو کاسەی چینی لە رومـەتیابو ،
هەیبەتیکی زورو دلیکی قایمی هەیە کە ئەو هاتە ریی کردن من لە خوم
بوردمەوە دلی من لە عەشقا جوشی خواردو فوارەی کرد ! دل
توایەوەو دازاییە خوارەوە، ئەبوا وای لی بهاتایە مادام یاری زیرریني چاوپی
کەوت .. بویەش ئەبوا وا بوایە جونـکە من گەلیجار چاوم پی کەوت ئەو وینە
ملائـکەییە وەکو مەشخەلان پرد نور بو ! ... رومەتی وەکو فەنەرە
- چرا - خالەکانی عەنبەرە ، بونی بونی گولاوە ، لیوی شەکەرە ئـەو
مەی پەرستەی سەر خوشي مەیە جوانە جامەکەی دەستی فەرفوری بو ...
ئەو مەیە کە لە سەر دەستیەوە بو زور موشتەهاو سافبو .. مەیکی وابو
سوزی دەفی دا بە شەراب... ناتوانم باسی جوانی یارەکەم بکەم و پیم نا کری
تاریفي بکەم چونـکە هەر شتیکء بلیم ئەو لەوەوە دورەو زیاترە ... بانگء
کرام وەرە مەی بخورەوە بو ئەوە جوشو خروشیکت بی، بە گویم کردو
لە هوش چوم ! .. ئەممە کە بەسەراهات لەبەر نازو عشوەی یاربو نەوەکء
لەبەر ئاوی تری - کە شەرابە - . . من لە خەوا ئەو ماهتابەم چاوپی کەوت
دلمی دایە بەر قولاپیجوتە قەلەکەی چاوی ... دلي تیکدا - دلیمن - خوینی
لی دەرهینا برینداری کرد ، جوان جوان هارریەوەو وردی کرد ! لەشي
ورد کرد - لەشيمن - دوکەوانەکە - کە بروبەتی- کردیبە تیرو دای لە دل ،
هەی دادو بیداد ! برینەکان سەر لە نوی ئەکولینەوە لە بەر ئەوە عەشقي
ئیمە بە ناو بابـگء بو ... بە یەکء جورو لەسەر یەکء لەسەریەکء بو من
دین ، نور ، بەراستی ریی رونا کء کردەوە ... ئەمانە هەمو هی لیو جوانیکی
رومەت ئەستیرەیەکء بو، بەلام بو ئەم بەندەیە هیچ دەستورو فەرمانیکء

نەبو ... دلبەر لە بەیانا سەیرێکي کردم تەریق بومەوە زور زور ... چونکە زانیم کە ئەو مانگە روە وەکو لۆلوئی پەخش و بلاو وابو ... لە پاش جیا ـ بونەوەی ئەو مانگە روەو خوشویستنیکی زوری چومەوە لای .. وەسلی ئەو بو بە بەشم ، جا با رەقیبی مەلعون بو خوی هەز دلگران بی ... جاي زەلال لە شەرابي حەلالدا یاری شوخ و شەنگم خیرا دای بەمن .. عشقي ستەمکار سوتاني پەردە لەبەین منو یاردا ، کە ئەو پەردانە سەد شورە بون .. شای چاوان خەمیان رفان ، ماری شەو حوبی وەستان .. دەردو بەلا هەلاتن ، زەمانیک « مەلا » دورکەوتەوە لەم ئیش و ئازار ... من بو بوم بە هیلانەی زەجرو دوري ، تولەیەکم کەبو مابو بیتەوە بەیان و شەبەق بو . شەمعی ئیمە لە سەدلاوە هەلبو ، سوپاس بو خوا دل زور کەیف خوش بو... احرامان بەست بو رەش ( حجر الاسود ) یار سەر خوش بو ، من بی هوش بوم ... جوتە قولەکەی دو زولفي بون بەتیرو خویان بو هاویشتم ، حەجەکەمان بە پوختی قبول بو ! .. یار وەعدەی چاوی خوی بە ئیمەدا کەچی تاپی لی داخستم و پەردەی چین چین دادایەوە ... لە بەیانا کە چومە سەر وەعدەکە سەیرم کرد لەبەر بادە بەسەرخوشي کەوتوە ! ... کاکول و ئەگریجەکاني دل ئەچننەوە ، داوی بو دلی « مەلا » داناوە ... داوي دلان لە ناو گول و گولە سەر سورەکانا بو کە ناوەکانیان هەلکەنرابون ...

ئیمە کە تەماشای ئەم شعرانەو مەعنای ئەم شعرانە ئەکەین خیرا ئەکەوینە عالەمیکەوە لەویدا تەنیا روحیەتیکي غەرامي نەبی کە لە بوتەی زیرریني وشەی اعجازدا داررژاوە هیچي ترمان بەرچاو ناکەوی . . . گەلی کەس کەوتونەتە عالەمی غەرامەوە ، گەلی کەس چاوی چاوکالان لە گوشەی سیامالانا کاري تی کردون ، یا بوە بە گەوهەریک بویان بو ئەوە بەتیشکەکەی لەبن دەریاکانا شتي بەنرخی پی بدوزنەوە ! . بەلام نەوەک ئەوان و نەوەک مەلا ! : مەلا شیوەی جورە غەرامیکي سەدەی پازدەهەمان پیشان ئەدا کە تایەتي جەمال

له بناغه‌ی وشه‌کانی‌و له بنچینه‌ی تیایا سه‌ر سامه .. ئه‌مه له‌لایه‌که‌وه له‌لایه‌کی تریشه‌وه گویا علمای به‌لاغه ته‌نیا ئه‌و عیلمه‌یان هه‌ر بو مــه‌لا داناوه ، وه یا مه‌لا ده‌ستی علمای به‌دیع و به‌یان و مه‌عانی را کیشاوه بو سه‌ر زه‌وقی خوی‌و ده‌رزی داداون که ئه‌بی جناس ، ته‌لمیح ، به‌دیع ، تعبیه ، ئیستعاره ، مه‌جاز و کنایه ، اطناب و ئیجاز له‌و وه‌ر نگرزونابی که‌سی‌تر ده‌ست بو ئاسمانی خه‌یال و خه‌یمه‌گای غه‌رام دریژ بکا ته‌نیا ئه‌و نه‌بی !! ..

به‌لی راسته ئه‌م شعرانه ته‌ونیکه تانو پوکه‌ی وشه‌ی عه‌ره‌بی و کوردی‌یه به‌لام ئیمه نابی ئه‌وه له دل ده‌رکه‌ین ، که وه‌نه‌بی له ده‌وری مه‌لادا ته‌نیا مه‌لا عه‌ره‌بی به‌کار هینابی . . به‌رزی مه‌لا له‌وه‌دایه که ده‌وری عه‌ره‌بیــه‌ت گه‌یشتبوه چله‌پوپه که‌چی مه‌لا له‌و ریچکه‌یه لای‌داو عه‌ره‌بی به کوردی رازانده‌وه ...ئه‌مه‌و دیسان ئیمه له‌و ده‌وره‌دا سه‌یری مه‌عنا ئه‌که‌ین نه‌وه‌که وشه . ئه‌گه‌ر یکی به‌راوردی هه‌نمه‌نات و وشه‌و مه‌عنای ئه‌و ده‌وره بکا ـ که‌به هه‌ر زمانیک وترابی ـ زور زو ئه‌که‌ویته سه‌ر ئه‌و باوه‌ره‌ که مه‌لا مه‌شخه‌لانیکی هه‌لگیرساندوه بو ئه‌وه علمای ئه‌ده‌بی عه‌ره‌بی زه‌نگیانه‌ی له به‌ر به‌ونه‌وه وه بو ئه‌وه ئوده‌بای کوردی شوین رچه‌که‌ی مه‌لایان بو بی به شاریکه‌و له عاله‌ی بیگانه‌دا مه‌لایان بو ببیت به‌و سیمورغه که ئاوی ژیانی ئه‌ده‌بی‌یان له پشت کیوی قافه‌وه بو دینیت ... که‌وابو میژوی ئه‌ده‌بی کوردی به دریژایی زه‌مان کرنوش بو ئه‌و تاپویه ئه‌با که هه‌یکه‌لی زیرینی مه‌لایه‌و پیغه‌مبه‌ری ئه‌ده‌بی سه‌ده‌ی پازده‌هه‌میه‌نی ...

* * *

مه‌لا له باوه‌ری خویدا په‌رده‌ی غه‌رام دا ئه‌داته‌وه و به جوریکی زور ورد ئه‌چیته پاریزی تصوف و عه‌شقی حه‌قیقیه‌وه ، داوای ناسینی خوا له باده‌ی ئازمایشدا ئه‌کا و به‌شه‌رابی مه‌عنه‌ویات روبابی دلی ئه‌خاته له‌رزه‌وئه‌لی :

عەوەل کو یار دامە ، یەک زەررەیەک عنایەت
قسمت مە خەمرو جامە ، د دەفتەری هدایەت
حوسن و جەمال جانان نادیرتن تو پایان
هەرچی نەبت بدایەت ، اصلا نهین نهایەت
فیضا علوم و حکمەت جاما سەدەف ئەکو گیرا
مە ژ دەست مغبەچان دیت بە مصحف و بە آیت .
عارف حتا نەنوشی مەی ژ دەست مەی فروشي
غائب نەبو ژ هوشي ، پەیدا نەکر ولایەت
گوناه و زوهد و تاعات ، هەلنا گرت خرابات
کەسی بفی دەري دت دفی بکت رعایەت
عشق ژ هەردو چەشمان ئەوەل د دل اثرکر
لی زەررە زەررە ئاخر سوتن کرە سرایەت
شاکي السلاح هەر دەم بکوشتنا ملی دیت
گا زندەیا ژکي کم یەکی بکەم شکایەت ؟ .
جاما ژ دەست شاهد زەنگي ژ دل دشوتن
پیری موغان ژ رەندان وە وە دکر روایەت
اطوار عشق و مەستی ، ئەسرار بوتپەرستی
تەقریر سەد روایەت ناکت ژبو کفایەت
« لیطمئن قلبي » عین الیقین دبەخشیت
عین العیان دڤیتن کافي نهین درایەت
گەرمیر و پادشاهي مویەک لنک « مەلایی »
نادم بە ملك عالەم ، باللە یەک عنایەت ! . .
واتە : لە ئەوەلەوە کیار « خوا » دای بە ئیمە توزی عنایەت وچاوبري..
بەشی ئیمە مەی و جام بو لە دەفتەري هدایەتدا ... جواني و جەمالي جانان

پایانی بو نیه .. هەرشتێک ئەوەلی نەبێ ئاخریشی بو نیه ... بە ئایەتو بە قرآن سویند ئەخوم ئیمە بەهرەی علوم و حکەمان چاو پێ نەکەوت مەگەر لە سەر دەستی بەچکە موغانەکان ـ یا ئەو کوررانە کە لە مەیخانەکاندان ـ ... پیاوی زانا تا نەنوشی مەی لە دەست مەی فروشی .. لە هوش‌خوی ناچیو ولایەت پەیدا ناکا ... گوناح و زوهدو عبادەت مەیخانەکان ئاشنایەتیان لەگەلیانا نیه .. یەکێ کە هاتە ئەم قاپیەوە ئەبێ تەماشای یاساو اصول بکا ... عەشق کە لە دو چاوەوە سەری هەلدا لە پیشا کار ئەکاتە دل . . لەوەوە وردە وردە ئەتەنیتەوە بو لەش‌و ئەیسوتینی ... بە چەکی روتەوە هەمو جار بو کوشتنی مەلا دیت . . بانگی کی بکەم‌و پەنا بەرکی بەرم و شکایەت لای کی بکەم ؟... جامی کەلە دەستی شاهد ـ یار ـ بیت ژەنگی دل ئەشواتەوە .. پیری موغان لە رەندانی‌خەراباتەوە ئاوای‌ئەگیرایەوە ... باسی‌عشق‌و سەرخوشی‌و نهینی بوت پەرەستی .. ئەگەر سەد نومارو دەفتەری بو پرربکریتەوە هیشتا بەش ناکا ! .. ئایەتی ( لیطمئن قلبي ) پایەی ( عين اليقين ) مان پێ ئەبەخشی . بەلام ئەوەی ئیمە ئەمانەوێ ( عين العيانه ) روایەت کردن بەکەلک نایە .. ئەگەر میر بیت و ئەگەر پادشا بیت لەلای مەلا وەکو یەک وایە . سویندم بە خوابێ بە هەمو ملکی دنیای نادەم توزی چاویری خوا ...

ئیمە کە چاو بەم فەلسەفەگیریەی مەلادا ئەخشینین ئەبینین کابرا بە جوری خوی لە دەریای تصوف و عەشقیکی راستەقینەدا نقوم کردوە مەگەر هەر لە دەست دوورر ناسانی ئەو دەریا بێ بەیە هاتبیت ئەگینە نیمچە مەلەوان ناتوانێ با هەزار شانو قولیش بکوتێ بگاتە لیواری رزگاری ! . ئەمەش راستەوایە چونکە ئەو خوی بە ئاشکرا ئەلێ :

مەعشوقی راستەقینە کە نوری بارەگای یەزدانە سەرەتا ، کە توزی لای لە ئیمە کردەوە کەوتینە ریزی ئەو کەسانە کە ناویان لە دەفتەری رزگاربوتا نوسراوە و لە کورری سەرخوشانی ئاشنای بارەگای یەزدانیدا بە بادەی

تاقی کردنەوە شەرابی معرفةالله مان نوش کرد ، بوین بە یەکی لەو کەسانە کە لە عالەمی مادەوە کەوتنە عالەمی مەعنەویات ، کەوتینە ئـەو عالەمەوە کە تاپی نوری بارەگای کردەگارمان بو کرایەوە و پەردە لە روی کار لادرا هەر چەندە تەماشامان کرد ئەو پەرری ئەو نورەمان بەدي نەکرد ! چوني بەدي ئەکەین ؟! شتیک کە سەرەتای نە لە عالەمی مادەوە ، نە لە عالەمی ئەرواحەوە دیار نەبی بی گومان سەرەکەی تری هەر بەجاری دیار نابی ! . ئیتر بەبی پەروا بوین بە پەروانەی ئـەو نورە کە تیشکیک بو لە زاتي پاکي خوا و بو بە خوشەویستیکی راستەقینەمان ، وەنەبی من ئـەم ئیشەم سەربەخو کردبیت بەلـکو کە چومە کورری بادەنوشانەوە سەیرم کرد کوگا ، کوگا حکمەتو زانیاري لەویدا مەخشەلانیەتي ، تەماشا ئەکەم ئەمە هەمو لەو کەسانەوە پەرز ئەبیتەوە کە بادەگیرري ئەو کوررەن ، ئەوانەش هەمو نەونهالانی مەیخانەی حەقپەرستین و بە جامي اخلاص‌ودلپاکي شەرابي حـەقیقـەتي وحدانیەت بلاو ئەکەنەوە . . لەزەتی ئەو شەرابە سەر خوشی ئەکردم بو ئەوە کە زیاتر لەو مەیخانەیەو لەو نەونهالانە نزیک بکەومەوە ! . بویەش وام ئەکرد چونـکە ئەوانەکە ئارەزوی حەقپەرستیان لە سەردایە تا شەرابی حەقیقی لە دەست ئەو مەی فروشـە حەقیقیانە ـ کە شـارەزای جەمالي وەحدانیەتن ـ وەر نەگرن‌و نەنوشن لە عالەمی مادە دور ناکەونەوەو ناکەونە ئەو عالەمەوە کە هەمو نهینی کەونیانـ وەکو روژ بو دەرکەوی‌وناکەونە دەریای مەعنەویاتەوە و ناچنە ریزي ئەو پادشایانە کە بەچاو لە یەک‌تانیک ئەم پەررو ئەو پەرري دنیایان بو رون ئەبیتەوە . .

بارەگای کورري سەرخوشانی خواناسان وەنەبی پیاو بەگوناح یا بە عادەت دەستي کەوی چونـکە ئەو شوینە شوینیک نیە بی بە جەزای ئەو کەسانە کە لە گوناح دور کەوتونەتەوە . . تولە ئەوەیە بە ئەندازەی کردەوە بیت ، تولەی ئەو کەسانە کە لە خرابە دور کەوتونەتەوە هـەر ئەوەیە کە

خوابیانبەخشیت . ئەو شوینە کە دانیشتوەکانی لە لەززەتیکی ئەبەدیدان ئەمە تولەی کردەوە نیە بەلکو زیادە مهرەبانیەکە کە خوا لەگەل هەندی کەسیا ئەکا . . جا ئەو کەسە کەرو ئەکاتە ئەو قاپیەو بەتەمای ئەوەیە بچیتە ژورەوە و بە لەززەتی نوری خوا شادبی تابی بو بونەکەی عبادەت بکاو بو نەبونەکەی گوناح ، چونکە شوینەکە شوینی عبادەت و گوناح نیە بەلکو تەنیا هیلانەی مهرەبانی خوایە . .

بەلی راستە سەرەتای عشق لەتیشکی دوچاوی روالەتەوە ئەتەنیتەوە بولەش و ئەیسوتینی بەلام ئەمە وەنەبی کارەساتی هەمو مەعشوقیک بیت ، ئەمە تەنیا لە دەست ئەو مەعشوقە حەقیقیە دیت کە سەرەتا لە هەیکەلی نوری دو چاودا دەر ئەکەوی . جا ئەگەر یکیک توانی ئەو ئەرکە بەریوە بەری و خوی لە بەریا راگریت ئەوا رزگاری ئەبی ، خو ئەگەر نەیتوانی وردە وردە ئەتەنیتەوە بو دل و بو لەشی تا بە جاری ئەیسوتینی و ئەیخاتە ناو ریزی گومراهانەوە . .

من لەم لاوە ئەمە کارەساتە لەولاشەوە نەفسیکی پیسم لەگەلا یە ، مادیاتی بە فیکری خوی بو رازاندومەتەوە وە بە فیکری من بوی کردوم بە خنجەریکی روت و بەو خنجەرە بەلامارم ئەدا بو ئەوە لە لەززەتی مەعنەویات بی بەشم بکا و لە دەشتی سەرگەردانیدا بم سوورریتیەوە ! . جا کە نەفسیکی وام لەگەلا بیت نازانم ئایا ئەگەر پەنا نەبەمە بەر بارەگای وەحدانیەت و بانگ لەو نەکەم هاوار بوکی بەرم وشکات بخەمە بەرکی ؟؟ . ناچارم هەر ئەبی پەنا بەرمە ئەوی بو ئەوە هەرکە نزیک بومەوە بتوانم بە هوی ئەو کەسانەوە کە لە سیبەری عەرشی خوادا بە جەلالیکەوە راوەستاون هەندی لە ئاوی مەعرفەتی حەقیقیم دەست کەوی و وەسوەسەی شەیتانی و نەفسانی بەو ئاوە بشومەوە و خوم پاک کەمەوە . سەر بەخوش ئەمەیم نەکردوەو نایکەم پیری سەرخوشی ئەو راوێژەم بو ئەکا . . ئەو هەر ئەوەندە

ئاموژگاریەکە ئەکا ئەگینە من لەبەر ئەوە هیشتا لە بوتەدا ئال نەبومەتەوە ناتوانم نەباسی عشق بکەم وە نەباسی زانینی سەرخوشانی ئەو مەیدانە بکەم چونکە نە من وە نە ئەوان هیچی‌لی نازانین ا، من لی نازانم چونکە هیشتا نەکەوتومەتە ناویان ، ئەوانیش لی نازانن چونکە لەززەتی رواڵەتی نورەکە وای سەر خوش کردون لە حقیقەتەکەی هیچ تی نەگەیشتون ! دەی کارەسانی کە ئەمەبی چون بە هەزار تومارو دەفتەریش ئەنوسریتەوە ؟!.

ئیمە خو نەچوینە ریزی ئەو کەسانە یا یەکی لەوکەسانە کە خوای وت « اولم تؤمن ؟. » ئەویش وتی « بلی ولـکن لیطمئن قلبی » ؛ بەلی، بەلام بو ئەوە دلم دامرکیتەوە . جا ئەو دل دامرکاندنەوەی ئەوان یەقین و برروا یەکیاف بو دروست ئەکا ، ئەو ابراهیمی خەلیل بو ، پیغەمبەری خوا بو ، ئیمە بەندەیەکی شەر مەزارین تا بەچاوی خومان شت نەبینین بەگیرانەوە بروا ناکەین ، ئیجگار بویەش واینە چونکە نەفسمان پاک نەبوەتەوە ! . کەوا بو ئەبی ئیمە بو ئەوە کوشش بکەین کە سەر بەخو بگەین بە بارەگای وەحدەت‌پەرست و خومان بخەینە کورری سەرخوشانی وەحدەت پەرستەوە ئەگینە بەگیررانەوە بلین‌شت هەیە ئەمە ذادیکان‌نادانی!.

من کە « مەلا » م ئەگەر بکەمە ئەو پایەیە کەخوا لایەکم لی بکاتەوە ئەوە هەمو عالەمی مەعنەویانم رون ئەبیتەوە ، دەست لە دنیا ئەشوم و هەموم بەلاوە هیچە . کە گەیشتمە ئەو پایەیە پادشاهی و هەژاری ، ئەمیری و رەجالیم بەلاوە یەکەو وەکو یەکێ دیتە بەرچاو، چونکە هەمویان بەو عنصرە ئەزانم کە لەمن خرابتر ئاتاجی لوپچیکن لەو دەریای مەعرفەتی خوایە ! . .



مەلای شاعری ئیمە وەنەبی هەر مەی نوشی بادەی غرام یا سەرخوشی کورری تصوف بو بیتو هیچی‌تر بەلـکو کەدیتە باسي الاهیاتو فەلسەفەوە لەلایەکەوە ئەتخانە جەرگەی کورری فەیلەسوفەکانی یونانەوە ، لەلایەکەوە

ئەنجاو بژبتە ئەو کونگرەیەوە کە عالمەکانی ئیسلام و غەیری ئیسلام تیـــایا کو بو نەتەوە و هەمو باسو خواسیکیان هەر الاهیات و فەلسەفەی الاهیاتە . وات لی ئەکا ئەلیت مەلا بو هیچ دروست نەکراوە تەنها بو فەلسەفەی الاهیات نەبی . بویەش ئەمەت پیشان ئەدا چونکە ئەبینی تو وا لەو مەیدانەدا بی پەروایت ، یا سەرخوشی مادەیت یا دەستخوشی نەفسیت ، سەری رائەوەشینی و پیت ئەلی :

الله الله تو دعمری خو کو جارکێ نەبهی
چە سەدا تیت ژفی گونبەد دوار حدوث ؟
تو ژپیش پەردەی وەهمی ومرەدمر دا ببهی
چە نەوا تیت بەسەد نەغمە ژ ئەو تار حدوث ؟
حال و مستقبل و ماضی دخودا هەر سە یکن
سوبح موجودە بە عین خو دایشار حدوث

پیت ئەلی تو بو چ ئەوەندە سەر خوشی مادەیت و روالەت پەرست ؟! .

کەون با زور کونیش بیت شتە وردەکانی ئەوەمان پیشان ئەداکە دورشتەکانیشی هەر لەعالەمی نەبونیەوە هاتونەتە عالەمی بون ، تو بو چ ئەبی جاریک هوشت بەبەر خوتا نەیەتەوە ؟ بو ئەوەکە ببیەت لەم گومەزە شینەدا هەر دەنگیک کەدیت بانگی تیا چون ئەکا ، بانگی ئەوە ئەکا کە موجوداتی عالەم هەمو حادثە ، ئەم پەردەی وجودەکە کشراوە بەسەر تودا سیبەریکی روتە . جاریک لە ژیر ئەم پەردە وەهمیەوە سەریک بینە دەرەوە بو ئەوە ئەو دەنگانەت گوی لی بی کە لە تەلی دلی زانایان ، یا ئەو کەسانەوەکە لە حەقیقەتی وجود و عەدەم تی گەیشتون بانگی هوشیار بونەوەت ئەکەن ، بانگی ئەوەت ئەکەن کە عالەم بو تیاچون دروست کراوە نەوەک بو مانەوە . ئەم شتە روالەتیانەکەتو ئەیانبینیت یا ئەم پەردە جوراوجورانە کە هەلئەدرینەوە و دەمیک رابوردو ، دەمیک ئیستەو دەمیک زەمانی هاتووت پیشان ئەدەن ئەمانە با ، لە روالەتیشا جیا

بن لە حەقیقەتا هەر یەکن ، لەو حەقیقەتەدا کە حدوثە ، لە حدوثدا هەمویان عنصریکی هاوبەشن ، ئەو بەیانیە کەتو بەرچاوت ئەکەوی و بە مەوجودی دائەنیت هەر ئەو بەیانیە پەردەیەکە لەو ئیوارەیە کە بەجیت هیشت و بو بە حادث ئەمیش عەینی حدوث پیشان ئەدا ...

* * *

تا ئەم شوینە ئیمە لە باسی مەلای جزیریەوە دواین . ئەگەر لەم لایەنەوە خەریک بین گەلی توماری ئەوی و هیشتا بە تەواویش ناگەینە حەقیقەتی نەفسیەتی مەلا ! .. ئەوەندە هەیە ئەتوانین ئەوە بلین کە مەلا لە سە پەردەدا خوی پیشان ئیمەدا ، پەردەی غەرام ، پەردەی تصوف ، پەردەی الاهیات و فەلسەفە. لەمانەدا شیخ احمدی جزیری سەرامەدی دەوری خوی بو پاش خویشی بوە بویە ئیستەش هەر لەولاتی جزیرو بوتانا شعرەکانی شەوچەری دیواخانی رەوالان و شیخو مەلایانە ، بەزم هەلگیری هەلپەرکیو سەر شەخسانە ، زەمزەمەی کوڕی جمەو ئاهەنگی فەقیەکانە ..

شیخ احمد وەکو چون شاعریکی کوردی بوە هەروەها بولبولیکی فارسی و نەواخوانیکی عەرەبیش بوە .

مەلا دیوانیکی بەرزو بالای هەیە روژەلاتی نلسی ئەلەمانی « مون مارتن هارتمان » لە ١٩٠٤ لە بەرلین بەلیتو گراف چاپی کردوەو خویشی سەرەتایەکی بە ئەلەمانی بو داناوە . گوایەکی لەو نسخانەکەوتبونەلای « اب انستاس کەرمەلی » لە بەغدا . کتیبخانەکەی لە پاش خوی بو بەهی « مەکتەبەی ئاثاری قدیمە » هەر لە بەغدا . من گەلی کوششم کرد کە ئەو نسخەیەم بەرچاوکەوی داخی گرانم نەمدی ، لەگەل ئەوەش ماموستا « گورگیس عواد » مودیری مەکتەبە کوششیکی زوری بو کردم ، لە پاشا وەکو بومان دەرکەوت کتیبەکانی « اب » هەرشتیکی بەزمانی فەرەنسزیە لە « دیر »ەکەی خویا ماوەتەوەو لە کەلکی استفادە کەوتوە .

نسخەیەکی تر لە لایەن « محمد شفیق ئارفاسی حسینیەوە » لە ئەستەمبول لە

١٣٤٠ هـ ـ ١٩٢٢ م بەم تيپانە لە چاپ دراوە ... لە روی نسخە ئەلەمانیەکە نسخەیەکي دەستخەتي ماموستا محمد عـلی عونی لی وەر گیراوەو ئیستە لە کتیبخانەی « دار الـکتب المصریە» دایە لە قاهرە لە ژیر ژمارە (١٤٠/١١٢) لە بەشي فارسی‌دا. دو نسخەی‌تر دەستخەت هەرلای ماموستای ناوبراو هەیە یکیکیان لە سالی١٣٢٢ی‌هجری لە شاری جزیرە لەلایەن «عبدالسلام کورری مراد کورری عبدالسلام »ەوە نوسراوەتەوە. یکیکي‌تریان لەسالی « ١٩٤٥ـ ١٩٤١ لە بەغدا نوسراوەتەوە . . بیجگە لە چاپەکە دەستخەتیکیش لای من هەیە کە « عبدالقادر کورري علی » عمادي لە ١٣٣٨ ی هجری لە عمادیە نوسیویەتەوە ... جیاوازیەکي‌کەم لە بەین‌ئەم نسخانەدا ئەبینری ، وەکو چون لە پاش‌و پیش کردني هەندی قصائدا ئەم جیاوازیەش هەر هەیە ...

من لە چاپکردنی ئەم لاپەررەیەدا بوم کەچی داخی گرانم کوتوپرر پیان وتم وا ماموستا محمد علی عونی لە خەستەخانەی « ئەسکندەریە » لە روژی ٩٥٢/٧/٤ داکوچی دوایی کرد !.

ئەو خەریکی نەچول شام عەدەمدا * من نەکەربەلای سارای ماتەمدا
ئەو یەزید مەرگ وە ئەسیربردە * من زادەی زیاد خەم پاقیر کەردە !
ئاوانی هەر دولامان چوەگل ! .

# بیسارانی

## ١٧٠٢ - ١٦٤١

پیریکي دانا ، مەلایەکي زانا . دلي ئاوینەی چیاکان و فیکری بەرزي ئەلـکتریکي بەندەنەکان . . شەیدای ئاسمانی هەورامان ، شابازي کلاوەی بیساران ، ماموستای ئەدیبان و رەنگریژی شاعران . . دلی کراوەتەوە بە ئیلهامیکي یەزداني بوە بە هیلانەی ئەدەبیاتي گوراني .. هەندی جارمەی گیری مەیدانی خاس خواکان بووە،هەندی جاریش بویژی کورری دلخوازان بووە . سەرچاوەی خەیالي وردي کانی گەشاندنەوەی گیان ، باخچەی گەوهەری ئەدەبیاني گەلی بە هیزتر لە ئاو و لەنان ؛ چونکە ئەم دوانە تەنیا بو ژیانە ، بەلام ئەو دوانە کوروکي ژیانە ! . .

ئەم شاعرە کوردەی سەدەی یازدەهەمي هجری ناوی « مەلا مصطفی »و کورری « مەلا احمد »ی بیسارانییە . بەپی لی کولینەوەیەکي زور کە بومان دەرکەوتوە لە « ١٠٥٢ هـ ـ ١٦٤١ م » لە دیی بیساران هاتوتە دنیاوە وە لە « ١١١٣ هـ ـ ١٧٠٢ م » لە تەمەنی « ٦١ » سالیدا کوچی دوایی کردوە و لە گوررستانەکەی بەینی «دوزرو» و « رەزاو» و «تەرخاناوا » دا نیژراوەو مەزارگای مەردمە[١] . « بیساران » گوندیکە لە « ژاومرو[٢] » بە ملوەی.

---

( ١ ) « ف . مینورسکی » ئەلی : ( بیساراني لە ١٧٦٠ مردوە وە لە دیی «دوررو» نیژراوە ) . . دیارە بە قسەی ئەو هاتنە دنیاکەشي دواتر کەوتوە! . بەلام ئیمە لە پاش پشکنینیکی زوز وە لەپاش ئەوە کەمن خوم چومە سەر مەزارەکەی ئەمەی خوم بەلاوە راستربو . .

( ٢ ) « ژاومرو » ناوچەیەکە ، لای روژاوای هەورامانەو لای روژەلاتی=

« (٣٠) میلیک کەوتوتە جنوبی روژاوای شاری (سنە) وە . . لە نەتەوەی

---

= چەی «مەلـکشان» و «چەی «سنە» یە تا ئەگاتە چەی «گاومرو» و «مەمەرواری» . لای جنوبی ناوچەی مەمەرواری و شاخی «شاهو» یەو لای شیالی ناوچەی «کەلاتەرزان» ە . «٤٠» هەزار کەسی دانیشتوی هەیە و شیوەی قسەکردنیان شیوەی هەورامی یە . شوینیکی سازگار و ئیلاخە ، ژیانیان جوتوگاو رەزەوانی یە ، لە میوەهاتا یەکیکە لە شوینە هەرەچاکەکانی کوردوستان .

ژاوەرو بیشکەی ئودەبا و شاعرەکانی کوردوسُتان بووە ، پیاوی گەلی ناودارو زاناى لی هەلـکەوتوە ، مەلا «یعقوب» کە باپیرە هەرەگەورەی بەرەی مەلای «بورریەر» و «پایگەلان» ە هەورشیکی لە ئەدەب و عیلمی کوردیدا هەیە . مەلا «جاداللە» ـ کە بەرەی مەلای «زریژە» و «کولیژە» ئەچنەوە سەر ئەو ـ قسەکانی شەوچەرەی ئەدیبانەو لە «دیوەزناو» نیژراوە . مەلا جامی کورری مەلا «مهدی» و شیخ نسیم و شیخ وسیم و مەلا عزیزی کورری مەلاجسیم ـ کە ئەمانە لەهەردوخیەکانن ـ ئاشنای بادەنوشانی ژاوەرو بوون . مەلا «اسعد» ی بورریەری کورری مەلا عبد الرحمان هەر لەمانە . مەلا «محمد» ی شاعری بەناوبانگ بەرەی زاناکانی دێی «هویە» ئەچنەوە سەر ئەو و ئەو یش ئەچیتەوە سەر «سید شریف علامە» . بەتایبەتی لە عالم و ئودەبای بەرەی «هویە» سید هدایت‌اللەی کورری سید عبدالرحمان و سید عبد الفتاحی کورری سید عبد القادر لە وەختی خویانا سەر زنجیرەی کورری ئەدیبان بوون .

هەر وەها لە دەوری خویا ئەم خاکی ژاوەرویە پیاوانی وەکو مەلا محمودی «هویە» و شیخ سلامی «بیساران» و مەلا حسین و مەلا غفوری «زریژە» و مەلا سعداللەی «وەسی» و مەلا احمدی «گەلین» و مەلا فتاحی «پایگەلان» و =

مەلا احمد ئیستەش گەلی کەس ماوە هەم لە بیساران و هەم لەدەرەوەیدا .
لە مەلا احمد بەدواوە هەمویان بەمەلا یەتیهاتونەتە خوارەوە ، بەرەی (قاضی)
(جوانررو)یش هەر لە نەتەوەی مەلا احمدە . بیسارانی تاماوە ژنی نەهیناوە .

بیسارانی لەبەر ئەوە مەلازادەبوە ســــەرەتا لە قوتابخانەو لە پاشا لە حوجرەی فەقیان خویندویەتی ، بو خویندن هەمو هەورامان گەرراوە ، ماوەیەک لە ( نودشە ) بوە ، ماوەیەکی زوریش لە دیی ( پایگەلان ) لەلای مەلا قاسم خویندویەتی ، لەپاشا لە سنە خویندنی تەواو کردوەو گەرراوەتەوە بو بیساران ... بیسارانی مەلایەکی زور بالا بوە ، پاشماوەی ژیانی بەدەرز ـ وتنەوەوە رابواردوە و گەلی اجازەی داوە بە فەقیان . . پیاویکی شوخ و

---

= مەلا صادق « ئەوی‌هەنگ » و مەلا محمودی « نیەری » پی گەیاندوە ـ کە ئەمانە هەر یەکە پالەوانی مەیدانی شعرو ئەدەب وعیلم بوون .

(پایگەلان) شوین هەواریکی گەورەی لە پیش ئیسلامەتیو پاش ئیسلامەتی لە میژوی کوردوستانا هەیە . تەنانەت ئیستەش هەندی بەلـگەی کونی هەر ماوەتەوە ، وەکو قەلای ( بایەزید ) و گردی ( نەقارەخانە ) و ( زیندان ) و قەلا تورەکەریژەکەی ،کە وەختی خوی شوینپاریزی میرەکانی ( پالنـگان ) بوون .

دیسان لە بەلـگەکانی ژاوەرو ( شای‌ورد ) هەیە کە ئەلین یەکیکە لە حەو گەنجەکەی خسرەو پەرویز کەوتوتە جنوبی دیی ( سەرریز ) و شیمالی ئاوی ( پالنگان ) هوە . وەکو چون گەلی بەلـگەی کونی‌تر لە ئاوایی ( نسەنار ) هەر هەیە ( * ) .

(*) ئەم ئاگاداریەو هینەکەی ( پالنگان ) ـ کە لە ( باخی شاعران )دا دیت ـ بەهوی دوستم ماموستا سید عبدالحکیم لە مەلا علی مەزدوخی کورری مەلا اسعدی پایگەلانیەوە وەرم گرتوە .

شەنگێ و قسەخوش‌و فیکر وردبوە ، لە عیلمی اصولدا دەستیکی بەرزی هەبوە ؛ کە دانیشتون قسەی خوشي زور کردوە ، بەتایبەتي کە سەبیلەکەی تی کردوە دەماخی تەواو چاخ بوە ...

مەلا مصطفى - وەکو زور شاعراني تر کەشەیدای دیمەنی ئیلاخان بن - چاوەندازي بیساران تابي جریکەی شعری بو کردوتەوە ، لە پال ئەمەوە شوخی خوشەویستیشي ئەوەندەی تر ئاگری ئیلهامەکەی خوش کردوە . دەوری جواني بە عەشقیکی داوین پاکیەوە - لەگەل دوستەکەی ( ئامینە)ی کچی ( شیر محمد )ی پایگەلاني - رابواردوە ، نازی رازي ئامینە کردویەتە کاری کە لەکالین و قوژني دەریای شعردا بە هەمو جور بگەرری ، ئەم سوزەی کە زیادی کردوە ئیتر دلی بوە بە پەروانەیەک و بەلاگەرداني نوری خوااناسي و فەلسەفەی‌عەشقی راستەقینە بوە . .

بەلی ! ئامینە ناویک لە دیی پایگەلانی هەبوە کە بەشیکی تەواوي هەبوە لە هەلقولیني سەرچاوەی شعری مەلا مصطفی‌دا وپشتیوانیکی بە هیزی بوە کە خەیالي وردەکاري بکەویتە کەللەیەوە و لە پەردەی شعردا دەري برری . ئەم دوستەی گەلی جاری واش بوە کە پەردەی دلي مەلای روکاندوە ، بە هـــەر باریکا لەگەلی بزوتوتەوە ئەو هەر لە سەر رەوشتي دوستي بەناز لی بەخەشم بوە !. جا مەلا ویستویەتي لەگەل ئەم دلرفینەیدا بکەویتە رازو گلەیی، بەلام لەوەش ترساوە کە ئیشیکي وانەکا پەررەی گولي دلي دوستي بژاکي ! . زور بە پاریزەوە و لە پەناوە پی ئەلی :

قبلەم یە حەیفەن وینەی تو شایی      بگیرو نـەدل خەشمی گەدایی.
ئەگەر گوناهی وەنەم کەري بار      بە سەر ، بەشمشیر ، بەنەناف،بەدار
وەگەر نە حەیفەن بەوانەی بەدگو      نەپەردە مانو رازي من‌وتو !

مەلای بیساراني توانیویەتي سکالای دلی خوی بە جوری هەلبرریژی کە نەیەلی گولي دلي دوستي خوشەویستی گەردي قسەی‌لی بنیشی وە لەگەل

ئەوەشا خوی بکا بە گەدایەکی بی نەواو زور بە گزیەوە پی بلی :

قبلەی شیرینم حەیفە بو پادشاهیکي وەکوتو کینەبەري لەگەل کەمتر کەسیکا بکەی کەبی نەوایەکي وەکو منە ، چونکە بی دەرەتانیکي وەکو من لەگەل شکوهي بارەگای عەشقي تودا چی پی ئەکری ؟ ! . ئەگەر توهاتیتو کەمتر سوچیکت لەسەر من دیەوە من لاري نیم خوم شیرو تەناف و سەدارەت بو دینم باتو نەکەویتە عەزیەتەوە ، سەریشم لەبەر دەستتا دا ئەنیم ؛ ئارەزوت هەیە بەشیرەکە پي بەررینە ، ئارەزوت هەیە بیکە بە تەنافەکەوە . ئەگەر خو هیچیش لە بەینا نیە حەیفە بە قسەی بەدگو رازو نیازي من و تو لەژیر پەردەدا بشارریتەوە ! ... بیساراني وشەی ( یە ) ی لە باتي ( ئینە ) بەکار هیناوە .

کە لەگەل دوستی نازاریا ریی ئەکەویتەوە بە دل و دیدە روی تی ئەکاتەوە بەبی ترس ئەبینی : وازولفي لولي شەوەبی یاري ئازیزي ـ کە خەملیوە لەسەر گوناي ئالیەوە ـ وینەی مانگ و ئەستیرەی رومەتي پیشان ئەدا و کوتوپرر نەسیمی سارای کوساران شنەی دیی و ئەو زولفەلولە ئەشەکینیتەوە ؛ دەمیک هەروا پیکیا ئەدا ، دەمیک وەکو رەشماري پەپکە خورە ، دەمیک وەکو لاولاوي سەرەتای بەهار بە نەمامي بالایا ئالاوە ، هەندی جار پاسەواني خالی سەر گونای ئەکا ، تاویک ئەبی بە پەرژیني باخی گولي رومەت و ناو چەواني . کانیاوي شعری هەلئەقولی و ئەلی :

شیرین زولف لول ، شیرین زولف لول
فیدای زولفت بام گا ، گرژەن ، گا لول
گا چون سیاومار بەشیوەن مەلول گا وینەی لاولاو مەپیچو نەتول
گا تا ، تان نەدەس گەردش شەمال گا خەفتەن سا کن نە دەوران خال !
گاهی پەشیوەن ، گاهی گرنجەن گا گا گرەبەند ملەمای زنجەن !

کە ئەمە ئەبینی دەست ئەکا بە پاررانەوە وپی ئەلی : قبلەی خوشەویستم

ئایاچی ئەبی ؟ ئەگەر تالی لەو زولفە بون خوشە لول و سەربەکلافە بەتم بدەیقی بیخەمە گەردنم بو ئەوە ئەو عومرەم کە رام بواردوە بو تازە ببیتەوەو ئەو خویناو و زوخاوەکە بەهوی دوریتەوە خواردومە لا بچیتو نەمینی :

قبلەم چیش مەبو تابی جەو زولفە ؛ جەو زولف وەشبو لول سەرکلفە
وەزیم نە گەردەن عومر ویەردەم تەجدید بو ؛ دفع هوناوان وەردەم

ئەلین لەو سەر دەمەدا کە مەلا مصطفی لە بیساران دور ئەکەویتەوەو چاوی لە بەندەنەکانی مەلبەندی ئەبرری گەلی ئەطای چونەوە ئەکا بەلام ماموستا ـ کەی رای لی نابی بەچەند شعریک یادی بیساران ئەکاتەوەو ئەلی :

جەوساوە دیدەم دور کەفتەن جەتو * لیلاویش لیلەن ، لیلاوتر مەبو
روشنی بسات وەنەم بیەن تار * زیندەگیم تالەن وینەی ژاری مار
کەسی کە بەیتەور حالی جەستەش بو * پیسە جویای تو ئاوات واستش بو
خاسش هەر ئیدەن مەرگش مەهان بو
مەگەر ئەو بە مەرگ دەردش دەرمان بو !

واتە : لەو روژەوە کە چاوم لەتو برراوە پرری بوە لە فرمیسک هیچی پی نابینم کەچی دوکەلی جەرگی هەلقرچاو ـرز بوتەوە کەوتوتە بەینی ئەوو بەینی طالەم ئەوەندەی تر بەری روناکی گرتوە و فرمیسک و دوکەلەکە وەکو قورراوی لی هاتوە بەجاری نابینای کردوم !. جا لەبەر ئەوە کە روناکی سەر زەویم لی تاریک بوە ژیانم ئەوەندە تال بوە وەکو ژاری ماری لی هاتوە ، کەسی کەبەم جورەی لی بی‌و هەمو ئاواتیکی هەر گەیشتنە تو بی کەچی ئەویشی بو ریک نەکەوی چاک هەر ئەوەیە مردن بی بەمیوانی ؛ چونکە مردن نەبی هیچی‌تر لەم دوریەت رزگاری‌ناکا و هیچ کەسی‌تر وا دەرمانی ناکا !

جاریک مەلا لە دیی ( پایگەلان ) لەکاتیکا کە سوزی عەشقی یارەکەی ئەگاتە سەردەمیک وەکو میوەی کال چون وردە وردە روژ بە روژ دەست ئەکا بە گەیشتن تا ئەگاتە سەرەنجامی پوختەیی،ئەمیش لە دەوری ناوەراستدا

ئەبی و دیتە ئەوەکە ئەم عەشقە پی لی هەلبری و بکاتە عەشقیکی راستەقینەو نالەی دەوروبی پرر خورشی تیکلاو بی بەدەنگی فریشتەکان !. ئەچیتەسەر بانی مزگەوتەکە بو ئەوە یارەکەی ـ کە لە حەوشی مالی باوکیابەو دراوسی مزگەوتـە ـ چاو پی بکەوی ، بەلام دار توبک لە حەوشەکەدا وەکو شملی شەرر لقو پوپی بلاو کردوتەوە نایەلی بیسارانی بەم ئاواتەی بگا ! . کە ئەمە ئەبینی لە روی شموریکی پاکەوە بەنالەیەکی جگەر سوز ئەم چەند شعرەی بودیت : ـ

چلی نە پەنا ، چـــلی نـە پەنا چلی چون رەقیب مەدران نە پەنا
هور ئامان مەدران نەروی تەمەنا مەر باد قدرەت بدەروش فەنـا
وەباد قدرەت لەنـار لەتـار بو غازو بالای قبـــلەم دیار بو
بسوزو باهر با زەدەی ســەحەر ریشەش جە زەمین بەر بارو وە بەر
تا بالای قبلەم چون شەمع خانان بوینو وەچەم نە بەرزە بانانـ .

واتە : چلیک لە پەناوە ، لقیک لە گوشەیەکەوە وەکو رەقیب لە پەناوە دیارە . دەرهاتوەو خوی داوە بەسەر نیازا نایەلی نیازەکەم ـ کە چاوپی کەوتنی یارمە ـ بیهینمە دی ، مەگەر بای دەسەلاتداری قدرەت لە ناوی بەری ئەگینە بەمن لاناچی . دەسا ، با،بە بای قدرەت پارچە پارچەبی چونکە نایەلی بالای شوخەکەم لیوە دیاربی . . بسوتی بەو ئاگری بەرەبەیانە کە «با» لی ئەداو ئەیگەشینیتەوە و زور تیژو بە بررشتە ، تەنانەت بەجوری بسوتی کە ریشەکەشی لە زەوی دەربینی بو ئەوە لە بەینا نەمینی و بالای قبلەم وەکو چرای مومی مالە گەورە بەچاوی خوم لە سەر بانە بەرزەکانەوە ببینم !..

ئەلین کە ئەمەی وتوە باییک هەلیکردوە لقوپوپی دارەکەی تیک شکاندوە و بەدلنیایی هەمو دەمی یارەکەی چاو پی کەوتوە . . ئیتر لەمەوە سوزی گەیشتوتە بارەگای یەزدان و دلخوازی راستەقینەی بوە بە نوری پاکی بینایی چاوان . لە پاش ئەمە زورتر شعری لە پەردەی حەقیقەتدا دەر

بریوه وه‌کو لەم چەند شعرەی خوارەوەی ئەمەمان بو دەرئەکەوی :

ئیمەیچ پەروانەی شەم شناسانیم پەرروبال سوفتەی دین خاسانیم
میللەت پاکی دین پیغەمبەرانیم نەک جە تایفەی کەم نظرانیم
بنانە جەبین نور پاکتەن ئەر تو پاکنی جەکی باکتەن !!

واتە : ئیمەش ئەو پەپولانەین کە موم ئەناسن و بەدەوریا ئەسوررینەوە چونکە شەیدای ئەو رونا کیەن . پەرروبال کون کراوی ئایینی پیاوچاکانین. چونکە پەروانە لە ناو عەشقەکەی ئاگای لە خوی نامینی ئەوەندە بەدەور چراکەدا ئەسورریتەوە تا لە سەرەتادا باڵەکانی بەهوی گەرمایی ئاگرەکەوە وردە وردە ئەسوتی و لە پاشا خویشی ئەبی بە قەقنەس ، ئیمەش بەرامبەر بەو نوری حەقیقەتی خواناسیە لە سەرەتادا بەدەوریا ئەسورریینەوە و لە ـ پاشا بەبی ئەوە هوشیکمان بمینی ئەکوینە ناویەوەو ئەسوتین بەلام سوتانەکە- مان تەنیا لە باری عالەمی مادّە پەرستیدایە نەوەک بو عالەمی ئەرواح و مەعنەویات . . ئەمەش بویە وامان بەسەر دیت چونکە پەیرەوی ئەکەین ئایینی پاکی ئەو پیغەمبەرانەین کە پیشەوای حەقیقی ئادەمیزادن وریگەی رزگار بونیان لە دەشتی تاریکی نەزانی و بی هوشیدا بو رونا کی ئەکەنەوە . لە ناو ئەو پیغەمبەرانەشا تەنیا پەیرەوی کردنی ئایینی ( محمد ) ـ دورودی خوای لە سەر بی ـ ئەکەین کە ئایینی ئیسلامە ، چونکە هەر ئیسلام ئایینیکی بی خەوشە لە ناو ئەو هەمو ئایینانەدا کە پیغەمبەرەکان هیناویانە وە ئیشکاری ئەوانیتریش ناکەین .

بیسارانی لیرەدا سەری آیتی ( ان الدین عند الله الاسلام ) ی دەرخستوە مەبەست بە ( پاکی دین پیغەمبـــەرانیم ) واتە دینیکی پاکی کە لەبو پیغەمبەرەکان هەیە ، ئەو دینە پاکەش هەر دینی ئیسلامە چونکە ئەو ئایتەی بو هاتوە . ئەگەر مەبەستیشی دینی پاکی هەمو پیغەمبەرەکان بی ئەوەش هەر ئەبی چونکە ئایینی پاکی هەمویان خوا بەیەکی ناسینە . . جا ئەلی :

خوانەین نەوەکێ لەو کەسانانەین کە ورد بونەوەیان نیە دەست ئەکەن بەدارو بەردو پەرستن و هاو بەش پەیدا کرن بو خوا ! . کەوابو ئەی ڕێ ناوچەوانی خوت دەرخە، ئەو پیشانیە کە هەیکەلی نوری پاکی توبە ، دەری خە چونکە ئەگەر تو پاکێ بیت پاکت لەکێیە ؟. پاکیەتیت چونکە ئیمە هەردوکان بەشوین مەبەستو سوزیکی حەقپەرستیدا ئەسورڕینەوە .

بەپێی ئەم قسانە شاعری بەرزی بیساران ئەگەر بمانەوی بیناسین ئەلین شاعریکی غەرامیو فەلسەفەچیەکی ئاینیی بوە لەگەل شعوریکی پاکێو هەستیکی بەرزدا . بیسارانی بە زور شتیدا ماموستای گەلی لە شاعرە بەرزەکانی کورد بوە بەلام دیوانە نایابەکەی هیشتا لەچاپ نەدراوە ، شعری بەگەلی لایەکدا بلاو بوتەوە ، کەم کەسی وا هەیە هەمو دیوانەکەی بی .



# ئەحمەدی خانی

## ١٦٥٠ - ١٧٠٦

قەڵەم کە نوسی نەخشی زەرر کنفتی * شەیدای دەنگی بو کەوا ژنەفتی * چیروک نوسەکان تا بە هومیروس * لەبەر ئەوە دەنگە بون بە چیروک نوس ! * ئەو دەنگە دەنگی نەوای خانی بو * شمشاڵی گیانی نەوجەوانی بو * بادەپەرستان سەرخوشانی راز * قەتارەی عاشق پولی چاوبەناز * میرو شاریار، بەگزادەی دیار * فریشتەو پەری، ئاغەوجوتیار * رەوالانی مەم، کناچانی زین * سەرابەردەکەی ئەمیر زەین دین * چەکوو عارفەستی و تاژدین * حەیزەبون بەکر، وەیشومەی بەکین * ئەمانە هەمو کەوتنە خوشخوانی * بە تیغکی فیکری احمدی خانی ! ..



پیغەمبەری شعری میللی و چیروکی لەخاکی بایەزیددا ، سەر چاوەی ئەدەبی کوردی و باوەرری کوردی لە کورد زەیدا . جەمالی تەبیعەت مەفتون بە دوررو مەرجانی قسەی خامی ، شەمال و نەسیمی فینکی بەیان شەیدا بە لالەزاری بامی . لە دیوانی ئاشنایانی حەقپەرستیدا وەک گەلاویژی گەش ، لە هەیوانی زانایانی عیلم و هونەردا وەک بازی سەراویژی چەش ! ..

ئەستیرەی گەشی ئەم شوینە ناوی ( احمد ) و وەکو بیستومە کوردی ( شیخ الیاس )ەو لە عەشرتی خانیانی ولاتی بایەزیدو بوتانە ، لە سالی

( ١٠٦١ ) هـ . لە شاری بایەزید هاتوتە دنیاوە وەکو خوی ئەبلی :

لورا کو دما ژ غەیب فەکت بو    تأریخ هەزارو شیست ویەکت بو

کە بە میلادی ١٦٥٠ ئەگریتەوە ..

بەسەرهاتو رابواردن ومردنی احمدی خانی زور تاریکە، هەر کە قسەیەکی لیوە کردوە ، ئیمە ئەو قسانە لیرە ئەنوسین و لە پاشا ئاگاداری خویشمان ئەلین دور نیە راستیمان بو دەرکەوی :

لە ( القضية الكردية ) ی ( دوکتور بلەچ شیرکو ) دا ئەلی :

( شیخ احمد داستانی ( زین و مەم ) ی لە ١٥٩١ دا داناوە و لە ١٦٥٢ دا مردوە ) .. لە ( محیط المعارف ئیسلامیة ) دا ئەلی : ( لەبەین ١٠٠٠ و ١٠٦٣ هجریدا ژیاوە ) ... امین زکی بەگیش لە تأریخی کوردو کوردوستان و مشاهیر الاکراد دا هەر شوین ئەم تاریخانە ئەکەویت ! ... هەر وەها لە روژەلاتی ناسەکان وەکو (ئی فون لوک) و (ئوسکارمان) و (هو کوما کس) و (روجەرلیسکو) یش هەر یەکە شتیکیان و ئەوەو هەمویش بە تەخمین و مەزەندە دایان ناوە ، دور نیە لەم روەوە لی کولینەوەیەکی عیلمی بەتەواوی نەکرابی بویەوا هەمویان دورن لەیەکەوە و دویان بەکە ناگرنەوە ! .. ،

جاری قسەکەی القضية الكردية کە ئەلی دانانی مەم وزین لە ١٥٩١ دا بوە لام وایە ئەمە لەگەل ئەو میژوەدا ری نا کەوی کە خانی خوی لە داستانەکەدا ئەلی :

لورا کو دما ژ غەیب فەکت بو    تاریخ هەزارو شیست و یەکت بو

ئیسال گەهشتە چهل و چاران    وی پیشرەوی گوناهکاران

واتە لە ١١٠٥ ی هجری لە داستانی ( مەم وزین ) بوتەوە . دەی ئەم تاریخە ئەکاتە ١٦٩٣ ی میلادی ؛ زیاتر لە سەدسال بەینی دو تاریخ ئەبی ! ..

ئینجا ئەلی لە ١٦٥٢ دا مردوە مەعنای وایە ئەبی ٦١ سال پاش دانانی کتیبەکە ژندبیت وەبەپی شعرەکەی خوی لە تەمەنی ٤٤ سالیدا کتیبەکەی داناوە ئەبی

بەم پێیە ١٠٥ ساڵ عومری بوبێت .. هەر چەندە دور نیە پیاو بگاتە تەمەنی ١٠٥ ساڵی بەڵام لەولاوە کە سەیر ئەکەین لەکاتێکا عومری ٤٤ ساڵ بوە تاریخ ١٦٩٣ بوە ! ... هێنەکەی محیط المعارفیش کە ئەڵێ لەبەین ١٠٠٠ و ١٠٦٣ هجریدا ژیاوە لە هەر شوێنێک کەوترا فلان لە بەین ئەوەندەو ئەوەندەدا ژیاوە زورتر مەعنای وایە کە تەواوی پەیدا بون و مردنی لەو بەینەدابوە نەوەک توزێکي زور کەم لە ژیانەکەی .. دەی ئەگەر لەسەر ئەم قسەیە بێت ئەبێ احمدی خانی هەمو ژیانی تەنیا دوساڵ بوبێت ! چونکە ئەو کە لە ١٠٦١ هاتبێتە دنیاوە لەدوساڵ زیاتری بو نەماوەتەوە، ئەمەش هیچ ئەقڵێ نایسەلمێنێ.

قسەکەی ئەمین زکی بەگیش لە تاریخی کوردو کوردوستانا شوێن قسەی محیط المعارف کەوتوە ، لە مشاهیر الاکراد دا هێنەکەی القضیة الـکردیەش باس ئەکا ، خوی بیرو باوەڕێکي نیە کەوابو وەلامي ئەو قسەیە وەلامي ئەویشە .

ئەمینێتەوە سەر هی روژهەڵاتی ناسەکان، ئەوان هەمو لەسەر ئەو باوەڕەن کە احمدی خانی لە سەرەتای چەرخێکەوەیە تادوایەکەی وە ئەو چەرخەش سەدەی حەڤدەهەمی میلادییە . یەکێک ئەڵێ لەسەرەتای نیوەی یەکەمیەوە تا سەرەتای نیوەی دوەم ، یەکێک ئەڵێ تا دەورو بەری ناوەڕاستی نیوەی دوەم ، یەکێک ئەڵێ لە دەوروبەری ناوەڕاستی نیوەی یەکەم تادەوروبەری ناوەڕاستی نیوەی دوهەم . تەنها لەوەدا یەک ئەگرنەوە کە لەو سەدەیە دەر نەچوە . ئەمان هەر چەندە یەکیان نەگرتوە بەڵام لە حەقیقەتەوە وەنەبێ زور دوربن .

ئێستە لە هاتنە دنیای احمدی خانیدا بەپێ شعرەکانی خـــوی گومانێک نەمایەوە کە لە چە مێژویەکدا بوە وە دەرکەوت کە بەتەواوی لەساڵی(١٦٥٠)دا بوە ، ماوەتەوە سەرماوەی ژیان و ساڵی مردنەکەی .. ئەمەیان وەکو گەلێکی تری توشی عەزیەت کردوە بەوجورە منیشي توش کرد ، ئەو کتێب وشوێنانە

که نوژی له احمدی خانیەوە ئەدوان لام وایە هیچ نەمابەوە کەنەپشکنم ولیکی نەدەمەوە سەیر ئەکەم هەمو پیچەوانەی یەکن ، بە پرسیار کردن لەم و لەویش شتیکی‌وام بو دەر نەکەوت تا لە سالی ١٩٤٦ دا لەمەلایەکی پیرەوە شتیکم دەست کەوت‌و بوم بو بە بەلگە، لە پاش ئەوەش هەر چەندە خەریک بوم لەوە زیاترم بو ساغ نەبوەوە و دەستم نەکەوت . گویا بەپی ئەو بەلگەیە (طار خاني الى ربه) میژوی مردنی احمدی خانیەکە بە حسابی (ابجد)ی هجری ئەکاتە(١١١٨)کە بەرامبەر(١٧٠٦) ی میلادی‌یە ئیجگار کە لیکم دایەوە لەگەل ماوەی هاتنە دنیاکەشیا لەوانەیە ربی کەوی هیچ شکم نەمایەوە کە ئەم میژوە میژویکی راستەو ئەبی بەکلیلی‌دەرگای‌ئەو نهینیەکە سالەهای سالە روژەلانی ناسەکان و خەیری ئەوانیش بە شویلیا ئەسوررینەوە[1] .

---

( ١ ) ئەو سالە بو نویژی نیوەررو لە مزگەوتیک بوم لە بەغـــدا ، مەلایەکی‌نورانی‌پیرم بەرچاوکەوت هاتبو بونویژ، بەجلوبەرگەکەیا بە کوردی ولاتی دهوک وزانخوم زانی ، کە نویژ کرامن لە پیشا هاتمە دەرەوە لەسەر کورسیەکە ـ کە لەبەر هەیوانی مزگەوتەکە دانرابو ـ دانیشتم و چاوەرێم کرد، ئەویش لەپاش دوعا خویندنیکی زور هاتە دەرەوەو دامناو جگە دایەو چاکو چونیم لەگەل کرد و هەر وا دەستم کرد بە قسەکردن سەیرم کرد کوردە بەلام تەزی بەگران لە قسەکانم تی ئەگا ! خەلکی کویت ؟ . م دیکم لە دەوررو بەری عمادیە و بو خوم ئەکەم و بەئیشی کورد بەی زی ژنەکەم ـ کە عەسکەرە ـ هاتومەتە بەغـ بەلام لە شیوەی زمانەکەیا نەچوە دلەوە کە بە تەواوی خەلـکی عمادیە بیت ! چاوم لەمە پوشی و هەندی باسی مەلای جزیریم لی پرسی . وتی شتیکی وای لی نازانم شعرەکانی ئیستەش فەقیان لە بەزما ئەیخویننەوە . . ئینجا وتم احمدی خانی ؟. هەناسەیەکی هەلـکیشاو هیچ دەنـگی نەکرد ا وتم بو چ =

= قسەناکەی ؟. وتی بوچ لەمانە ئەپرسیت ؟ وتم کوردم و ئارەزوم لە ئەدەبیاتی کوردی‌یەو حەز ئەکەم بیانزانم، ئینجا لی پرسیم توکیت!. منیش ناوی خوم پی وت.. وتی : احمدی خانی خاوەنی مەم‌وزین لە بایەزیددایە . وتم بەلی‌لەوی‌یە بەلام شتی‌ترم ئەوی . گەلی قسەی بو کردم تەنانەت ناوی باوکی احمدی‌خانی ئەو پی وتم کە ( الیاس )ە بەلام ئەو وتی ( هەلیاس ) . ئینجاوتی :

من کتیبیکی دەستخەتم هەیە پی ئەلین ( صمدیە ) و کونیشە لە دەوری فەقیەتیمدا ئەو کتیبەم دەست کەوت ئەم خویند لە پال ئەو کتیبەدا نوسرا بو ( تأریخ وفات احمد خانی « طار خانی الی ربە » ) وە ئیستەش ئەو کتیبەم لە سەرمایەی کون هەر ماوە . گەلی شتی‌ترم هەر لەم بابەتەوە لی پرسی . لە پاشا لە بابەت خویەوە توزیکی‌تر سەرم خستە سەری وتی : ئەوی راستی بی من لە بنەرەتا خەلکی دەوری ( بتلیس) م لە شەرری پیشوەوە لەوی نەمام کەوتمە (پیران) لای شیخ‌سعید ، لە کارەساتی ئەو سالانەدا ـ مەبەستی سالانی ٩٢٥ ـ ٩٣٠ بو ـ ئەوەندەی‌تر دەربەدەر بوم وئیستە کەوتومەتە عمادیە ، هەناسەیەکی‌تری هەلکیشا وئیتر دواءان بە قسە هینا . هەر لەو وەختەدا تاریخەکە کەپی‌وتم نوسیمەوە بەلام داخی گرانم ناوی گوندەکەم نەنوسی کە ...تە لی‌بەتی و لە فیکرم چوەوە، وە بویشم دەرکەوت کە ئەم پیاوە پیاویکی راستگویە بە تایبەتی لە تاریخەکە[redacted]کر کردنەوە هات بەسەر زمانیاو وتی . .

بریارمان دا کە بیتەوە بولام بەلام وا دەرکەوت لەبەر ئیشی خزمەکەی بوی ری نەکەوت بیتەوە ، ئیتر نەمدیەوە ، ئیستەش نازانم ماوە یا مردوە ، ئەو وەختە من چاوم پی‌کەوت لەوانەبو شەست ، شەستو پینج سالیک عومری ئەبو ، ناویشی مەلا صالح بو . .

له ناودارەکانی تری کورد گەڕاپیتەوە ! وەکو چون زورتر لەوانـــ ناو و نیشانو رابواردن و جەوهەري خویانیان لەگەل لەشەکیانا بردوتە خاکەوە ئەمیش هەر وابوە . بەپێ پرسینو تەقەلایەکی زور کە دەملو دەم گیڕراویانە ـ ئەوە رابواردنو بەسەرهاتي احمدی خاني گویا بەم جورە بوە :

شیخ الیاسي باوکی بەگەلی سال پیش هاتنە دنیای احمد لە شاری بایەزید دانیشتوە بەلام ئاشنایەتي لەگەل عەشرەتی خانیانـــ هەر بەر تەداوە و لە بایەزیدیش هەرمالە گەورەبوە . لە (١٦٥٠) احمددیتە دنیاوە،نازداری باوکو تاتانەی دایک ئەبی . بەربی و شوینی بنەمالەیەکی دەولەمەند لە ژیر چاویری باوک و خولاني بەرمالا لە پیروکەییەوە ئەگانە سەر ریگەی قوتابخانە ، ئەنریتە خویندن ، ریگەی ئەو سەر قوتابخانەو هي ئەم سەری دیواخانە ، لە قوتابخانە دەرزی زانایي ، لە دیواخانە دەرزی دانایي وەر ئەگریت ، تا گەورەتر ئەبی پایەی خویندني بەرزتر ئەبی ، ئەچیتە ناو فەقیان بو دەرزي عەرەبیان ... بەرزتر خویندن لەو دەورە ئەوە بوە بەکیک بوی ربی کەوی بچیتە فەقیەتیو دەرزی صرفونحو و بەلاغەو اصول بخوینیت . احمد ئەمەی بوریک ئەکەوی هەر لە بایەزید ئەچیتە مزگەوتی ( مرادیە ) . لە پاش ماوەیەک مانەوە لە مزگەوتەکاني بایەزیدو دەوروبەریارو ئەکاتە ئورفە، ئەخلات وبتلیس ، ئەگەڕری شیرەی گولی شوینان ئەمژی ، لە هەر لایە کە ئەبیی عالیکي بە ناوبانگ هەیە بو وەرگرتنی عیلم و زانیاري روی تی ئەکا ، ئەلین سەری لە میسریش داوە . لە ئاخرا کە اجازەی عیـــلم وەر ئەگریت ئەگەڕریتەوە بو بایەزیدو خەریکی دەرز وتنەوە ئەبی،عالیکی بەناوبانگ و شارەزای هەمو عیلمیک بوە ، بە فەرماني شاهانە چوەتە ( بابی عالی ) یش لە ئەستەمبول ..

. شیخ احمدی خانی وەکو دەماو دەم ئەیگیڕنەوە پیاویکی گردەپیاو بوە ،

سەری لە چاو لە شیا گەورەتر بوە ، چاوەکانی بچوک و گەش بوون ، ریشی توپ بوە رەشی زوری تیا مابو ، دەنگی نیرو بەرز بوە ، زور کەم تورەبوە ، دلتەر بوە ، ئەم دلتەرییەی لەئاخرا ئیکیشاوە بولای تصوف ، لە جلوبەرگدا کوک بوە ، میزەری خرری سپی لەسەر ناوە ، بوزوی دیاربەکری تایبتی لەبەر کردوە ، ئەلێن زوریش هەوەسی لە راو و شکار بوە ، کە چوە بو راو جلی راوی لەبەر کردوە ، سوارچاکێ و بە دەسو نەفام بوە ، ئەلێن پالەوانیش بوە ، هەمو جار جیملاسکی ئەکرد ، پیاوێکی بەریزو بە دەسەلات بوە لە ناو مەردما ، دوجیگەی هەبوە ، یەکی عیلمی ، یەکی بنەمالەیی . هەر وەها پیاوێکی دیندارو خواپەرستیکی وابوە کە سوزی مەعنەویاتەکەی کاری کردوتە هەمو کەس . بەم جورە راژەبو بری تا لە « ١٧٠٦ » لە تەمەنی



مزگەوتی مرادیە ، ئەو مزگەوتە جوانە کە لە بیناکانی سلطان مرادی دوهەمە لە ، سالانی ١٤٢١ ـ ١٤٥١ لە شاری « بایەزید » دروستی کردوە بو ئەوە « احمدی خانی » لە سالانی ١٦٥٠ ـ ١٧٠٦ دەرزی تیا بخوینی .
ئەم وینەیە لە ١٩٣٦ دا گیراوە .

« ٥٦ » ساڵیدا کوچی دوایی ئەکاو هەر لە بایەزید ئەنیژری ، گورەکەی ئیستەش هەر مەزارە .

مایەوە سەر ئەوەکە ئایا چەهیزیک بوبیت وا احمدی خانی خستوتە هوشو فیکری شعرەوە ؟ لەگەل ئەوەدا ئەو دەورەو ئەو شوینە کە ئەوی لی بوە پەردەی تاریکی کونەپەرستی وەکو شەوەزەنگ هەمو لایەکی گرتبوەوە ؛ لە لایەکەوە بیرو باوەرری دارو بەردو پەرستنی مەزارەکان ، لەلایەکەوە زەبرو زەنگی تورکەکان بو ژیر دەستەکانیان بە تایبەتی بو کوردان کە ئەیەلن سەر دەربینن لە قولاخی خویان ، لە لایەکیتریشەوە چەوسانەوەی فیکروا هوش لەبەر ئەو هەمو ژاراو و تالاوە کە وەکو لیلاوی باراناوی بەهار بە سەر و لایەکدا هاژەی ئەکرد ! کەچی سەررای ئەمانە احمدی خانی بەم جورە خوی باوبژیتە مەیدانەوە ! . . بەلی تەبیعەتی شعر بو کورد وەنەبی شتیکی بەلاجەوری بی، کورد بەماەرزادی شاعرە، چونکە شوینەکەیو ئاوە ـ کەی وهەواکەی ئەمەی پیشان ئەدا ! . سەررای ئەمەش احمدی خانی ئاوازی شعرەکانی شیخ احمدی جزیری و فەقی تەیران و مەلاباتی وعەلی حەریری وەکو دەنگی شمشال کاری لە هەمو دەمارەکانی کردوە و لە نیوەی شەودا بە خوروشی ئەو دەنگەوە ئاوازی سوزی گەیشتوتە ئاسمان و دیمەنی هەمو ولاتی بوتانی کردبو بەکانیاوی فیکرو خەیالیکی وەها کە هەمو ولاتی سوران بە ئەردەلان و موکریان و بابانەوە لویچ لویچ لی هەلینجن و بیکەن بە نوشی شاعرەکانیان ! ...

راستە شعری شاعرەکانی بوتان هەر ئەوەندەیە تەلی عاتفەی احمدی خانییان بزواندوتەوە یا ، خود بەتایبەتی شیخ احمدی جزیری بە روحیکی لاهوتی یا دەنگیکی ناسوتی هەر ئەوەندە پالی بە احمدی خانیەوەنا کە خوی باوبژیتە کورری سەراپەردەی شاعرانەوە ؛ بەلام ئایا روحی میللیەت و نەوای قەومیەتەکەی لە کوی هینا ؟ لە، سەردەمەدا کە روم و عەجەم نەوەکت تەنیا

چوار چمکی خەیالی کورد بەڵکو هەمو ئاسوی کوردیان وەکو ژی کەوان هینابوەوە یەک و کوردیانی بە بەردی جەورو چەوسانەوە مول دابو وەکو خوی ئەلی :

ئەڤ روم و عەجەم بوان حەسارن ... کرمانج هەمي لە چار کەنارن

وەیا دەردە دل بکا لە دەست بەختو لەبەر تەخت وەکو ئەلی :

ئەساز ئەزەل خودی وساکر ... ئەڤ روم و عەجەم لە سەرمە را کر

وەلەو دەورەدا چون کەوتە سەر ئەو شعورە ؟ کە بلیت :

گەردي هەبوا مە سەرفرازیک ... ساحب کەرەمکێ،سوخەن نەوازکێ

نەقدی مە دبو بە سکە مەسکوکێ ... نەدما وەهە بی رەواج ومەشکوکێ؟!

وەیا چون گەیشتە ئەو ئاسمانە بەرزە کە بە دوچاوی دل و دیدە تەماشای کورد بکا و لە گەورە و بچوکیان تی بگاو ؟ بلی :

جوامیری و همەت و سەخاوەت ... میریي و غیرەت و جەلادەت

ئەو خەتە ژبو قەبیل ئەکراد ... وان دانە بەشیر و همەتی داد ..!

کەچی لە گەل ئەوەش کەوابن ! . بە چاوی گریانەوە بلیت :

ئەز مامە دەحکەتا خودی دا ... گرمانج دە دەولەتا دنی دا

ئایا بەچە وەجە مانە مەحروم ... بالجملە ژبو چە بونە مەحکوم ؟!.

ئەم کارەسانی احمدی خانیە من لام وایە نەبەری بزواندویەتەوە ، نەفریشتە خوی پیشان داوە ، نەدلی خوی لەبەر باوەشینی ئەگریجەی چاو کالانا دیوە ، نە وینەی خوی لە گونای ئالی رەوالانا چاو پی کەوتوە ! . بەلکو دوستی دلخوازي ئەو سەرەتا بیجگە لە دیەنی ولاتەکەی تەنها دیوانی شاعرەکانی پیش خوی بوە ، چون دەنگي کەمانچەکار ئەکاتە سەر دل ، بویەش کار ئەکا چونکە ئەو تەلە دەماري گیانلەبەریک بوە کە گیانی ئەو گیانلەبەرە لە عالەمي ئەرواحدا لە گەل گیانی ئەم گوی گرەدا ـ کەخاوەن دلەکەیە ـ رازو نیازیکیان پیکەوە کردوە ! ئیستە ئەو رازو نیازە دینیتەوە

فیکر !.. شعریش بەو جورە کار ئەکاتە سەر دل ، نەوەک تەنیا دل بەلـکو کار ئەکاتە سەر هەمو دەمار . بویەش کار ئەکا چونـکە شعر راستەو راست دەنـگي عالەمي ئەرواحەو لە میشکی خاوەنەکەیا ـ کە شاعرە ـ ئەزرنـگیتەوە ، لەویوە ئەچیتە دلیەوە و دەنـگ ئـەداتەوە ، ئەکویتە سـەر زمانی و بلاو ئەبیتەوە .

جا لەبەر ئەمە شعری ئەوان بوە بە سەرچاوەی ئیلهامي شعری .. ئەمینیتەوە سەر میللیەت و قەومیەتەکەی :

ئاشکرایە هەتا هیزي کوشین زیاتر بی تەقین زورتر ئەقەوی ، هەتا هیزی کوشین زیاتر بی دەنـگی ئەو تەقەیە زورتر بەرز ئەبیتەوە ، هەتا بای پیچەوانە توندتر بی دەنـگي کفەکفەکە قایتر ئەبی . مندال یاکە سیکی تر هەتا لیدەیت دەنـگي گریانەکەی زیاتر ئەرروا . ئەگەر ئەم هیزانە هیچیان نەبونە دەنـگي تەقینو نە دەنـگي کفەو نە دەنـگي گریان بەر گوبی کەس ناکەوی ... زورو ستەم و چەوسانەوە لەو دەورەدا ـ کە لەمانەکارەساتیکي غەیرە تەبیعین ـ گەیشتونەتە پایەییک کە عاتفەی احمدی خانی‌یان بە جوریکی وا گوشیوە ئەو دەنـگانەی لیوە پەیدا بوە ، ئـــەو دەنـگانە کە نالەی خوی‌و نالەی کومەلەکەی بوە ! . .

رەنـگي بوتری ئەگەر عامل بو بزواندنەوەی عاتفەی شاعریکی وەکو احمدی خانی‌ئەو جەورو ستەمە بوایەکە لەو دەورەدا روی کردبوە ئەو شوینە خو وەنەبی شاعریش هەر احمدی خاني بوبیت ، بەلـکو لە دەوری ئەودا و لە پیش ئەویشا گەلی شاعری‌تر هەبورن بوچ هیچیان دەرونیان نەهەژا ؟! .
بوچ هیچیان ئەو کارەساتانە کاري تی‌نەکردن تا ئەوانیش بە جورەکەی ئەو وەکو بولبول بکەونە نەواخواني و رازونیاز ؟! ... ئیمەش ئەلین ئاشنایەتي روحي دو جوزە ؛ جوریکیان پەیوەندە بە شکلەوە شوین شکلەکە ئەکەوی کاریکي بە مادەکەوە نیە . وەکو یەکیکی ئارەزو پەرست چون ؟ ئەگەر

چاوی بە ئینسانێکی شکل جوان کەوت بۆ جێ بەجێ کردنی ئارەزوەکەی دڵی لێ ئەچێ ، کە ئەو ئینسانە جوانیەکەی بەسەرچو ئەمیش دڵی لە سەر لا ئەچێ و دڵی ئەچێ لە یەکێکی تر و هەر بەم جورە پیوە ئەڕروا :. ئەمە وەئەبێ کابرا دڵی لە مادەی جوانی چوبێ بەڵکو دڵی لە شکلی جوانی چوە . ئەگەر دڵی لە مادە کە بچوایە ئەو جەوهەری مادەیە لە ئینسانەکەی ئەوەلدا هەر ماوەتەوە ئەوەندە هەیە شکلەکەی تیکچوە ! . بۆیەش ئەڵێن هەر مایەتەوە چونکە مادە نافەوتی . بەڵگەی ئەم قسەیەمان ئەوەیە کە کابرایەک دڵی ئەچێ لە یەکێک ، بەکە ؛ بەڵی لە سەرەتا دا جوانە بەڵام لە ئاخرا زەمانەکەڕرو کویرو پیری ئەکا کەچی کابرا ئەو دڵلیچونە ، کە دڵی لێ چوە هەر ماوەتەوە لەگەڵیا و بەڵکو زیاتریش ئەبێ . ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە دڵی لە مادەکەی چوەو مادەکەشی تیدا ماوەتەوە بۆیە دڵلیچونەکەی ئەمیش ماوەتەوە . .

ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی تریشەوە دڵیک کە پەیوەند بو بە مادەی شتیکەوە با لە روالەتا هەزار تەنگو چەڵەمەشی بەسەرا بیت ئەو پەیوەند بونە پەیوەند بوە ممکن نیە لێ ببیتەوە و بنوسی بەشتیکی ترەوە . . دڵیک کە پەیوەند بو بە مادەی جوانی ژنیکی تایبەتیەوە با هەزار جار چەرمەسەری کابرا بدەن کە دڵی لەو ببیتەوە و دڵی بچی لە مادەی جوانی مانگێک ، یا گولیک هەر هەست بەو چەرمەسەریەش ناکا و هەر لای وایە هیچی بەسەر نەهاتوە .. وەکو منالیک دڵی ئەچێ لە سیویک وررکی لێ ئەگری و ئەیگری بە دەستەوە هەر چەندە لێ ئەدەن سیوەکەی لە دەست نابیتەوە ، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئەوەندە دڵی لەو سیوە چوە هەست بە ئازاری لیدانەکە ناکا ، ئەگەر هەستی پێ بکردایە خیرا سیوەکەی لە دەست ئەبوەوە ! . .

شتیکی تر سیبەم ؛ هەر یەک چەررو مەنگەنەیەو هەر یەک هیزی هەیە ، نارنجوکیکی ئەخەیتە بەر ، هەر کە توزی هیزی گەیشتی ئەتەقی ، کەچی

پارچە لوکەیەک گرنمولـکە ئەکەیت و ئەیخەیتە بەری هەر چەند هیزی بخریتە سەر هیچ وەکو خوی ئەمینیتەوە ! . ئەمە رو لەوە ئەکانەوە کە شتە کە خوی ئەبی قابلیەتی تەقینی بی ئەگەر نەبی باهەزار گوشین وکارە ـ ساتیش بی هەر بە هیچ دەرئەچی ! . .

ئەو شاعرانە کە لە دەوری احمدی خانیدا یا لەپیش ئەودا بوون ، یا شکل پەرست بوون یا مادە پەرست ، ئەوانەیان کە شکل پەرست بوون هیزو پیزیک لە شعرەکانیانا نیە وەکو گەلی شاعری شکل پەرستی تری دوای خو یان ، بویە هیزی نیە چونـکە شعریان لەبەر ئارەزو پەرستی بو شکلی دیمەنیک وتوە ، شعریان لەبەرشعر وتوە نەوەک لەبەر فەن ! . . ئەوانەشیان کە مادە پەرست بون ، بەلی شعرەکانیان بو فەن و هونەرە : ـ وەکو وترا ـ ئەوکە روحی ئالا بە مادەیەکی تایبەتیەوە ئیتر هەمو عالەمی لی ئەبزری تەنیا ئەو مادە تایبەتیە نەبی کە وەکو تیشکی روژ لەو تاریکستانیەدا گزنـگی بو ئەدا بیبجگە لەوە شتیکی تر ناناسی و نایە بەدلیا کە شتیکی تر هەیە ، وە لەبەر ئەوەش کە روحە کەی ئالاوە بەو شتەوە ئیترممکن نیە دەستلی هەلـگرتی.

یکیکی وەکو مەلای جزیری روحی پەیوەند بوە بە مادەی « سەلما » یەکی تایبەتیەوە ، کە مادەی ئەو سەلمایە گزنـگیکە لە نوری مادەیەکی حەقیە ـ رستیەوە ، تارە لەو میدانەدا عـــەودال بوە با هەزار کارەساتی تر یا نیوە ژەندنی تر روبدا دەرچونی لەو مەیدانە نە بە ئەقلی خویا دیت نە بە ئەقلی یکیکی تردا ! . .

یکیکی وەکو احمدی خانی جاری شکل پەرست نەبوە . کە مادەشی پەرستوە روحە کەی لەپیش عالەمی لەشەکەیدا ئالاوە بە مادەی میللیەت و قەومیەتەوە . کە لەشەکە بو بە قەفەزی روحەکەیو کەوتە عالەمی شکل و وینەوە ئەو سوزەی عالەمی ئەرواحەی تازە کردەوە . لەبەر ئەوە قابلیەتیکی راستەو راستی تیدا بو ـ قابلیەتەکەشی پەیوەندبونی روحە کەیەتی بەو مادە

تایبەتیەوە ـ کە ئەو جەوروستەم و کارەساتانەی بینی وەکو لافاوی ئاویکی لیل ئەهات بەسەر خویو قەومەکەیا کەوتە ئەو سوزو گودازەوە کە دەنـگەـ کەی وەکو دەنـگی زرنـگەی زەنـگێ لەگویچکەی نەوە بە نەوەی کورددا دەنگێ ئەداتەوە !... جا لەبەر ئەم شتانە کەباس کرا احمدی خانی کەوتەبازاڕی شعروەو تایبەکی دەریای تەبیمەنی بو کرایەوە . .

بەلی خانی لەدەورو بەری ١٦٨٣ لە « نەوبەهار » ـ کەفەرهەنـگیکی کوردی و عەرەبیە ـ بوەتەوە . بەلام وەنەبی ئیجگار ئەمەیانـ بوبی کە قەلەمی نوسەرەکانی لە باری احمدی خانیدا خستبیتەکار ، وەیا نامیلـکە شعرـ یەکەی کە بە ناوی « عقیدة الایمان »ەوە دایناوەو ( ٧١ ) شعرە ناوی ئەوی بەرز کردبیتەوە . بەلـکو ئەوی زور نالەی احمدی خانی بەرزکردوتەوە داستانە بەناو بانـگەکەی « مەم وزین » یەتی ، کەوا کارەساتی ئەو داستانە ئاگریکی کاریگەری لە دلیخانیدا کردوتەوە بو ئەوەخانی بەریتە ریزیشاعرە هەرە گەورەکانیعالەمەوە لە دو شتدا ، لەباری چیروکیدا ، لە باری نیشتمانیدا .

سەرچاوەی ئەم داستانە: لە دەوروبەری ١٣٥٠ی میلادیدا (ئەمیرزین الدین) ناویکی کورد هەبو ـ کە دورنیە شوینی دانیشتنی لە دەورو بەری خەلیجی ئەسکەندەرونە بو بیتو فەرمان رەوایی بەسەر هەمو ولاتی بوتانا کردبیت ـ دو کچی پەری ئامیزی هەبوە ، یەکی « ستی » ، یەکی « زین » . دوپەریزادی ولاتی بوتان ، یا جوتە فریشتەی خاکی کوردان بوون .. یەکی لە سەردارەکانی ئەمیر زین الدین ( ئەسـکەندەر ) ناویکێ بوە ، ئەم ئەسکەندەرە سە کوڕری بووە : تاژدین ، چەکو ، حیفو . ئەمانە هەر یەکە پالەوانی مەیدانو شیری بیشەی بوتان بوون ... « تاژدین » دەستە برایەکی دلسوزی خەمخوری ئەبی ( مەم )ی ناو ئەبی ـ کەلەبنە مالەیەکی بەرزی ولاتی « ئالان » ئەبی ـ . مەم و تاژدین شەوو روژ لە راوو شکارا ، لە گوندو لە شارا ، لە باخچەو کەنارا پیکەوە ئەبنو بەبی یەکێ هەلناکەن ...

روژێ لە روژان سەرێ سالی نەوروز ئەبێ ، زەوێ رابەخێ سەوزێ خوێ راڵەخا ، شاخ و چیا سەرپوشێ بەفر لا ئەدا ، دارو دەوەن گوارەێ گوپکە لە گوێ ئەکەن . دەنگێ هاژەێ کانێ و سەرچاوە ئەبێتە سەمتورو سازێ ئەو ناوە ا . هەواێ فینکێ ئاسمان تێکەڵ ئەبێ بە باێ بەرێ بەیان ... میرزین الدین بە خوێ و بارەگاێ و ئەهلێ شارەوە بو ئەو سەیرانێ جەژنێ نەوروزە ئەچنە دەرەوە . . مەم و تاژدین لە سەرچاوەیکدا « ستی » و « زین » یان لە ناو پولێ کەنیشکانا بەرچاو ئەکەوێ ا . ئاگرێ عـــەشقێ ( تاژدین ) لە دلێ (ستێ) دا ، وە هێ ( مەم ) لە دلێ ( زین ) بەر ئەبێ . نەمامێ بالاێ ستێ لە دلێ تاژدین دا و نیگارێ ئالووالاێ زین لە دلێ مەمدا نەخش ئەگرێ ا ماوەیەکێ بەم جورە ئەرروا ، لەپاشا دینەسەر خوازبینێ دویار بو دو دلدار . زەماوەـ ندێ ( ستێ ) بو ( تاژدین ) ئاێ خەم بو ( مەم ) ئەکاتەوە ا . بەکر مەرگەورر کە ناپچێ بارەگاێ میر بو لیان ئەبێتە شەڵێ شەرر و ئەکەوێتەکار بو ئیشێ ناهەموار ا . . میرو مەم لە سەر دلخوازێ ئەو بو ئەم ئەکەونە شەترنج . دیسان بەکر مەرگەورر دەست ئەکاتەوە بەفیل و بەفرر ا. ئاگرێ زین لە دلێ مەمدا بلیسە ئەسێنێ و بەژارەێ مەم لە دلێ زیندا بەرە ئەستێنێ . میرلیان تێ ئەگا ، بە دوزمانێ بەکر مەم ئەکەوێتە گوشەێ زیندانێ تاریکیەوە ا زین لە تاوێ مەم ئەکەوێتە باخچەیەکێ تەریکەوە . ستێ و تاژدین عارف و چەکو ئەکەونە رەزم بو رزگار بونێ مەم . بەکر ئەکەوێتەوە دوزمانێ ا . لە ئاخرێ کارا میر پەشیمان ئەبێتەوە ا کە ئەچنە سەر وەخت مەمەوە مەم ئەوا لە عەشقێ زینا گیانێ کردوە بە گیانبازێ و ناردویە بو مەزارێ عاشقان ا . ئەیهینن بە تەدارەکەوە ئەینێژن . زین ئەچێتە سەر گوررەکەێ و بەسەریا ئەکەوێ کاتێ کە سەرێ لێ ئەدەن سەیر ئەکەن گیانێ ئەویش پەروازێ کردوە بولاێ گیانێ مەم ا . لە ، شەکەێ لە تەنشت مەمەوە ئەنێژن . تاژدین لە ئاخو داخێ ئەم کارەساتەدا بەکر مەرگەورر لەبەین گوررەکەێ هەر دو گیانا

سەرگەبڕی ، خوێنەکەی ئەبێ بەچقلیکێ لە بەینیانا سەرهەڵئەدا نەیهێشت لە کوڕەکەشا بەکێ بگرن !. ئەڵێن ئیستەش هەمو ساڵێ ئەو چقڵە سەر هەڵئەداتەوە !! ...

ئەم داستانە کە احمدی خانی بە ٢٦٦١ شعر ئەیگرێتەوە بەرزتر داستانێکی کوردیە کە تینوانی مەیدانی ئەدەبی و نیشتمانی و چیروکی و مەلحەمەی پێ تیراو کردوەو ناوی احمدی خانی لە ریزی هومیرۆسی یونانی و فردەوسی فارسیدا لە لاپەڕەی تاریخی کورددا هیشتوتەوە .. ئەم داستانە لەپیش احمدیخانیدا دەم بە دەم وەکو چیروکی گوێ ئاگردان لە دیواخانەکانا بەچیروکێ ئەیاـ نەگێڕرایەوەو قالبێکی ریکوپێکی نەبوە ، نەبونەکەشی لەبەر ئەوە سەر لێ ـ شێواویانە بوە کە کورد هەیبوە وەکو خانی خوی باسی ئەکا . ئینجا ئەم هێنای و خستیە ئەم قالبەی ئیستەیەوە ... ئیمە چەند پارچەیەکێ لەم شعرانە ئەخەینە بەرچاو بو ئەوە بزانین مێژوی ئەدەبی کوردی چەکەلکیکێ لەم ئەدەبەی خانیە وەر ئەگرێت ؟ وەیا احمدی خانی چەپایەیەکی لە ئەدەبیاتی کوردیدا بوە ؟ ...

خانی لەم داستانەدا دو پەردە پیشان ئەدا ، یەکەم پەردەی نیشتمانی و قەومی، دوەم پەردی چیروکی وقەسەسی . لە سەر ئەم رەوشتە هێناویە کتیبەکەی لە سەر ( ٩٥ ) باس داناوە ، هەر باسێکی کردوە بە بەندیکێ ، هەر بەندە لە ١٠ شعر کەمتر وە لە ٩٧ شعریش زیاتر نیە . سەرەتای باسی بە ستایشی خواو پیغەمبەر ئەکاتەوە لیان ئەپاڕیتەوەو داوای لێبوردنیان لێئەکا . چوار بەند هەر لەگەل ئەم ستایشانەدا خەریکێ ئەبێ ، لەبەندی پینجەم وشەشەمدا باسی کورد وبیچارەییان ئەکا ئەڵێ: لەبەر ئەوە خاوەنیکی ئەدەبیان نەبوە هەمو داستانی ئارەمانی و رازونیازی ئەدەبیان تیاچوە و نەماوەتەوە وەکو گەلی پیاوی شاسوارو ناوداریشیان هەر وەها روەیشتون و بەبێ ناو ونیشان

گای چەند قایم و سەخت بو کەنوانی ئەرکی وەرگرتنی وینەی ئەو دلبەرە بەری بە ریوە و نەشکا ! . . هەر وەها سنگم کە شوینی دلە بەهوی گرفتار بونی بە دەست عەشقی ئەوەوە پارچە پارچە بوتەوە و دەرمانەکەی وا بەچاوی مەستیەوە .. هەرکە سەیریکی کردم لەبەر ئەوە کوا ئەزانم ئەوە روی دلی نی کردوم ئیتر چاک ئەبمەوە ، بەلام چون عەشقەکەم ـ لەبەر ئەوە کە عاشق بە یەکیکی بە نیز بووم ـ عەشقیکی خرابە بەختەکەشم هەر وەها بەختیکی خرابە ئەگینە یارم لایەکی لی ئەکردمەوە . .

جا ئەم یارەم کە لە ئەندەرون ـ حەرەمسەرا ـ هاتە دەرەوە دەستی رەقیبی لە دەستا بو ـ کە شەرابە ـ بویە ئەلیم شەراب رەقیبە چونکە لاموایە من و شەراب هەر دو عاشقی ئەو یارەین ؛ من بە روەتی ، ئەو بە لیوی ! بەلام ئەو گوی هونەری خوی دەرکرد و دەستی خوی خستە ناو دەستیەوە بو ئەوە کە من بە داخەوە سەیریان بکەم ! . لەم دیمەنە هەم خەمبارم هەم شادمانم ؛ شادمانم چونکە مایەی کامەرانیم ـ کە یارمە ـ لەپشت پەردەوە دەرکەوت ، خەمبارم چونکە ئەشکەنجەم بەرچاو کەوت کە رەقیبە . . هەستام بچم بو نویژ کردن و ئیتر تەوبە بکەم لە هەمو ئیش و کاری کەچی لەدیکەدا تەماشام کرد وا یارم خەریکە شەرابی عەشق وجوانی ئەفروشی پەشیمان بومەوە و پام دایەوە بولای ئەو ! ...

ئەم یارە بە عیشوەیەم زور سەیری هەیە !. هەر خوی لە من ئەشاریتەوەو خوی پیشان نادا لای وایە جبرئیل ئایتی « ولیضربن بخمرهن علی جیوبهن ولا یبدین زینتهن » ی لە ئایینی ئیسلاما هەر بو من و ئەو هیناوە !! .. ئای دوینی لە بارەگای دلدا چە کورریکی خوش و گەرم بو ؟ : دلبەر شەرابی عەشقی ئەگیررا و « سالم » یش دلی بوریانی ـ کە سوتاوی ئەو عەشقە بو ـ کردبوی بە مەزە و بە کوررەکەدا ئەیگیررا ! ...

بەراستی لیرەدا سالم لە بەلاغەت و فەلسەفە و تشبیە و غەرامیاتدا توپی

هونەری لەو مەیدانانەدا بە گورجی و چالاکی فرواندوە ..

سالم لە مەیدانی فەلسەفەو تصوفدا کە ئەسپی خوی تاو ئەدا لات وا ئەبی. کە تاقە سواریکی ئەو مەیدانەیەو بە بیریکی ورد و شعوریکی خەلوەتنشینی. هەمو کەلین و قوژبنی پشکنیوە، بەلی پشکنیویەتی و کوتوپرر دیتەوەو ئەلی :

لەبەر تەعمیری ئەم ویرانە جنّت ملـکی ئادەم بو
حەقیقەت پادشاهی کرد و لیکن مدەتی کەم بو
خوشـــا ئەیامی گریانم لە خاکی کەعبەی مقصــــد
هەمو قەترەی سرشکم بو شەرەف وەک ئاوی زەم زەم بو
خەمیری خاکی من ئەوەل بە بارانی فەرەح نەکرا
جوانی و پیری و طفلیم، سەراسەر جوملەگی غەم بو
لەسەرسەبزەی چەمەن یاری سوها قەدم کە جلوەی کرد
لە سەجدەی خالی لالیوی بنەوشە گەردنی خەم بو
بە قوربی خەلوەتی دلبەر نەنازی ئەی سەبا زینهار
لەجی تو پیشتر « سالم » دەمی هەمرازی مەحرەم بو !

سالم لیرەدا زور قوول رویشتوە، ئیمە تەنها لە دو شعر لەم بررە شعرەی ئەکولینەوە لە پاش وردبونەوە ئەوانیتریشی پی دەز ئەکەوی . یەکەمیان « لەبەر تەعمیری ... هتد »

ئەلی لەبەر ئاوەدان کردنەوەی ئەم جیهانە ویرانەیە بو کە بەهەشت کرا بە شوینی کوشکی پادشاهی ئادەم ، لەبەر ئەوە بو کە دنیا ئەبوایە ببوایە بەلام ویران بو بە خراپەکردن و دروزنی ، بە چاندنی تووی ناکوکی و خوا نەناسی، بە پچرانی شیرازەی اصلاح لە هەمو شتیکدا .. ئەو ئەو ئەرکەی خرابوە سەر کە دنیا کە ئاوەدان کاتەوە بە نەهیشتنی ئەمانە و گورینەوەیان بە چاکە . بەلی پادشایەکی پایە بەرز بو لەو شوینەدا بەلام لەبەر ئەوە ئەو ئەرکەی پی هەلنەگیرا ماوەی ئەو پادشاهیەی زور نەبو خیرا لەوی هەلیان.

گرت و خستیانە ئەو ویرانەیەوە کە لـــەوەل‌جار تەمای ئەوەیان پێ بو ئاوەدانی کانەوە ...

لەپال ئەمەدا شاعر لە شعرەکەدا مەجازیکیشی بەکار هیناوە ، ئەلی :

لەبەر ئاوەدان کردنەوەی ئەم لەشە ویرانەی منەبو ـ ویرانەبو لەبەر ئەوە کە یاری تیدا نەبو ـ دلم کە بەهەشتە بو بە ملـکی ئادەم کە یاری خوشەویستمە، دلم بەهەشتە چونکە هەرکە توانی بە خەیال وینەی ئەو وەر بگریت ئەوەندە خوش و کەیف خوش بو وەکو بەهەشتی لی هات ! . بەراستی یار لەوێدا پادشاهی و فەرمانرەوایی خوی کرد ، بەلام داخەکەم ماوەی زور نەبو چونکە نەیویست زوری تیدا بمینیتەوە ، نەیویست نە دلم بېی بە بەهەشت بەهوی مانەوەی خەیالی ئەوەوە تیدا وە نە لەشم ئاوەدان ببیتەوە بەهوی فەرمان رەوایی بەکەیەوە لە هەمو شەوریکا ! . .

دوهەمیان « خەمیری خاکی من .. هتد» ئەلی لەسەرەتاوە کە خوا ویستی ئادەم دروست بکا جبرئیلی خستە سەر ئەم دنیایە لە هەر سوچیکەوە مستی خولی هەلـگرت و بردی کردی بە کوگایەک ، لە پاشا فەرمانی دا بە دەریاکان ، دەریای تال و شیرین ، سویر و خوش هەلیان بەرز بوەوە بو بە بەلە هەوریک ، بەلە هەورەکە لە تاو گوشینی توی تویەکانی هەوا دەستی کرد بە گریان چەند دلوپە فرمیسکیک کە لەو ئاوە خوش و ناخوشانەوە پیکیەوەی نابو هەلیرژاند . ئەو بارانی فرمیسکە کەوتە سەر گلەکەی ئادەم و بو بە قورر ، لە پاشا ئادەم بو بە ئادەم . سروشتی من کە لە نەتەوەی ئادەمم لەو توزە قوررەوە پەیدا بو کە ئاوەکەی لە خـەلمی دەریا سویر و ناخوشەکەوە پیک هاتبو . . جا لەبەر ئەوە زەمانی پیری و جوانی و مندالیم هەرکام تو بیگری هەر بە ناخوشی و خەم و ئەندوە گوش کراوە ! . دیسان لەم شعرەوە دەر ئەکەوی کە سالم لە هیچ بەردەیەکی ژیانی خوی رازی نەبوە و هەموی لە ژیر باری غەمدا رابواردوە ...

سالم لەو بڕە شیعرەیدا کە دو شیعري سەرەتاکەی ئەلی :

زەورەقە دل ، دیدەیـــە دەریا و مەردم ناخودا

جوشي خاتر وەک شەپول و غەم نەهەنگ ، لەنگەر جەفا

جان مسافر ، تاجرە ئاه ، تجارەی تەن مەتاع

گەمیە غەرقو دوورە ساحل ، دل لە ڕێی یەم و بەلا

تشبیە و وردەکاریەکی زور بالای بە بێ دلی هەژارەی کردوە ، هیناویە شتومەکي دەریایی هەمو ئامادە کردوە بو ئەوە لێ بپەڕێتەوەو ڕزگاري بێ لە دەردو ئەندوهي ئـــەو ژیانە کە تیدایە لەگەل ئەم هەمو تەقەلایەش هەر ڕزگاري نەبوە ئەلی :

چاوم لەبەر لافاوی فرمیسک بوە بە دەریایێکو دلم گەمیە بچکولەیەکە بە سەریەوە ، گەمیەوانەکەیشی مەردمە ، مەبەستی بەو مەردمە دوستیکی تایبەتیە کە بوە بەهوی ئەم سەرلی شیوانەی و بەم جورە دەستە جلەوی دلی گرتوتە دەست . غەمەکەم کە نەهەنگیکي ترسینەرە بەو تەکانانەکە ئەیدا شەپولیک - کە هەژارەو ئەندوهە - پەیدای کردوە . لەنی لەنگەری ئەم نەهەنگەش جەفا و جەورە .. کە ئەمانەی پیکهینا پیویستە شتومەکیک لەم کەشتیەدا بێ ئەلی :

بازرگانەکە لەم کەشتیەدا ئاهو هەناسەی پڕ ئیشو خەمبەردمە ، چیت و کوتالەکەی لەشمە کە بە بایا ئەدا ، گیانیشم کە چیت وکوتال نەما ئەبێ بە کاروانچی بار ئەکاو ئەڕوا ! . دەسا خوایە چاریکم بکە چونکە ئـــەوا نەهەنـگی غەم خەریکە کەشتی دلم نوقوم ئەکا ، قەراخی دەریاش دورە ئەم کەشتیە ناتوانی بیگانی و خوی ڕزگارکا . بە کورتی دل کەوتوتە ناو ترس و لەرزی بەلاوە ! .. لیرەدا بەراستي ئەوەی شایانی بیری شاعریکي دنیا دیدە و خەیال بازو فەلسەفەچی بی نەیتوانیوە خوی لە دەست سالم ڕزگارکا وە بکرە لەوانەیە هەر تەنها سالم توانیبیتی بەم هەمو تشبیهانە کاروانیکی خەیالي و

دەریایکي خەیالي دروست بکا و بەوجورە بیەوی لی بپەرریتەوە ...

* * *

سالم تا ئیستە خوی دابو بە دەم بای هەوەسکاریەوە ، جار جار ئەوە بو لە مەیدانی فەلسەفەو تصوف و وردەکاریشدا چالاکانە ئەسپی خوی تاو ئەدا . ئەم دەشتانەی هەمو بړی تا گەیشتە ئەو مەیدانە کە نیشتمانپەروەرو میژو نوسەکان ئەسپ و قەلەمي خویان تیایا ئەخەنە کار .. ئایا سالم ئەتوانی لەو مەیدانەشدا گوی هونەر دەرکا ؟ . . من لام وایە سالم لەو چەرخە و لەو شوینەدا کە تیایا ژیاوە بلیمەتیکي ئەو مەیدانەبوە ، چونکە دیتی کارەساتە بە ناوبانگەکەی « عزیز بەگی » بابان لەگەل رومیەکانا بە « ٨٥ » شعر ئەیخاتە شریتیکی سینەماوە ، لە کوشکی شاری سولەیمانیدا تروسکە لە هەمو روناکیەکی ئەبرریت و ئەم ئەو شریتەت بو ئەخاتە سەر مەکینەی قسە کردن(*). تو هەم چاوت لە بگرەو بەردەی نەبەردی پالەوانان ئەبیت ، هەم کوییت لە شریخ و هورری توپ و تفەنگ ! . . کەوابو سالم لە تەنشت ئەوەوە کەبو بە میژونوس دلیشی لە روی شعوریکی قەومیەوە بو بە نیشتمانپەروەرو بو بە پسپورریکی «تمثیل ـ لاسایي»ش . . تەماشا ئەکەی سەرەتای کارەساتی شورش بەم دوشعرە ئەکاتەوەو ئەلی :

لیم گەررین با گوشە گیربم ، دەستە ئەژنو کەف زەنان

گیژەلوکەی بای نەدامەت تاری کرد صفحەی جهان

---

(*) وانی ئەکەم ئەم کارەساتە لە « ١٨٥٠ »دا بووە ، چونکە لە ئاخرو ئوخری سالی ١٢٦٦ ی هجری سولتان عبد العزیز خانی عوسمانی داوای لە ناصر الدین شا ـ شای ئیران ـ کرد کە پیکەوە دەست بکەن بە یەکا بو لە ناو بردنی ئەمارەتی بابان . لە لایەن حکومەتی ئیرانەوە غولامشاخانی ئەردەلان نیررا بو سولەیمانی . لەم هەرایەدا عەزیز بەگ دەربەدەر بو چو بو زەهاوو لەویوە بو ناو عەرەبەکان .

بەزمی صیدی ئیمە صیادی فەلەک کاریکی کرد
رەنگە بالای تیر قەداغان بیتە تەرکیبی کەمان.

دەردە دل و لانەتیکچونی خوبو مەردم باس ئەکا تاوای لی دی ئەلی :

دل لە محنەت کەیلە تابی سەیری ناوشارم نیە
عەینی چاوم خوینی ئیژاوە لە داغی مەردمان

لە پاشا دی بە باسی گولولە لیژی بەرەی باباندا و کوژاندنەوەی شەمعی نگینیان و چەپکەردی روزگاری چەپکەرد بەرامبەر بەوان و بەکوردان لە دەست کارەساتی تورکان . ئینجا ئەلی :

شارەزور بەحرو سولەیمانی لە سەر ئەو گەمیە رەنگ
بو شکستی وەک ئەهەنگە ، بو فتنەی ئاخر زەمان
صاعقە و بەرقی نەدامەت ظلمیدا شەرق و غەرب
بەردەبارانە بە مەخصوصی لە سەر ملکی بەبان
چاوی عیبرەت هەلبررە ئەی دل لە وەضعی دەهری دون
سەیرکە سا تورکی ذەلەک چی کرد بەزومرەی کورد زمانا[1].

پیاپا ئەرروا تا ئەگاتە سەر باسی ناو شاری سولەیمانی لەویدا ئەلی :

بی زبان ، کوکو زەنان ، هەر خانەدان تی دەفکرم
عەنکەبوت خواجە نشینە ، جغت جوغدە دیدەبان !

هالو هەوالی ناوشـــار باس ئەکا ، کە ، کی چی ئەکا ؟ و چی بەکی دراوە ؟ . شیرازەی ئیش و کار چون لە بەر یەک هەلپچرراوە ؟ . ئەوانەی ناسازو نا هەموارن هاتونەتە پیشەوە ، ئەوانەی خاوەنی شوین و پایە بون سەرەکانیان

---

( ١ ) لە هەندی نوسخەدا نوسراوە : « سەیرکە سا ، تورکی ، فەلەک چی کرد بە زومرەی کورد زبان ؟ ! » مەعناکەی وای لی دیتەوە : تەماشاکە سا ، فەلەک ! بزانە تورکی چی کرد بە کورد ؟ .

لەو ناوەدا هەلئەخاتەوە . ئەمانەش هەمو کارەساتی روی بو چونکە :

وەکە مەگەز روي لە لایان فەرقی پاکە وپیس نەبو

لەق لەق و نیري ئەچن بو زابني نەهری موان

هەراو هوریای کوردان و تورکان لە گەررەکي چوارباغ دەست پی ئەکاو

رومیەکان دبن بەگژ روستەمەکاني کورد دا ، بەلام چی ئەکەی لەوە کە نگین

خەوي لی کەوتبی ئەگینە :

مەردی مەیدان هاتە جەولان باز لەرەنگي تەپلي باز

« حەیتە » وەکە شاهوی گیژو کورد بە میسلی بالەبان

لە پاشا ئەلی عەزیز بەگە

گولە توپ وەکە توپی ئامیض بو لە ئاتر غیرەتی

تەبمی جوبای بەزی شیلکە بو لەجی سینە ، کەمان

ئینجا ئەلی :

تورکە وەکو « تیلکی » زەعیف وکورد « اسد » خوهاتنە پیش

جەنگجو بون یەکە بە یەکە هەرسو لەکو بەبری بەیان

چەند جوانە ئەو شعرانەی کە ئەلی ؟ :

هەی خوا ، رو ، لەو دەمە چی کرد تەقەی توپ و تفەنگ ؟

سەر زەمین تاریک و دنیا توزو گەرد ، گوبی ئاسمان

ماهی تالع ربی عاق و روژی نەگبەت جیلوەگەر

خەرمەنی شادي لەبەر با بەرقی غەم ئاتەش فشان !

گەرچی پیشاپیش بە هەیبەت بونو ئازا چونە پیش

حەسرەتا بازهەم نەیانزاني « نظام » وا بیحەیان ؟!

پیش دەمیان شیلکی توپ ، پشت سەر ئەو ئاگرە

گەییە چەرخی هەفتەمین لەو حینەدا ئاهو فوغان !

گوێی فەلەک کەر بو لەبەر ناڵەو نەفیری ئەهلی شار
لامکانی گرت ، سەدای ناڵەو فوغان و الائەمان

لە پاشا باسی پیکا هاتنی کوردو تورک ئەکا ، یەکە یەکە ناوی هەندی کەس دینی و داخە دلی ئەوە ئەخوا کە چون لە ناوشاری سولەیمانی‌دا ئەو دەریای خوینە هەستاوە ؟ . و ئەلی :

ڕەنگی سەحرای مەحشەری بو شیوەکەی لای «پیرمەسور»
گرمە گرمی توپی رومی ، هەو ، هەوی سوارەی بەبان
ئایا بیجگە لە سالم کەسی‌تر وتویە ؟ :
بو بە جارروبی مەحەلە هەر تەرەف پەنجەی پەرریو
پەی کراو بی پەی لە مەیدان پەهلەوانی پالەوان

ئینجا عەزیز بەگی بابان ئەلاوینیتەوەو باسی هەتیوی شارەزور ئەکاو دوایی شعرەکانی بەوە دینی ئەلی :

چنگی شـــابازی بازی بازبانی باز نـــەبی
فش هەلات «کەهیا» لەسەر بیضەی طمع وەک ماکیان !

لەمانەوە هەمو بومان دەرکەوت کە نەفسیەتی سالم نەفسیەتیکی غەرامی ، فەلسەفی و نیشتمانی بووە لەگەل ئارەزویەکی زور بەرزدا .

دیوانی شعرەکەی لە لایەن «کوردی» مەریوانیەوە لە سالی ١٩٣٣ ی . میلادی لەچاپخانەی «ئەیتام» لە بەغدا بو جاری یەکەم لە چاپ دراوە ...



# مەولەوی

## ١٨٠٦ - ١٨٨٢

زررەی زایەڵەی دوکانچەی دەماخ ئەیداتەوە دل ئـەکا ئاخ و داخ
پیشەنگی کاروان قەتارەی شەونم لەبـەر بـەیاندا ئەررژینی نم نم !
پیری بەراستی شاعران ، سەر دەفتەری خوشپەیکری ئەدیبان .



خامە شەق وەردەن دەم مەکردەوە
زار زار مەنالو وە دەم دەردەوە
توپا ، شکستەی بەرد هـەردەی دەرد
چەم کور مەینەت،تەن لاغر، رەنگ زەرد !
مەولەوی

بادەنوشی خانەدانی تاوە گوزی. ئارایشدەری بەرەبابی شاهوی . پیغەمبەری شعری سەدەی رابوردو ، شورش گیرری باوەرری تازەو نو . شەیدا بەنوری پاکی یەزدان ، مەفتون بە سوزی نالەی دەرویشان . پیشەنگی کاروانی دوررناسان ، خەرقە پوشی ئاهەنگی مەی نوشان . مەلەوانی دەریای بیر تیژی ، شوررە سواری سارای نوکتە بیژی . دلی رونا کث بووە بە رونا کی خاوەنی جیهان، زمانی گویا بووە بە دەنگی فریشتەی ئاسمان .

شابازی خەیالی هەر دەمە لەمیرغوزاریکا بونی گولیکی کردوە ، دەمی بە سوزی پیری پیران و نالە نالی جەرگی دەرویشان ، دەمی بە دەربرینی گەوهەری نوکتە بە یادی نیازی ئازیزان ، دەمی بە باسی رشتنی ئاوی شەتاوان و هاژە هاژی تافگەکان ! . کەوابو مەولەوی هەم خوشخوانی حەقپەرستی بوە ، هەم نەوا خوانی بەزمی سەرمەستی !! ...

شاعری بەرزی ئاسمانی کوردەواری : « مەولەوی » ناوی «عبدالرحیم»و کوری « مەلا سعید »ە . بە شەش پشت ئەچیتەوە سەر « مەلا ابو بکری مصنف » خاوەنی کتیبی « الوضوح » و لە بنەمالەی پیر خدری شاهویە.. «مەلا یوسف جان» ـ کەیەکیک بوە لە نەوەکانی مەلا أبوبکرـ لە « چورر »ی مەریوانەوە چوەتە « تاوەگوز »ی جوانرو و ئاوای کردوتەوەو تیایا دانیشتوە . ئەو شوینەکانیو سەراویک بوە بی ئاوەدانی داری « تاوگ » و « گویز »ی لی بوە ، لە پاشا دیەکە هەر بەو ناوەوە ناوبانگ ئەستینی و لە وتندا بو سوکی ئەبی بە « تاوەگوز » . .

لە سالی « ١٨٠٦ » ی میلادی لە « تاوەگوز » هاتوتە دنیاوە ، سەرەتای خویندنی لە لای باوکی دەست پی کردوە ، کە چوەتە فقیەتی بە سوختەیەتی لە مدرەسەی «نودشە» دا بوە ، لەویوە چوە بو مەریوان ، ماوەیەکی باش لە «چورر»و لە «نەنە» بوە ، لەویشەوەچوە بو «سنە» لە مزگەوتی (وەزیر) چەند مانگیک ماوەتەوە ، لەویوە چوە بو « بانە » . گەرراوەتەوە بو سولەیمانی لەمدرەسەی شیخ مارفی نودیی لە مزگەوتی گەورە . لەویوە ئەچی بو هەلەبجە لە مدرەسەی شیخ ئەولای خەرپانی ماوەیەک ئەمینیتەوە .. لەم وەختەدا مەلا احمدی نوتشی کورری مەلا ئەورەحمانی نوتشی یەکە مستعدی شیخ ئەولای خەرپانی ئەبی و دەمە دەمی اجازە وەرگرتنی ئەبی . هەندیک ئەلین لە جوشی اجازە وەرگرتنی مەلا احمــددا ئەم چوەتە هەلەبجەو لەو وەختەدا ئەم « کمال » ی خویندوە بەلای مەلا صـادقی تەویلەییەوە ـ کە

ئەویش هەر مستەدێ شیخ ئەولا بووە و تەواوی کردوەو لە بەر بێ جێگەبێ هیشتا اجازەی وەرنەگرتوە ـ لەپاش ماوەیەک لەبەر پیشهاتیکي خێزاني خوێندنەکەی پەکێ ئەکەوی و هەڵەبجە بەجێ دیڵێ . .

دوسالیک بەم بێ خوێندنیە ئەمینیتەوە و لەپاشا تێ هەڵئەچیتەوە . بە مدرەسەکانی ئەو ناوەدا ئەسوورریتەو لەپاش ئەمانە ئەچی بو جوانررو بولای قاضی جوانررو ماوەیەکی باش لەوی ئەمینیتەوە ، سەریکیشی لە « پاوە » داوە بەلام ئاوائوای کاڵا بو خوێندن چووە یا هەر بە کاروان ری تێ کەوتوە ؟. لە ١٨٣٩ دا لە دەورەی ئەمانلڵا خانی کورری خەسرەو خانی والی‌دا بو جاری دوهەم ئەچیتەوە بو « سنە » و لەم جارەی زور ئەمینیتەوە ، لە ئاخردا لە مزگەوتی « دارالاحسان » دائەمەزرێ و لەکن حاجی مەلا احمدی نوتشی ـ کە لەم ماوەیەدا مفتی سنە ئەبێ ـ دەرز ئەخوێنێ ...



مزگەوتی (دارالاحسان) لە شاری «سنە» بەدو مەنارە جوانەکەیەوە . « امان‌الله خان » والی گەورە لە (١٨٠٣)دا دەستی دایە،لە (١٨٠٦)دا تەواوی کرد بو ئەوە مەولەوی لە (١٨٤١)دا اجازەعیلمي تیایا وەرگری.

لەو سەر دەمەدا کە لە سنە ئەبێ دەنگي ئاوازی روح ئەفزای شعری مەولەوی لە تاقچەی دیوانخانی خەوانین و پیاو ماقولەکانی سنەدا دەنگ

ئەداتەوە ، مەولەوی ئەبی بە بولبولی هەمو دیواخانی .، یا هەمو دیواخانی ئەبی بەپەروانەی مەولەوی! . هەر وەها لەو ماوەدا پیاوی وەک مەلاعبداللەی دشەیی و سید عبد العزیزی کەلجیی پی ئەگەیەنی بو ئەوە لە پاشەروژا یەکەمیان بیی بە مفتی و دوهەمیان بە شیخ الاسلامی سنە . .

مەولەوی بەمجورە لە سنەدا رایئەبوبری تا لە (١٨٤١) دا اجازەی تدریس لە حاجی مەلا احمدی نوتشیوەر ئەگری . لەگەل ئەو هەمو ریزە ، کەلیان گرتوە و لەگەل ئەو هەمو تەقەلایە کەلەگەلیان داوە بو ئەوە هەر لە سنەدا دانیشی گیرنەبوەو راستەوراست گەرراوەتەوە بو ولاتی خوی و زور بە حورمەتەوە رەوانەیان کردوتەوە . کەهاتوتەوە ئەوەندە گیرنەبوە سوزی رایەلی مەعنەویانیشیخ وەسمانی تەویلە رایئەکیشی بولای خوی، لەوی ئەبی بە داوی تەریقەتەوە ، یا خود ئەبی بە پەروانەی پەرر و بال سوتاوی دەوری سراج الدین، یا بەبولبولی تینوی بە عەتری گولی سراج الدین و ئەبی بە خەلیفەشی . ئینجا ئەچیتە دیی « جوررستانە » لەوی دائەنیشی و تدریس ئەکا ، بەلام ئەم تدریسەی تاسەر نەبوە چونکە سەودای تەریقەت لەگەلکی ئەوەی خست کە بتوانی ئتیر پیبەندی تدریس بی . لەپاش جوررستانە ئەچیتە « بیژاوە »و لەویشەوە ئەچیتە « بیاویلە » . لەپاشا لەویش مالی باری کردوە چوەتە دیی « سەرشاتە » لەپشت قەلای شیمرانەوە لەسەر سیروان . ئەلین بەکاروان جاریکیتر ربی کەوتوتەوە سولەیمانی . . لەهەر لایە لەم شوینانە بوبیت هەر پەپولەی سراج الدین بوە تا لە (١٨٨٢) دا بە «١٥» سال دوای سراج الدین هەر لە سەرشاتەلە تەمەنی « ٧٦ » سالی دا کوچی دوایی کردوە و لەویش نیژراوە . گوررەکەی جی رازونیازی خەمباران‌ودل سوتاوانە . .

هوی مردنەکەش ئەوەبوە سوار ئەسپیک ئەبی و ئەچی بو « پریس » . پیاویک جلەوی ئەسپەکەی رائەکیشی ئەویش چاوی کوبر بوە ، کەئەگەنە دەشتی بەردەمی«هانەسورە» دارتوییک لەویدابوە ، مەولەوی لە زەمانی چاو

ساغ ، شارەزای بوە،بە پیاوەکەی وتوە کە گەیشتینە بن دارەکە پیم بلی باپشتم ەوینم- چونکە خوی نەیبینیوە ـ کە ئەگەنە ئەوی پیاوەبی ئەلی ، ئەویش پشتی دائەنەوینی و هیشتا لی تی بەررنابن لایوا ئەبی لەژیری دەر چوون پشت بەرز ئەکانەوە و لقی دارتوە کە لەپشتی گیر ئەبی و ولاخەکەش بەگوررئەرروا پشتی ئەشکی ، ئیتر ئەم پشت شکانە ئەبیتە هوی مردنی ...

مەولەوی پیاویکی میانە بالاو زوریش لاواز نەبووە ، ریشیکی تەنکی هەبووە ، دوچاوی گەشی دریژکاری پیوەبوە ، هەندیجار میزەری سپی کوردانەو هەندی جاریش جامەدانەی ئەبەست بە سەرەوە ، هەمو دەمی خەرقەیەکی بەرەنگی سەوز سەوزکراوی ئاوەلدامەنی لەبەر کردوە ، گالوکیکیشی ئەگرد بە دەستەوە،قسەکانی لەسەرخووپرر مەعنابووە، جارجار سوزیکیشی بوە وەکو تەعبیر لە نهینی تصوف یا کاون بدانەوە ، بەچەند سالیکی کەم لە پیش مردنیا ئەو چاوە جوانانەی کە دیعەنی تەبیمەت و سراج الدین و خاتو عەنبەری پی ئەبینی کوربون ئەوەندەیتر سوزی گەیشتە ئاسمان ...

مەولەوی لەدەوری فەقیەتیدا ـ وەکو لە ئاخر دەوریا ـ زور پابەندی خانەقای تەویلەبووە ، ئەو خاناقایە بە هاتوچوکردنی هەمو تیرەیەکت وەکو بورەی هەنگت وابووە ، لە هیندی ، لە ئەوغانی و لە کەسانی تریش . ئەو ئەوغانیانە کە لە چوررستانە بوون و لەپاشا بوون بە خزمی مەولەوی ئەوانیش هاتوچوی بنەمالەی شیخ وەکانیان کردوە ، سەرەتا کە ئاشنا ئەبن بە مەلا عبدالرحیم لە زەمانی فەقیەتیدا تەماشا ئەکەن ئەم پیاوە لە تەرزی ژیان و رابواردنیا دەرویشی و خواناسی وعیلم ئەدرەوشیتەوە ، ئەوغانیەکان لەسەر رەوشتی لای خویان ـ کەبەم جورە کەسانەیان وتوە مەولەوی ـ ناوی ئەبەن بە مەولەوی . وردە وردە ئەم ناوەی لە خانەقای شیخی سراج الدین و ولاتی

سویدەکانیا بو بلاو ئەبیتەوە . داکەوتنی ناوی مەولەوی بو مەلا عبدالرحیم لەسەرەتادا بەم جورە بووە .

کە لە ١٨٥٨ دیسان بە فرمانی شیخی سراج الدین لە لای والی ئەچیتەوە بو سنە . والی غولام شاخان تەماشا ئەکا دەنگی شعری مەولەوی زەنگیکەو دەنگێ ئەداتەوە ، بادەنوشانی ناسوتی لە خەرقە پوشانی لاهوتی هیچ جیاناکاتەوە . بیجگە لەمەش پیاویکی ریز لی گیراو و سەربە شیخ وەکانی تەویلە یە ، لە لایەکەوە قسەزانی و ئەدەبی مەولەوی خوی ، لە لایەکەوە شوین ئاگردانی شیخ وەکان ، لە لایەکیترەوە زەوقی ئەدەبی غولام شاخان ئەمانە هەمو ئەکەنە کاری کە والی ئەنجومەنیکی تایبەتی لەئەدیب و علماو پیاو ماقول و میرزاکانی سنە پیکەوە ئەنی ، بەشەربەتخوریەکی شاهانە ناوی مەولەوی - کەتا ئەو وەختە غەیر رەسمی بوە بووی - ئەکا بە لەقەبیکی رەسمی بو مەلا عبدالرحیمی تاوەگوزی .

مەولەوی کەلە جوررستانەبووە لەو سەردەمەدا چەند مالیکی ئەوغانی لەوی بوون (خانوعەنبەر) - کەبەشیکە لە هەلقولینی سەرچاوەی شعری مەولەوی - لەو ئەوغانیانە بووە کردویە بەهاوسەری ژیانی خوی .. لەم خانوعەنبەرە چوار کورری بوە ؛ شیخ محمد ، شیخ احمد ، شیخ محمود ، سید عبداللە . لە ژنیکی تریشی (سە) کورری تری بووە ، سید هادی ، سید حسن ، سید حسین . بیجگە لە سید عبداللە ئەوانیتر هەمو لە گەنجیی و دەمە دەمی پیریدا مردون . سید عبداللە ئیستە نەتەوەی هەیە نەخویندەوارو نیمچە خویندەوارن .
هەروەها برایەکیشی بووە « مەلا سعداللە » ی ناوبوە ..

مەولەوی لەقەلای جوانرو « مەلکە » ی شاعری بەناو بانگی جوانرروی چاو پی کەوتوە . کاروانی بەغدایشی بووە گەلی جار لەگەل مفتی زەهاویدا یەکیان گرتوە و قسەی خوشیان کردوە .

بەبی شک مەولەوی بەرزتر شاعری سەدەی نوزدەهەمی کوردە . تائەم

تاریخه و بگرەهی پیشەوەش، نەوەک هەر ئەوەندە بەلکو ئەگەر بەراوردی خەیالی شعری مەولەوی لەگەل شاعرەکانی سەدەی نوزدەهـەمی غەیری کورددا بکری هەمو زمان و قەلەمیک دان بەوەدا ئەنی کە فیـکری بەرزی مەولەوی لەسەرهەمویانەوەیە . نازکی خەیال ، تیژی بیر،وردی مەعنا ، جوانی وشەو راکیشانی دل بەعباراتی رەنـگین و بزواندنەوەی تەلی عاتفە مەگەر هەر لەدەست مەولەوی هاتبی . یاخود مەگەر هەر خانوعەنبـەر توانیبیتی لە پەردەیەکی نهینیەوە خوی بنوینی بو مەولەوی بوئەوە قاپی شعری بوبکریتەوەو پی بەومەلەوی بە کەقەلەم لەباسی شعرو زەوقیدا کولە ! . .

ئیمە ناتوانین بلین مەولەوی دیدەنی لەمەلـکە جوانرروی و احمد بەگی کوماسی کردوە ، یاخود گویچکەی بە شعری مەلا مصطفی بیسارانی ئاشنابوە ئیتر لەمەوە سەرەوژور بوەتەوە بو گومەزی بەرزی بارەگای شعر. چونـکە خەیالی مەولەوی و پاریزی مەولەوی بو وردەکاری شعر و ئاوەدانـکردنەوە شعر گەلی بەرزتر بوە لەوەکە ئەمانە پیشەنـگی خەیالی شعری مەولەوی بو بیتن ! . .

مەولەوی کە بە قانونیکی تەبیعی زایەلەی خەیالی بە شنوی شەتاوان ، تەلی عاتفەی بەهاژەی تافـگەی کوساران ، رشینەی پەررەی دلی بە بونی چنوری سەردیاران بوبیت ئەبی‌چون سەر سنوری ئاسوی خـەیالی تەنها لوتـکەی کلاوەی جوانررو و کوماسی و بیساران بوبیت ؟؟!.

مەولەویەک کە لەبەرەبەیانی جوانیـەوە لەژیر پەردەی تاریکی شەوی گیارەشی بەهارا ، لەوکاتەدا کە پەلەوەرو جانەوەر ، ناسوتی ولاهوتی هەمو لەکولانەو هیلانەی خویانا سەرخوشی پرخەی نوستن بن، دنیا کش‌ومات‌بی، پەردەی خاموشی‌دادرابیتەوە . ئەم بەبی چرپە هەستیت چاوی بکلوفی و بچیتە سەر قرلەی شاخیک تەماشابکا ، وا هەوایەکی سافە ، دنیا بی تەمە ، ئاسمانیکی شینە ، ئەمـ ـ ەکا لە سەمادان لەخوارەوە خوررەی کانیـاوەکان لەگەل

شنەی نەسیم‌وخشەی نەرمي گیا کانا پێشوازي دەنـگي نهێني قودسـیەتی کردگار ئەکەن ـ کە تێکلاوی هـەمو مەوجوداتیکە و موژدەی عالەمێکی خوشتر لەم عالەمە بلاو ئەکەنەوە ـ کەبچیت و ئەم دیەنە ببینی ئایا ئەبی چون خەو بەری نەداو نەکەویتە عالەمێکی مەعنەویاتی وەهاوە کەهەمو شعوریکی پابەندي هـــەمو ئاشنایەکی ئەو نیگارستانەبیت !؟ و لە جوشی کورەی دەرونیەوە نەلی :

ئەم شەو دیارەن بانـگم بی شەرمەن     زایەلەی سەرمتور کەللەکەم گەرمەن!

وە یاخود نەلی ؟ :

شەوەن خەلوەتەن مال بی ئەغیارەن

ئالەم گشت خەفتەن ، دوس خەوەردارەن !

مەولەوی‌یەک کە لەدەمە دەمی زەردە پەرری خوراوادا لە روژیکي مانـگي ئوردی‌بەهشتدا سەر لەتاقچەی مەغارەی خەیالات دەربێنی و روبکاتە پانایی دەشتی‌سارای‌بەر کوساران ببینی‌وا: خوانی زومرروتی لەو دەشتەدا راخراوە، دوکانچەی گەوهەری پررجەوهەری گولالان خەرمانەیان داوە ، هاژەی قەلبەزەی شەتاوی بەفراوان لەگەل نەوای روح‌ئەفرای بولبولان تێکلاوە ، رەشمالی پررلەمالی وەکی رەشخالی گونای ئالی ناودەشمالی دلخوازان هەلدراوە، تیشکی روژ لەو دانـگي‌ئیوارەدا لەسەر زەنـگولي بەفر لەوسارەدا وەکو رەنـگی شاپەرري پەری خەرمانەی داوە ، گولوپ گولوپ لە دلوپ دلوپی ئەو بەفراوە بەریزە وەستاوە ، وینەی بی وینـەی روژیان پیا ئالاوە ، ئەمانە هەر یەکە بە رەنـگی وینەی دوبارەی ئەم زومرروت و گولالەو رەشمالانە ئەدەنە دواوە ! ...

جاکە ئەمانە ببینی و بە زمانیکی نهێني پی بلین کەوا هەمویان سەرچاوەی هەلقولینی لافاوی ئەو تەبیعەتەن کە ناموسی تەبیعی تەعبیریانی لە بەردەی خەیالی ئادەمیزادا نەخشاندوە . ئایا ئەبی چون دلي نەکریتەوە و نەکەویتە

عالەمیکی خەیالبازي وەهاوەکە دلو دەروزو هەمو شموریکی ئادەمیزادیتر گولاوپاشی نەکا . و ؟ چون ئەبی بانگي سەربەستي تەبیمەت بە دنیاذا بلاو نەکانەوەو لە مانگای دلیکی فراوانەوە نەلی ؟ ! .

گول چون روی ئازیز نزاکەت پوشان

وەفراوان چون سەیل دیدەی من جوشان !

یا خو نەلی :

های جە شنوی وەش روح‌ئەفزای کاوان

ئای جە شاخەی تاف ساف سەراوان !

کەوابو مەولەوی‌یەکێ کە ئەمە کردەوەی بوبیت و بەم جورە ئاشنای بادەی مەی‌نوشان بوبیت چون ئەبی ؟ لە باتی دیەنی مەلبەندو یەیکەری تەبیعەت و نازکي سروشتي زەوقي خوی شتیکی‌تر بوبی بە هەیکەلی قبلەغای بو ئەوە بەهوی ئەوەوە بە تاسەوە باوەش بە ئاسوی شمردا بکا ؟ . بەلکو مەولەوی خوی پیغەمبەری شمرو زەررنگەري خەیالی شمرو یەیکەرتاشی ئاسمانی بەرزی شمر بووە . مەولەوی خوی‌سەرچاوەی‌ئاوی رونی شمر بووەو تینوانی بازاری شمر تەنها بەفینکي ئاوەکە دلیان گەشاوەتەوە ، نەوەکێ هاتبي جومالی بو جوگەلەی شمری غەیر کردبی بو ئەوە لە بەراویانا باغچەی شمر بەخیو بکا ! ! . .

بەلی ! مەولەوی لە عەنمەناتي خەیال نازکي شمردا یادی بیساراني و خالوی کوماسي کردوە و جار جار قسەکەیانی کردوە بەتاني ئاوریشمي نەونی زەرر کفتی شمری خوی ، وەکو خوی ئەلی :

بیساراتیەن نەنوی فەردی من خەم چەنی خەمان زو مەبو ساکن

وە یا ئەلی :

بولند کەر مەقام دلسوزی رامی نەزیلەش بو فەرد ، خالوی کوماسی

بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنی کە سوزی شمری بیساراني ، یا تیشکي رونا کی

شعری خاوی کوماسی ، مەولەوی ، یا سوچی لە دلی مەولەوییان را کیشابیتە مەیدانی شعرەوە . . مەولەویەک کە خوی خاوەنی ئەو فیکرە نازکە وردەبیت بلیت :

رو‌خسارش وەختی مەسقەل مەدولیش وەشنوی پاریز خەیال مەبو ریش

یاخود بلیت :

چین کەفتەن وە روی پیشانی چون سیم

چون زنجیرەی ئاو وەشنوی نسیم

پیویستی بەوە نیە کە دەماخی خوی بە بونی باخچەی شعری مەلامصطفی ی بیسارانی و احمد بەگی کوماسی چاخ بکا ! . . ئەوەندە هەیە ئایا ئەمانە ئەبی چەندە گەورە بوبیتن کە مەولەوی بەو هەمو خەیال بەرزیەوە شعریانی هینابی و کردبیتنی بە پارسەنگی شعری خوی و لە کانگای دلیشیەوە ئیمانی بە شعرەکانیان هینابی ؟ ! .

ئەوا « عبدالرحیم » بەم جورە کەوتە کوشی تەبیعەتی شعرەوە چاری نەمابو لەبەر ئەوە سەر خوشی هەمو مەیدانیک بو تا ما هەر ناوی شعری « معدوم » بو ...

* * *

ئینجا ئیستە سەرەی ئەوە هاتوە کە باسی هەندی لە شعرەکانی مەولەوی بکەین بو ئەوە مەولەوی‌مان لە بازاری ئەدەبیاتی کوردی‌و ئەدیباتی کوردی‌مان لە دلی مەولەوی‌دا بو دەرکەوی .

جاری لەپیش باسەکەدا ، مەولەوی زورتر لە شعرەکانیا ناوی «ئازیز»ی هیناوە مەبەستی شیخ عزیزی جانەوەرەی مەریوان بووە کە دوستیکی گیانی بە گیانی بووە ، وە «خاوی کوماسی» ش مەبەستی احمد بەگی کوماسی بە کەهاو چەرخی خوی بووە ..

مەولەوی بەبی پەروا ئەکەویتە کورری غەلسەفە چیانەوە بە بیریکی ورد و

فیکریکی تیژ لەم گونە ورد ئەبیتەوەو لاپەڕەی مێژوی دەوران دبلیتە بەرچاو، لەپاشا خەرمانی کشت وکالی کردوەی ژیانی خوی لە گەروی ئاشی نامرادی دائەهاڕێ اکوتوپڕد ئەلی :

چەرخ هەر ئەو چەرخەن تا ئاوردو برد
دەست ئەو دەستەگین تا خانـــەم ئاورد
دا بەزم شیرین خوسرەو وە هەمدا
جام دا وە سەرجەم ، جەم وەسەر جەمدا
شورەت نامەی نام حانەمەش کرد تەی
کرد وەکاسەکەل ، کاسەی کەلەی کەی
ساقی گەرد ئارد یاران هام فەرد مەدو نەدەماخ ئاسیای چەپ گەرد
سەدای ئاسیاوچی مەیو بەیا بەی ئاسیاو خالیەن نوبەی ن سا ، دەی !
هەرکاتی زانای چەرخی وەردەوە چون یاران دانەی منیچ هاردەوە
بەهەر سەر دەشتی کشتی کریا بو وەجوی چەمەی مەی ئاو نەدریا بو
نیاوا بو خاس دانەش بەو ئاوە لایق نین بەرێش بەو ئاسیاوە
فیدات بون ئامان ساهورکەر با ، بی
وەسەر کشتدا پەی بەی جو ، جوی ، مەی
ئەر سەد کشتەکەم ئاخر کارشەن هەفتەی ئاخری نەوبەهارشەن
بلام بەل تل ، تل کیشوی کەرو جـــەی ئاخرەدا دانەی وەرو
حەیفەن تو میراو سەرجوی بادەبی وە هەر کەس وەقەد کەناف دادە بی
من کشتم رو زەرد هام فەردانش بو دانەم روسیای هام دەردانش بو !

ئیمە بو ئەوە بەتەواوی جەوهەری ئەم فەلسەفەی مەولەوی‌یە دەرکەوی ناچار ئەبین کە بە جوریکی ورد و دریژ بچینە جەرگی شعرەکانیەوە . کەوابو ئەلی :

ئەمە ... ئەمە ... و ئەم چەرخە کە بەرحاوت ئەگەڕی زور کونە ؛

هەر ئەو چەرخ و دنیا کەیە ئەوەتەی بوەو هیناویە و بردویە .. دەست هەر ئەو دەسلنگینەیە ئەوەتی ئەنگوسیلەی هیناوە .. لیرەدا مەولەوی شتیک دینیتەوە بیر ، گویا ئەنگوسیلەی سلیمان پیغەمبەر ئەنگوسیلەی نگینە لەدەست هەر کەسیکا بیت ئامەیبەنیو هات روی تی ئەکا . جا ئەلی دەست هەر ئەو دەستەیە مادام ئەنگوسیلەکە هەرچەندروژ لە دەست یەکیکایەو وەفای بو هیچیان نیە دەستەکان هەریەکن باجیاش بن ! .. یا خود ئەلی ئەو نگینی شەرەفی پیغەمبەریەتیـە دەساو دەست هات تا گەیشتە خاتم‌الانبیا کە « محمد »ە « ص »و لەویدا برڕایەوە . ئینجا دیت بە تانو پویاو ئەلی :

ئەم چەرخ، نگینە ئەزانی چونە ؟ . ئەوەیە کە بەزمی شیرین و خوسرەوی تیکدا ، ئەوەیە کە جامی جیهانئمای کوتا بەسەر جەمشیدا و جەمشیدیشی کوتا بەسەر خالەمدا و وای تیکلاو کردن کە هیچی بەسەر هیچەوە نەهیشتن . جەمشید پادشایەکیزور کونی عەجەم بووە گویا لە حکمەت ئاوینەیەکی دروست کردوەو ناوی « جامی جیهانئما » بووە ، هەمو قەلەمڕەوی خوی لەو ئاوینەدا بینیوە ! ـ .. دیسان ئەم چەرخە ئەو چەرخەیە کە حاتەمی کورری عبداللەی تایی ـ کە پیاویکی عەرەب بووەو لە نانبدەییدا ناوبانگی دەرکردوە ـ لە ناوی برد و مەگەر ناوونیشانی دەماو دەم بگیرریتەوە . هەر وەها کاسە سەری کەیکاوسی کورری کەیقوبادی کەیانی کرد بە سوالەت و لەژیر خاکا رزاندی . ئەو کەللەیە کە خاوەنی ئەو تاجە بووە وا ئیستەش هەر بە شانازیەوە ئەلین « تاجی کەیانی » ...

جا ئەم فەلەکی ناهەموارە بە هەزاران هەزاروبە ملیون ملیون هاو ـ سەران و نەونەمامانی کرد بە گەردو توزو دای بە لوتی ئاشی چەپگەردی زەمانەدا و هاررینی ! . کەچی هەر تیری نەخواردوەو وەکو ئاشەوان ئەکاتە سەر باناناو لەسەر یەک لەسەر یەک ئاش بەتال ئەکا و ئەلی وەرە پیغەوە سەرمت هاتوە بو هاررین ! . ها ، هەر ئەوەندەت زانی ئەم ئاشە

سورریکی خواردەوە و « دان »ەی لەشی منیشی ماشیەوەو هاوری ! ...

ئەبی ئەوە بزانیت کە لە هەر دەشت و دەربکا هەر کشت وکالیک کرابو ئەگەر بە جوگەلەی سەرچاوەی مەی ئاو نەدرابو و جوان جوان دانەکانی بەو ئاوە تیراو نەبو بو ، ئەوە هیشتا بەکەلکی ئەوە نایەکە بکریت بەکەروی ئەو ئاشەدا ! . هەر ئادەمیزادیک کە لەم بەراوی کیتیەدا دیتە بەرهەم تا بە ئاوی مەعرفەتی حەقیق و خواناسی و داوین پاکی ئاو نەدری و تیراو نەبی نابی روبکاتەوە بارەگای یەزدان و روبەروی محاسبەی ئەو بیتەوە . . گوابو لە دەورت گەرریم ! بانگ کە ، با جوگەی مەی لە سەر یەک لەسەریەک بیت بو ئەوە لە ئاوی مەعرفەت تیراویم وبتوانم بچمە رو .. بانگ کە با ئەم ئاوی مەیە بیت هەرچەندە کشت وکالی هوسریشم گەیشتوتە ئاخر و رابوردووم بە وشکی رابواردوە و ئاخر حەفتەی بەهاری ژیانمە ! . هەر بانگ کە بەلکو تەلە تەلەیەکی ئاهیکی تیدا مابی و ئاو بکیشی و لەم ئاخرەدا شیلەی نی کەوی و دان بگری ... بەخوا حەیفە تو میراوی سەر جوگەلەی بادەی حەقپەرستی و خواناسی بی‌و بەشی هەمو کەس بە ئەندازەی خوی بدەیت کەچی کشت وکالی من لەبەر بی ئاوی رو زەردی ناو مەردم و هاو سەران بی و دانەکەی رو رەشی هاو دەردانی بی ؛ رو رەش بی لەلای ئەو کەسانە کە وەکو من چاوەروانی دەستی تون و بەشی ئەوانت دابیت و منت ناهومید کردبی ! . لیرەدا مەولەوی بە هەمە جور روی دلی کردە پیغەمبەرە خوشەویستەکەی و ئەم پاررانەوەیە لەو بووە ..

مەولەوی لە ژیر پەردەی فەلسەفەو وردەکاری‌دا دەستیک بو ئەو دیوی پەردەی تەبیعەت دریژ ئەکاو ئەلی :

زوسانەن وەی رەنگ وە گەردون یاوان

گیجیان لول گیج کلیلەی کاوان

چه شیرین زەرگەر ، هەوای توفی سەرد
گوشوارە نەگوش نەونەمامان کەرد
بەی نگای بالای نەمامی بی گەرد
بەخ ئایینە گرت ، ئەم چارشیو ئاورد!
ئەی مەحبوب خاس وەی بەنای تەمام
مەناو بەی بەزم ساقی و شیشەو جام
ساقی با کێ نیەن جە سەردی « دەی » دەی
هەوا وەش کەرو نەشەی نوشای مەی !
ئاخر سەرمەشقەن پەری مەی خواران
واردەی ویەردەی واردەی یاران !
زوانەکەی سوزو ، دەستەکەی پیالە بکیانو ریزو رەحمەت پیالە :
رەحمەت وەروی خاکێ رستگاراندا پیالە دا وە دەم انتظاراندا
دیرەن با ئیمەیچ نەی گوزەرەوە جامی وەسەر نین دەس وە سەرەوە !

ئیمە ئەبی لەو باوەرەدا بین کە تەنیا فیکری مەولەوی نەبی بتوانی ئەم تاقچەو مەغارەو تەلارو شانشینە دروستکا وەمەی و مەی نوشی تیدا دابنی و بەزمي شاهانە لە وەختي زستانا بەم فیکرە وردانە گیرری لە دەست کەمی تر نایەو ئەو فیکرە بو کەمی تر دەست نادا. چونکە بیجگە لەمەولەوی کەمی تر ناتوانی بلی :

ئەوا زستان بەم توف و سەرمایە کەوتە گەردونەوەو جیهاني بەجوری پرر کرد کە کایلەی بەفري کیوەکان گیژو لولیانە . لە پاشا بلی : ئەو بەنا کە بورج وباروی شوریان و بەندەنەکانی دروست کردوە لەپاش ئەوە کەرەنگی هەموی رشت و ژور و ئەشکەوتي لی دروست کرد هینای تاقچەی مەغارە - کانیشی بە بەفرگەچکاری کرد .. یا خود ئەو بەنایەکە «بورج» ە ولەشوینە بەرزەکانایە هینای تاقچەی ئەشکەوتەکاني بە بەفرگەچکاری کرد . . ئەوا

لیرە بارەگایەکی بو بوکیکی تازە وەوی دروست کرد و سوارەی سەرمای نارد بو گواستنەوەی. دیارە ئەم بوکەش نەمامی کوسارانە ! . بەلی وا بوکی خرایە ربی و ئەگویزریتەوە . ئینجا باسی جونیەتی گواستنەوە و ئارایشی ئەم بوکە ئەکاو ئەلی :

وەستای زەررنگەری توف چەند بە وەستایەتی گوارەی زەنگولی بەفرو سەهولی کردبو بە گویچکەی نـــەمامی بوکدا و وەکو گوشوارە شورری کردبوەوە !. بوکی سوار کرا .. لەناو کورددا ئەو رەوشتە هەیەکە بوکی گویزرایەوە تارایەکی بەسەرا ئەدەری و ئاوینەیەکیشی ئەخریتە بەردەم . جا ئەلی :

ئەم بوکی نەمامی ئیمەیە بو ئەوە بالای نەونهالی خوی ببینی (سەهول)ی بو کرا بە ئاوینە و «تەم» یش بەچارشیو و درا بەسەریا . . بوکی گویزرایەوەو شایی و ئاهەنگە ، بەلام ئەم مەحبوبە جوانەی نەمامەو ئەم گەردونی وەستای بەنایە بو بەزی ساقی و شوشەو جام نالە نالیانەو ئەیانەوی یەکیکی ئەم بەزمە بگیرری ، بویەش نالە نالیانە چونکە ئەمانە هەموی بەستویەتی کەس گویی لە خوررەی نابی ئینجا پی ئەلی :

گیانە وا مەزانە ! ساقی هیچ باکیکی لە ساردو سەرمای روژی دەی «دەی مانگی» نیە . ـ «دەی» ناوی مانگیکی فارسیەو ناوەراست مانگی زستانە ـ هیچ باکیکی لەوەنیە نوشانوشی مەی هەواکەی خوش ئەکا . . یاخود ئەلی هیچ باکیکی نیە چونکە دنیا کوریەی گوررانە لە سەر حالیکی نامینیتەوە، سبەی روژ خوش ئـەکاو هـەوای نوشانوشی مەی لەکەللەمانا دەنگی ئەداتەوە ! . گویا تو نازانی یەکیکی ئەیبیژی و یەکیکی ئەیخوا ؟ . نازانی کە سەر مەشتی مەیخواران پاشماوەی بەجی ماوی رابوردوی یارانە ؟. تو نازانی رابوردوەکان ئەوی خواردیان ، خواردیانو ئەوی لیان بەجی ما بەجی ما ؟ . ئیمەش بەو چەشنە ئەبی لەسەر ریچکەی ئەوان بین ! . .

ئاخ زمان بەم سوز و گوداز و گورانیەوە ، دەست بەم مەی و بادەو پیالەوە ، بنیری و برریژی رەحمەت وپیالە ؛ برریژی رەحمەت بەسەر خاکی مەزاري ئەوانەدا کەرزگار بون لە دەست چەرخی چەواشەو لە مەزارەکانیانا چاوەنواردي ئەو باراني رەحمەتە ئەکەن . بنیري پیالە لەبرریزەکەش بیدەی بە دەست ئەوانەوە کەماون و چاو لە ریگەن و چاوی بەزەی یان بررپوەتە ئاني لی خوش بون . . دیارە لەمەو نەشرەکەش لەبەر چاوە . لەپاش ئەمانە ئەلی :

دەسا کوررە دەرەنگە یا ئیمەش لەم رێ بازەدا جامیک بگرین بە دەستەوەو مەرمخەین بە پشتا و دەست بگرین بەسەرەوە و تا دوا چورر بیخوینەوە و بچینە جەرگەی یارانەوە ! . .

مەولەوی بە سوزیکی مەعنەوی یەوە رو ئەکاتە مەیدانی ستایش بیژانی لەش و لاری خال خاسان ، لەو کوررە دا بەیادی دوستیکی دیرینەوە بادەی مەینو - شانی دوست پەروەراني حەقیق ئەلیتە سەرەوە ، ئەلي طاقەی بە شاپەرری خوشەویستي ئەو دوستەی دەنگ ئەداتەوە و ئەلی :

چون چهرەی خەیال روخسارەکەی ویش

نە پەردەی دلەی « مەعدوم »ی دلریش

عانا جەبین شای سوسەن خالان ، کەم کەم نەگوشەی لای سیا مالان

نەنوی تاریکی نای شەدەی بی گەرد

لەتافەت چون ئاو حەیات مەوج مەوەورد !

ئەلی وەکو پەیکەری خەیالی رومەتی خوی لە پەردەی دلي مەعدوی دل برینداروە شای سوسەن خالان ناو چەوانی خوی دەرخست ! . لە کوی دەری خست ؟ . لە گوشەی دەواری رەشەوە ! . کاتیکت زاني ئەوا لە ناو تاریکایی شەدەو پوشینی رەشا کە لە سەری ئالاندبو ، وە یا زولفە رەشەکاني جواني نازکي دەمو چاوی وەکو ئاوی ژیان لەناویا شەپولي ئەدایەوە ... بەلام مەولەوی هەر وا بەسەر زارەکي وەنەبی ئەم ستایشەی کردبی بەلکو ئەم

شعرانه که ئیمه بەم جوره خویندمانەوەولی نی گەیشتین گەلی قولترە لەم مەعنایەکە بەم جورە چوه دلمانەوە ، چونکە ئەلی :

ئا ئەم دوستە کەمن قسەی لیوە ئەکەم دو وینەی هەیە ، یەکی لە دەرەوە ( الشبح الخارجی ) ، یەکی لە ناو دلی مندا ( الشبح الذهنی ) . ئەوی لە دلمدایە دەستکردی خەیالە . هیناویە راستەو راست پەیکەری رومەتی ئەوی دروست کردوە و خستویەتە دلی مەعدومی دل برینداری‌وە . . بەم قسەیە ئەوەی دەرخست کە خەیال وینەیەکی لە نمونەی دلخواز دروست کردوە و لە دلیکی تاریکا دایناوە . دلەکە تاریکە چونکە تا ئیستە ئەو وینەیەی تیا نەبووە تا روناکی بیت . شای سوسەن خالان ورده ورده لە گوشەی سیامالانەوە ـ کە دلیەتی ـ وینەی ناو چەوانی دەر کەوت وەکو چون لە ناکاو لە تاریکی شەودا روژ گزنگ بدا هیدی هیدی شەوەکە ئەکا بە روژ ئەمیش لە دلی مندا وابو ! . جا لە ناو ئەو تاریکی دلەمدا کە تاریکیەکەی وەکو شەدەی خاو وابو جوانی نازکی وەکو ئاوی ژیان شەپولی ئەدا ، یا خود بلی لەنامەت وەکو ئاوی حەیات شەپولی ئەدا ! دەرکەوتنی خەیالی وینەی ئەو لە دلما وەکو جوانی زنجیرەی شەپولی ئاوی ژیان وابو لە ناو دەریایکی تاریکدا ... دیسان مەولەوی گەلی لەمە وردتر رویشتوە چونکە باسی « مانگ »ت بو ئەکا لە کاتیکا کە لەبەین پەلە هەورە رەشەکانا سەر هەلئەدا ! .

مەولەوی لیرەدا بە پیچەوانەی هەمو مالەکانی بەلاغە ـ کە ئەمە مەگەر هەر لە دەست ئەو هاتبی ـ بە دوجار تشبیه باسی یاری خوبیت بو ئەکا ، جاریکیان یاری ئەکا بە پەیکەری خەیال لە نازکی دا ، جاریکیشیان خەیالەکە ـ کە « مشبه »ە ـ تشبیهی ئەکا بەمانگ و لەگەل ئەم کردەوەیەدا باسیکی دەرهاتنی « مانگ »یشت بو ئەکا ! . ئەلی :

دوستی دیربنم وەکو پەیکەری تاپوی خەیال چون لە دلەوە سەر هەلئەدا ئەویش لەتوی پەردەی دلی مەعدومی دل برینداری‌وە بەو جورە سەری

هەلدا ئینجا باس و تاریف ئەکا . ئەم تەعریفە هەم بو خەیال و بەیەکەوەی یارە ، هەم بو « مانگ » ەکەیە کە دەر ئەکەوێ ! . ئەلی : شای سوسەن خالان ـ کە یارمە ، یا ، مانگە ـ ناو چەوانی خوی وردە وردە دەرخست لە گوشەی سیامالانەوە ئەم سیامالانە یا دلیەتی بەچاو خەیالی دوستیەوە . یا پەلە پەلە هەورە رەشە ئاودارەکانە بەچاو مانگەوە . بەم جورە خوی دەرخست لە تری تاریکی شەدەی بی گەردی پەلە هەورەکانەوە ، وەیا دلەوە لەتافەت و جوانی و فینکی وەکو ئاوی ژیان شەپولی ئەدا . دلی رونا کئو دنیای فینک و روشن ئەکردەوە .

لە راستیدا ئەوا مانگی چواردەیە و چەن پەلە هەوریکی رەشی ئاودارە ، هەمویان بە ئاسمانەوەن ، مانگ کە ئەرروا و جارجار لەبەین پەلە هەورەکانەوە سەر دەردینی . ئەم دیمەنە تەنها مەولەوی ئەبی کەسی تر ناتوانی باسی نکا . ئینجا دیتە سەر ئەوە ئەلی :

غەریب بیم چەنیم کەردم غاتا وەسەوقات پەریم خەدەنگی شاتا
ئەر سەد چون یاران گیان تەسلیم کەردم
پەی یادگاری خـــەدەنـگی بەردم

لە ساڵای دوریدا بوم ، لەو دەشتەدا بوم کە عەودالی یادی ئەو یارە خوشەویستەبوم ، بەلی لەو دەشتەدا غەریب و بی ماوا بوم بەلام غەریب ـ نەوازی هەر لە دەست ئەو دیت ، لایەکی لی کردمەوە . ئەو بینینەی لەوکاتەدا کە بەخەنیکی راست لە گلینەی چاویەوە کەوتە سەر بارسایی لەشم ئەوەی بو کردم بە تیریک و بە دیاری بوی ناردم ! . راستە تیری بو هاویشتم و ئەنگاوتمی و تلانیەوەو منیش وەکو یارانی سەرخوشان گیانم دا بە دەستەوە بەلام هەر قرانجم کرد ، چونکە بو یادگار تیریکم بەرکەوت . ئەم یادگارە دو ئیشم بو ئەکا ، یەکی دلی مەعنەویم بەوەخوش ئەبی کە پیکراوی دەستی

یارم ، یەکێ لە ڕۆژی دواییدا ئەلیم من شەهیدی چاوی بیارم و ئەمەش ناوو نیشانەکەمە ...

دیار بو ئەمانە هەمو ئاگری دوری دوستەگیانی بەگیانیەکەی ـ شیخ عزیزی جانەوەرە ـ بو کەوا بەم جورە بایسەی دایەوە لە تاو لیبڕانی لەو و لەبەر ئەوبو کە ئەمانەی وت و دیسان پیشی ئەلیتەوە :

گازیز دیارەن کوچی دوایەن　　زایەلەی پیچی مالاوایەن
دەولەتەکەی وصل پا نە زەوالەن　　دیدەنی بالات ئیتر مەحالەن

دوستی خوشەویستم وادیارە بارگەی کوچی دوایی ئەپیچینمەوە ، وا دیارە ئەو دەنگە دەنگە کە لێرەوە دیت دەنگی نالەی مالاوایی کە کەلیت ئەکەم . ئاخ دەولەتی ـ کەپیک گەیشتن و دانیشتنەکەمانە پیکەوە ـ وا خەریکە دوایی دیت ! . کەوابو جاریکی تر ئیتر دیدەنی کردن لەو بالایەت ـ کە ئاوینەی بالاغای من بو ـ بو بە مەحال و ناتبینمەوە ! ...

• • •

مەولەوی نیوەی سەرچاوەی ژینی ـ خانو عەنبەری ژنی ـ کوچی دوایی ئەکا و چەند بە سوز ئەیلاوینیتەوەو ئەلی :

شورای عاشورا دیسان بەزمی بەست
محرّم ئاما مەحرەم شي نە دەست

ئەو خەریک نەچول شام عەدەمدا　　من نەکەربەلای سارای مانەمدا
ئەو یەزید مەرگ وە ئەسیر بردە　　من زادەی زیاد خەم یاقیر کەردە
بازاڕەن وادەی مامەلەن ساقی　　هەی بگرە فانی ، وەی بدەر باقی
ڕو ، حسین ئاسا فەردا، کە ، ڕو، بو　　داخوسەر، جەکوەلاشەو، جەکو بو؟
ئیمسال نەوبەهار چون خەزان سەرد ؛
بەرگ وەرد باغ مەعدوم برد پەی هەردا

مەشیو ناڵەی من خلاف ئەنگیز بو
وەرنە کەی ؟ کی دی بەهار گولریز بو ؟!
دل وە کەچبازی چەپگەرد بازیش کەرد
جفت ئارەزو کەرد ، چەپگەرد تاک ئاوەرد
بوی عەنبەر نەتوی دەماغم دور کەرد
فرسەتش ئاورد هەوای وەبای دەرد
نەیچی ! وەبی بەزم یاران گیانی کام سەفا مەندەن بەی زیندەگانی ؟
چون مەزاق تاڵە جە گردین لاوە بو وە شیرینی یەکێ دو نەواوە
یەکێ یەکجاری تاونومەوە ئەو یەکێ لاونوم بازنومەوە
دوریت دیارەن چەن ساحب نیشەن توی دەرون وەخارنیشتر ریشەن!
هەرچی مەوینون شیوەی توش پیشەن
دل وە هەنیتەی حەسرەتدا گیشەن
هەر ماهی نەو بو حاڵم پەشیوەن هلالش شیوەی ئەبروی توش پیوەن
نە شەو راحەتم نە روژ دلشادم
شەو ، زولف و ، رو ، روت ، مەوزا وەیادم
شمشاد و نەرگس ، وەنەوشەی چەمەن
سەبرشان ئازار بینایی چەمەن !
ئەو مارو وەیاد تەرز کەی بالات ئید دیدەی مەستت ئەو خالی ئالات
سوچنوم حەسرەت دەردی جودائیت
نەکێ چون بلیسەی یادی تەنهاییت
وە مەرگت ! دیدەم هانە گوزەردا
منیچ رای لای تون ئاررو ، نە ، فەردا
موترب مەتای دەردم ناچارەن ساقیا جای دوس انتظارەن !.
شورا روژی دەیەمینی مانگی عاشورایە کە مانگی محرّمە . ئەلی : شورای

عاشورا دیسان بەزمی خوی گیرا ، مانگی محرّم هاتوتەوە بو گریانو زاری چونکە مەحرەمی هاوسەرم لە دەست چو . . ئەو لە چولو بیابانی ئیوارەی نەبونی - یا، ولاتی شام - دا ئەسوورریتەوە من لەدەشتی کربەلای ماتەمی‌دا !.

ئەو یەزیدی مردن هات و بەدیل بردی ، من تارقی کورری زیاد بی چەتاندومەتە قیری ماتەمی مانەوەوە ! . ئوف بازارر گەرمە وەختی کررینو فروشتنە . دەسا مەی گیرری فەلەک وەرە ها ئەوە گیانی ئەمانەتی وەرگرەو ژیانی هەتاهەتایی پاش مردنم بدەری . . بەیانی کە روژی دەی محرّمە ، رو روی تازیەی حسینی بو ئەگرم .. ئاخو منیش دەردی حسین سەرم لە کوی بکەوی و لاشەم لە کوی ؟! . سیا سالە ئەگینە چون ئەبی ؟ .. تەماشا ئەکەی ئیمسال تازەبەهار وەکو خەزان و گەلاریزانی قەوسی پایزی لی‌هاتوە ! . بەررەی گولی باخی مەعدومی هەلوەران و بردی بو کیوان . . ئەبی بەخت و نگینی من پیچەبوانە بی . ئەگینە لە چە وەختیکا کەس دیویەتی کە لە بەهارا گول هەلوەری ؟! ...

دل بە ، کەچبازی چەرخی چەپگەرد یاری کردو پی‌کەنی چونکە ئەم ئەیویست جوت‌بن و بەمە گالتە بە چەرخ بکا کەچی ئەو تاکی هینا دلەکە لە داخا پی‌کەنین گرتی ! ، ئەم ئەیویست لەگەل خانو عەنبەردا پیکەوە بمیننەوە کەچی ئەو لیکی جیا کردنەوە ! .. بونی گولی عەنبەری لە سەرومیشکم دور خستەوە .. ئای هەوای وەبای دەرد چون هەلی خوی زانی و لە دەستی بەرنەدا ؟ . نەی ژەنی گەرو ئەم سازو نەوایە چیە لیتەوە دیت ؟ بەبی بەزمی دوستانی گیانی ! ئایا ئیتر چە خوشیەک بو ژیان ماوەتەوە ؟ . نەی‌چی ! ئەوا ژیان تال بو لە هەمو سوچیکەوە . . دەسا وەرە بە شیرینی ، بەکی دو هەوایک لی‌دە ، یکیکیان با بە تەواوی بمتوینیتەوە ، ئەویتریان بلاوبلیتەوەو بمهیلیتەوە ! ...

ئاخ دوریەکەت دیارەکە چەند بە ئیشە .. توی دەرونم بەنیشی دررکیکی‌تر

خەراش خەراشە .. هەر شتێکم بەرچاو ئەکەوێ هەموی شیوەی توی تیایە. کەوابو دل هەمو دەمی ئەبێ جەزرەبەیەکی تری بو بکا .. هەر مانگێ کە نوێ ئەبیتەوە حالم بەد حال ئەبێ . . چونکە مانگی یەکشەوەکەی شیوەی بروەکانی تو ئەنوێنێ دلم ئەکولێنیتەوە ! . نە بەشەو ئارامم هەیە نە بە روژ . بویە وامە چونکە ، شەو زولفت ، روژ روت ئەخاتەوە بیرم . . شمشادو نیرگس و وەنەوشەی چەمەن . سەیر کردنیان ئازاری بینایی چاوی منن . . چونکە شمشادەکە قەدو بالاکەت ونیرگسەکە دیدەت و وەنەوشەکە خالە رەشە ئالەنیەکەت دینیتەوە یادم ...

ئایا ئەم اعجاز و لەفەو نەشرە چیە مەولەوی نواندویەتی ؟ ؟ ...

گیانە ! بایسەی ئاگری یادی تەنهاییەکەت لە گوررەکەدا سوتاندمی . . ئەم هەر ئەوەندەی کرد ، بەلام ئاخ و حەسرەتی جیابونەوەکەت بە جورێکی لی کردم ، کردمی بە قەقنەس . . دیدەم ! بە مەرگت قسەم چاوم هەر وا لە ریدا . . ریگەی منیش هەر بولای تویە بەلام نازانم ئیمروژە یا سبەینێ ؟. دەسا موتربی زەمانە بەزمیکیتر بینەرە ناوەوە چارم ناچارە .. مەی گیرری فەلەک جامی مەرگم بدە بە دەستەوە دوسێم وا چاوەریم ئەکا !! ...

ئەگەر ئیمە بلێن لاوانەوەکەی مەولەوی بو خاتو عەنبەرگەلی بەرزترە لە هینەکەی «دانتی» شاعری سەدەی سیازدەهەمی ئیتالی بو دوستە جوانە مەرگەکەی « بیاترتشی » وەنەبێ لە حەقیقەت دور کەوتبیتینەوە و یا قەومیەت بینینە ناوەوە ...



مەولەوی بەمانەش وازناهینێ ئەم بەردانە دائەداتەوەو خوی ئەخاتە عالەمیکیترەوە . لەوێدا گولو گولزاریکە ، باخ و بەهەشتیکە دلی هەزار دل حەیرانیە بولبولی زەوقی دەست ئەکا بە فرین لەم چل بو ئەوچل و لەم گول و ئەوگول : شابازی خەیالیشی لەسەر سەرەوە لە ئاسمانی نوکتەزانی و

وردەکاری‌دا لەنگەری گرتوە . تەنها ئیلهامیکی تەبیعی نەبێ، هیچی‌تر مەولەوی فیری ئەوشتانە نەکردوە ؛ تەنها ئیلهامیکی تەبیعیە کە بکانەکاری مەولەوی بلی :

باڵەخانەی چەم دل دیوانی تون   بانەناو وەخاکێ ئاستانی تون

تکەش عاجز کرد خەیالت تیشدا   ئازیز بۆ جاری پابلیە پیشدا !

رو ئەکاتە دوستی دیرینی وپێ ئەلی : یاری شیرینم چاوم باڵەخانەتە چونکە هەرکە، سەیری تۆم کرد تاپوەکەت لەگلینەی چاوما مایەوە !. دلم بو بە دیوا- خانەت چونکە بیجگە لەتو و لەبیر کردنەوە لە بالای نەونەمامی تو کەسی تری تیدانەبو . ئەواچاو و دل کە یەکێ لەیەکێ بەنرختر بون بەشوینی ئارامگاو باڵەخانەو دیواخانەی تو .. باڵەخانە و دیواخانە بەبی گەبان نابی ، گەبانەکەیان خاکی بەرقاپیەکەی تویە ؛ چونکە ئەوەندە لەوی کەوتون ئەوگەبوەبە گلەبانیان . جا خەیالەکەت کە لە دیواخانی دلەکەمدا و تاپوکەت کە لەگلینە- کەمدایە فرمیسکی چاوم لەبەر دوریت بویان بوە بە دلوپە عەزیاتیان ئەدا ! . وەرە پی‌یکێ بەوبانەدا بنی - کە چاوەکەمە - وبیکوتەوە با ئیتر دلوپە نەکا و بەتایبەتی خەیالەکەت لە دیواخانەکەدا نەرەنجیت !! . .

سەردەمی کە مەولەوی لەشاخ و کیوەکانی کوردوستانا فیکری بو لەوە چوە کە تاپو لەگلینەی چاودا ئەمینیتەوە ئاوروپاو عیلمی‌تازەی ئیمرو کە ئەلین گلینەی چاو پیاوکوژی پی‌ئەبینریتەوە بەبی گومان ئەو سەردەمە ئەوان نوستبون ! . .

مەولەوی بە تەنها شعریکێ یارەکەی ئەلاوینیتەوە کە ئەمە مەگەر هەر لەدەست ئەو هاتبی . ئەلی :

قازان قەلەتاران قولەنگان حەوایی   حەیفەن بالاکەت شەو وەتەنیایی

یاری ئازیزی کوچی مالاوایی ئەکا ئەمیش هەم ئەیلاوینیتەوە ، هەم ئەو کارەسانە ئەگیریتەوە ، ئەلی لەلایەکەوە مەیجەلەکان ریز کراون ئاوازیان تیایانا

گەرم کردوە بۆ شوردنەکەت ، لەلایەکی کەوە گوررەهەڵکەنەکان قولنگە و پاچەکانیان هەموو بەرزلەکەنەوە و ئەیدەنەوە بە زەویدا بۆ هەڵکەندنی گوررەکەت . ئاخ حەیفە ئەو بالاتە شەو بە تەنیا لە گوررەکەدا بمێنیتەوە ، ئەوە بوچ لەگەڵت نەبوم !!...

مەولەوی بە دوبەیت ستایشی رومەتی ئازیزی ئەکا . ئاخو بیجگە لە مەولەوی کەسی تر توانیویە ؟ بلی :

روخسارش وەختی مەسقەل مەدو لیش
وەشنوی پاریز خەیاڵ مەبو ریش

ئەسرین جەرگت دەمن وەبان نیشدا چەنی دل ئامای ئامانی پیشدا ! ؟

ئەلی ئەم دوستەم کە رومەتی خوی مشت و مال ئەدا ئەزانی چونە؟: ئەگەر خەیال بەبی چرپە و بەبی دەنگ و سەنگ بچیتە پاریزی ئەوە کە خوی پێداگری و خوی بپارێزی ئەو رومەتە لەویوە لەم کردەوەی خەیالە ئەرروکی و ئەزیەتی ئەکا ! . ئەوا و رومەتی ئەمە کارەساتی بی ئەری هەی فرمیسک ! جەرگت بەر درک و دال کەوی تو چون دلت هات هانی بەسەریا !!...

مەولەوی باسی روژی پیری خوی ئەکا ئەلی :

پوس کوس گوش نم کیشا کەم کەم ئەم سەر لەوسەر من دوربینەکەی چەم

تەماشا ئەم فیکرە ئەم کردویەتی ! ! : پیستی کە ئەگیری بە تەپلا ئەبی ئەوەندە وشکتر بی زرنگەی لیوە بیت ، هەتا وشکتر بی دەنگی زیاتر لیوە دیت ، هەتا تەرر و خاوتر بی دەنگی کپ تر ئەبی . ئەمیش ئەلی پیستی تەپلی گویچکەکەم وردە وردە وا لە بەر پیری نمی کیشاو دەنگی لیوە نایە کەرر بوە . دوربینەکەی چاویشم ئەم سەرو ئەو سەر بوەتەوە، واتە دوور بەنزیکەو نزیک بەدوور ئەبینی ، پیاو کە پیربو چاوی هێزی نامینی ئەوشتە کە لە نزیکەوە ئەیبینی پیویستە ئەو توزی دووری خاتەوە ئەو وەختە ئەیبینی . ئەوەش کە دوورە خو هیچ !..

شیخ عزیزی ئاشنای لە سنە ئاولە دەر ئەکا مەولەویش گویا باسی ئەکاو ئەلی :

چین گەفتەن وەروی پیشانی چون سیم
چون زنجیرەی ئاو وەشنوی نسیم

ئەلی دوستی ئازیزم لە تاو ژانی ئاولەکە ناوچاوی هینابوەوەیەک بەلام ئەو ناوچاوهینانەوە یەکەی چون بو؟. بەجوریك بوکە پیشانی ـ ناوچەوانی ـ وەکو زیو لە تاو ئازار لوچی تی کەوتبو . جا ئەو ناوچەوانە و لوچە لە زنجیرەی وردە شەپولی ئاو ئەچوکە «با» لەسەر دەریاچەیەکی پاکەو خاوین و رونەوە دروستی ئەکرد !. .

بە دوستی ئەلی ، ئەلی :

دیدە هیند خەیال بالات بی تیشدا     راگەی خاو نەبی بویەرو پیشدا

ئەلی چاوم ئەوەندە بە خەیال سەروبالای توی هینابوە ناو خویەوە خەو هەرچەندی کرد سوچیکی تیایا دەست نەکەوت کە ستاری تیدا بگری !..

مەولەوی لە هەلەبجە لەبەردەم شیخ محمودی باوکی مفتی هەلەبجەدا وەستابو ، فەرەنجیەکەی لەبەرابو ، گالوکەکەی بەدەستەوە بو ، سەری خستە سەر گالوکەکە و لەپاشا سەری بەرز کردەوەو وتی :

گول چون روی ئازیز نزاکەت پوشان
وەفراوان چون سەیل دیدەی من جوشان !

روی کردە شیخ محمود و پیوت: « تەماشاکە ئەم قورمساغە چە فیکریکی کردوە !! . » مەبەستی خوی بو .. . ئایا بیجگە لە مەولەوی کی تری بتوانی ئەم جورە تشبیە ریک خاو بلی ئەو جوانی و نەزاکەتە کە لەروی گولدایە ئەوە وەکو هی روی ئازیزم وایە . بەفراوی کویستانان کە ئەتویتەوە ئەوە لە لافاوی فرمیسکی خوشەویستی من ئەچی ! . مەولەوی تەنها بەم شعرەی بە جاری ئەدەبی کوردی هەلگیراوەتەوە ، زور حەیفە تا ئەم شعرە وەستابی

ئەهلی بەلاغە و بەیان بلێن « ابو حنیفة کانی یوسف ! » ...

تو خوا چاوێکت لەم شعرەی مەولەوی بێ کە ئەڵی :

بێ کوڵ وەی وەکوڵ پەی دەردان دەرد

ماساو جە سەراو ریزاو هەرزان کەرد !.

ئایا ئەم شعردی مەولەوی بەچی ئەزانی و چون مەعنای لێ ئەدەیتەوە؟. هیچ سەرت تیایا سەر ئامێنی ؟. جاوە ئەوە توزێکی لێ تێ ئەگەین ئەڵاین :

جارێک تازە بوکێک زەردوی گرتبو. گویا زەردویدار تەماشای ماسی بکا زەردوییەکەی لەکوڵ ئەکەوی ، ئەمیش هەڵئەستی روئەکاتە ئەو چوڵە نوشی کانیاوێک ئەبێ لەبناری «هانەسورە» کە ماسی تیدا ئەبێ و دار «بێ»یێک لق بەسەر کانیەکەدا شوربو کردبوەوە، ئەچێتە سەر لقی دار «بێ» یە کە سەیری ماسیەکان بکا لەناو ئاوەکەدا . مەولەویش لەو وەختەدا بەسەرا ئەچی تەماشا ئەکا ماسیەکی زور کەوتونە سەر ئاوەکە تومەز ئەمە «بوک» ە هەرتەماشای ماسیەکانی کردوە سەردوز و کەوتونەتە سەر ئاوەکە !. ئەمیش ئەڵی :

« بێ »یە کوڵەی وەوی لە کوڵ کە بو ئەوە هاتوە دەردی لە کوڵ کەوی ! بەهوی دەردەکەیەوی ئەوەندەی ماسی رژاندە سەر ئاوەکە هەرزانی کرد !.

مەولەوی کە چاوەکانی کوێر ئەبێ رو ئەکاتە دڵخوازەکەی و پێ ئەڵی :

وەختێ چەم نەچەم شیوەت دیاربی جەلام فصل وصل بەزم ئەغیار بی

ئیستا لیلایی گرتی دو دیدە خەلوەتەن سابو هەی بەرگوزیدە !

مەولەوی ئەو سەردەمەی کە دوستی چاوی کەوتوە چاوی خوی بە بیگانە زانیوە لە بەینیانا !. ئەڵی ئەو وەختە کەچاوم بەچاوت ئەکەوت و شیوەت دیار بو ئەوە بەزمی بیگانەیەک بوکەچاوم بو ئیستە والیلایی داهات وەختی خەلوتە کەس لەبەینمانا نیە بەزم هەر ماوەتەوە بودلم و حوت ! دەسا وەرە .

* * *

لەگەل ئەمانەشا مەولەوی پیاویکی قسەنەستەق و بەزمچی بووە ، زوری حەزبە قسەی خوش و نوکتە کردوە ، وەکو ئەوە جاریک ئەچیتە «پاوە» میوانی مەلایەکی پاوەیی ئەبی،سە روژ لەوی ئەبی هەر (توو) و(دوی) ئەدانی، لەپاش سە روژە ئەیەوی بگەریتەوە . مەلاکە پی ئەلی : « ماموستا زو ئوغرت کرد، مەرریکم بوداتابویت بوت سەرببرم .» ئەمیش ئەلی : «کەواتە سویندم وابی تانەیخوم نارروم ! » مەلای هەناسە سارد ئەچیتە ناسەوە . .

جاریک مەولەوی پیاویکی ئەبی لەگەل خوی هەلیئەگری و بە نیازی حەج لە « سەرشاتەوە » بەری ئەکەون تا ئەچنە بەغدا و ئەچنە تەکیەی « شیخ عبدالقادری گەیلانی » . لەوی مەولەوی نەخوش ئەکەوی و ئەکەویتە حالی خویەوە ، پیاوەکەی کە ئەزانی وا مەولەوی تازە رزگاربونی نیە هەلئەستی هەج پارەیەکی پی ئەبی لە باخەلی دەر دینی و پی لی ئەدا بەپشتا بەرەومال ! . وا مەولەویش لەوی لەگیانەلادایە . کە دیتەوە هەر لەدورەوە خوی ئەنیتە قوررو دەست ئەکا بە « باوە مەولەویم روا » . ئەلی : « باوە مەولەویم لەبەغدا نەخوش کەوت و مرد خوم ناشتم و پارەی حەجەکەشم بوکرد بەخیرات » . مالی مەولەویش ئەکەونە شین و شەپوررو گریان ، لەپرسە ئەبنەوەو دو مانگیکی پی ئەچی مەولەوی ناسری و بەلام پارەی پی نەماوە پەکی حەجەکەی ئەخاو ئەگەرریتەوە ، روژی قوت ئەکا بە مالا !. کابرای پیاری کە ئەمە ئەزانی هەلدیت و ئەداتە کیو . کوررەکانی مەولەوی دەستی لی ئەبەدەنە تفەنگ، مەولەوی ئەلی دەستی لی مەدەن هەرچی بوە ، بوە خومن وا هاتمەوە. کە کابرا ئەگرن و ئەیهینە بەردەم مەولەوی پی ئەلی : « برا ! خوا ، روی مردن رەش کا واتوی شەرمەزاری لای من کرد ، ئەگەر بمردمایە تو بوچ ئەم خەجالەتیەت بەسەرا ئەهات !؟ » لەپاشا بەرەلای ئەکەن . .

جاریک لە سنە لە کورریکا ئەبی لی ئەپرسن : ( توهەر ئەلیت هوزەکەم خوشیان ئەوێ و بەگەورەم ئەزانن بەجیا پیشانی ئەدەیت کەراست ئەکەیت؟.)

مەولەویش ئەلی: «خو ئەگەرهیچ نەگیرمەوە ئەمەبومن بەسە هەورامیەکێ کەباریکی ئیجگارگران لەکۆرەکەی ئەنی ، ئەیەوی بە ملەی «ئەویەنگێ»دا سەری‌خا بەڵام کەرەکە نارروا پی‌ئەلی : «هەچە دەی !. بەخوا ئەگەر وەکو مەولەویش بی هەر سەرت ئەخەم !.. »

مایەوە سەر ئەوە کەئایا مەولەوی بوچ بە شیوەی هەورامي شعری وتوە لەگەل ئەوەشا خوی هەورامي‌نەبووە ؟ .. ئەمە یەکەم لەبەر ئەوکارەساتەبوە کە لە لاپەررە« ١٤٢ ـ ١٤٦ »دا قسەمان لیوە کرد ، دوهـەم لەبەر سوزی مەعنەویانی شیخ وەسمانی تەویلە بووە ، شیخ وەسمان لە بازارری تصوف دا قبلەنمانی مەولەوی بووە و زمانی شیخ وەسمان زمانی هەورامي بووە ، لەو روزەوەکە شیخ وەسمان ئەم دو شعرە رو ئەکاتە مەولەوی و پی ئەلی :

یاکاغەز وررپان ، یا مەلا مەردەن    یا هەر طارتەن دوس وەیاد کەردەن
غەمگین مەنیشو غەم بدەر وەباد    نەلەکێ نمازو کەس وەخاتر شاد

وە مەولەویش لە وەلاما رو ئەکاتە مرشدی پایە بەرزی و بە بررە شعرە بەناوبانگەکەی کە ئەمە دو شعری هەوەلیەتی و ئەلی :

شیخی دەولەمەن بەهرەی سەرمەدی
یاگەی حەقیقەت جلوەی احمــدی
جە وارگەی مەنزل فەنا ویەردە    پای هەردەی بەقا یاتاخگە کەردە

ئیتر زمانی شعري لە خوشەویستی شیخ وەسمانی تەویلەوە ئە بیبە زمانی هەورامي ...

* * *

کەوابو ئیستە مەولەوی چونـ هاتە پیش چاو و لە چەند بەردەدا دەرکەوت ؟؟ .. مەولەوی بە بەرزتر ئەدیبیکی کورد هاتە پیش چاو و لە بەردەی فەلسەفە ، تصوف ، غەرام ، مەفتونی دیمەنی تەبیعەت ، شاعریکی

زور وردی بیرتاش ، نوکتەزان و فیکربەرزدا خوی نواند ؛ بە جوریک خوی نواند کە هەرە شوینی بەرزی لە مەیدانی ئەدەبیاتی کوردیدا بو خوی تەرخان کرد و بو بە ماموستای ماموستاکان .

دیوانی شعرەکەی «حاجی توفیق پیرەمیرد» بەناوی «روحی مەولەوی»بەوە شعر بە شعر خستویەتە سەر شیوەی سولەیمانی ، لە سالی ١٩٣٥ دا بە دو بەرگ لە چاپخانەی « ژیان » لە سولەیمانی بو جاری یەکەم لە چاپی داوە . هەر وەها دیوانیکی کوردیو فارسیشی بەناوی « العقیدة المرضیة »وە لە لایەن « محی‌الدین صبری نعیمی » بەوە لە سالی ١٣٥٢ ی هجری لە میسر لە چاپخانەی « سعادة » بو جاری یەکەم لە چاپ دراوە . . دیوانیکی عەقائدی عەرەبی زور بەرزیشی هەیە کە سەرەتای بە :

متی انی حتی انی الیه من این این ینتمی الیه ؟

دەست پی ئەکا هیشتا لە چاپ نەدراوە ...

هوی داناني ئەم کتیبەی ئەوە بووە لە(١٨٥٥)هەر بەهوی فرمانیکی شیخ وەسمانی تەویلەوە ئەچیتەوە بو «سنه» ، روژیک لە مال مەلا محمد صالحی نخر العلمادا ئەبن ، مەلا لطف اللەی شیخ الاسلامو مەلا محمد امینی امین الاسلامو مەلا فتح اللەی قازیو گەلیکی تر لە مالەکانی سنە لەوی ئەبن،وردە وردە بەدەم قسەکردنەوە باسەکەیان ئەچیتە سەر عیلمی کەلام و عەقائد تا ئەگەنە باسی « لاهو ولا غیره » کە گویا سفەتەکانی خوا نەزاتی خوانو نەجیان لە خواش ، لەویدا مەولەویش ئەکەویتە قسەکردن لیوە . کوتوپرر مەلا فتح اللەی قازی ئەلی : « باوە ، مەولەوی تو چەت دا گە بەسەر ئەمەوە ؟ ، بچو ئاملان لەرزانەی خوت بیژە ! . » . ئەم قسەیە زور کار ئەکاتە مەولەوی، تەنانەت دانیشتوەکانیش ئەمەیان ئیجگار پی ناخوش ئەبی _ کە ئەگەریتەوە بو شوینی‌خوی لەماوەی(٣)روژدا ئەو عەقائدە عەرەبیە دائەنی

به شعر ، نوسخه‌یه‌کیشی لی ئه‌نوسیته‌وه‌و ئه‌ینیری بو مه‌لا فتح‌الله ، ئیتر خوی ئه‌گه‌ریته‌وه بو هه‌ورامان . که مه‌لا فتح الله سه‌یری ئه‌کا هیچی لی نازانی ، به‌کوششیکی زور له پاش ماوه‌یه‌کی دورو دریژ ئه‌و وه‌خته له قسه‌کانی ئه‌گا ! ئینجا هه‌لئه‌ستی کاغه‌زیکی دل نه‌وایی‌و لی بوردن ئه‌نوسی بو مه‌وله‌وی و ئه‌لی : «ئاخر سه‌لامات بی مه‌وله‌وی ! . تو که مه‌لایه‌کی وایت نه‌خوت بشاره‌وه ، نه‌مه‌ردمیچ شه‌رمه‌زاربکه ! »



# مەلای جباری

## ١٨٠٦ - ١٨٧٦

پیری مەیخانەی خەیاڵ شناسان ، بادە ئەنوشی لە جەرگەی خاسان . ڕشتەی مرواری قسەو باسیە،نەوای قومریان وینەی رازیە . بینی هەناسەی شنەی شەماڵە ، تیکەڵ بەپیری بەرزی خەیاڵە . ئاسوی جەباری لە نیوی هەودا ، ئەنوینی وینەی مەلا لە خەودا . بویە ئاوبانگی جەباری هەیە ، چونکە شاعری وەک مەلای هەیە . بیرە وردە کەی خوراکی گیانـــە ، قسەی رەوانی تەلی کەمانە ! ...

هاورازی داستانی ئەم شوینە ناوی « فتاح » و کوڕری سید مصطفی سیداسماعیلی سیدجانی‌یە ولەنەتەوەی سید جباری باپیرە گەورەی عەشرەتی جەباری‌یە . لە سالی ١٨٠٦ی میلادی لە ئاوایی « بانگول » هاتوتە دنیاوە . « بانگول» یەکیکە لە «٢٨» گوندەکەی عەشرەتی جەباری ... ئەم عەشرەتە هەندیکیان سەیدو هەندیکیان ئومین . ناوچەی جەباری کەوتوتە روژهەلاتی کەرکوک بەلای قیبلەوە ، لای ژوروی « هەمەوەند »و لای خوارووی « شیخان »ە . لای خوراوای « قەرە حەسەن »ولای خورنشینی ئاوی روخانەیە ـ کە سنوری بەینی ئەوانو عەشرەتی زەنگنەیە ـ ئەم عەشرەتی جەباریە ئیمروژ شەش سەد مالیك ئەبن . شیوەی قسەکردنیان شیوە موکریانە ...

فتاح کە دیتە دنیاوە وەکو منالیکی بنەمالەی لادێی لە کوردەواری‌دا ئەئالی بە دەور بەرخ وکاردا و لە دەشتی « بانگول »دا بەوینەکان چاو ئەبرنە گیاکان ئەمیش چاو ئەبریتە هەوای ئاسمان ،لەمە مەلا « روستەم »

ناویك لە گوندەكەیان مەلا بووە بە مندالانی ئەخوێنی، قوتابخانەكەی ریبازی.
بەیانی و ئیوارانی فتاح بووە ، دەنگی دەوری منالەكان دەنگی باررەی
بەرخەكان لە گوێچكەی فتاحدا دەزرنگا و سەرخی ئەبەرریتە سەر خوێندن ،
باوكی فتاح چاری نامینی فتاحی کورری لەتەمەنی دوانزە سالیدا لە لای
مەلا روستەم ئەنیتە بەر خوێندن ، قرآن و کتێبە وردەلەكان لەوێ تەواو
ئەكا ، بە فەقیەتی ئەچیتە كەركوك ، سەرەتا بە سوختەیتی لە مزگەوتی
« نائب ئوغلی » دائەمەزری ، لە پاشا بەررەوازە ئەبێ و ئەچێ بو سولەیمانی،
ماوەیەك ئەمینیتەوەو ئەگەررێتەوە بو كەركوك ، ئەمجا ئەچێ بو هەولیر،
بو رواندز ، بو شنو . دیسان دیتەوە بو كەركوك . لەم هاتو چوانەیدا تا
«عبداللەیەزدی» ــ لە منطق دا ــ ئەخوێنی . لەبەر ئەوە لە «١٨٣١» دا باوكی
ئەمرێ ئیتر یەكی لە خوێندن ئەكەوێ و بە هوی ئەو خیزانەوە كە ئەكەوێ بە
سەریا ئەبێ بە ژیر چەوسانەوەی ژیانەوە . شان بەشانی چەوری زەمان
تەكان ئەدا ژیانی بەكشت وكال رائەبویرێ . لە «١٨٤٢» دا بو سەندنەوەی
ئەو ملـكانەكە لەلایەن پادشای عوسمانیەوە كرابو بە وەقف بو تەكیەی بنامالەی
جەباری ئەچێ بو ئەستەمول ، لە «١٨٤٦»دا دیسان بو دوایی هاتنی ئەو
دوژمنایەتیەكە لەبەین جەباری و هەمەوەند دا هەبو چوەتەوە بو ئەستەمول.
كە گەرراوەتەوە سەر لەنوی ئەكەویتەوە ناو ژیانی كشت وكال و مەلایەتی .
لەم ماوەیەدا گەلی دیی گورریوەو لەگەل گەلی پیاو ماقولی عەشرەتی ئەو
دەورە وەكو محمود پاشای جاف و شیخ عبـد الرحمانی تالەبانی دەملو دەم و
هەلسوكەوتی كردوە ، تا لە « ١٨٧٦ » لە تەمەنی « ٧٠ » سالیدا لە ئاوایی
« تاوێربەرز » كوچی دوایی ئەكا و تەرمەكەی ئەبریتەوە بو « بانگول »و
لەوێ ئەنیژرێ . .

سید فتاح پیاوێكی بالا بەرزی باریكەلەی سەر زل بووە ، دەم و چاوی
درێژكارو چاووبروی رەش بووە ، برژانگی كورت و چاو زور گەورە

نەبوە ، گەنم رەنگ و گونا کانی قوپابون ، ریشە تەنکە سپیەکەی قەلەم ئەکرد ، سمێلو چەناگەی دریژ بون ، کەواو سەلتەو لبادەی لەبەر ئەکردو جامەدانەی ئەبەست بەسەرەوە ، عەباشی هەبو ، لە قسەکردندا خیرابووە ، توررە تەبیعەت و زویش هیمن ئەبوەوە ، بەبێ دەسەلات زور بەرچاو تیربووە ، بە دەست چەوسانەوەی ژیانەوە زور دل بریندار بوو . هەرچەندە زوری نەخویندبو بەلام زیرەک و موتالا دوست بووە ، لە ناو عەشرەتی جەباریدا مەزن بووە ، هەر چەندە مەلای لادێش بووە بەلام پشتی بەرەنجی شانی خوی ئەستور بووە ، نانی وشکی بێمنەتی بەرەجونی خوی نەگوررێبوەتەوە بە نازو نیممەتی مەردم . .

بەلێ ! سید فتاح تا بو بەو پیاوە کە لە کوشی مەینەت و ئاوارەییدا تانو بوی ژیانی ئەتەنی بیری لە شعر نەکردەوە ، بیری لەوە نەکردەوە کە لەپاشا دەنگی شعرەکانی ئەبێ بە دەنگی زەنگی پیرەی بول لیدەر کە لە بەیانیەکی تاریکو لیلەی شەویکی سافدا لە توی پەردەی نەسیم وشەوعدا بە ریشـــە سپیەکەیەوە ، بە دەنگی یا اللەوە ، بەدلی رو لە اللەوە دەست ئەخاتە سەر بێ پلیکانی مەنارەکەو یەکە یەکە پیایانا ســـەر ئەکەوی بو ئەوە بە دەنگی زەنگەکەی تەلی دلی ئەم ناسوتیانە لەگەل پەردەی گویچکەیانا - کە هەر دو کیان پەردەی کشوماتی نوستنی دراوە بەسەریانا - بجزوینیتەوە و سەر لەسەر سەرینی خەوە کە بەرز کەنەوە و روبکەنە ئەو عالەمە کە پێ ئەلین عالەمی تەفەکیر و بەربەرەکانی ژیان ، یا ئەو عالەمە کە دوستیک لەگەل دوستەکەیا ئەچنە ژوان وتەنها بیر لە بینی هەناسەی خویان نەبێ لە شتیتر ناکەنەوە !! ...

سید فتاح بیری لەمانە نە ئەکردەوە تەنها هەر ئەوە بو لە جوشی مندالیدا دەنگی باورەی بەرخەکان لە دەشتەکەدا ئەهاتە گوێ ، چاویشی ئەبرریە شاخ و داخەکان کە تنوکی ئاوی بارانی ئاسمان کردبونی بە بوکی رەنگاو رەنگی مانگی نیسان . میشکیشی لە هەوای سافی کوساران دا بوبو بە

بیشکەی کوربە خەیالیکی نەژاکاو بو ئەوە لە پاش « ٢٥ » سال ئەو خەیالە کە ساواو زادەی چارەکە سەدەیەکێ بو بکەویتە جوشی گەنجیەوە و وینەی رابوردوی دەوری مندالی بداتەوە دواوە ، وینەی ئەو دەورە بداتەوە دواوە کە خاوەن خەیال لە کوشی بە نازی باوکدا بەدەنگی لایەلای بەرخەکان ئەشنایەوەو رو بە روی ئەو روژە ئەبوەوە کە تەنها تاپوی کامەرانی نەبی هیچی تری لیوە دیار نەبو ! ...

بەلی سید روی کردە ئەوە روژە و ئەو روژەشی بەسەرچو . کەوتە روژ ـ یکەوە کە نازی باوکێ و دەنگی باوکێ ئەسپەردەی خاکێ کرا ، زەمانی سەربەستی و بی بەروایی گورریەوە بە زنجیری چەوسانەوەی دنیاو پابەندی بە هەلگرتنی باری بە ئەرکی ئەو خیزانەکە باوکی بوی بەجی هیشتبو !. دەوری فەقیەتی، کەدەوری هەنگی تازە بال گرتوەو هەر ساتە بەهیزی بالەجوانەکەیەوە ئەنیشیتەوە بەسەر گولیکەوە گورریەوە بە دەوری بولبولیکی بال نەکراوی لە قەفەز کراوەوە ، هەلئەفرری و تەلی قەفەزەکە بالی ئەشکینی لە تاوانا بەیادی روژی سەر چلانیـەوە ، بەدەنگی زەلالی زەنگولەییەوە ئەچریکینی و ئەلحای ئەو روژە ئەکاتەوە ! ...

سید ئەم کارەساتانە هەمو دەوری لیدا ، تاپوی زەمانی مندالی ـ کە لە میشکیا مابو ـ لەگەل ئازاری ئەو روژە کەنی کەوتبو و بارسایەکەی بەسەر شانیەوە بو کردیانەکاری کە لە سوزی دەرونیکی بە کولەوە ئاشنابی بە شعر و بە بیری وردی شعر ، بەو بونەوە هات لەپیشەوە « مەلا »ی کرد بە ناوی شعری و ئینجا کەوتە داوی شعرەوە و وەکو بولبولەکە یادی دەوری رابوردوی ئەکردەوە ...

مەلام ! بەم جورە ئەکەویتە بەهارستانی شعرەوە ، کە ئەشکەوی ئەوی زورتر شیفتەی بو بی ، یا ئەوی زورتر لەدەوری خەیالی مەلادا گەررابی دیمەنی تەبیعەت و ئەورەنگی غەرام بوە ، بەراستی ئەگەر ویستبیتی ستایشی

بەردەیەکی تەبیعەتت بو بکا چە بە هونینەوەی عبارەت،چە بە بەرزیِ باسەکەی ژیانیکی سەرەونوی داوەتەوە بەو شعورە کە ئارەزوی لە مژینی بینی ئەم جورە گولانە هەیە ، وەکو لەم بررە شعرە بەهاریەی دا ئەم معجزەیە دەر ئەبرری کە بە سوزیکەوە ئەلی :

میرزام ! بە وەعدەی نەو وەهارانەن سەرەتای تلعیت خاتر دارانەن
فەسل وەسل دوست سەیرهەردانەن لەرەی لەرزانەی زەنەخ دارانەن
زەمزەمەی بولبول ، دەبدەبەی گولەن
نزارەی هوزار دەرون پررچلەن
نەقرەی منقار تەیران سوب خیز بیزەنان نەغمەی نەکیسای پەرویز
چریکەی چەکاوس چون حەنجەرەی عود
مەر دەنگ چل چەنگ پەنجەی بارەبود
هو هوی بابەقوش شەو وە هەردەوە زام دەیرینان تازە کردەوە
دەنگ قیررەی قاز سوب لە سەحرای سوس
مەر موزیقەی مەشق شەهەلتای عروس
تیپ تیپ قولنگان قەتارەی قازان میرزام ! تا وەروژ ئاوات مەوازان
جەرەس وە ئاهەنگ خوش قانونەوە
دەنگ وەسەدای ساز ئـــەرغەنونەوە
قوسری وەقانون قوقوی ویشەوە مل وەتەوق زەوق وەفا ریژەوە
قوقوشەن وەفەرق شاخ ســـەروەوە
مەر حاجی وەرای « صفا » و « مروە » وە
قەوا قوی قەتار قولەنگ تیژ پەرر
کەردەن هوش و گوش « کەررو بیان » کەرر
فەرش فەرەح بەخش سەوزەی قەدەم خیر
فەرر شەنەن وە ملک سەحرای گەرمەسیر

دەی ساجەی دەم دا هەر کەس دلی بو
چوین بولبول هەوای سەودای گولی بو
یا خود چوین « فەرهاد » دل گاهرین بو
مەزەی مەزاقی تام « شیرین » بو
مەبو گەزم سەیر سەوزەو ساراو کو
دامانی نەهورن دەرون داران کو
نەو فیض فتوح نەو وەهارەوە نەو بیضای گەنوار کوی دلدارەوە
سەیر سەحراو دەشت سەر دیارانەن نالەی مورغزار میرغوزارانەن
دوست لە بەهانەی دلستانی بو لاقەید لە جواب « لن ترانی » بو
شەو سەر گەردانان سەر ئازاد کەرو شوانان وە«وادی ایمن » شاد کەرو
مەر « مەلا » یش نیشو شەو لە دەیجوردا
نەو تیرەی تاریک سیای بی‌نور دا !

لیرەدا نازکی تەبیعەتی مەلا دەر ئەکەوی و پەردەی گاوریشمی خەیالی پیشیان ئەدا کە چەند بەجوانی‌وریکو وپیکی باسی بەهاری کردوەو چون کوچ وباری خیلاتی تیدا رازاندوتەوەو ؟؟. کردویە بەوادەی سەیرانی دوستان و لەرەی لەرزانەی چاوکالان و دەنگی چریکەی بولبولان لەپوپەی چلان و گوشەی رەشمالان دەنگ ئەداتەوە ؟.. بەرە بەیانی روژانی ئەو بەهارە دەنگی مەل وخشەی لەنجەی چروی دارەکان‌و سوسەی نەرمی شنەبا دەنگی نەکیسا و بەزمی پەرویزی تەبانە دواوە ! .. خو قەتارەی قازانی حەوایی بە دەنگی موزیقای مەشقەوە ـ کە روبابەکەی دەنگی هو هوی بایەقوشە ـ مەگەر هەر ئەو بتوانی تیپی قولەنگان لەگەرمیانەوە ریز بکاو بیان نیری بو هەوای کویستانان ! .. ئایا دەنگی سەلای حاجیانی « سەفا »و « مەروە » ئەگاتە دەنگی قو ، قوی ئەو قومری و کوترەباریکانە کە کەمەندی زیرریلیان کردوتە گەردن و نەوا‌خوانی ئەکەن ؟ . .

قریوەی قولەنگانی بەرزە دیاران گوێی فریشتە پایە بەرزەکانی ئاسمانیان کەرر کردوە ! . . رایەخی سەوزی بەزم ئاوەری دەشت و دەر فەررو جوانیەکی تری داوە بە سارای دلگوشای گەرمەسیر . سا، لەم وەختەدا هەر کەسە کە خاوەنی دلە و دل تەررە ئەبی وەکو بولبول شەیدای گولیک بی، یا خود وەکو « فەرهاد » دلی بە ئاگری عەشق سوتابی و ئاوی ئەو ئاگرە و مەزەی سەرخوشی عەشقی ناوی شیرینی « شیرین » بیت . . جا ئەو کەسە ئەبی یادی سەیری سەوزەی دەشتو کیو بکا و داوینی لە بەر خوینی جەرگی داران ـ کە لەبەر هاتنی بەهاران دەری ئەدا ـ کوی بکاتەوە . .

واتە : کە بەهار هات دەرو دەشت ئەبی بە گولالەی ئالو والا ، دارو دەوەنی لە ئاوخورکەکیانەوە ئاو دەر ئەدەن کە ئەمانە هەمو لەبەر بەهارە ، پیویستە پیاو بچیو سەیریان بکاو خوی بو بینینی ئەو دیمەنە ئامادە بکا . .

لە فەیزی هاتنی ئەو بەهارەوە ، لەو دەشتی پیروزی نورانی لای یارەوە . وەختی سەیری دەشت و دەرو سەردیاران دبی . . نالەی مەیی میرغوزاران دەنگی دبی ... دەشت و دەری بەهار کە بە فەرشی رەنگاو رەنگ وینەی بەهەشتئەداتەوە دیمەنی پەرستەکان وا لی ئەکا کە گویا نوری بارەگای ئیزەد تەنها لەوی‌دا کەوتوتەوە ، وە بە سەرمەستی ئەو نورەوە روی دلیان ئەکەنە خاوەنی نور کە خویان پیشان بدا ! . ئەویش ئەلی : نام بینن بەلام سەیری ئەو دەشتە کەن، ئەو دەشتە کەمایەی زینی بەهارە . .

ئایا ئەو شوینە وادی ئەیمەنە ؟ یا دەشتی کوردەو پرر لە دیمەنە ؟

لە شەوانی ئەم بەهارەدا بە هوی بون و شەوقی گولی شەوبو و شەوچرای ئەم دەشتانەوە سەرگەردانانی چول گەرد ریی ئەبیننەوەو شوانان بە دەشتی ئاسایشو بی ترس شاد ئەبن، کەوابو مەلاش بو ئەوە رزگاری بی لە گیژاوی دەریای سەرلی‌تیکچون ئەبی دانیشی لەو تاریکایی شەوەدا بو ئەوە بە هوی

ئەو گولانەوە رێی ببینێتەوە ... لێرەدا مەلا سەرگوزەشتی موساو دەشتی توریشمان دینێتەوە بیر ! ..

* * *

مەلا لە بازاڕی غەرامیاندا دەستێک بو گوشەی تەبیعەت درێژ ئەکاو بەجورە غەرامێکی تازەوە دێتەوە و ستایشی دوستی شیرینی ئەکاو ئەلی :

شیرین تاتا کرد ، شیرین تاتا کرد
تای توغرای تومار زیرڕش تاتا کرد
کوکو ، کوی کلاف عەنبەر ولا کرد
خەرمەن خەرمەن میسک خوتەن وە با کرد
پەنجە برد پەرچین جە هەم جیا کرد تەخت پیشانیش بەدری دو جا کرد
حاجبان دو قەوس پایەی سەما کرد موژان تەور تیر توشنەی غەزا کرد
گیسوی سەراویز چون بەڕەزا کرد
سەز نەتوی جامەو دوگمەو قەبا کرد
ساق ستون سیم تازە جەلا کرد خڕەی خرخالش خەلای بالا کرد
دەم نوکتەی مەدهوش لایجزی کرد
لە لوەی گەوهەر لولوی لالا کرد
خەم چەشمەی حەیات کەس نەنوشا کرد
چەن کەس چون یوسف خەریکی چا کرد
غەبغەب چون تورنج کەس نەبوسا کرد
گەردن سەرای ساف سەبوی سەبا کرد
وەو شنوی شەوبو شەمال شنیا کرد
نەسایەی سەمەر لیموش جیا کرد
ناف وەعەتر ناف ئالەم غەنا کرد
هەر با چون وە میسک خوتەن خەتا کرد

قامەت تەرز تول سەول سەوا کرد    ئەوسا وا ماوای جنت ئاوا کرد
سورەین چون شیرین بانوی کسرا کرد
رزکێ ئەفزای ئاهو دەنگێ وە سەدا کرد
نەمەز بەنجەی پای حومرەی حەنا کرد
یان وە هون سورخ جەرگێ « مەلا » کرد ؟

مەلا ستایشی یاری شیرینی ئەکا ئەلی :

زولفی نوغرایی کە وەکو تومار لولی خواردبو بە پەنجەی شمشالی دانە دانەی کردەوە . . کوگا ، کوگا بە بارسایی کەلان عەنبەری زولفی پەخش کردەوە . خەرمان خەرمان میسکی خوتەن ـ کە زولفیە ـ دیسان کردی بە بادا . پەرچەی خاوی لیک کردەوە . . ناوچەوانی وەکو مانگی چواردە بەدەر خست . . بروەکانی کرد وەکو دو کەوانی پایەی ئاسمانی رومەتی . . برژانگی کرد بەتیری بە غەزا تیژو . . زولفی وەکو بەررەزا ئاویزان کرد ، ئاویزانی کرد تاسەری لە بەینی جل و دوگمەو کەواوە دەر کرد و رژا بەسەریانا . . باسکی وەکو ئەستونێکی زیوین نواندو خررەو زرنگەی خرخالەکانی کرد بە خەلاتی . . دەمی کرد بە نوکتەیەکی بی هوشی وەها بچوکێ کە لەوە بچوکتر نەبیتەوە . . لە لولەی گەوهەری گەروی لؤلؤئی ددانی رازاندەوە بە لەعلی لیویەوە . . بەهوی ئەو سەرو بالایەوە خەمی کرد بەکانی ئاوی ژیان ، وەکو چون ئەو کەس نەیخواردوتەوە ئەمیش بە هوی جوانی سەرو بالاکەیەوە کەس توشی نەبووە ! . . چون یوسف خەریکی ئەو چالە بو کە تی کەوت گەلی کەسیش بەو جورە سەراسیمەی چالی ژیز لیوی ئەم بون ! . . چەناگەی وەکو کەبانی کەس ماچ نەکردوو . . گەردن سەرای سافی کرد بە سوراحی بی گەردی بەربای سەبا . . بەشنوی شەوبوی زولفی بای شەمال ـ کە لە هاتو چوی زولفەکەیەوە شنەی ئەهات ـ لە سیبەری بەری لەشیا لیموی مەمکی جیا کردەوە . . ناوکی بینی ناوکی ئاهوی بە عالەم دا . . هەر

بایەکێ ئەهات بونی ئەو ناوکە کردبوی بە میسکی خەتاو خوتەن ! .. بالای خوی وەکو سەولی شەیدا لی کرد . . کە ، وای کرد شوینی خوی کرد بە شوینی بەهەشت . . سوربن وەکو شیرین بانوی خوسرەوپەرویز خوی نواند .. بو دیقە دیقەی مامز لای کردەوە و دەنگی بەرز کردەوە . ئاخو پەنجەکانی «بی» ـ کە سوری کردبون ـ ئەوە خەنە بو نی گرتبون ?. یا خوینی سوری جەرگی مەلابو نی خستبو ? ! ...

ئیمە کە بە چاویکی وردبینەوە تەماشای ئەم شعرانە بکەین ئەبینین لە رەوشتی هونینەوەو فیکر کردنەوە لە هەندی تەعبیر بو نەوازشی دلخواز، یا بو ستایشی دیمەنی تەبیعی مەلا بەجوری‌چوەتە پاریزەوە پیاو ئەکەویتە سەر ئەو باوەرە کە لەم جورە کردەوانەدا لەو پیاوە هەرە گەورانەیە کە پیان هاویشتوتە ئەم تایەوە . راستە ئەبی وابی چونکە :

تو گەلی شعری‌ترت لەم دوبابەتە بەرچاو ئەکەوی وبی ئاشنا ئەبیت بەلام ئەو کارەساتە کە ئەم شعرانەی مەلا ئەیگیرن وە ئەو تاسیرانە کە ئەمانە ئەیکەنە سەر دەماخ لام وایە کەم شاعری‌تر توانیویانە بەم جورە ئەم پەیمانە بدەن ، کەم لەشاعرانی‌تر توانیویانە ئاوا ماتقە بخەنە گەوهەری ئەو وشانەوە کە ئەو هیناونیەوەو وایان لی ئەکا کە جاری ئەبن بەشنەی بای هەمال دل ئەلەرینن ، جاری ئـــەبن بەتەلی روباب پەردەی گوی ئەلەرینن ، جاریکیش ئەبن بە هیزیکی مەعنەوی پیاو ئەبوریننەوە ! ...

• • •

ئینجا ئەگەر بیتو . نەوەی مەلا و شعری مەلا بناسین ئەلین : مەلا خوی ئینسانیکی ماتق بووە ، یەعنی شعری لە ماتقەیەکی نازکەوە وتوە ، شعرەکانیشی لە هەمو دەوریکیانا ریچکەی تەبیعەت و خەرامیان گرتوە ...

مەلا وەکو شاعریکی بەرزبووە نوکتەزان و قسە خوشیش بووە ، لەگەل پیاوی گەورە و ئەربابی نوکتەدا ئاشنا بووە .

جاریک محمود پاشای جاف به پەنجا شەست سوارەوە لە کویستان ئەگەرریتەوە بو گەرمیان نزیک دیەکەی مەلا ئەبیتەوە پیاویک لە پیشەوە ئەنیریتە لای مەلا ئەلی پی بلین « بەنان و گانەوە میوانین ! » . پیاوەش دیت کەچاوی بەریشی سپی مەلا ئەکەوی زور شەرم ئەکا راسپیریەکەی پی بلیت ، مەلا بە هەر جوریک قسەکەی پیدەر ئەخا . ئینجا ئەمیش بەم شعرە وەلامەکە ئەنیریتەوە بو محمود پاشا :

وەک قەومی لوتن ئەهلی جەباری دایم ئامادەن بو میوانداری ! ...

محمود پاشا کە ئەیخوینیتەوە زوری پی خوش ئەبی و نەوازشیکی زوری لەگەلا ئەکا ..

ئەم شاعرە دیوانیکی بەرزی بەزمانی کوردی ، تورکی ، فارسی و عەرەبی هەیە هیشتا لە چاپ نەدراوە ...



# سەی یاقۆ

## ١٨٠٨ - ١٨٨١

بولبولی خوش بێژ کوردی زمان، مەلی خەیالی سەر لە ئاسمان . ئاوازی شعری تازەی ناوە ، پشتکو و پێشکو خەی نەملوە ... لەدەشتی بەرینی مایەشتدا نەواخوانیکی دەنگ زەلال ، لە لاپەڕەی مێژووی کوردردا نمونەیەکی بێ‌هاومال. پالەوانی شاعرانی دەوری خوی ، نامەخوانی تەلارانی خەوانینی بەرز خوی . ئاشنا بە هەمو بیری شاعران ، بە ئاگا لە هەمو رازی ئەدیبان . . خوش خوان و خوش نەوا . شورش گیرێ بێ پەروا !... شاعری بەرزی ئەم هوزەمان



ناوی «یاقو ـ یعقوب»و کورری سید«وەیس»ە . لە سالی«١٨٠٨»ی میلادی لە دێی « قەمەشە » هاتوتە دنیاوە . « قەمەشە » گوندیکە لە دەشتی « مایدەشت » لە بلوکەکانی کرماشان . . خاوەنی ئەم داستانە بەپێی ئەو ئاگاداریانە کە دەست ئیمە کەوتوە لەبنەمالەیەکی خوێندەوار و میرزای کوردر بووە . لەسەر پەیرەوی خوێندنی ئەو شوێنەو ئەو دەورە بەمندالی خراوەتە بەر خوێندن ، پایەی خوێندەواری لەو جیگەدا تەنها خو خەریک کردن بوە بە فارسی و خەت خوشی بو ئەوە بێ بە میرزا . چەند سالیک بەم جورە خەریک بووە، جارجاریش بو رەوشتی میرزایەتی چوەتە کرماشان،

هاتو جوی « کرند » و « بی‌ستون » یشی زور کردوه ، له پاشا به ئیش و فرمانی « مامه‌حه‌سه‌ن خان » گه‌لی جاریش چوه‌ته « تاران » . چه‌ند جاریکیش چوه‌ته « قوم » وکاروانیکی « شیراز »یشی هه‌یه .

سه‌رده‌می که گولستانی سعدی و حافظی شیرازي خویندوه هه‌وه‌سیکی زوری که‌وتوته سه‌ر شعر ، هه‌ر له‌و ده‌وره‌وه ورده ورده ده‌ستی داوه به شعر وتنه‌وه و ته‌بیه‌تی له گه‌لیا گونجاوه . ئینجا خی داوه‌ته دیوانی شاعره کانی که‌لهورر ، وه‌کو « ئافه » ی کورری « مه‌لك قاسم خان » و ( ئه‌لماس‌خانی ) که‌لهورر .

له‌بن ده‌ست ئه‌مه‌شه‌وه به خوین شعری شیوه‌ی موکری‌شدا گه‌رراوه و ئاشنایه‌تی له گه‌لا بوه . زوری ئاره‌زو له رازو نیازي چیروکي بووه ، له‌به‌ر ئه‌مه هه‌مو ده‌می شعره کانی خانای قوبادی و مه‌لا وه‌له‌وخانی حه‌ز لی کردوه .

زورتر وه‌ختی له باري چیروکی‌دا به خویندنه‌وه‌ی کتیبی « خورشیدوخاوه‌ر ، شیرین و فه‌رهاد ، بارام و گوله‌ندام و روسته‌م و زوراو » وئه‌م جوره شتانه‌وه خه‌ریك کردوه بو ئه‌وه ده‌رزی شعری روانی‌یان لی‌وه‌ر گری . له پی و شوینی شعری غه‌رامی شیوه‌ی موکری‌شدا ئاوازه‌ی « مه‌لا خدری نالی » و ئه‌وره‌حمان به‌گی سالم ـ که‌هاو چه‌رخی خوی بون ـ گوی‌ی لی بووه و له سه‌ر ریگه‌ی ئه‌وانیش روه‌یشتوه :

بم جوره ئه‌م شاعره‌مان ئه‌که‌ویته کوشی شعره‌وه و « سه‌ید » ئه‌کا به‌ناوی شعری ، هه‌ندی جاریش هه‌ر « سه‌ی‌یاقو » بووه ، له میرزایه‌تیشدا ده‌ستیکی بالای بوه ، له « ١٨٣١ » دا ئه‌بی به میرزا و شاعری تایبه‌تی « مامه‌حه‌سه‌ن‌خان » حاکمی که‌لهوررو تا مردن له گه‌ل ئه‌و و شعردا پیکه‌وه ئه‌بن ، تا له « ١٨٨١ » دا له ته‌مه‌نی « ٧٣ » سالیدا کوچی دوایی ئه‌کا و ته‌رمه‌که‌ی ئه‌بریته‌وه بو ئاوایی « قه‌مه‌شه » و له‌وی ئه‌نیژری و خزمه‌کانی ئیسته‌ش له مابیه‌شت به ده‌وریه‌وه‌ن ..

سه‌ی یاقو پیاویکی بالابه‌رز و زور ئه‌ستور نه‌بووه ، چاوه‌کانی گه‌وره‌و

بروی پررولیک جیابون ، لونی قەڵەمي ، دوسمیلی قیتی سپی نەنگیان بەگوبچکەی هەڵچنیوە ، ریشی توپ بووە ، خولامانەی هەبوە ، گەواو سەڵتەی رەشی زورتر لەبەر کردوە لەگەڵ کولەنجەدا ، تەپلەی لە سەر ئەنا لەگەڵ مشکیو سر کەبی ، سوارچاک و دەست و نقامیکی نایابی بووە ، لە قسە کردنا دەنگی نیر بووە ، قسەی رەوان بووە ، وشەی «چنەو ئەوت»ی زور بەکار هیناوە ، وانە : « چون ئەبی » . لە نوسینا زور خیراو حەتیکی خوشی هەبووە ، هەمو دەمی قەڵەمدانیکی زەردی پیبوە کردویە بە بەر پشتینەکەیدا ، بەقەڵەم قامیش ئەینوسی ، دو مقەبایلشی کردوە وەکو «فایل» کاغەزو پارچە شعرە تازەکانی ـ کە ئەیوتن ـ ئەیخستە ناوی و لەگەڵ خوی ئەیگیراو ئەیخستە دەستەبو خچەیەکەوە . کە لە دیواخانی مامە حەسەن خانو زین‌العابدین خانی برای مامەحەسەن خاندا دا ئەنیشت بەگەفو گورریکەوە شعرەکانی خوی ئەخویندەوە . لەگەڵ ئەوەش کەهاو دیواخانی ئەمانەبووە لە باری گوزەراندا زور ئامادە نەبووە و لە حالی خوی رازی نەبوە ...

سەی یاقو بەرزتر شاعریکی ئەو دەورەی ولاتی لوررو کە لمورر بووە ، لە شیوەی شعری کەلموررو موکریدا ماموستا بووە ، سەری کیشاوەتە نابی هەمو جورە وتنیکەوە ، غەراي ، ئاینی و ستایشی دیمەنی تەبیعەت . ئیمە لەبەر ئەوە هەمو دیوانەکەیان دەست نەکەوت نەمانتوانی لەمە زیاتر وە لەم چەند بررە شعرەی کە لیرەدا ئەینوسین زیاتر بنوسین لەگەڵ ئەوەش « مشتی نمونەی خەرواریکە » ...

سەی یاقو لەبەر ئەوە دلخوازەکەی بە تەواوی کاری کردوتە هـــەمو رەنگ و شادەماریکی دینی باسی گیرودەیی خویو خوشەویستیەکەی ئەو لە دلیا و ستایشی بەم شعرانە ئەکاو ئەڵی:

شوری وەسەرم گوتگە لەی مەستی چاوە
هیچ جیگە نەنیشم مەگەر لەی ـبی کە شراوە
گونات وەکە مانگ و دو زولفت وەکە عەقرەو
هەرچەن کە قەمەر گیرە لە عەقرەو، چە وشم کارە کراوە
شور دلە باعث تاوو تەوە گریان
مەعلومە کە ئاگر سەبەبە جوشەش ئاوە
ئەی خالو خەتە دلبەرە؟ یا لەیل و نەهارە؟
یا هەور رەشە پەردە کەشە روی حەتاوە؟!
چامان نگارم وە سوپاوە موژە ماچان
کەی لەشکەر خیون ریژئەیە وەخت چەپاوە؟
ئوشن کە غەزالان چەرزنی شورە زەمینە
پەس ئاهوی من رایچە کەلەی دیدە رماوە؟
دلبەر لە غەمت «سەید» بیچارە سەرە شەو
خیون ریژیە لەی دیدە حەتا سوبح دەماوە!
سەید! وەکەلام! غەیر لە خەت ئەبروی دلبەر
مەیلم نە وە مزگت، نەوە میراو و کتاوە!

واتە: شوریکی وام کەوتوتە سەر لە مەستی ئـەم چاوانە. هیچ شوینیک نیە نیایا دانیشم تەنها ئەو جیگەیە نەبی کەوینەی چاوی یاری تیدا کشراوەو ئەوی تیدا هەیە. کولمت هەر وەکو مانگ و هەر دو زولفەکانت هەر وەکو دو پشک ـ لەوەدا کەلار بونەتەوە ـ.. هەرچەند کە مانگی رومەتت گیری خواردوە بە دەست دمارەکەلي زولفتەوە بەلام بلیم چی ئیشەو کراوە و وا هاتوە .. شورشی دلە بونە موی ئەوە کە بارانی فرمیسکی گریانەکەم بە تاو و بەگەرمي ئەررژی. . ئەمەشتیکی راستە کە ئاگر هوی کولان و جوششی ئاوە ، ئەگەر ئاگری عەشقی تو نەبی فرمیسکم بەم جورە نارزژیتە

خوارەوە . . ئەم خاڵ و خەتە کەبەر چاوم ئەکەوێ ئایا ئەمە دلبەرمە ؟ یا شەو و روژە ؟ . . یا خود هەوری رەشەو پەردەی کیشاوەتە سەر رومەتی وەکو هەتاویا ؟ . . چاوەکانی یارم بەلەشکری برژانگێ ئەلی : . . ئەی لەشکری خوین ریژ ئەمە کەی وەختی تالانە ؟ . . ئەلین ئاسکەکان بە سەر زەوی و دەشت و دەردا ئەسوڕرینەوە و نەوای شوری سەرمەستی بلاو ئەکەنەوە . . ئەگەر وایە ئەم ئاسکەی من چون هەر لەدیدەی مندا کەوتوەو بو هیچ لایەکیتر ناڕروا ؟ ... دلبەرم ! سەیدی بیچارە لە غەمتا هـــەر لە گیوارەوە . . خوین لە چاوی ئەڕرژیت هەتا پاش بەیانـ و دەمە دەمی نیوەڕرو ! . . سەید ! سوینم بە کەلام ـ قرآن ـ بیت بیجگە لە خەت وخالی دلبەر . . مەیلم نەلە مزگەوتە بو نوێژو تەعات ، نەلە میراوی کەوثەرە ، وە نە بە کتیبی محاسبە . هەمو شەوو بیم لای تو بە ! ...

ئیمە ناتوانین بلین ئەم شعرانە لەو بەرزیەوەن چونـکە رەخنەیان لی ئەگیریت ، تەماشا ئەکەی لە شعری دوهەما کە ئەلیت : « گونات وەکە مانگێ » گونا ناشوبهینری بەمانگێ ، گونایەکێ کە سوربی و مانگیکێ کە سپی بی ـ با هەر دوکیشان جوان بن ـ لەگەل ئەوەش ناتوانری وەکو یەکیان لی بکری . بەلکو رومەت ئەکری بەمانگێ کەگوناکەشی تیدایە ، گونا ئەبی بکری بەشتیکی سوورو ئال ... دیسانـ لە شعری چوارەما ئایا مەبەستی بە خال وخەت چیە ؟ . ئەگەر مەبەستی رومەت و زولفیەتی بەلی هەمو تەشبیهی شعرەکە دروستە بەلام ئەمەش نەبیسراوەکە خال و خەتە رومەت و زولف بیت ، ئەوا خال ، خالە خەت چیە ؟! . ئەگەر بلین خەت رومەتە . ئەم رومەتە لە شعرەکەا بو بە کورەی روژ و بو بە هەتاو بو ئەوە خال ـ کە شەوە ، یا هەوری رەشـەـ دایپوشی ! . دەی ئەو خالە ئەبی چە خالیکێ بی کە هەمو رومەتی داپوشی ؟! . ئەگەر خالیکێ ئەمە بی کە هەمو رومەت داپوشی ئەمە نابی ناوبنریتە خال ، بەلکو ئابی بلین ساجیکی رەشی

خستوته سەر رومەتی و هەموی داپوشیوە ! . . ئەگەر بلین نەأ ، با خەت زولف بی و « خال » رومەت بی ، دیارە ئەمـــــە بەولاترەوە خراپترو ناررێکترە . ئەوەشمان لە بیر نەچی کە لە شعری هەشتەمیشدا « خەت » ی کردوە بە برو ! ...

لەگەل ئەمەشدا ئەم شعرانە وەنەبی لە پایەی سەی یاقو کەم بکەنەوە یا پیاو بخەنە شکەوە لەشاعریەتی سەی یاقو ئەم شعرانە ئەوە بو ئیمە دەر ئەخەن چە پەردەیەکێ لەو دەورەدا بەسەر شاعرەکانی بەشی موکری دا کشراوە هەر ئەو پەردەیەیە کە بەسەر بیرو باوەرری شاعرەکانی کەلهوررێشدا کشراوە ، چە هەواو دیمەنیکێ ئەمانی پی گەیاندوە هەر ئەو هەواو دیمەنە بوە تەلی مانەی ئەوانیشی بزواندوتەوە . هەر وەها ئەوە بو ئیمە دەر ئەخەن کە ئەمانە لە هەر سوچیکی کوردەواریەوە بو بیتن لەقە کەیان با لەیەکێ دور بو بیت بیرو باوەرریان پیکەوە بەسراوە و پەروانەی یەکێ موم بوون . جا ئەو مومە خال و خەت بو بیت، یا دیمەن و پەیکەر بو بیت، یا بیرو هوشیکی تر .

* * *

دیسان سەی یاقو لە باسی بادەی مەی نوشی و بەرەرەکانی زاهد و منبەر- نشینەکانا وینەیەکی تر بەجوریکی تر دینیتە ناوەوە و ئەو پەردەی پیشوە دائەداتەوە و ئەلی :

خانەیەکێ وەو سەوت وەو قەتارەو عەنبەر وەو ئاوازی سەدای تارەوە
ئەگەر بوینی ، بشنەوەی وەگوش حەقپەرستی ویت مەکەی فەراموش
تو هەر های لەفیر روژەو نمازان منیش هام لە فیر گەمەن درازان
تو هەر های لە ویر مەحراب و مەنبەر
من هەر هام لەویر زولف بو عەنبـەر
رای روباو ئەنجیر گرتی لە پیش باوە! نوگورگیەهای لەجەلدە میش!
هەر یەکێ نامەمان بگەریم وە دەس نیکی و بەدیعان ئەوت مرشەخس

ئەو سا لەو دنیا خودا شاهدمن حەق وە (سەی یاقو) یا وە زاهدمن ؟

واتە : « خانە بەگ » ـ کە گورانی بیژیکی کەلهوررە بووە بە دەنگی خوشی ئاوازی « قەتار و ئەلاوەیسی » یەوە . « عەنبەر » یش دیسان دەنگ خوش و تارچیەکی کەلهورر بووە ، ئەویش بە دەنگ و ئاوازەوە با تی چریکینن . . ئەگەر تو بیتو بە چاوی خوت ئەم بەزمە ببینی و بە گوی خوت گویت لی بی . . حەقپەرستی خوتت لە فیکر ئەچیتەوە . تو ساتیک لەلای ئەمانە دانەنیشتوی ، دانەنیشتوی تا گوی بدەیتە دەنگی نالەی هەراو زەنای ئەمانە ! . . تو هەر وایت لە فیکری رۆژوو نویژەوە . . منیش هەر وام لە فیکری کەمەنی هونراوانەوە ـ کە خاوەنی زوانی دریژن ـ . . تو هەر هایت لە بیر کردنەوە لە محراب و مێبەر . . منیش هەر لە بیری زوانی بوزنەعەنبەردام . . تو ریگەی ریوی و هەنجیرەکەت گرتوە ـ ئەمە پەندیکی پیشینانی ولاتی کەلهوررە ئەلین : « رووا دەمی وەدار ئەنجیر نارەس ئوشیت خراوە » واتە : « ریوی دەمی نا گاتە دار هەنجیر ئەلی خرابە » . جا ئەمیش ئەلی تو دەردی ئەو ریویەت لی هاتوە . . بابە ! تو خوتت کردوە بە گورگ و چویتە پیستی بەرانەوە ، بەم جورە شتانە ریی لە مەردم تیک ئەدەیت . . من و تو هەریەکە نامەی خومان بگرین بە دەستەوە . . ئەو وەختە چاکی و خراپیمان دەر ئەکەوی . . ئەو وەختە لەو دنیا خوا خوی ئەیزانی . . حەق بەلای سەی یاقودایە یا بەلای زاهددا ...

سەی یاقو لەم شعرانەدا خوی نزیک کردوتەوە لەو کەسانە کە لە ئاهەنگ و بەزمدا مەی گیررن ، بەو بونەوە دەست ئەکاتە بەر بەرەکانی کردنی ئەو کەسانە کە خویانیان بە بادەیەکی ترەوە خەریک کردوە . ئەلی من هەمو هەستیکم کەوتوتە گوشەی چاوی زولف لولانەوە ! . لە پاشا ئەکەویتە عالەمیکی ترەوە وەکو عالەمی فەلسەفەو تصوف . . رو ئەکاتە ئەو کەسانە کە لە ژیر پەردەی ئایینداا مەردم هەلئەخەلەتینن و خویان سەر

ئەخەن . ئەلی ئەم ریگەیە کە من گرتومە ئەمە باشترە چونکە ئەگەر زیانی بێ هەر بو خومە ، بەلام ئەو ریگەی تو گرتوتە چاو بەستە خواناسی راستەقینە بەو جورە نابی، تو خوینی مەردم ئەمژی، من بونی مەردم ئەکەم .

کەوابو سەی یاقو چون شاعریکی غەرامي بو هەر وەها نەفسیەیکی فەلسەفی تیکلاو بە تصوفیشی هەبو . وا دیارە لە ژیانیا زورتر ئەم دو ریگەیە گرتوە .

«سەی یاقو» لەم بررە شعرەیدا زورتر شیوەی « گارەرو » ی گرتوە . ئەمە نیشانەیە بو ئەوە کە ئاشنای گەلی شیوەی کوردي بوەو لە هەمویانا مەیداندارې کردوە .

ئەم شاعرە زیاتر لە بیست هەزار شعری لە شوین بەجی ماوە ، بەلام تا چوار هەزاریکی لی کو کراوەتەوە و بوی کراوە بە دیوانیک ئەوانیتری سەری تیاچوە . ئەم دیوانەش هەر وا بە دەسخەتی ماوەتەوە و تا ئیستە لە چاپ نەدرواوە و لەلای خزمە کانیەتی .



# کوردی

## ١٨٠٩ - ١٨٤٩

سوتاوی سارای رەشپوشان بە دەست عەشقەوە ، کوژراوی ئالای بالا نەمامان لە سەر مەشقەوە . تاقە گولی محمود بەگی صاحبقران ، کوردی ناوو کوردی گیان و کوردی زمان . لە کوڕری بادەفروشانی سوزو گودازدا کەمەر بەستە ، لەپولی مەی نوشانی قسەو باس و بەلاغەتدا سەر دەستە . رەنجی کە ، داوە ، دوایە لە پیناوی چاوی کال ، سەودا بووە بە خەتی سەوزی کوڕریکی چواردە سال . ئەم سوزەوە بووە کە سەرەنجامی ئیشە کەی ، کوتو تە عالەمی ئەرواحەوەو نەیماوە ئیشەکەی . ئەم سوزەوە بووەکە نەفیرەتەوە کاربزی شعری بەرزی ، لافاوی کەوتە ئیران « قاأنی » پشتی لەرزی . کەوابو « کوردی » هەم شاعریکی کوردی بوە ، هەم غەرامیەکی کوردی بوە ، هەم دەرویشیکی راستەقینەی کوردی بووە ! ..

ئەم شاعرە غەرامیە بەرزە ناوی « مصطفی » و کوڕری محمود بەگی کوڕری احمد بەگی صاحبقران و ئاموزای ئەورەحمان بەگی سالمە بنەمالەی صاحبقران بێشکە ، بیشکەی شاعران بووە بویە احمد بەگی فتاح بەگیشیان تیدا هەلکەوتونەوە . لە سالی ( ١٨٠٩ ) ی میلادی لە شاری سولەیمانی هاتوتە دنیاوە . هەر لە سولەیمانی خراوەتە بەر خویندن و لە پاشا هەندی خویندنی علوی ئیسلامیشی لە حوجرەی فەقیان خویندوە . کە ئەم شاگرد بوە سالم خەلفە بووە ، کە ئەم سوختەبوە سالم مستعد بووە .

هەرچەندە بنەمالەی صاحبقران ئاوەدان بووە بە چاندنی نووی شعردانان بەلام لەوەی بە تایبەتی بوی بە سەرچاوەی ئیلهامی شعر لە کوردیدا ،

نەوجەوان ، ئەبرو کەمان ، شیرین دەهان و نوکتەدان
تورکێ رەفتــار و پەری روخسارو تا کولدارەکەم

قادر ناو بوە لە سولەیمانی کە بە خەتی سەوزی سەرلیوی ، بەتا کول و خولامانەی سەر شانی سوزی ئەشقیکی سوتینەری خستوتە کوردییەوە ...
ئەم کوررە کاریکی زوری کردوتە سەر زبانی مصطفی بەگ ، تەنانەت ئەلێ لە ئاخر هەناسەیا بە ئاگری عەشق سوتاوە و پروزەی چوە بە ئاسمانا ! ..

کوردی جاریک ئەبێ کە « قافلە » ی چوە بو « سنە » ئەمیش دەستبەجێ سولەیمانی بەجێ دیلێ و ئەچێ بەشوینیا ، کەلیک لە سنەدا ئەسوورریتەوە ، پێ ئەلێن ئەوەی تو ئەتەوی هیشتا نەهاتوە ، ئیمرو و سبەی ئەگاتەجێ ، ئەچێ بەپیریەوەو دەشتی «سەرنوی» لێ ئەگرێ ، کە گوێ لە دەنگی زەنگی کاروانەکە ئەبێ دەست ئەکا بە وتنی بررە شعرە بەسوزەکەی و سەرەتای بەم شعرە ئەکاتەوە ئەلێ :

سەدای کاروانی فرقەت دێ ، ئەلێن سەر قافلەچی یارە
زررەی پیشەنگی محنەت دێ ، دەلێن کالای غەمبارە !

کوردی ئەدیبیکی پایە بەرزو شاعریکی شعر رەوان بوە ، سوزی (قالە) وای لێ کردوە لەوانەیە کەم کەس لە غرامیاتدا دەستی ئەوی بوبێ . کردوەی تورکەکان لە سولەیمانیدا کەلێ جار بوە بەهوی دڵ رەنجاندنی کوردی و تەواسانەوەی لەسولەیمانیو بارکردنی بو ولاتی ئیران . لە کوردوستانی ئیراندا خزمەکانی سالم خزمی ئەمیش بوون . چونی بو ئیران وەکو چونی جەوری تورکان پێ کردوە هــەر وەها هاتوچو کردنی قالەش بوە بو سنە و لەبن دەست ئەمەشەوە دیدەنی کردنی بوە لە خزمەکانی . لە ئیراندا زورتر وەختی لەگەڵ ئەربابی قەلەم و شعردا رابواردوە ، لەگەڵ دیوانی شاعرەکانی عەجەمدا سەودا سەریەکی چاکی بوە بەو بونەوە ناوبانگیکی بەرزیلە ئیراندا هەیە ، بە تایبەتی لە سنەدا کەلێ وەختی رابواردوە و کەلێ شعری جوانی لە

شوین بەجێ ماوە . لە تاران ماموستای شازادەکانی شای ئیران ئەبی وە لە یەکەم کاروانیا ئەبی بە ئەندامی « ئەنجومەنی ئەدیبان » یش لە تاران . لەگەل «قائانی[1]» شاعری بەناو بانگی ئیراندا داستانیکی سەیر و شەررە شعریکی زوریان لە بەیندا بووەو لە ئاخردا بورری قائانی داوە . گویا ئەلین لەسەر روّلینانی (شا) لەسەر حەوزیک دائەنیشن وئەکونە «شاعیرەوە ، قاآ لەپشت کوردیەوە وەستاوە وینەکەی لە ناو حەوزەکەدا دیاربووەو ئەبیتە هوی ئیلهامی کوردی ، قائانی هەست بەمە ئەکا بە دار دەستەکەی حەوزەکە ئەشلەقینیو وینەکە تیک ئەچیا . کوردی هەر گوێ نادانی و بوی هەلئەـتی بە بەنجە ئەدا لە ئەپلی چەری قائانی ـ کە کەچەل بوە ـ و ئەلی : « لای ئیمە کە مانگ گیرا لەمس و تەنەکە ئەدەنا . » قائانی بەمە زور توررە ئەبی و جنیو بە « سنی » ئەدا و لەمەوە شەررەکەیان سەر ئەکیشیتە لای ئەوەکە بەجەی یەک بگرن ، ئەو وەختە شا تـکا لە کوردی ئەکا کەوازی لی بینی . .

هەر وەها ئەفسانەی سەیر بەرامبەر بەکوردی ئەگیرنەوە ، وەکو ئەوە ئەلین پیالەی زەهری خواردوتەوە و پی نەمردوە و لەپاشا بە ئاگری عەشق سوتاوە . کوردی بیجگە لەکاروانە زورەکانی ئیرانی ئەلین چوەتە «شام» و دو جاریش چوەتە پاریس و تەنانەت سەفارەتی فەرەنسەشی هەیە .

شاعرەکانی کورد بەچاویکی بەرزەوە سەیری کوردییان کردوە ، وەکو ئەوە باسی شاعرەکانی پیشوی کورد لەشیخ رەزای تالەبانی ئەپرسن ، ئەویش ئەلی « ئەگەر هە ـ بهاتنایەوە دنیا ، روژی جاریک دیدەنیم لی

---

(١) قائانی ناوی میرزا حبیب بوە و خەلکی خوراسان بوە ، لەدەوری فەتحعلیشا، تا دەوری ناصرالدین شای قاجار ژیاوە . بدیع الزمانی خوراسانی لە کتیبەکەیا « منتخبات ئەدبیات ایران » ئەلی قائانی لە « ١٢٧٠ »ی قەمەری مردوە .

ئەکردن بەلام لە کوردی روژی پێنج جار » . حاجی قادری کویی کەباسی کوردی ئەکا ئەلی :

شەهەسەواری بەلاغەتی کوردان یەکە تازی فصاحەتی بابان
مصطفی بە مخلصی کوردی غەزەلی کردە بەربەتی کوردی

کوردی زمان و ئەدەبیاتی فارسي چاک زانیوە ، لە عەرەبی و تورکیشدا دەستی بووە . لەبەر دور کەوتنەوەی لە کاکولەکانی تالە زور جار ناوی شعری لە دیاری بیگانەدا کردوە بە « هجری » وەکو ئەلی :

تاکەی ئاخر حەسرەتی کاکولەکەت پەنهان بکەم ؟
« هجری » ئاشوفتەدل وکاکول پەرەستی کاریە ! .

دیسان ئەلی :

ئومیدی وەصل و دیداری نەما « هجری » ئەمیستاکە
هەمیشە انتظاری نامەی پەیک و سەلامیکە .

کوردی پیاویکی بالابەرزو کەلەکەت ، سور وسپی ، مورەقی و چاو گەورەو بە هەیکەل بوە . زور گوبی بە جل و بەرگی جوان نەداوە بەلام زمانی زور خوش بووە . لە پاش چەند جار هاتو چو کردن بو تاران ئاخر جار کە ئەگەرریتەوە بو سولەیمانی لەبەر ئەوە شەیدای عەشقیکی راستەقینە کاری تی کردبو نەفسی پی نەئەگیرا لەو ئەمرکە بەری بەریوە ، لەبەر ئەوە بە نەخوشیەکی نەفسي لە سالی « ١٨٤٩ » ی میلادی لە تەمەنی « ٤٠ » سالیدا گیانە پاکەکەی دابە دەست ئەو عەشقەوە و لەشەکەشی سپارد بەدار ئەر - خەوانەکانی گردی سەیوان بو نەمانی عشق ! . دور نیە ئیستەش لە دەرونی گورەیەکی بەجوشەوە دەنگی‌سوزی (یا قادر) لە گوررەکەیەوە بیتە دەرەوە !

لە گەر ئیمە بمانەوەی لەشعری کوردی بکولینەوە لە پیش هەمو شتیکدا ئەلین : کوردی شاعریکی فیتری و شعرەکانی وەکو ئاوخواردنەوە وابون بوی ، وە زورتر ئەفسانەی لە سەر غەرام و غەزەلیات برراندوتەوە .

ئەمانەشی هیناوە خستونیەتە ناو گولدانیکی وشەوە بو ئەوەکە پیاو گویی لی بو هەم دلی بە بونی گولی مەعنا بگەشیتەوە ، هەم چاوی بە دیەنی گولدانی وشە رون ببیتەوە . .

کوردی کە لە بەهەشتی زەمانی مندالی دەرئەچی و ئەکەویتە ناو دەشتی بەسامی دنیاوە ، لە باتی ئەوەکە دەرو زوری تاپی ژیان بپشکنی بو ئەوە کە لەو دەشتەدا کوشکیک دروست بکا و بـە دلنیایی تیایا دابنیشی کەچی بە پینچەوانەی ئەمە ئەکەویتە ناو دەریاییکی بی بەبەوە و بە هەر لایەکدا شان و قول ئەکوتی تەمشا ئەکا هەر لە شوینەکەی خویدایە ! . پی ئەلین : بو چ وایە و وا ئەکەی ؟ . ئەلی :

مەکەن مەنعم کە سەرگەردان و ویلم     بە دەست عەشقە زەمامی اختیارم !

پی ئەلین بازاری عەشق بازاریکی بەسامە ، پیاو کە چوە ناویەوە هەر شتیکی پی بی ئەبدووربنی و ناویشی ئەزرنگی ! . ئەویش ئەلی :

من کە رسوا بوم و تەپلی عاشقیم لیدا ئیتر
کوردی هیچ پەروای دل وئیمان و مالی دین نیە !

گەلیکی لەگەل ئەکولنەوە وپی ئەلین : هەمو عومری خوت بە خواررایی دووراند . ئاخر تو ئەم عەشقەت لەسەرچیەو بوچیە ؟ ! ... ئەلی : راستە ؛

هەمو عومرم بە ضایع چو لە ریگەی عەشقدا چونکە
گرفتارو ئەسیری داوی عەشقی طفل فامیکم

کە بویان دەر ئەکەوی ئەمە بەچکە بچکولەیەکی بی ناوە ، وا ئاگری لە عومری بەرداوە ، لی ئەپرسن ؛ باشە ! لە چە بنە مالەیەکە ؟ . ئەو بنەمالەیە لە کوی یە ؟ . چی لەبەر ئەکا ؟ . خو و رەوشتی چونە ؟ . چون کوریکەو ناوی چیە ؟ . . کە ئەمەی گویی لی ئەبی دلی ئەگەشیتەوە و هوشیکی بەبەرا دیتەوە و زمانی ئەکریتەوەو ئەلی :

گەر دەپرسن مەنزڵو شــکڵ و لباس و تائفەی
مالیان نەزدیکە بە بەندیخانەو وگاشی ئەحان (١)

ئەسمەرە ، لاغرتەنە ، بالا میانە ، کەچ کوڵاە
سوخمە سەبزە ، مەیتەن ئالە ، چاو خومار ئەبرو کەمان

عاقڵو داناو مؤدەب ، وەحشی و مەغروورو عەجوول
گە دەڵێ سنداڵ بە عاشق ، گە دەڵێ چاوم قوبان !

زود خیزە توند رەوتە ، مەستە دایم چاو بە خەو
گاه بەدخو زالمە ، گە مشفقە شیرین زبان

سا ، لە هەر کوێ ی کەمەسڵت کرد سؤالی لێ بکە
رازی پەنهانی سەراسەر بوت دەکا ئەلبەت عەیان

رەهرەوت قادر بێ بو اعطای جوابی مەسئەلەت
وەرنە « کوردی » ناتوانێ حالی خوی بوتـکا بەیان !

تەماشا ئەکەی لێرەدا شورشی عەشقی کوردیکی نەورەسی چاو خوماری سوخمە ئال بووە بە سەرچاوەی ئیلهامی شعری کوردی ، ئەو کوردیە کە لەو دەریای بێ پەیەدا تەکان ئەدا و کەچی ئەو هەموو هوشیکی لێ سەندوە ... بەلام ئایا ئەم عەشقە بەرامبەر بەو کوررە عەشقیکی دەبەن پەرستی بوە ، یا سەودایەکی هەوەس رانی ؟ ؟ . ئایا ئەو کەسانە کە لە گوشەی ئەشکەوتی خوا پەرستی ، یا لە دوکانی بازاری عەشق پەرسلیدا بەرمال وَ کەلپوستیان راخستوە

---

(١) بەندیخانە لە گەل سەرادا لە بناکانی سلیمانی بەولا آغا بووە ، حەوزیکی گەورە لە حەوشی بەندیخانە کە بووە ، شوینەکەی کەوتبوە پشت ئەم سەرای ئیستەی سولەیمانیەوە نزیکە بە مزگەوتی بن تەبەق ـ کە لەم ئاخرەدا مزگەوتی مەلا فتح الاسلام پێ ئەوەت . ئاشەکەش کەوتبوە پشت مزگەوتەکەوە بەلای پیرمە سورەوە .

چی ئەلین بەرامبەر بەم کارەساتەی کوردی و بەرامبەر بەم شورشە کە کوردی بە ئاشکرا خستویەتە ناوەوە ؟ ؟ ..

بەلێ گومانی تیدا نیە کە کاکولی لە خەنە گیراوو چاوی مەستی بە دەستی کردگار جوان کراوی قادراغا بوە بەو هیزە کەپی ئەلین « ائیر » و گەلی گەلی لەهەوا نازکترە وخوی داوە بەسەر هەمو ذرە ـ گەردیکی ـ مصطفی بەگدا ! . ئەویش لە تاوا کە گریاوە فرمیسکی خوینەکەی لە سەر زەوی و لە هەواوە ، نەخشەی وشەی عەشقی کیشاوە و ناوی قادری هیناوە ! . ئەوەندە هەیە لە گەر هیتو ئیمە نەفسی عەشق، نەفسی عاشق، نەفسی مەعشوق بخەینە بەر ئەومەکینەیە کە خەوشی لەئالتون پی جیا ئەکریتەوە بومان دەر ئەکەوی کە عەشقی « کوردی » بەرامبەر بە « قالە » عەشقیکی داوین پاکی بوە ، عەشقیکی خوا ناسی و فەلسەفە بوە . عەشقیک نەبوە کە کورریک دلی لە کورریک چوبیت ، یا ئەو عەشقە نەبوە کە کورریک دلی لە کچیک چوبیت ، بەلکو عەشقی راستەقینە ـ ئەگەر بوبیت ـ تەنها ئەو عەشقە بوە کە کوردی بەرامبە بە قادراغا توشی بووە، چونکە ئەو کە عاشق بوە بە قالە بو ئەوە نەبووە کە لەبەر مانگە شەویکی چواردە دا لە سای گەردنی قالەدا شـــەرابی سەرخوشی بخواتەوە بو ئەوە بە گزیکەوە دەستیک بو قالە دریژ بکا ! . بی گومان ئەگەر ئەم عەشقە بوایە نەیئەتوانی بلیت :

شەهیدی عەشقم و مەمنون و کفنم بو مەکەن یاران
گەواهی حەشرە بو دەعوای شەهادەت بەرگی خوینینم !

بەلکو عاشق بوە بەو دیمەنە کە عەکسی جوانی کردگار بوەو لە ئاوینەی سەرو بالای قالەدا دەر کەوتوتەوە ! . عاشق بوە بەوجەمالە کە توزیک بوە لە پرتەوی جەمالی بارەگای ئەو خوایە کە بە دەستیکی نهینی گولی ئەندامی قالەی دروست کردوە و کردویە بە نمونەیەک بو دەرکەوتنی ئەو گەورەیی و دەسەلانە کە بە هەزاران هـەزار ئایاتی کونی و غەیرە کونی هەیە ، قالە

تەنها یکیکیانە و سوزی « کوردی » ش تەنها یکیکە ! ..

دیسان نیشانەیەکی تر بوو ئەوە ، کە عەشقی کوردی بەرامبەر بە قالە عەشقیکی راستەقینەو داوین پاکی بوە ئەوە بەلـگە منطقیەیە کە ، لام وایە هەموکەس وەری ئەگری :

هەر شتیکی مادّی یا مەعنەوی لەم گیتیەدا کە تو بیگری بەلانی کەمەوە پیویستە وەکو بەردی ئاگر دان سە کوچکی بی ؛ یەکەم داواکەر ، دوهەم داواکراو ، سیهەم مەرام . وە هەر یەکێ لەمانە ئەبی لەوانە بن کە لە شانیانا بی ئەو ئیشەی خویان بەرن بە ریوە . . تو دلت لە میوەیەکێ ئەچیت ، ئەوا تو و میوەکە هەر دوکتان هەبوون ، مەرامەکەش ـ شکاندنی ئارەزوی ئەو میوەیەیە ـ دیارە ئەبیت ؛ چونـکە هەم تو لە وانەیت کە میوە بخویت ، هەم میوە لەوانەیە کە بخوریت . کە ئەم دوە هەبو سیهەمینەکە بە ناچاری ئەبیت . بەلام ئەگەر دلت لەبەردیکێ چو ـ بو خواردن ـ ئەمە ریکێ ناکەوی ؛ چونکە نە تو لەوانەیت بەرد بخویت ، نە بەردیش لەوانەیە بخوریت بو نەهیشتنی ئارەزوی برسیتی . وتمان ئەوا هەر هات و کردتە زورەملی بەردەکەت خوارد ممکن نابی جاریکی تر بتوانی ئارەزوی بەرد خواردن بکەیتەوە ...

دل لی چونەکەی مصطفی بەگیش لە قالە هەر لەم بابەتەیە ؛ مصطفی بەگێ ئەتوانی دلی لە قالە بچیت ، قالەش لەوانەیە کە مصطفی بەگێ دلی لی بچیت بەلام ئەگەر مەبەست لە دل لیچونەکە ئیشی خراپە بیت ئەمەیان ریکێ ناکەویت،چونـکە سروشتی قالە بو مصطفی بەگێ بو ئەوە دروست نەکراوە . راستە ئەمە ئەبیت : کە کورریکێ دلی لە کورریکێ بچی بو ئیشی خراپەو داوین پیسی ، هەر کە کردی ئەبرریتەوە ، ئەگەر هینەکەی مصطفی بەگیش بو ئەوە بوایە جاری بیجگە لەوە کە لە ملوەی بیست سالدا هەر ئەیتوانی بەو ئارەزوە بکا ، ئـەم سوزە ئەوەندە نەئەمایەوە کە کوردی بخاتە ئەو حالەی

ئەرواحەوەو بە جوري تيايا ون بی کە ناوی قادری خاوەن جیهان بە تاپوی قادری چاو جوان بێنیتە مەیدانەوەو بلی :

عبث کوردی ! مەلائیکە دین دەپرسن مذهب و دیلت
کە قادر خوی دەزانی من لەسەر کام مذهبودینم !

پرسیار کردنی فریشتە لە پاش مردن و لە گوردا ئەبی ، ئەمەش ئینکار نا کری کە کوردی ئەمەی زانیوە چونکە ئەلی « دین » . هەر وەها ، نە کوردی و نەغەیری کوردی ئەوەیان بەرگوی نە کەوتوە کە لە دەوری ژیاندا فریشتە بیت و پرسیار بکات . کەوابو قادری چاو جوان ئەو دەسەلاتەی نیە کە دو فریشتە لە پاش مردنی کوردی بنیری بو پرسیار کردن ، بەلکو ئەلی قادری خاوەن جیهان ـ کە دروستی کردوم ـ خوی ئەزانی کەمن لەسەر چە ریگەیەکم ئیتر ئەم پرسیارە چیە ئەیکا ؟ ! ... جا ئایا عەشقیکی هەوەسرانی و ئارەزو پەرستی ئەتوانی بگانە ئەو پایەیە کە کوردی بخاتە کوری ئەو فەلسەفەو تصوفەوە کە هەزارانی وەکو « معرّی وخیام و منصور » تیایا مەی گیرد بوون !! ...

ئیمە لیرەدا بومان دەر کەوت کە ( کوردی ) بو بە عاشقیکی لاهوتی ، نەلی عاتفەی هیچ شتیک نایبزوینیتەوە تەنها ئەو بەیکەرە نەبی کە لە نیگاری ( قالە ) دا بوە بە ئاوینەی جیهانئەای کوردی ! . جا لەبەر ئەوە خوی لەبەر هەر تەونیکا ، کە دانی ئەبی یا ( تان ) ەکەی ، یا ( پو ) ەکەی عەشق بی ...

کوردی دەردە دلیکی خوی لەگەل یارەکەیدا باس ئەکا ئەلی :

چیشتم ئەسرو ژەهری مارو روحی شیرینم نەهات
زەخمی کونەم هاتەژان و مەرهەمی برینم نەهات

من غەمم خواردو غەمیش خوینی جگەری خواردەوە
بویە گریام چەند بەچەند فرمیسکی خوینینم نەهات

ئەلی : دوري یاری شیرینم بوم بو بە ژەهرو خواردمەوە .. هیچ

جەژەیێکی پیاما نەهاتەوە کە بێت و نەبەڵێ ئەو زەهرە بخومەوە .. زور دەمێکە من بەداوی ئەوەوە گرفتارو برینداری .. ئەو برینە کونەیەم ـ کە دور کەوتنەوەی جاری پێشوی ئەوە ـ هاتەوە سوی و نەهات بو ئەوە ئەو هاتنەیەم بو ببی بە مەلحەم .. من لە داخی دوریەکەی دەستم کرد بە غەم خواردن و ئەمویست بگریم و فرمێسکی خوێنین هەڵرێژم .. بەلام لەبەر ئەوە کە غەمیش وەکو « زەرو » خوێنی جگەری خواردبوم هەر چەندم کرد دلوپە خوێنێکم چنگ نەکەوت بو ئەوە بیکەم بە فرمێسک !! ..

کەم کەس توانیویەتی بەم جورە باسی خوی و غـــەم و یاری بکا وەکو کوردی کردویەتی . لە پاشا ئەبینیتە سەر ئەوە ئەلێ :

گوی سەرم چەوگانی مِیحنەت دایە بەر خوی رایفرراند

العجب بو ، شەهسەواری خانەی زینم نەهات ؟ ! .

لیرەدا بەراستی کوردی وەستایەتی بەکار هیناوە ، یەکەم لەوەدا : گویا سەرو کەللەی ـ کە شوینی مێشک و تەفکیرەتی ـ لەبەر نەهاتنی یاری وەها تێک چوەو بەکی کەوتوە وەکو توپی بوشی جلیتێنی لی هاتوە کە گوچانی ئیش و ئازار بە هەمو لایەکدا هەلیئەفرێنی و هەلیئە سوڕێنی . ئەلی ئەمە زور سەیر بو ؛ من ئەمەم بە سەرا هات و کەللەی سەرم هەمو کەس یاری پی ئەکرد کەچی یارم دیار نەبو ؛ کە ئەویش وەکو شوررە سواران لە ناو زینەکە دانیشی و گوچانێک بگریتە کەللەم ! .. دوهەم کوردی بەم شعرە یاریەکی شەقێن و رمبازی و توپ بازی ـ کە لەو دەورەدا لە کوردەواری باو بوەو هەر هی کورد بووە ـ ئەبخاتەوە فیکری ئیمە . زور نزیکە ئاوروپاییەکان یاری « پولو »یان لە کوردەوە وەرگرتبی ...

کوردی لەو شعرەیدا کە ئەلێ

گەر مخیرم لە مابەینی بەهەشت و وەصلی یار

وصلی تو ؛ بو من ، جهنم پرر لە جنت نامەوی

وردەکاریەکی کوردانەی سەیری کردوە . . رو ئەکاتە یارەکەی ئەلی : ئەگەر بمکەن بەسەر یەکێ بو ئەوە کە گەیشتن بەتو هەلگرم و جەحەنەم جیگەم بی ، یا دەست لە تو بشوم و بەهەشتم بدەنی . بی گەیشتنەکەتم ئەوی نەوەکێ بەهەشتەکە !

کوردی ئەم بەیار گەیشتنەی ئەوەندە بە سوز داوا کردوە ئـــەلی : نەوەکێ هـەر ئەوەندە کە بە دەست لی گیربونەکەت بەجەشتم ناوی !. بکرە لەبەر تو ئەوەندە لە بەحەشت دور ئەکومەوە ئەگەر بیتو جەحەنەمیش ـ ئەو جەحەنەمە کە ئەگەر تومر بوی ئەبی بە جیگەم ـ پرر بکریت لە بەحەشت تەنانەت ناچمە ئەویەوە نەوەکێ پیم بلین تو ئەوا چویتە بەحەشت ئیتر نابی بە یار بگەیت ! . .

« کوردی » سوچی قسەیەکی کوردی هەرخستوە کە یەکیک بە یەکیک ئەلی : « دە بررو جەحەنەمت لی پرر ! » . کابرا توررە ئەبی‌لای وایە قسەیەکی ناشیرینیان پی وتوە ، هەر چەندە ئەو کەسەش کە قسەکە ئەکا لە کاتیکی توررەییدا و بو ئەوە ئەیلی گویا جنیوی ئەدانی کەچی لە حەقیقە ـ تیشدا قسەکە لە مەبەستی هەردولایان دورە ، چونکە « دە بررو جەحەنەمت لی پرر » بەعنی بررو جەحەنەمت لی پر کرابی بە هیچ جور جی توی تیدا نەبیتەوە . کەوابو مەعنای شعرەکە ئەوە نیە وەکو هەندی کەس ئەلین : « بەهەشت پرربی لە جەحەنەم نامەوی » . ئەگەر مەبەستی ئەوە بی ئەلی : « جنت پرر لە جهنم » . . دیسان ئەم هەر لەبەر ئەوە کە بە یار بگا ئەلی : نەوەکێ هــەر بەحەشتم ناوی ، تەنانەت ئەگەر جەحەنەمیشم بو بی بە بەحەشت‌ئەویشم هەرناوی تەنها تو نەبی . کەوابو کوردی لە باری ئەدەبیاتدا زەوقی لەگەل شاعر بەرزتر بووە . . .



کوردی هەر لە خانەی مەشقدا دیواخانیکی دروست کردوەو بە بررە

شعره بەرزەکەی باسێکی ئاهەنـگی ئەو دەورە بو تاریخ ئەگێرێتەوە .
سەرەتاکەی ئەکاتەوەو ئەلێ :

دل لە میحنەت کەیلە ئەی پیری موغانی بەزمی ساز
هەرئەتوی بو بارەگای عەیش‌وتەرەب مەسنەد تەراز

کە دیواخانـی لە کوڕری مەی نوشان گەرم ئەبێت مەی و مەی گێرر لەچنە ژورەوە ، ئینجا بە زاهدیش ئەلێ تاپێ مەیخانەو ئاهەنگ کراوەتەوە واز لە خانەقا بێنەو پێ‌یەک باوێژەرە ئەم دیوەوە ! .. کوڕرمان زور خوشە ؛ چاو مەستی کلاولار بەکاکولی پەریشانیەوە بە نازیکەوە مەی ئەگێرێ .. بێ گومان گەردون تەماشای ئەو مەیەو ئەو مەی گێرەو ئەو لیوانە ئەکا کە ئەو مەیە ئەخوانەوە ! .. ئەلێ هەر وتنی گوێندەکانمان ناتەواوە ، دە با :

ئاغە ذەنون لێ بدا سینە کەمان فارس گرفت
ئەلـکە تەنبورو دەف‌و اسعد بدا دەستی بە ساز

مستو ئیبراهیم‌و ئەورەحمان نەواو نەغمی حەزین
مصطفی ناری وسەگا ، یونس بلێ دەشتی‌و حجاز

یا رەسول هەلدالە راست ، سالح بلێ : نیوەشەوی
محی‌دین چوارگاو قەرە دەنگی بلندکا بو قەزاز

جار بەجار بەگزیکەوە هەستی لە پەردەی تاهری
یا رەکەی عاشق کوژەو مەعشوقەکەی دوشمن نەواز

لە پاشا دیلێت « باربود » و « ئەیاز » و « نەکیسا » ئەکا بەگاو گەردونی ئەمانە ، ئەلێ دیواخانی وا گەرم « جەمشید » ئەبێ بێ بە تاپێ وانی ، کەوابێ صوفی‌و شیخ‌و زاهد نابێ بێنە ژورەوە ، هەزارانەلباز نەشیان ئەبێتەوە !.
ئاخری شعرەکانی بەوە دیلێت ئەلێ :

وەنیە کوردی مائلی ئەو نەوعە ئەتوارانە بێ
لازمە شاعر لەهەر نەوعی بلێ بو ئیمتیاز

تەماشا ئەکەی کوردی لەو شعرانەدا وینەیەکی بەزم و ئاهەنگی ئەو روژەی مولەیانی و کوردەواری ئەگیرێتەوە ؛ بەکە بەکە ناوی گوێندەکان دینی لەگەل ئەو گورانیانەدا کە ئەو سەر دەمە باو بوون . لە پاشیشا نەفسیەتی خوی بە تەواوی دەر ئەبرری .

ئیمە لیرەدا ئەبی بکەوینە سەر ئەو باوەرە کە ئەگەر سوزی عەشقی کوردی نەبوایە نەمان ئەتوانی ئاگادار بین بەسەر نقام و موزیقاو چونیەتی ئاهەنگی زیاتر لە سەد سال لەمەوپیشتر لە کوردەواریدا ، کە ئیمروژ ئەم ناحیەیە پایەکی زلی هەیە لە ژیانی کومەلایەتیدا . . دیسان ئەبی ئەوەش بزانین کە لە سەدەکانی رابوردودا کورد لەگەلی شندا شان بەشانی قەومەکانی تر روەیشتون ...

سوزی قەومیەت لە مصطفی بەگدا کردویەتە کاری کە ناوی شعری بکا بە « کوردی » . لە تاران ناو و نیشانی خوی ئەکا بەم نیوە شعرە : « احمده جدو پدر محمود ونامم مصطفی است » و ئەبخانە سەر نقیمی ئەنگوستیلەکەی بو مور ..

لەو شعرانەدا کە لە ولاتی ئیران وتونی غەزەلیاتیکی زوری بە زمانی فارسی هەیە بەلام دەستا و دەست کەوتوە کو نەکراونەتەوە . دیوانیکی کەی بە زمانی کوردی لەلایەن « کوردی مەریوانیەوە » لە چاپخانەی « دار السلام » لە بەغدا سالی ( ١٩٣١ ) بو جاری یەکەم لە چاپ دراوە ..

# حاجی کویی

## ١٨١٥ - ١٨٩٢

پیشرەوی بەرزی بنەماڵەی بورزی لە بەختی دەشتی کوی‌دا [١] ، عایانی شایەنی ترازوی روناکی و دلپاکی لە کوی ئەدا . پیری کە کو بو لە ناو ئەو شەوەی کە کویە گرتبو ، تیشکی بیو بە روژ و ترازوی خـــەیالی بە کویە گرتبو ! . پیشەنگی کاروانی شـــاعرانی نیشتمانی لەم دەورەدا ، هەمدەنگی رابەرانی خوشخوانی لەم بەردەدا . ئەستیرەیەکی گەشی میللیەت لە ئاسمانی کورد زمان ، بولبولیکی خوش ئاوازی قەومیەت لە لالەزاری کوردوستان . تاقە سواریکی پیروزی نیشتمانی لە باوەرردا ، فـەلەکزەدەیەکی دەست



---

(١) « کو » کویسنجق ، کومەل و گرد ، برره ئەستیرەیەکە . ئەم ئەستیرەی کوبە چەند ئەستیرەیەکن کە لە ئاخرو ئوخری حەزیراندا لە لای روژهەلاتەوە دەر ئەکەون . « ترازو » ترازوی شت پی کیشان ، شەش ئەستیرەشن کەلە تەموزدا بە شوین « کو » دا دەر ئەکەون ، لە هاوین و پایزدا ئەستیرەی کو ، ترازو ، گەلاویژ و کاروانکوژە پیکەوە ئەبینرین . کاروانچی ولادیی بەم ئەستیرانە وەختی شەو و فەسلی سالی پی ئەزانن . کە « کو » ئاوابو بەرانە کیوی ئەکەونە تەگەرە . لەبەین هەمو عبارەتەکانا جناس و لەتافەتی عیلمی بەلاغە هەیە .

راستگوبی لە خاوەردا ئاشنا بووە بە بەرزي ولاتی کانی کە دوو بوە لەو مەرزە بی بیرە ، ئاشنا بووە بە باسی شیخ و زولی سەمەزبو دەوری کە تیابوە بەو بیرە خوش بیرە ئاوازی نەلی عاتفەی نەشئەیەکی ئەدا بە دل ، شورشی راویژی زیرانەی « هەلـگورد(*) » ئەخاتە گل . فیکری گلوبی کارەبا ، خەوی نەزانی لائەبا . قسەی نوورریکی بی وبنە ، لەسەردەستی نی و بی نوینەا.

شاعری بەرزی نیشتمانی ئەم شوینەمان ناوی « قادر » ی کوری احمدو دایکی « فاتمە » ی ناوە . لە سالی « ١٨١٥ » ی میلادی لە دبی « گورر قەرەج[1] » هاتوتە دنیاوە ، هەر بەمندالی باوکی مردوە ، دایکی لەبەر هەژاري و بی نەوایی هەلیگرتووە و لەبینی بو کویە . نیشانەی زیرەکی و وریایی لە ناو چەوانیـــا دیاربوە ، بە پشتیوانی ئاغەکانی کویە دایکی لە تەمەنی حەوسالیدا ئەیخاتە بەر خویندن ، لە پاشا چوەتە فەقیەتی ، دەوری سوختەیەتی لە کویە لە مزگەوتی مفتی رابواردوە ، هەر لە کویە گەلیکیشی لای مەلا احمدی هومەرگونبەتی خویندوە ، بە فەقیەتی چوەتە خوشناو ، هەولیر ،

---

(*) شاخیکە لە سەرووی روژهەلاتی لوای هەولیرو جنوبی (رایەت) لەناوچەی « روست » نزیک بە سنوری عراق و تورکیا . بەرزاییەکەی « ٤٠٠٠ » مەترە یەکێ ئەبی .

(١) « گوررقەرەج » گوندیکە بە « ٩ » میلیک کەوتوتە جنوبی روژاوای شاری کویەوە و ئیستە ویرانەیە . گوررقەرەجی ئەچنەوە سەر عەشرەتی « دەزبەندي » کە لە زەمانیکی زوەوە لە دەربەندی زەهاوەوە هاتون . ئەمانە ئیستە لە دەوروبەری کویە چوار گوندیان داگیر کردوە : « سەکانی ، سەگرتکان ، کانی لەلە ، گومەرگونبەت » تەنانەت دانیشتوی ئەم دیهاتانە ئیستەش شیوەی قسەکردنیان ئەچیتەوە سەر شیوەی دەربەندی زەهاو و لورر ، وەلەگەل هەمەوەندەکانیشا تیکلاوي بنەمالەییان هەر هەبوە .

سەردەشت ، سابلاخ ، شنو و سولەیمانی . لەگەل حاجی مەلا عبداللەی جەلیزادەدا فەقیەتیەکی بالەکایەتیشیان هەبووە وەکو لەو کاغەزەدا کە بەشعر لە ئەستەمبولەوە بوی نوسیوە و تیایاتەوە میکری و ئەلی :

بە فیکرت دێ زەمانی چوینــە بالەک
بەپێ خاوس ، نەکەوشم بو ، نەکالەک ؟!

کە خوێندنی فەقیەتی تەواو ئەکا ئەگەڕێتەوە بو کویە لەبن دەست حەمائاغاو ئاغەکانی‌تر کویەدا لەگەل حاجی مەلا عبداللە پیکەوە راپەڕیبوبرن . تا لەکوی بوە لەگەل بیرو باوەڕی شیخەکانا هەر لە چرکەپرچیدا بوە ، ئەم دەست بزیوەی کردوبەتەکاری کە ئاغەکان نەیانتوانیوە تاسەر چاوبری بکەن .

ئەمەو دیسان لەو سەردەمەدا « کەیفی » جوانرروی بە فەقیەتی لە کویە بوە لە حزگەوتی حاجی مەلا عمر ، کەیفی پارچەیەک بوە لە زیرەکی‌و زەین تیژی لەگەل حاجی قادردا ئیجگار دوستایەتیان خوش بووە . کەیفی دلخوازیکی بوە لە کویە ناوی « هەبیەتی » ئایشوکی بووە ، سەرو سەودای کەیفی و ئایشوکی لە هەمو کویەدا بلاو بوبوەوە ، ئەمە توزی ناوی کەیفی زرنگاندبو . دیسان کەیفی لەگەل شیخ رەزای تالەبانی‌دا بەینیان تیکئەچی و لەرقی شیخ رەزا کەیفی زەمی ئاغەکانی کویە ئەکا . ئەم دوکردەوەیە ئەکەنەکاری کە جیگەی پی لیژ ئەبی و ئیتر ناتوانی لە کویە دانیشی ، شەو لە ناویکدا دەشت ئەگریتەبەرو بە جوریکی ناخوشی کویە بەجی دیلی‌و ئەچی بو هەولیر ! . ئەم نەمانەی کەیفی بەم جورە کاریکی زور ئەکاتە سەر دلی حاجی قادر . لەبەر کردەوەی پیشویش ئیتر ئەویش کویە بەجی دیلی و ئەچی بە شوین کەیفی‌دا لە هەولیر ئەیگریتەوە ، لەویوە لە پاش ماوەیەک پیکەوە بەجوتــە ئەکەونە دولی خوشناوەتی و ئەچنــە رواندز ، بائەدەنەوە بو ناو عەشرەتی حەیدەرانی لە تورکیا و لە « ١٨٥٤ » دا ئەچن بو ئەستەمبول و ئەکەونە بەنای بەدرخانیەکانەوە ، کەیفی‌یاز خستوتە حقوقی و

حاجی قادریش بووه به ماموستای کورره‌کانی به‌درخان پاشا . ئیتر له‌گه‌ل روژگاردا له په‌نجه بازی‌دا بووه تا سالی « ١٨٩٢ » له ته‌مه‌نی «٧٧» سالی‌دا هه‌ر له ئه‌سته‌مبول کوچی دوایی ئه‌کا و له گورستانی « قه‌ره‌جه احمد » ـ له به‌ری « ئوسکودار » ـ دا ئه‌نیژریت و له گه‌ل « نالی » دا ئه‌بن به دونه‌مای هه‌لبرروکاوی کورد له ویدا[1] ...

حاجی کویی پیاویکی به‌ژنو بالا ناونجی ، به‌رازلوت و چاو گه‌وره و گه‌نم ره‌نگ بووه ، له قسه کردندا خیرا بووه ، تا تورره نه‌بوبیت زور که‌یف خوش و قسه خوت بووه ، له‌سه‌ر شتی هیچه تورره ئه‌بو و زور زویش هیدی ئه‌بووه‌وه تا مه‌رده‌وه ژنی نه‌هیناوه وکه سیشی له شوین به‌جی نه‌ماوه وه‌کو خوی ئه‌لی :

هه‌ر منم ئیسته وارثی عیسا    بی ژن و مال و بی کوررو ملوا

حاجی و کویه ، قادر و حج

ئایا حاجی کویی بووه ؟ . ئایا قادر حجی کردوه ؟ ..

به‌لی حاجی هه‌رچه‌نده له دیی « گورر قه‌ره‌ج » هاتو ته دنیاوه به‌لام هه‌ر له کویه گه‌وره بوه‌و گورر قه‌ره‌جیش له دیهاته کانی کویه . دیسان ره‌وشتیکی کورده‌واري هه‌یه ، کورد که له‌ولاتی خوی دور که‌وته‌وه‌و که‌وته شوینیکی تر که لیان پرسی خه‌لکی کویت؟ نسبه‌تی خوی ئه‌دا به شارکه با ، له راستیشدا خه‌لکی ناو شار نه‌بی . ئه‌گه‌ر هاتو ئه‌و کابرایه خه‌لکی گوندیک بو له‌و به‌رری سنوری سنه یا سوله‌یمانی یا کویه له وه‌لاما ئه‌لی : سنه‌یی ، یا سوله‌یمانی ، یا کویم . ئه‌مه‌ش بویه وا ئه‌لی چونکه له‌و ولاته دوره‌ده‌سته‌دا

---

(١) بو ئه‌م چونیه‌تی ژیانی حاجیه سالی « ١٩٤٧ » به تایبه‌تی چوم بو کویه . ئـــه‌وی له‌وی ده‌ستم که‌وت هینامه‌وه . دوستیکیشم جو بو ئه‌سته‌مبول ژیان و مردنه‌که‌ی ئه‌و یشی بو ناردم .

پیرەمێرد دبنی باسی جوانی دوستە خوشەویستەکەی ئەکا ـ کە لەسەر ریی و شوینی شاعران گلەیی لە دوستیان ئەکەن بو ئەوە جی خویان لە گوشەی دلیانا بکەنەوە ـ جا ئایا ؟ ئەم دوستەی راستە ، دوستیکی تایبەتی بووەو بەپرشنگی روانینەکەی بروسکەیەکی ئاقاری دلی ئەم کردوە و لە کورەی عەشقا سوتا ـ نوبەتی و وای لی ئەکا بیخاتە سەر ئەو باوەرە کە بلیت : تەنانەت لە بەهارانا کە گولیش لەژیر خاکەوە سەر دینیتە دەرەوە لەناو بەروکە سپیەکەی یارمەوەیە کە بە ، رو زەردی و دەم کراوەیی دەردین ، گویا وەکو سنگیان پارچە پارچە کرابی ! ... دیسان بەمەش وازنایەنی ئەلی : ئەو چاوە جوانەی ئیشیکی وای لی کردم کە سەیرم کرد تواندمیەوە ، تەنانەت نەوەک هەر لەشەکەم بەلکو خوینە کەشم رەنگی بزرکاو بو بە رونی بادام ! . ئەم یارە ئەوەندەی کار تی کردم ئەگەر بە ریی کەوت لەسەر بە ردیک گریابم و بەردەکەیان شکاندبێ کارەساتی عەشقی من ئیشیکی وای کردوە ناو بەردەکەی پرر کردوە لە گولاو ! ...

وەکو وتمان ئەم دوستەی دوستیکی تایبەتیە کە خەیالی خالەکانی کاریکی وای کردوە دلی هەلکرو زاندوەو دوکەلی دلەکەی کەوتە ئاسمان و کردویە بە تەم ومژ ؟ . یا هەر ویستویەتی لە غەرامیک بدویت کە هەمو چاو کالیک دلی راپسکینی ؟ . هەر کام لەمانە بی خو ئەو ئەلی :

خەیالی خالی هەرگا بی بە دلما دوکەلی نالەم :
وەها رەش دا دەگیرسی ، تەم ئەخاتە سەر سەری عالەم !

لەژیر برژانگەوە پرشنگی چاوی وا بریسکەی دا
وتم سەیالەی بەرقە ؛ لە هەوری رەش بووە پەیدا !

بەهاران گول لەژیر خاکا کە زیندو ئەبنەوە و ئەررویین
لە عەشقی ئەو بەروکە سپیە ، زەردو سینە چاک دەردین !

نگای ئەو چاوە بادامیە وەهای کارکردە سەر اعضام
هەمو خوینی لەشم یەکسەر بەجاری بون بە رون بادام !
بەیادی روی گولی ، چاوم لەسەر بەردی کە گریابی
کە بەردیان کرد بە شوشە پرر گولاوە ، عەشق ئەبی وابی !..

بەلی ئەم بررە شعرە کە پیاو هەروا لە روالەتا سەیری ئەکا پارچەیەکە لە غەرامیاتی شاعرە کونەکان ، بەلام کە بە پوختی لی ورد ئەبیتەوە لی پەشیمان ئەبیتەوە و ئەلیت : ئەمە نمونەیەکە لە بیری فەلسەفەی پیرەمیرد . بە تایبەتی لە شعری سیەم و پینجەمدا هومای خەیالی لەو ئاسکانەدا ـ ئاسمانی فەلسەفە ـ هەروا ئەتوانی بال بدا بە یەکا ، چونکە :

لە زیندو بونەوەی گول ، نەفەوتانی مادّەمان پیشان ئەدا و لە گریانی بەسەر بەرد دا ، فیکرە قولەکەی ئەفلاتون دەر ئەبرری کە ئەلی : « ئەگەر گولیکی جوان ، یا ئینسانیکی جوانت خوش ویست ئەوە لە حەقیقەتدا فیکرەی خوشویستنی جوانیەکت لەسەردایە کە لە ئینسانەکە ، یا گولەکەدا تەمسیلی کردوە . » . . ئەمیش هەرچەندە لە روالەتا بەسەر بەردا گریاوە و بەردیکی رەق وتەق کردوە بە مظهری جەمال ، بەلام لە راستیدا فیکرەی جوانی و جەمالیکی مەبەست بوە کە لە بەردەکەدا تەمسیلی کردوە . ئەمەش راستە چونکە بە دوپایە ئەگانەوە بە مەبەستی ئەسلی ؛ یەکی لە گول ، زانی جوانی مەبەستە ، یەکی بونی گولەکەی ناوە بە بەردەکەوە ! . ئەم ئاهو نالەی ئەمە بەسەر بەردەکەدا بە تەواوی مەبەستەکەی ئەفلاتون دەر ئەبرری ...

لە پاش ئەمە پیرەمیرد دەوریکی تری هەیە کە فەلسەفەی زمان ومەعنای کوردی دەر ئەبرری، لەم پارچە شعرانەی خوارەوەیدا ئەو بیرو باوەررەی خوی‌مان پیشان ئەدا کە ئەلی :

ئەبی بەخشندە مل کەچ کا لەراستی موجە خوری خوی
سوراحی بو پیالە سەر فرو دینی کە ، نی کا بوی

که ئاو داری لەسەر سەر گرتوە ئەمزانی چی تیایە
لەلای نەنگە کە پەروەردەی نقوم کا ، گەورەیی وایە !
لێی شوورری درەخت میوەی ئەخون بی ئەرکی پەردودار
پەلی بەرد بو پەلی بەرزە ، لەقەیشە بو لێی بەردار
لە دەردی دوریا بیزارو بیزراوم ئەمەند زارم
ئەجەل دی بمکوژی چیبکەم ناسەم ملوم ؟ !
لەبەر ئاشوبی خیلم هیچ شەوی خەو نایەتە چاوم
خەوی ناخوش ئەبینم بەم پەریشانی خاویە خاوم !
ئومیدی سەر لەسەر دەرگی ئەوانەی راستو روتا کن
قەلەم هەر سەر قەلەم ، موم بو مەقست ، هەر بو ئەوەیش چا کن !
ئەلین مورغی سولەیمان ئاو لەژیر خا کا ئەبینی شەو
منیش حەوساله ریی دوری بەچاوی دل ئەبینم ئەو !

ئەم شعرانەی پیرەمیرد فیکریکی وردی تیایانا خەرج کردوەو بە جناسو تشبیهی نایاب رازاندونیەوە . بەلی ئەوەش ئەلین کە ئەم فیکرە لە ئەدەبیاتی شعری فارسی‌دا هەیە و پیش کەوتوە ، بەلام بەرامبەر بە میژوی ئەدەبی کوردی دیسان‌خالی نین لە جەمالی‌جوانی، لە وتەدا ولە نازکی خەیالو مەعنادا . جا ئەم نازکی مەعنایە یا لە فارسی‌شدا بی بەلانی کەمەوە خو ئەوەندە بە ئیمە پیشان ئەدا کە زمانی کوردی ئەوەی لە باردا هەیە مەعنایەکی وا قول و بەرز بگریتە خوی ، مەعنایەکی وەها کە ئەلی :

تەبیعەت بەخشندەی ئازاد کردوە لەوە کە بەرزی پیشان بدا و خوی بە زیاد بزانی ، نابینی سوراحی لەگەل ئەوەش کە ئەو شەراب ئەدا بە پیالە کەچی بە مهرەبانیەکەوە سەری بو شورر ئەکاتەوەو بەشی ئەدا ! . . هەر وەها سەیرکەی دار ئەکەویتە سەرئاوو نقوم نابیت ! . ئایا ئەوە نازانی لەبەر چیە ؟ . لەبەر ئەوەیە کە ئاو وا ئەزانی «دار» لە پەروەردە کراوی خویەتی ،

بەلایەوە زور تەنگە ژیر دەستی خوی لە مەعنەویاتا بخاتە ژیر خویەوە . .
هەر کە بەراستی بزوتەوە و ریی چەوتی نەگرت توشی هیچ نایە ، کە لای‌دا
بەناچاری ئەبی بهینریتەوە سەر ریی راست ؛ داری کە بەلەکەی بەرز بوو
دەست نەیگەیشتی بە ناچاری ئەبی بەردی تی گیری بو ئەوە بەرەکەی بدا
بە دەستەوە ، وەکو چون لقەکەی ئەگەر ملی رانەکیشا ئەویش ئەبی لقەی
پیامالی تابەرەکەی بەربداتەوە . . جا ئەمانە ئەگەر ریگەی راستیان
بگرتایەت‌وجەموشی‌یان نەکردایە،نە بەلەکە بەردی ئەخوارد نە،لقەکەش لقە.
بەلام لێ‌شورر لەبەرئەوە ئەوەندە لوت بەرزي نانوینی‌میوەکەی خوی ئەدا
بە دەستەوە ، ئیتر نەبەردی تی ئەگیری وە نە توشی تی هەلدانیش ئەبی . ئەم
شعرە بەرزتر دەرزیکی ئەخلاقیەکە دایئەدا. (بەل) بەلای زل ئەو کوچکەیە
کە فرری ئەدری بو شتیک . (بەل) بەلاي بچوک لەم شوینەدا لێ داره .
شعری شەشەم ئەلی : ئەوانەی راست و روناکن و ئەیانەوی خزمەت بە
کومەلەی ئادەمیزاد بکەن تەنانەت نابی بە تەنگ سەری خویشیانەوە بن ؛
نابینی قەلەم ـ قەلەی نوسین ـ هەمو دەم هەر سەرەکەی قەلەم کراوە ؛ واتە
قرتینراوە . مومیش ـ شەم ـ هەر سەری بو مەقەست شورر ئەکاتەوە بو
ئەوە ببیررن . ئەویان تا سەری خوی‌نەدا بە قرتاندن نایەتە نوسین،ئەمیشیان
تا ســەری خوی نەدا بەبررین روناکي نادا . . « مورغی سولەیمان » پەپو
سلیمانەیە. دیارە ئەوجناسانەش کە لەم بررە شعرەداهەیە هەمومان لەبەرچاوە .



پیرەمیرە لە پاش ئەمانە دیتە سەر باسی دیعەنی تەبیعی ؛ بەو جورەکە، بشی
خەیالی شاعریک باسی هەوارگەی نازداریک ، یا چەشمەزاری چیمەن و
روباریک، یا بە کوردی دەستکردی کردگاریک بکا ، بە شیوەیەکی رەوان‌و
بە تەبعیکی رەوانتر لە ئاوی‌سیروان، بو ئەوە بی بە نمونەی شعری بی گری لە
زمانی کوردان ، باسی دیعەنی تانگەی «زەلم» ئەکاو ئەلی :

ئاوە جوانەکەی سەرچاوەکەی زەلم بوکەلا ریزان سەر بە تەم و هەلم
ئەلی سەرچاوەی بەختی کوردانی سرەوتت نیە ویلی هەردانی !
تافگەکەت سەربەرز ، سازدە وەک تەرزە
دانەی مرواری لەنجەی سەد تەرزە
لەو ئاسمانەوە ئەررژیتە خواری لە چاوی گەردون فرمیسک ئەباری
وینەی عاشق ، کە نالەکار بی سەحرا نەومرد بی ، بەمجوری یار بی
ویل و سەرەرو ، بە رو روی پرر دەرد
بە قەلبەزەوە سەر ئەدەی لە بەرد
دەست لە ملانی لەگەل « تانجەرو[1] »
بە سەودای « سیروان[2] » شەیداو رەنجەرو
لە«دواوان[3]»دا کە یەک ئەگەوی دو مصرەعی بو ؛ بەیتی مەولەوی :
( سیروانی ئەم چەم ، تانجەروی ئەو چەم
بدەن بە یەکدا ئەم چەم تا ئەو چەم )
مەوەستە بررو بە لم و خاکا بگری لە بارگەی سەلمانی پاکا
پی بلی : قوربان تو ئاوت پاکە بەسانجەرە ریی یەکیەتی و چاکە
لەبەر ئاودیری ئەو خاکە دیە کە پاراو ئەبی بە ئاوی ئیمە

---

( ١ ) سەرچاوەی تانجەرو « سەر چنار »ە کەبە ( ٧ ) کیلومەترەیەک لە روژاوای شاری سولەیمانیەوەیە . ( ٢ ) روباری سیروان لە روخانەکانی : گاوەرو ، قشلاخ ، ئاوی مەریوان ، روباری لیلە و ئاوی هەواسان پیک دیت کە ئەمانە کەوتونەتە بەشی ناوەراستی کوردوستانی ئیرانەوە . ( ٣ ) دواوان شوینیکە بە (١٨) کیلومەترییەک لە روژاوای هەلەبجەوە یەکە ئاوی زەلم و تانجەرو ئەررژینە یەک . سەرچاوەی «زەلم» بە (٢٠) کیلومەترییەک کەوتوتە شیمالی روژەلاتی هەلەبجەوە .

با گوڵ و نێرگس هەردو پێکەوە   شادبن بەدڵی ڕێک و پێکەوە .

مێژوی ئەدەبی کوردی کە ئەم شعرانەی پیرەمێرد ئەبینی ئەوەی بو دەر ئەکەوی کە پیرەمێرد شورشێکی خستە ماڵەی ئەدەبی کوردیەوە ؛ شورشی ئەوەی هێنایە ناوەوە ڕچەی شکاند بو ئەوە کە شعر بو جوانی عبارەت دانەنراوە ، بەلکو شعر دەرد و ئازار ، یا خوشی و ئیشی بازارر پیشان ئەدا ئەبی لە عبارەتێکی سادەی وەهادابی کە ناو بازارریش لی تی بگا ، هات بە بی ئەوە خوی عەزیەت بدا ئەم ڕیچکەیە گرت و ئەم ڕچەیە شکاند ، دەستی دا بە دانانی شعری ڕەوانی وەهاوە کە هێزی مەعنای گەلی لە جاران بەپێزتربی.

شعرەکانی « لامارتین » هیچ گری و قورتیان تیا نیە . لامارتینی فەرەنسی « ١٧٩٠ ـ ١٨٦٩ » بە دوسال لەپیش ئەوەدا کە لە دنیا دەرچی و ماڵاوایی بە ئەدەبی فەرەنسی بکا « پیرەمێرد »ی کوردی « ١٨٦٧ ـ ١٩٥٠ » لە کوردەواریدا بەجی هێشت بو ئەوە ئەو شورشـــە ئەو لە فەرەنسەدا هەلیگرساند ئەمیش لە کوردەواریدا هەلیگیرسینی ! ...



پیرەمێرد ئـــەم پەردەیەش دا ئەدانەوە ، پەردەیەکی نیشتمانی لە شیوەی کوردیەکی پەنیدا هەلئەدانەوەو ئەلی :

ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشینەوە بە شەو
وەکو من بەداخەوەن، نەسرەوتیان هەیە ، نە خەو
چـــەند ساڵە ئاشنای شەوی بیداری یەکترین
وەکو سەرسەری بن، شەوی سەری ناکەینە سەر سەرین !
من خوار و زور لە دەستچوەکەی بیولەت ئەوان
وەکو خێلی خوارو زور کەری کورد ، ویلی ئاکان !
شەو ، شەونمی ئەوانە چیمەن ئاو ئەخواتەوە
ڕوژ هەلی ئاوی چاوی منە هەریەخانەوە !

دویشەو بەری بەیان بو ، دەگریان بەسەر منا
منیان کەساس ئەبینی لە ناو دوست و دوژمنا
دلسوزی وام نەدبو ، کە بوم بگری وەکە خەشیم
فرمیسکەکەی ئەوان بو ، بە ئاونگی نی ئەیم
« با » م راسپارد بلی کە خەفەت بو چ ئەخون ئەوان ؟
وەکە ئیمە نین ، نزیکتری لای بارەگای خودان !
راسپیریان نوسیبو بە شەونم لەسەر گیا
تا ئاسمان پریشکی بەدی ئیوە هەلپژا !
هاواری کوردەکانی سەروو گەیبە ئاسمان
بەو دوکەلی هەناسەیە ئاو دیی لە چاومان !

ئایا ؟ ئەگونجی بوتری : تا ئیستە شت لەمە جوانترو بەرزترو خاوینتر کەوتوتە زمانی کردیەوە ؟ . بەراستی ئەم پارچە شعرەی پیرەمیرد ئەستیرەیەکی پرشنگدارە لە ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردیدا وە تاریخی ئەدەبی کوردی ئەتوانی لە گانگای دلیەوە شانازی بەم پارچە شعرەوە بکا . .

پیرەمیرد شابازی خەیالی هیلانەکەی بەجی دیلیت، بەرز ئەبیتەوە لە ئاسمانی سەرخوشانی نیشتمانپەرەرانەوە ئەسوڕریتەوە ، وەکو باکی نەبی ، نە لە کورەی ئاگرینی تەبەقەکانی فەزا ، نە لە تەنورەی توف و سەرمای بورجی هەوا ، ئاشنا ئەبی بە ئاشنایانی میللیەت و دەمارەکانی تیراو ئەبی لە سەرچاوەی قەومیەت،لە کاتیکا کە قەتارەی شەهیدەکان ئەبینی، وا رەنگی خوینی سوریان لە سەر بەفری سپی خاکی نیشتمان هاراری دایکی وەتەن ئەکا تا بە ئاسمان ، لەنیکەر ئەخاو پرر بە دەم بانگ هەلئەداو ئەلی :

هاتن شەهیدەکان بەجلی سوری خوینەوە
دایکی وەتەن، دە هەلسە سلاویان بسینەوە

شیخ قادره له پیشەوه سەرقافلەی ئەوان
چەند جوانه؟ خوین و ریشی سپی، پیرو نەوجوان!
مەیری ئەمانەکە، کە هەمو کوردی سەف شکێن
روحیان فدا ئەکرد و ئەیانوت بژی وەتەن
قوربانی تون به ریزه، کەتو غەم لەبەر نەبی
بو ئیمه مردنه ئەگەر ئازاده سەر نەبی
مەکری و مەناله با، بەخەفەت دل شکست نەبن
نەختی ئەلات ئەمیننەوه و بو بەهشت ئەچن!
تو خوا له بانی ئیمه به چاوێکی رونەوه
نەرمو که خوا ئەزانی له بیرمان نەچونەوه
ئاخو له فرسەنیکی‌ترا بەختیار ئەبین
ئیمەش وەکو ئەوان له دلی میللەتا نژبن؟
من وام ئەوی که حەشر ئەکریم خوین به بەرگەوه
بەو عەشقی میللیەو بەگرەی سوزی جەرگەوه
ئەو ئاگرەی له دلمەوه بەربیته کفنەکەم
تا دوژمنم نەکا به زوخال، شەرته پفی نەکە!

میژوی ئەدەبی کوردی که ئەم شعرانەی بەم هیزو پیزەوه بەرچاو ئەکەوی به بی اختیار و بەبی دو دلی چاری نامینی ئەلی، پیرەمیرد له باسی شعری نیشتمانی و لاواندنەوەی نیشتمانیەوه پیغەمبەری ئەو مەیدانەی سەدەی بیستەمی کوردە و له لایەرەی عەنعەناتی ئەدەبیاتا وینەیەکە له باروی بە شکوی ئەو نیگارستانه، بویەش وایه چونکه دەری ئەخا، که لاپەرەیەکی به تیشکه بو بەرچاوی ئەو کەسانه، یا ئەو بیگانانه که، ئەلین ئەدەبیاتی کوردی وەکو ئەهرامەکانی میسر وایه گورانی به سەردا نایه!..
لام وایه ئەگەر به چاوێکی بیلایەنگرەوه سەیری ئەدەبیاتی کورد و

غەیری کورد بکەین ئەکەوینە ســـەر ئەو باوەرەڕەکە بلێن لە چاو خویا ئەدەبیاتی ئەم قەوم وەکو ئەدەبی قەومی کورد بەرەو پێشەوە هەنگاوی ناوە ، بویەش وا ئەلێن چونــکە ئەو دەورانە کە لە بەرەبەیانی تاریخەوە کورد تا ئیمروژ بینیونی ئەگەرهەر قەومیکی تر بیبینیایە تا ئیستە ئیسکو پروسکیشی نەمابو ا ...

* * *

پیرەمیرد وەکوچون ئەم شاعرە بەرزەبووە، لە لایەن نوسینی ئەدەبیشەوە یەکیکە لە ئەدیبە هەرە گەورەکانی کورد لە دەوری خویا ، هەر وەها ناقە روژنامەچیەکی کوردیش بووە ، کە « ٣٦ » سال قەلەم و فیکری لە ئاسمانی کوردەواریدا هەمو جورە نەخشەیەکی کیشاوە ، بیجگە لەمە ، کە خوی بە خوی تاریخیک بو، بو میللەتی کورد نوسینەکانی لە بابەت حقوق‌وادارەو کومەلایەتی ، ئابوری و تاریخ و ئەشخاص گەلی جاری وا ئەبو شورشیکی ئەخستە بیرو باوەرری ــکومەلەوە ، لاپەرەی روژنامەکانیو و بەینی دو بەرگەی گوڤاری گەلاویژ ئەم شاهدیەی بو ئەدەن . .

ئەمێ پیرەمیردە یاسایەکی بو خوی دانابو ناوی نابو « پەندی پیشینان » . لیرەدا « ضرب المثل کوردی » یا ، قسەی پیشینانی ئەهیناو هەریەکە بە جوریکی رەوان ئەیکردن بە شعریکو بەرە بەرە لە روژنامەکەیا بلاوی ئەکردەوە ، ژمارەی ئەم شعرانەی پەندی پیشینانە گەیشتنە «٦٤٤٨» شعر بەراستی ئەم ایشەی بلیمەتیەکی لە پیرەمیرددا پیشان ئەدا ، چونــکە بیجگە لە فەنی ئەدەبی مێژوی رەوشت و ئادابی « ١٨ » سال ولاتی سولەیــــمانی پیشان ئەدا ، کە ئەمە بو تاریخی ئەدەبکانیکی ئالتونە و گوشەیەکی ئەقلیەتی کومەل دەر ئەبری .

پیرەمیرد لەبن دەست ئەدەب و شعرەکەیەوە دلی لی‌ئەدا بو هەندی‌شتی‌تر

وەکو داتان و خزمەت کردنی بە قوتابخانەی «زانستی[1]» لە سولەیمانی ، خانە خانەدانی ژنان و کچان بو خویندەواری و داتانی کومەلە بویان ، شیفتە ـ بونی بە نەو روزو بە هەلمەتانی جەژنی نەوروز ، چونکە بە جەژنیکی قەومی قەومی کوردی ئەزانی ..

پیرەمیرد ، بو کو کردنەوەی شعرو نوسینەکانی خوی زور شل و شیواو بووە ، کەچی بە پیچەوانەی ئەمە بو کوکردنەوەو پیشاندانی شعرو ئەدەبیاتی شاعرەکانی تری کورد زور توندو تول بووە . وەکو ئەوە ، هیناویە دیوانی شاعری گەورەی کورد «مەولەوی» کو کردەوەو شعر بە شعر خستویەتە سەر شیوەی سولەیمانی لە دو بەرگا ، لە ١٩٣٥ لە چاپی‌داوە . سەر گوزەشتی «مەم و زین» ی شاعری میللی «احمدی خانی» لە شیوەی بوتانەوە کردویە بە روایەت و لە سالی «١٩٣٥» لە چاپی داوە ... چیروکی دوانزە سوارەی مەریوان و روایەتی محمود اغای شیوەکەل ـ کەدو حەقایەتی راستی و دو داستانی قەومی کوردن ـ مزادەی فیکری خوی نوسیونی و یەکەمیان لە سالی «١٩٣٥» و دوهەمیانی لە سالی «١٩٤٢» لە چاپی‌دان ... هەندی سەرگوزەشت و پەندی کورت کورتی کوردی کو کردەوەو لە ژیر ناوی «گالتەو گەپ» دا لە سالی «١٩٤٧» لە چاپی داوە ... روایەتیکی ئەلەمانی لە

---

(١) «زانستی» قوتابخانەیەک بووە لە شوباتی «١٩٢٦» دا بە سەروکی ، احمد بەگی توفیق بەگ لە سولەیمانی دروستکراوە ، نەخویندەواران بە شەو ئەچون دەرزیان تیایا ئەخویند ، لە «١٩٣٣» دا پیرەمیرد بو بە سەروکی ، پولەکانی تا شەش چون ، خویندن و پروگرامی وەکو هی معارف بو ، دبلومیشی هەر وەکو دبلومی معارف بووە ، لە «١٩٣٨» دا داخرا . لە پیناوی ئەم قوتابخانەیە گەلی شاعرو خویندەوار لە شاری سولەیمانیدا پی گەیشت .

ژیر ناوی « کەمانچەژەن » دا ـ کە کرابو بە تورکی ـ ئەم هیناىو کردی بە کوردیو لە ســـالی « ١٩٤٢ » لە چاپی داوە . چاپخانەی ئەم هەمو چاپکراوانەی چاپخانەکەی خوی بو ، کە چاپخانەی « ژین »ە .

تەماشا ئەکەی بەم جورە شتانەی ، پیرەمیر سـەر باری هیزی شعرو ئەدەبەکەی خوی لە جوشی پیری‌دا ئەدەبی کوردی جوان کردەوە . . کەچی دیوانیکی بەرزو بالای خوی هەیە هیشتا لە چاپ نەدراوە ...



# حەمدی

## ١٨٧٦ - ١٩٣٦

قارەمانی سپەی مەیدانی شعر لە بەرەبابی صاحبقران ، پاسەوانی بە خەی خەرمانی ئەدەب لەم دەورەی دوایی کوردان . پابەندی وردی مەعنا بە هەمو هێزیکیەوە ، دلبەندی پێزی قسە بەهەمو تینیکیەوە مەفتون بە فیکری فەلسەفە لە هەمو باسو خواسیکیا ، تەشبیهـــەپەرست و خـەیال دروست لە هەمو کارو باریکیا . پەستی زەمانە هەمو دەم هاورازی روژ وشەوی بو ، بویە گولوکی زەوقی کە دەپشکوت بونی کزەی دەرونی شەی بوا . دەنگی لە زەنگی کلیسە بە نرکەتر بووە بو ئاو و خاکەکەی ، هوشی لە شاپەرری بالی شـــەهینا بە هاژەتر بووە بو هوزو قەومەکەی . دلی بە شعری گەلی خوش بووە چونکە إمیژویە ، نەمامی نەورەسی فیکرە و بە ئاوی دیدە ناشتویە !



شاعری بە دیەنی ئەم باسە ناوی «احمد» و کورری فتاح بەگی ئەرازی یە . فتاح بەگ کورری حاجی برایم بەگی محمود بەگی صاحبقرانە . ئەم «احمد»ە برازازای «کوردی» و ئاموزازازای «سالم» بووە ، بەدو زا ئەگاتەوە بە کوردی و بە سە زا بە سالم . لە سالی ( ١٨٧٦ )ی میلادی لە شاری سولەیمانی هاتوتە دنیاوە هەرچەندە کە لە کتیبی « شعرو ئەدەبیاتی کوردی »

ماموستا رفیق حلمی‌دا ئەلیت لە (١٢٩٥)ی هجری هاتوتە دنیاوە بەلام من لە پاش ئەوە کە دیوانەکەیم خویندەوە شعریکی خویم دەست کەوت کە باسی هاتنە دنیای خوی ئەکا لە (١٢٩٣)ی هجریدا . دیارە ئەمە زورتر ئەچیتە دلەوە بویە بەم جورەم دانا . شعرەکە ئەلی :

گەررام بو ســـالی تأریخی ولادتم و غـــەریبم دی
بە هجری حەمدی دەنگی بوءلە نەو «باری‌غمم» دەست کەوت

«باری غمم» تأریخی هاتنە دنیاکەیەتی ، کە ئەکاتە (١٢٩٣)ی هجری وە (١٨٧٦)ی میلادی .

بنەمالەی صاحبقران پابەندی خویندەواری بوون، وەکو چون دەربەندی شاعری بوون . لە تەمەنی هەشت سالی‌دا فتاح بەگ احمدی کوری ئەخاتە قوتابخانەی مەلا عەزیزی زەنزەنەی لە سولەیمانی ، قرآن وکتیبە وردەلەکانی لەوی خویندوە ، لە پاشا ئەچیتە حوجرەی مەلا سعید ـ خواجەفەنی ـ لە مزگەوتی عەزیزاغا مزگەوتی ناوبازارر ، ئینجا چوتە مەکتەبی ابتدائی تا گەیشتوتە پولی یەکەمی رشدیە ، بو خویندنی‌عەرەبی و دینیش هاتو چوی مزگەوتەکانی سولەیمانی کردوە ، بە تایبەتی لە خانەقای مەحوی‌دا گەلیکی خویندوە ،ئیتر لەپاش‌ئەمانە دەستی‌لەخویندن‌هەلگرتوە . لە زەمانی تورکەکانا هاتو چوی‌ئیرانی کردوە، جاریکیش چوتە تەوریز، لە دەوری حکومەتی عراقیشدا کاروانی بەغدای بووە، کە ئنگلیز عراقی گرتوە ئەم یەکیک بووە لە ئاژاوەچیەکانی‌دەوری‌شیخ‌محمودی‌شیخ‌سعید، وەبو گەیشتن‌بەبەرزبونەوەی خاکی کوردوستان لە هاتو چودا بووە ، کە شیخ محمود دیل کراوە و براوە بو هیندستان جیگەی ئەم کە زورکیوەکان بووە ئاگاکانی داوە بەخویاو زەوی کردوە بە رایەخی . کە شیخ محمود هاتەوە و حکومەتی کوردوستان دامەزرا ئەم لە ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣ بو بە رئیسی گمرک ، لە پاشا لەبەر، ریی نەکەوتن لە هەندی بیروباوەرردا ئەو میانەیەیان لەگەل شیخ‌محمود‌دا نەماو لی تەکیەوە ،

تا ئەم وەختە بەمال‌و بەگیان‌و بە زمان لە پشت شیخ محمود بو، بەلام لەم وەختە بەدواوە ئیتر نەما ! . .

لە حکومەتی عراقی هاتە پیشەوە لە (١٩٢٤) بو بە رئیسی بلدیەی سولەیمانی و نازری ئەعشاری ناوچەی سورداش ، لە (١٩٣٦) دا لەوەش وازی هینا و ئیتر توخنی هیچ جورەکارو فرمانیکی حکومەت نەکەوت، تا لە روژی (١٢)ی تشرینی دوەمی (١٩٣٦) لە تەمەنی (٦٠) سالی‌دا بەمەرگی مفاجات لە شاری سولەیمانی کوچی دوایی کرد و لە گردی سەیوان نیژراوە ئەم شعرانەی خوی لە سەر بەردی مەزارەکەی هەلکەنراوە :

حمدی خوا ئەکەم ، بەسە بو افتخاری من
دیوانیان لە مجلس ئەکەن انتظاری من

بەگ روبەرەی جوابی سؤالی مەلەک ئەدا
دیوانەکەم کفایەتە بو سەر مەزاری من !

احمد بەگ پیاویکی کەلەگەت و جوان چاک ، شوررە سوارو تفەنگچی بووە ، ناوچەوانی پان و لوتی توزی دریژو مەیلەو زل ، دو چاوی گەورەو بروکانی لیک جیابون ، دو سمیلی زورتری سپی بەدریژای دەمی و توزی زیاتریش بریان ئەکرد ، لەبنەوەپان و تا ئەهاتە دوایی هاتن باریکتر ئەبونەوە ، ریشە سپیەکەی قەلەم ئەکرد ، ریش‌وسمیلەکەی جوانیەکی تری دابو بە احمد بەگ ، گوناکانی پان بون ، دەمی گەورە نەبو ، چەناگەی خرو چالایی ژیر لیوی توزی دیاربو . زور تەرپوش بووە ، کەواو سەلتەو سوخمەی لەبەر ئەکرد ، زورتر دلی بەلای تاقەو غەزەلدا ئەچو ، مشکی‌و جامەدانەی ئەبەست بەسەرەوە ، پشتینیکی کەی ئەبەست ، تا لە دەرەوە بووە کلاشی لەپی کردوە ، لەم دواییەدا هەر کەوشی بووە،جار جاریش قوندەری لەپی کردوە ، لە قسەکردنـــدا دەنگیکی‌نیرو پیاوانەی هەبووە ، لەکاتی قسەکردندا بە جوری تی هەلئەچو پیاو بە ئاشکرا ئەیزانی

که بیر له وشه وشه‌ی ئه‌کانه وه ، وه به تام و له‌زه‌تیکه‌وه ده‌ری ئه‌بری . به تایبه‌تی که شیعره‌کانی خوی ئه‌خوینده‌وه شورشیکی تری پی ئه‌دا . ده‌ستبلاو ومیوانپه‌روه‌رو دیواخانگیر بووه ، راو وشکارو دیه‌نی ته‌بیعی زور پی خوش بووه ، له خواردنه‌وه دور نه‌بووه ، خوینی گه‌رم بو بویه توزی مه‌یلی توورره‌یی هه‌بو ، له‌ژیانا زور دلته‌نگ بو ، له‌گه‌ل ئه‌وه‌ش که پیاویکی روخوش و قسه‌خوش بووه گه‌لی جار ئه‌بینرا ده‌ستی ئه‌خسته ژیر چه‌ناگه‌ی و ئه‌که‌وته ده‌ریای خه‌یاله‌وه وه‌کو فیکر له نهینی ئه‌م گه‌ردونه بکاته‌وه ! ، بو ژیان زور به چنگ بووه .

ئه‌میلیته‌وه سه‌ر ئه‌وه ئایا چی احمد به‌گی هان دابی بو ئه‌وه بکه‌ویته کوشی شیعره‌وه ؟ . .

سه‌رچاوه‌ی ئیلهامی شعر که چاوی به‌ریزادیکه ، یا چاوه‌ی سه‌راویکه ، یا جورغی روزگاریکه ره‌نگی ئه‌مانه هیچیان نه‌بوبیتن به‌هوی بزواندنه‌وه‌ی ته‌لی دلی احمد به‌گ ، مه‌گه‌ر ئه‌مه‌ی دواییان جارجار توزی ده‌ستی تیدا بوبیت . احمد به‌گ له‌بنه‌ماله‌ی صاحبقران بو ، ئه‌و گلینه‌یه که سالم و کوردی ئاوی شعریان پی خواردبوه‌وه له تاقی زوره‌که‌ی احمد به‌گدا هه‌ر مابوه‌وه که‌وابو ئه‌میش ئه‌بوا ببوایه به شاعرا . . من نالیم شاعري میراته ، به‌لکو ئه‌لیم به‌راته، به‌لام سه‌ر چاوه‌ی له‌زه‌تی روحي ئه‌بی بته‌نیته‌وه بو وه‌چه‌ش ، جا ئه‌و وه‌جه‌یه ئه‌گه‌ر ئاماده بو بو وه‌رگرتنی وه‌ری ئه‌گری ، ئه‌گه‌ر نه‌بو نه‌أ. داریک ئاوی ئه‌ده‌ی ، ئه‌م داره گه‌لی لق لی بونه‌وه ، ئاوه‌که ته‌نها توزیک له بنیایه ، هه‌ر به‌م توزه هه‌ندی له لقه‌کان- با له‌قه‌قی داره‌که‌شه‌وه دور بن- له‌به‌ر ئه‌وه ئاماده‌ی وه‌رگرتنن خیرا له ئاوه‌که وه‌ر ئه‌گرن ، هه‌ندیکیشیان له‌به‌ر بی‌که‌لکیان - بالیشیه‌وه نزیک بن - تا دینه ئه‌وه وه‌ری بگرن ئاوه‌که وشک ئه‌بی ! ...

احمد به‌گیش به‌رامبه‌ر به «سالم» و «کوردی» ئاوا بووه چونکه ئاماده

بووه وەری گرتوە، ئیتر ئەمه ئەوه نا گەیەنی هەرچونکەئەوان شاعر بوون ئەبوایه ئەمیش بیوایه؟ ئەوا بنا غەیه کێ هەبو ئینجا نزیکێ کەوتنەوەی لەبیرو باوەرری مەحوی‌و هەلسو کەوت کردنی له دەرزخانەکەی ئەودا پالیکی پیوەنا بو پیشەوە ، ئەوەندەی پال پیوه نا، کە ئەمیش وەکوئەو بکەویتە خەیالبازي‌و فەلسەفەکاري و شوێن مەعنای رەق کەوتن .. بەلی احمد بەگ پیاویکی تصوفی نەبووه،بەلام پیاویکی وەکو فەلسەفەچی وابووه، ریچکەی شعرەکانی ئەوەمان پیشان ئەدا کە لەگەلی لاوەوە شوین پی مەحوی هەلگرتبی ! ..

ئاگری تیژتر کە کلپەی سەند،دەوری قەومیەت و نیشتمانی بو، احمد بەگ تینو بو بە بەرزي کوردوستان ، تینو بو بەوه کە پەردەی رەشی ناسوادي لەسەر دیمەنەکانی کوردوستان لا بەریت و پەردەیەکی ئالو والای جوانتری بەسەرا بدریت ، ئەو دیمەنانە کە نیشانەی بیبیلەکانی چاوی احمد بەگ بوبونو تاپوەکانیانن لەگوشەیەکی دلیا لەنگەریان خستبو ، بەجوری لەنگەریان خستبو کە لەبەر کزي ئەوان احمد بەگ بە دریژایی ژبانی کزو گوشەکەی تری دلی پەردەی ماتەمي بەسەرەوە بووه ، ماتەمیەکی وەها کە خەم و ئەندوه و کفتە کاري هاورازی دەروژوری بو ، وه لەبەر هەمویشیا ئەبوایه خوی رابگرتایه ، با ، دەردەدلیشی بکردایه هەر رازی بو بە بەش، بویه ناوی شعري کرد بە « حەمدی » ! .

ئینجا بینه سەر ئەوه قسه له هەندی له شعرەکانی «حەمدی» یەوه بکەین بو ئەوه بزانین«حەمدی» چه ریگەیەکی گرتوە؟. وه له چه جوره شاعریکێ بووه له بازارری ئەدەبیاتی کوردیدا ؟ . . .

ئیمه کە ئەمانەوی نەفسیەتی حەمدی‌مان بیتە دەست ئەو قابیانه کە ئەو ، پی تیهاویشتوه پیویستە ئیمەش یکە یکە پی تی هاوبژین و له هەر یەکەیانا چەند بەلگەیەکێ پیشان بدەین ئەو وەختە بە تەواوی بومان دەر ئەکەوی کە حەمدی یەکەجار- له نیشتمانی‌و دوهەمجار له فیکری وەکو فەلسەفەچیەکیدا

له هەمو قاپیەکانی تر زیاتر تیایانا مارەتەوە . ناهەقیشی نەبوە کە لەم دوە دا بی ، چونکە ئەو لەدەوریەکا زیاوە کە دەنگی زەنگی قەومیەت لە هەمو موچیکەوە زرنگەی ئەهات ، کوردوستان لە ناو جەوری تورکان شاخو کیوەکانی دەستیان کردبو بە گریان ! . ئەو فرمیسکە وردە وردە بو بە ئاوی نەمای تازە پی گەیشتوان ، حەمدی یەکیک بو لەوان ، کە هات و کەوتە مەیدان ، کوتوپر بە دلیکی بوریان و دەنگیکی بە گریانەوە هاتە زمان و وتی :

ئەی وەتەن ! روم و عەجەم موشتاقی کوردوستانتە
ئیفتخاری میللەتی کورد شەوکەتی عنوانتە

بەستە سەربەرزی سبەینان وشەوانت مانگ و روژ
وەک نیشانی ئیفتخاری سنگ و نەجەی شانتە

بەرق ئەداو ئەررژی وەکو ئەمواجی گەوهەر چەشمەکان
ئاوە ، یا روحی رەوانی چەشمەی حەیوانتە ؟

ئاوە ، یا نورە لە عەکسی خور ، کە ئەبریسکیتەوە ؟
ئەهلی حکمەت وا ئەزانن دوررەکانی کانتە !

گول گولی سوور و سپی ، خال خالی خاکی رەش ئەلی :
پودرەی روخسارو سورمەی رشتنی چاوانتە !

عاشقی رەنگی خەزانی تویە بویە دی بەهار
فەسلی هاوین گەرم و مەیلی بەفرەکەی زستانتە

بوچی عەنباری زەخیرەی کالنانە شارەزور ؟
شەهربازارد خوانی میوانە لەبەر میوانتە !

باسی میوەی تو دەکەم بویە قەلەم هاتوتە بەر
بەستەکانم بەستەی ئەهلی دلو عرفانتە

بو ئەمەی جاری بەسەرتا پی‌نەنیم ئەفکاری من :
یا بەسەر رویشتنە ، یا سەر بەسەر هجرانتە !

بلپە و لاگیرەی زیرینی جوانی فەوی کورد
زرر زررەو پشلینەبێ بەردینی قەد شاخانتە !
کورد « کوررە کاژاو »ی لونی وا بلند کردوتەوە
هەر وەکو شەمدینی بادین ، گارەزوی بارزانتە
گاسمانو شاخی بەرزو سەختی گەرزت دەردەخا
مالی کوردیت و گەوە دیواری حەوشەو بانتە !
« پەبکولی »تا قەسری شیرین را کشاوە پێ ، کولی
دەشتی «قەندیل»ت دربژە ، بو چراچی «وان»تە
« پیرەمەگرون » تاجی شاهانەی بەسەر بەرزی فرراند
ئەم « دەماوەند » داگری ، مەحجوبی «هەورامان»تە
خەنی دیوانی شکستەی کردو لول بەرزی شاخ
والزحە بو ســـەربەخوبی ، توررەی فەرمانتە
جار بەجار « حەمدی » گلەت کەر لی بکا ناحەق نیە
چەردە رامەگرە نەلین خەلـکی ، کە جانی جانتە !

گیمە گەگەر بە جاویکی وردبینەوە سەیری گەم شعرانە بکەبن گەگوینە سەر گەو باوەررە ، کە لەو بەرری بەرزیەوەمزو لە کوررەی دەرونیکی بەکولەوە هەلقولیوە ، چونکە بیجگە لەوە کە ناوی هەندی شوینی بەنرخی کوردوستانی بو یادگار لە لا بەررەی تاریخدا هیشتوتەوە و گوشەی دلی پێ رون گەبینەوە فیکری چە شاعریک توانیوەتی مانگ ورروژ بکا بە نیشان ؟ نەوەک هەر گەوەندە، بەلـکو بیکا بە نیشان بو سەرسنگی بەیانی وئیوارانی کیوەکانی کوردوستان ا. لەوبوە بچی ستایشی کانیاوی بکا، لە کاتیکا کە گزنگی خور لی گەداو بریسکەیەکی گالتونی لی گەبیتەوە و بەردەکانی ناویشی وەکو دوررو گەوهەری کانی گەوهەر گەدرەوشینەوە .. لە پاشـــا بیتە سەر گەوە بلی : بەهاران کە کویستانان گەچنەوەو خل خل گەبنەوە ، پەلەپە-

موورو پەلەیە رەش و پەلەیە سپی، ئەوە بودرەو موورمەی رەش و سپیە بوسەر روومەت و چاوەکانی ! . . چوار وەخت لەو خاکەدا بە چوار جور بویە دەت ؛ چونکە بەهار، کە رەنگی پاییزی خەزانت لەبینی رووەنی دارو دەونەکان شیفتەی هاتنی خوی لەکا . هەر لەبەر گەرمای هاوینە گەشتەکە بەفری زستان روومەتی کیوەکان فینک لەکاتەوە . . چەند بە تاسەوە لەلی : زلزلەو پشلینی شاخەکانتەکە کورد لەبەر خوشەویستی کردویە بە بلپەو لا گیرەی بوکەکانی و جیگەی لە هەر سەرەوە بو تەرخان کردوە ! . .

حەمدی کە لەمانە لەبیتەوە دبنی نیشانەکەی بە حـــەو پینج خشتەکی ئەلاوینیتەوەو لە یەکەمیانا سەرەتای لەکاتەوەو لەلی :

ئەی خاکی وەتەن ! بی فەرەح و زەوق و سەفا خوت
پور حادثە ، مەحکومی هەمو حوکمی قەزا خوت
بازیچەی ســـــەر پەنجەی ئەربابی ریا خوت
بی گوردو بە بی زەخمەمەی شاهو سەرا خوت
سەد ئاه ! کە بویتە هەدەفی دەردو بەلا خوت !

لە پاشا دیسان ئەیلاوینیتەوەو لەلی ئەم کوردە قووربەسەرە لەبەر جەوری ئەم و ئەو جلو بەرگی هەمو دەمی لەبی بی بە پلاس و گوینی ! . .
ئەگەر ئەمە بەری شارستانی بی، هەردە گەررو کیویەکان گەلی گەلی چاترن لەم بانگدەرانی شارستانیتیەو ، چول نیشینی زور خوشترە لەم شارلشینیە!.
هەمو میللەتیکی بەرزو نزم هەر یەکە بو خوی بو بە شلیک، ئەم کوردەنەبی. بە هوی ئەم شارستانی پەروەرانەوە روژ بە روژ هەر ئەچنەوە بە ناخی هەرزا ! ... ئینجا دیتە سەر مەنمەنات وخانەدانی رابوردوی کورد و بردە شمرەکەی بەم پینج خشتەکیە دوایی دبنی کە لەلی :

هاوسی هەمو وەکە دالن و ئەم کوردە وەکو لاکە
چنگیان لە جگەرگاهی هەمو داوە بە بی باکە

بێخوێنە گوڵی زەردو زەمینە وەکو خاشاکە
حەمدی ! دە، بپیوە قورر وسنگت بکە چاکە چاکە
بێ قەوم، وەتەن ، بێ شەرەف و پرر بە جەفا خوت !

لە پاش ئەمانە دێنی بە «٢٨» شعر هەرا بەناوبانگەکەی « ئاوباریک[1] »
ئەگێڕێتەوە کە لە سالی «١٩٣١» دا شیخ محمود بەنجا کەسی لەگەل ئەبێ ،
فەوجی سەربازو حەوسەد پولیس ئابلوقەیان ئەدەن ، ئەمیش بەم چەند
سوارەوە ئەو لەشکرە زورە تارومار ئەکا . جا ئەمە داستانێکی زور گەورەی
قەومیەو پایەی حەمدی لە مەیدانی چیروکی میژوییدا دەر ئەخاسەرەتای بە:

ئەی وەتەن لوتفاً تەواوی کە، وقوماتی میلل
ئەم مەراقە با نەکا بو ئاخری نەشری میلل

دەست پێ ئەکا و بە :

رەبی موی لی بی زبانی ، پەنجەکانی هەلوەری
هەر کەسی گولشەنی بەدمەردی گوتەنی دوزەخ بەری !

دوایی پێ دێنی . .

حەمدی زنجیرە تەرجیع بەندێکی هەیە لە دوانزە بەندە ، ئەم تەرجیع
بەندانە میژووی کارەساتی ئەودەورەیەتی کە لەگەل شیخ محمود تیکچون و
هەمو حالو هەوالی ئەو دەورەیە ئەگیڕێتەوە . لە بەندی شەشەما شعری
سیانزەهەم ئەلی :

جائزە بو میللەت و کوردایەتی بێ رەشبەلەکە
«باجی رەحە» بێقەزاییانەلێ ریکە هەلپەررین !

ئەم شعرە بیجگە لەوە ، کە لە رواڵەتا زەوقیکی ئەدەبی هەیە، فەلسەفەیەکی

---

(١) ئاوباریک گوندێکە کەوتوتە پشت «توزخورماتو» و «کفل»ەوە لە
لوای کەرکوک .

زور نازکیشی تیدا کردوته‌کار ، من لام وایه جناس و ته‌شبیهی وا ساده لەم جورە شتانەدا لە زمانی کوردیدا کەم ریی کەوتوە کە ئەوەندە وشە ئەوەند مەعنا بدا بە دەستەوە .

• • •

حەمدی پەردەی قەومیەت دائەداتەوە و ئەکەویتە ناو فەلسەفەو خەیالی چونیەتی زەمانەوە ، ئەم بررە شعرەی خوارەوەی وا پیشان ئەدەن کە بە تەواوی لە چونیەتی زەمان تی گەیشتوەو زور بە وردی یەکە یەکە دەری ئەبری و ئەلی :

ئەحوالی ئەم زەمانە لە کابەی منال ئەچی
دنیایەکی چە پوچەلە ، کە لە زەوقی بەتال ئەچی

لەم باغە ا هەر دەمە کە دەگا میوەی ئەلی :
لەم کونە گومبەزە لە دوکانی باقال ئەچی

نەقص و کەمالی ئەهلی جیهان موعتەبەر نیە
هەر دو موحقەقە کە بەدەستی زەوال ئەچی

گەه ، روژەوا ئەبی بە ئەسیری ظلامی شەو
گەه ، بەدری کاملە کە بەدەردی هیلال ئەبی

اقبال و شومی تابعی عیلم و جەهل قەت نیە
ریی کەوتە بازە ئەمرو ا سبەینی لە دال ئەچی

ئەو نەونەمامە سیبەری دوبنی لە نازی ئەکرد
ئەمرو لە ئاگرایە لە چیلکەو چەوال ئەچی ا

بی لیوە ئەم جیهانە تەماشاکە نەی ژەنی
بینایی کویرە ، افصحی دایم لە لال ئەچی

هەر نالە ، وا لە بورجی جەلالا وەکو هیلال
هەر ما هە ، وا لە کونجی مەلالا لە نال ئەچی ا

بازاڕی دەمرە قیمەتی ئەشیا بە جێگەیە
میشی گەیشتە ڕوی نگاری لە خاڵ ئەچی

دنیا هەناســەیی بێ نە چوبێو نە هاتی
حالێکە بو بەچی؟ کە لە ماڵەم بە حاڵ ئەچی

بەو عومرەوە کە بویەتی «نوح»یش وتویەتی
دنیا لە ڕحلەتا لە خــەوی بێ خەیال ئەچی

بلێی سەراوە کاکە، جیهان نی بفکرە تو
بو کەس نەبو بەمالو، نە بو کەس لەمال ئەچی

ـــو لا بدەن لە باری گرانی حقوقی خـــەڵک
بواررە هەڵگری کە لە «قەپە[1]»ی حەمال ئەچی

نەگبەتیە ئەو کەسە کە عزەتی نەفسی عروج ئەکا
شای مەلالی بویە لە ڕوژی جەلال ئەچی

بو نەفمە خوا شناسی و عبادەت ریاییە
تەقوای ئەم زەمانە بە نرخی وەبال ئەچی

زورتر لەبێنـــەوا بە مەنافع ئەکا غەنی
ئەم تا بی تنزل ئەکا، ئەو بە بال ئەچی

دەنگێکی تر ئیستە لە غەیبەوە کە هاتە گوێم
هێندە زەلالە دەنگی لە دەنگی بلال ئەچی

«الحشر» و «القیام» ئەکات و جیهان ئاخرە ئەلی:
لوقەی حەرامی ئەمرو بە نرخی حەلال ئەچی!

ئەگەر ئیمە بەراستی و دروستی ئەم بررە شەرەی حەمدی بینینە بەرچاو و تەماشای ئەو جناس و تەشبیهە و فەلسەفانە بکەین کە تیایانا خەرجی کردوە

---

(١) مەبەستی حەماڵی نەیلیە، کە لە بەغداوان.

به بی دو دلی ئه‌كوینه سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه كه حه‌مدی له باری ته‌فكیرو فه‌لسه‌فه‌دا یه‌كێكه له شاعره هه‌ره گه‌وره‌كانی كورد و ئاوی مه‌عناناسی له بادەی خه‌یالانا خواردوته‌وه . .

به‌لی له‌م شعرانه‌یدا هه‌یه كه ریچكه‌ی یه‌كیكی‌تری گرتبی ، به‌لام وه‌كو ئه‌وه هه‌یه ئه‌وه‌ش هه‌یه كه به جناس و عباره‌تیكی زور جوان باسی ئه‌وه ئه‌كا كه زه‌مانه ئیشی‌وا ئه‌كا شتی هیچو پوچی وه‌كو نال له بی نرخی‌دا ئه‌گه‌یه‌نیته ئاسمانی به‌رزی و ئه‌یكا به مانگی یه‌كشه‌وه بو ئه‌وه هه‌مو كه‌س په‌نجه‌ی بو بكیشی ! . وه شتی به‌نرخ و به‌رزی وه‌كو مانگی چوارده‌ش ئه‌خاته سوچی ده‌رد و مه‌ینه‌ته‌وه‌و وای لی ئه‌كا وه‌كو نال بی نرخی ئه‌كا . ئیتر ئه‌مه بیجگه له جناس و نازكیه‌ك كه له به‌ینی وشه‌كانا هه‌یه .

حه‌مدی ئه‌م پەرده‌یه‌ش دا ئه‌داته‌وه و ئه‌كه‌ویته بازاری غه‌رامیاته‌وه .

له غه‌رامیاتدا ئیمه ناتوانین له بره شعریكی ته‌واویا له ریزی شاعره به‌رزه‌كانی غه‌رامی دابنین ، چونكه یه‌كه‌م له‌به‌ر ئه‌وه فیكری ورده‌كاری و عبارت ئارایی ئه‌وه‌نده بالی كیشاوه به‌سه‌ریا له‌وانه‌یه ئه‌گه‌ر ویستبیتی قصیده‌یه‌كی غه‌رامی دابنی له سه‌ره‌تاوه ده‌می بو بردوه‌كه‌چی له ناوه‌راسته‌وه یا ئاخره‌وه لی لاداوه و فیكره‌كه‌ی گوڕراوه ، دوهه‌م هه‌رشتیكی له غه‌رامیاندا گرتبی له‌به‌ر ئه‌وه كه زور ئاشنابوه به فیكری مه‌حوی خیرا با ، به ده‌ست خویشی نه‌بوبی گورج له فیكره‌كه‌ی ئه‌و تیكلاوی بووه ! ... جا له‌به‌ر ئه‌مانه ناتوانین قصیده‌یه‌كی ساغ پیشان بده‌ین مه‌گه‌ر به‌ده‌گمه‌ن نه‌بی !.

به‌لام ئه‌گه‌ر بینه سه‌ر تاقه تاقه شعر لام وایه له پرو مه‌عنایی‌دا كه‌م كه‌س گه‌یاندویه‌ته حه‌مدی . . ئه‌وا بو نمونه ئه‌م بره شعره غه‌رامیه‌ی ئه‌خه‌ینه پیش چاو :

كی هیلالی دیوه شه‌ق بی ؟ ماهی نه‌خشه‌ب بی به‌گو !
قه‌ل چاوی یار ئه‌كا بازی به‌سه‌ر كولم و برو

کوی یارم پێ مەدە ، زاهد بە جەنەت مالەکی
بەردەبارانم ئەکەن چونی بدەم گەندم بە جو ؟ .
من لەرێی عەشقا بە پیری کەوتووم وەک داری شەخس
شاخی ئومیدم خەریکە دەر بکا تازە چرو !
موژدەی پشکوتنی وەقتی بە گولشەن دا سەبا
غونچە وا تیک چون ، بە قرر چون هەر بە مەشق خو بە خو
خوینی من گەر خوت لە پێ ئەگری زەریفە بمکوژن
من بسوتێنن ئەگەر ئەمەکن بە «کل» بو چاوی تو
بونی ئەو زولفەی بە روژی رونی کرد شەوبووونی :
من کە شەوبوم ئەمیشم ناو ئەوانا روژ بو
باسی ئەو خالە وەنەوشەی مل شکان بێهوشی کرد
خو فەقیرە لیشی هەلناسی بسوتی بێنی سو !
دەستگاهی قودرەتی تاقە عەجایب دەر دەخا
ئەم نیگارە هەر لە روشتەی بەرگی گولیە،نانو،پو
هزەتی نەفسی گەدایان سفرەی سولتانیە
دودی ئاهە نانی گەرمی «حەمدی» ئەشکێ ئاوو دو

لە بن دەست ئەمەشەوە حەمدی کە ئەکەویتە باسی جناس و وردەکاری هەر لە باری غەرامیاتدا یەکێ لە لقە بەرزەکانی خەیالبازی ئەکا بە شوینی هیلانەی خوبو بە شانازیەکەوە سەیری شاعرەکانی تر و مەردم ئەکا . جا لەبەر ئەمەیە بویە ئەلێ :

خەیالی عەشقی رونە وا لە سەرما بە رونی بوبە نیمە باکی سەرما
لە سکالەرزی سەردی تویە گەرما، بەمن نا گاو نەگەیوە باسی گەرما
دلی ئاگر بە ئاهی من ئەسوتی کەچی نالەم لە دلتابی ئەنەرما !
دەمیکە دل گومە نامەرد بزانن لە لای ئەو شوخەیە ، یا دەر بەدەرما

لە سەرماوەی کەبابی یارە ساقی    دلی برژاوی دانا لە بەرما
بە پیری یارەوە «حەمدی» بە پێ چو    بەسەر ناچی ئەگەر ئەمجارە سەر، ما

دو «سەرما» لە شعری یەکەمدا کە جناسە ، یەکەمیان واتە : سەری من دوهەمیان سەرما .. لە شعری دوەما ئەلی : لەبەر ئەوە تو لەگەلما ساردبت ئەو ساردیەت بووە بە لەرز و چوەتە سکەوە . جا ئەگەر گەرماییک لە سکابی ئەو لەرزەیە ، خودیارە لەرزو گەرمایش پیچەوانەی یەکن ، کەوابو من هەر نازانم گەرمای جیە! . هەمویشی لەبەر ئەوەیە کە تو لەگەلما ساردبت. لە شعری پینجەما ئەلی : بەلی مەی گیرر بەزەبی پیاما هاتەوە و هەندی کەبابی بو مەزە نایە بەردەم ، لەو کەبابە ، کە پاشماوەی مەزەی یارم بو ! بەلام کە نی فکریم ئەمە دلە برژاوەکەی خوم بو کە لەبەر ئاگری عەشقی یار بو بو بەمەزەو دلخوازم کردبوی بە کەباب ! . . لە ئاخر شعردا ئەلی : ئەوا ئەمجارە حەمدی بە پیان چوە پیر یارەوە ، بو جاری دوایی ئەگەر ماو نەمرد هەر بە پیان ئەچی نەوەک بەسەر ، چونکە ئەگەر بە پیان چو بەشینەیی ئەچی و زورتر خوشی وەر ئەگری ! . .

حەمدی ئەوەندە بە شوین عبارەت ریکخستندا گەرراوە جوانی مەعنای لی گوم بووە ! . ئەم شعرەی دوایی ئەگەر بەو جورە مەعنای لی بدریتەوە هەر چەندە جناس لەبەین وشەکانیا هەیە، بەلام وەنەبی مەعنایەکی جوان بدا بە دەستەوە ! . کەوابو لەبەر ئەوە مەعناکەش توزی جوان بێ ئەلین :

ئەوا حەمدی ئیستە بە پیان چوە پیریارەوە، بەلام ئەگەر ئەمجارە رزگاری بو ، یەعنی نەمرد لە خوشی ئەوەدا کە یاری چاو پی ئەکەوی ، بو جاری دوایی بەسەر ناچی ئەگەر سەر ، ما ، یەعنی بە سەر بچی نەوەک بە پی ، ئا ئەم بە سەرچونەی بە سەر ناچی هەر ئەیکا . ئەمە تەعبیریکی کوردیە کە ئەلی : «ئەو ئیشە نەچوە بچی ، یا هیشتا بەسەر نەچوە ، یا خەمت نەبی بەسەر ناچی » ئەمیش ئەمەی مەبەستە لەگەل ئەمەشا دیسان وەنەبی هیشتا شعرەکە مەعنایەکی جوان بدا بەدەستەوە ! . .

حەمدی ستایشیکی « برو » ئەکا ئەلی :

بالی کیشاوە بەســەر حوسنا لە دولاوە برو
وەکو هوما گەیبە مەقامی ، بی لەسەرچاوە بروا

لیرەدا هەتا بلیت فیکرەکەی نازکەو بە هەمو مەعنایەکت حەقی داوە بە برو . کەم شاعر نوانیویانە بەم جورە باسی برو بکەن وبیکەن بە هومابیک کە شابالی بەسەر جوانیدا بلاو ئەکاتەوە و بگاتە پایەیبک کە بی لە سەرچاو بیت ، ئەمە مەگەر هەر لە دەست حەمدی هاتبیت ، بەلام خیرا لە شعری دوایی‌دا کە ئەلی :

ئەمری هەر قەتلە ئیشارەی دل بە دولەت کردنە
شیری میسرە ، فەت لە کالانا نەوەستاوە بروا

ئەگەرریتەوە سەر ئەو جورە ستایشانە کە شاعرەکانی‌تر کردویانەو برو ئەکەن بە شیرو تیر ا . ئەگەر هەر لە شعری یەکەمدا خوی بگرتایەوە، بە تەنها ئەو شعرەی پایەیکی بەرزی لە شعری غەرامیاتدا لە ئەدەبی کوردی بوخوی تەرخان ئەکرد . .

* * *

حەمدی ئەم پەردەیەش دا ئەداتەوە و ئەکەویتە وردەکاری و دەربرینی قسەی نەستەقی زور جوان ، لەم پەردەیەدا جی ئیشکاری نیە کە بەرزتر شوینی بو خوی لە ئەدەبی کوردی‌دا گرتوە . ئەم پەردەیە ئەوەمان پیشان ئەدا کە حەمدی زور چەوساوەی دەست ژیان بووە ، ئەو دەورە ، کە ئەوی تیا ژاوە . یا ئەو ژیانە. کە ئەو رایبواردوەو توزیکە لە ژیان تیکرراپی، هەمو جورە پەردەیەکی دلتەنگی بە سەرا کشاوە بویە قسەکانی ئەو نمونەیەکی رابواردنی ئەو دەورەیە ، چونکە خوی پیغەنگی غەم و ئەندوە بووە وەکو ئەلی :

حەمدی رەئیسی مەجلسی دەردو غەمە ئەسەف !
جیگەی دیارە دەولەتی ئەو با ، جیا نەبی

یا خود ئەلی :

گرامافونیکی دەستی زەمانەم نیمە تاوانم
کە تأریخی بەشەر موحتاجە گوێی بگری لە قاوانم

لە باسی دنیادا کە ئەلی :

نی نەگەیوں خەلکی دنیا وا بەراست و چەپەدا
گالتە بەم خەلکە ئەکا ، کردونیە داری هەلوکە

زور بە نی گەیشتوانە ئەلی . هەرچەند لەم بابەتەوە مەحویش هەیەتی بەلام هینەکەی ئەمیش لەو کەمتر نیە . لە باری چونیەتی ئەو رەوشت ویاسایە کە مەردمی لە سەرن ئەلی :

حەرفی ناساغی بەجیم بی چاترە ، نەک بی جای ساغ
کاسە کەل بینە لەمەی پرر ، خالی ، نەک مینای ساغ !

ئەم شعرەی ئەوە پیشان ئەدا کە قسەی راست و حەق باوی نیە و مەردم لی هەلدین ! جا ئەمیش ئەلی کەوابە قسەیەکی ناساغی بەجیم بی چاترە نەوەک هەرزەیەکی ساغ ! . بەلی قسە ئەگەر بەجی بو ئەوە ئەبی ساغ بی کەچی ئەم کردویە بە نا ساغ ، لەبەر ئەوە چونکە با ، ساغیش بی مادام مەردم پیان خوش نەبو لی هەلدین ، کە لی هەلهاتن ئیجی بو هیچ کەلکی نەبو ! . هەر وەها سوالەتیکی پرر لە مەیم بی چاترە لە مینایەکی ساغ کە خالی بی ، مەبەست شکاندنی ئارەزوەکەیە بە مەی نەوەک شوینی مەیەکە ، کە مەیەکە بو ، با لەسوالەتابیت ، خو من میناکە ناخوم ، بەلکو مەیەکە ئەخومەوە ...

حەمدی لەمەی وتوە بەلام لەبەر ئەوە ئەوەندە خوی بە شعرەکەوە خستوتە حەزیەتەوە ریکو پیکیەکەی لە دەست دەرچوە ، لە کوردیدا نەبیسراوە « صفتی » دوهەم پیش « موصوف » بکەوی ، کەچی ئەم لیرەدا پیش « نی »

موصوفەکەشی خستوە ! ! . .

ئەم شعرەی چەند فەلسەفەیەکی وردی تیدایەکە ئەلی :

شیخ و عەدل و ، حاکم وکەشف و ، حەکیم و مەرحەمەت
نەبووەو نابی ، بونی خەرقی قاعدە ناکا بە شاز

بەراستی ئەم شعرەی کە ئەلی :

لەسەر هیلکەی قەمەر سیمورغی گەردون کرکەوی بەلکە
هەلینی بیچوە روژیکی منورتر لە روژی روت !

لەئەو بەرەی جوانیەوەیەو هیچ شاعریکی کورد نەیتوانیوە ئەم فیکرە غەرامیە بەم جورە دەربری . لیرەدا حەمدی گوی هونەری دەر کردوە .

ئەم شعرەی کە ئەلی :

بو ، لە برسا مردنە حازر بوون ئەهلی شەرەف
چونکە نعمەت ئیستەکی دەدری بەمقداری ریا !

ئەوەمان پیشان ئەدا کە هەر لەو سەردەمەوە شیرازەی ئیش‌وکار لەبەریەک هەلپچراوە ! . چون هەلنابچرری ؟ ! ئەو کە ئەلی :

ژنیەتی دنیام بە حەقەت ئیستە بو ساغ بوتەوە
هەرکەسی ئەمرو کە پیاوی ژن نەبی نابی بە پیاوا !

یا خود ئەلی :

بە عومری خوی قسەیەکی راستی کرد شاهم ئەویش مەست بو
وتی وەک لازم و مەلزومە بو گەورە درو کردن !

کە حەمدی ئەمانە ببینی ناچارە ئەم فیکرە وردە دەربری و ئەلی :

هیندوتم خەلکە مەبن عەیبە ئەوەندە دو زبان
وا لە داخانا شەقی برردوە زبان ، بوتە دوان !

خوا هەقە ئەم شعرەی کە ئەلی :

ناقلیشی دار پوازی تا لەجلسی خوی نەبی
پشتی کورد کوردی شکاندوەیە، وەها بو هەر قەدەر !

فەلسەفەیەکی جوان و قسەیەکی هەتا بلیت راستە .

تەماشایەکی ئەم فیکرە نازکە ، کە باسی رەقیب ئەکاو ئەلی :

رەقیب ! بو بەزمی خەلوەتمان کەهاتی وەکو دومەل لەجی نازک دەرانی

تا ئیستە کەس فیکری بەوە نەشکاوە کە رەقیب بە جوری پیشان بدا عەمەلیا بزانری ناهەموارە وەکو حەمدی نیشانی داوەو کردویەبە دومەلی سەگباب !

ئەی ئەم شعرەی ؟ کە ئەلی :

تەپلی سەر دەنگی نەماوە ، سینە هەر وەک دەف دررا

زولفەکانت کەوتە چنگم ئەیکەمە عودو زوباب !

ئایا پیاو ناخانە سەر ئەو برروایە کە بلی پەردەی نازکی خەیالی حەمدی زەوقیکی بی گەردي شاعرانەمان پیشان ئەدا ؟ . .

حەمدی بە دو بەیت دو فیکری چەند جواني دەر برریوە کە ئەلی :

دینە دنیاوە بەروتی خەلک وەکو بچنە حەمام

غوسلی دەرچی‌و دەرنەچی ، هەر دەردەچی شاهو غولام

هاتەوە لەو دەرچوانە تی‌گەویشتوی ونی :

خو نەگورراوە زەمانە ئیسکی تاس ، ئیسکی حەمام !

ئەم شعرەی لە نەشئەگەیاندندا پارچە زیرریکە کە ئەلی :

وەک مەدینە بی « نەبی » بی ، یا نەجەف بی بی «عەلی»

شاری غەزنەش ئیستە بی محمودە وەک « داریکەلی[1] »

---

( ١ ) داریکەلی گوندیکە بە « ٣٥ » کیلومەتریەک کەوتوتە جنوبي روژاوای شاری سولەیمانیەوە . شوینی دانیشتنی پیشەوا شیخ محمودی شیخ سعید بووە . ئەو سەردەمە کە حەمدی ئەم شعرەی وتوە شیخ محمود لەلایەن ئینگلیزەوە بەدیل گیرابو برابو بوهیندستان، واتە سالی ١٩١٩-١٩٢٠بوە، ئیستەش داریکەلی هەر ئاوایە و شوین دانیشتنی شیخ محمودە .

بەلی پارچە زیر ریکە کە ئەم هەمو شوینە دورانەی لیک نزیک کردوتەوەو فیکری شاعرانەی بویان چوە .

* * *

لەم شعرانەوە ئیمە ئەو فیکرەیەمان لە « حەمدی »یەوە وەرگرت کە شاعریکی نیشتمانی بووە لە پیشا و لە پاشا فەلسەفەچی و قسە نەستەق . لەم دو ریچکەیەدا پایەیەکی بەرزی لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەیە .

دیوانیکی بە تورکی وفارسی و کوردی هەبوە لە سالی « ١٣٣٤ »ی رومی ـ کە دەوری ئیحتلال بووە ـ خانو وکتیبخانەکەی لە سولەیمانی سوتینراوە ئەو دیوانەش بەر کەوتوە . لە پاش ئەوە دیوانیکی تری کوردی پیکەوە ناوە بە خەتی خـــوی ئیستە لەلای بنەمالەکەیەتی ، وە لە روی ئەوە لە حەزیرانی ١٩٣٩ لە لایەن « نجم الدین مەلاوە » لە سولەیمانی نوسخەیەکی بو عقیدی متقاعد « محمد علي بەگی کوردی » نوسراوتەوە « ٣ » هەزار و چـــەند شعریکە هیشتا لە چاپ نەدراوە .



# ناری

## ١٨٧٤ - ١٩٤٤

لە سایەقەی سامالی ئاسمانی مەریواندا گولوپیکی کارەما . لە لالەزاری پرزنیگاری دەوری زریباردا بولبولیکی خوش نەوا . بە سروەی شنەی



نەسیمی بەیانیان باوەشینی کلپەی دلی زاری کردوە ، بە زەردەپەرری خوراوای ئیواران زررکفتی پەردەی دلی کردوە !. ئینجا لەو دلەو لەو لالەیە ، لەو سایەقەو لەو پەردەیە، دیەنی نەیلوفەرری شعری. تەرری سەر دەفتەرە . زمانی گویایەکی بازارری شعر فروشان لە غەرامدا ، قەلەمی نەمامیکی گولزاری ستایش بیژالە مەرامدا . زانا بووە بەباسی عیلمو ئەدەب لە هەمودەوری خوی، دانابووە بەکاروئیشی پەسەند بو هەمو دەوری خوی،شعری تەرو رەوانەو جناسیقەو خوشخوانە ...

شاعری داستانگیرری ئەم باسەناوی« کاکەحەمە »وکوردیمەلا احمدی کورری مەلا محمدي کورری مەلا عبد الرحمانە . باوکی هەر چەندە بنەمالەی کونیانلەدەشتی « شلیر » بووە ، بەلام خوی لە دی « ساوجی کون » ـ لە

مەریوان ـ دانیشتوە . کاکە حەمە لەبەر ئەوە دایکی لەبەگزادەکانی « کیکن بوە لەسالی «١٨٧٤»ی میلادی لەو گوندە هاتوتە دنیاوە . ـ « کیکن »یش هەر گوندیکە لە مەریوان . لە تەمەنی شەش سالیدا لای باوکی دەستی کردو بە خویندنی قرآن و کتیبە وردەلەکان ، لە پاشا لەکن فەقیەکانی باوکی دەست لەکا بە « عوامل »و ئەبی بە سوختە ، ئینجا بە فەقیەتی بە مەرنواند گەرراوە ، لەویوە چوەتە « سنە » و گەرراوەتەوە بو « پینجوین » شرح شمسی لەلای عالمی گەورە مەلا عبدالرحمانی پینجوینی خویندوە . لەویوە ئەچی بو سولەیمانی، ماوەیەک لە مزگەوتی شیخ‌عبدالرحمانی شیخ ابو بکر. کە ئیستە بە مزگەوتی بابە عەلی بە ناوبانگە ـ ماوەتەوە ـ . .

ئینجا بو جاری دوەم گەرراوەتەوە بو « سنە » لە مزگەوتی « شریعت مدار » و «دارالاحسان» نزیکەی سالونیوک ئەمینیتەوە ، لەویوە چوەتو « بانە » بولای قاضی‌عبدالرحمان ، لەویوە بو سابلاغ بو مەدرەسەی تورجانی زادەکان ، لەویوە بو « وان » و « باشقەلا » و گەرراوەتەوە بو هەولیر ، لەویوە چوە بو « رواندز » بولای اسعد افندی خەیلانی . لە « ١٨٩٧ » دا اجازەی تدریس و عیلمی لە اسعد افندی وەرگرتوەو گەرراوەتەوە بو مەریوان . لەم ماوەدا باوکی مردوە ، کە گەرراوەتەوە بو مەریوان لەدێی « کیکن » دائەنیشی و لە پاش « سە » سال لە خزمەکانی دایکی ژن دینی ، لە (١٩٠٤)دا لە سەر داوا کردنی « حسین بەگی بیلو » بە ناوی مدرەسیەوە ئەچیتە گوندی « بیلو » . ـ بیلو دیکە لە مەریوان بە « ٩ » میلیک کەوتوتە روژەلاتی پینجوینەوە ـ ئیتر لەوی وەختی بە دەرس وتنەوەوە رائەبویری ، تا لە « ١٩٤٤ » لە تەمەنی « ٧٠ » سالیدا کوچی مالاوایی ئەکاو لە دێی « بیلو » ئەنیژری . .

خاوەنی تەرجەمە پیاویکی بالا پیاونە بوە ، چاوەکانی لەم ئاخرەدا لەبەر زور موتالا کردن توزی تیکچو بون ، لوتیکی زل‌ودریژ کەلەی پیوە بوە ،

ناوچەوانی پان و سەر کولمەکانی نەختێ زیاد هاتبونە دەرەوە ، ریشێکی توبی سپی ، جوتی سمێڵی سپی پالەوانانە ، میزەری سپی کوردانەی لەسەر ئەنا گوێچکەکانی پێدا ئەپوشی . لە جلو بەرگدا دل تەرربووە ، کەوشی سوری لەپێ و کەوای شیرداخ و جوبەیەکی مەلایانەی لەبەر ئەکرد . زمانی پاراو و قسەکردنیشی لە سەر خوبو .

مەلا کاکە حەمە مەلایەکی بەرزو بالابووە ، بە تایبەتی لە عیلمی بەلاغەدا دەستێکی بەرزی هەبوە ، گەلێ اجازەی بەفەقیان داوە ، پیاوێکی ئەدیبو قسە خوشو رو خوش بووە ، بەرچاوتیرو رەند مەشرەب بووە ، لە ناومەردما زور بەریز بووە ، نوکتەزان و قسەرەوا بووە ، لەگەل پیرەوا شیخ محمودی شیخ سعیددا گەلێ داستانی ئەدیبانەیان هەبووە ، هەر وەها لەگەل تاهر بەگ ـ شاعری جافانیشدا ـ رازو نیازی شعریان زور کردوە .

کاکە حەمە بو بە « مەلا کاکە حەمە » وە هەرچەندە زایندەی « کیکن »ە ، بەلام بە مەلا کاکە حەمەی « بیلو » بە ناوبانگە .

ئایا هیچ ئەچیتە دلەوە بیجگە لەو شتانە کە تا ئەم دەورە ئیلهامی شعری شاعرەکان بوون شتێکی تر باوەشی بە شعوری مەلا کاکە حەمەی بیلودا کردبێ بو ئەوە بێ بە شاعری مەریوان وە بگرە بێ بە شاعرێکی بەرزی کوردەکان ؟ . نەأ . هیچی تر نەبوە ، چونکە سایەقەی سامالی کوردوستان ، دیمەنی بەندەنی بەرزی کیوەکان ، خوررەی ئاوی سافی تافگەکان . ئەمانە ، کەوتنە چاوشارکی لەگەل جریوەی ئەستیرەکانی ئاسمانەکاندا خەیالی دانیشتوانی ئەو شوینە ئەکەن بە هەیکەلیکی فریشتەیی کە باوەشی بە ئاسوی تەبیعەتا کردبیت ! . یەکی کە ئەمە مەلبەندی بێ ئەبوایە « دوربینی » خەیالی بو گەلێ شتی دورو قول برروانیتایەو لە ئاسمانیکی ترا بەروازی بکردایە ، کەچی تەلی ئانفەی یا بو چاوی خەوالوی بەربزادیک ، یا بو نیگاری باغچەسەرای نەوزادیک ، یا بو دانەوەی وینەی کانی و سەراویک ئەبزویتەوە ! . .

بەلی لەگەل ئەمانەشدا پەرچەی بوکی خاکی کوردوستان لە باتی تارای سوری بوکینی خارایەکی رەشی مانەمی بە سەرەوە بووە . ئەمەش زور بە کول ئەبیتە تیسکەی هاندانی رەورەوەی فیکری شاعر، بەلام ئەوشاعرانە کە تا ئەم دەورە ، لە بادەی عەنعەنانی خەت و خالدا شەرابی زیانی غەرامی یان خواردوتەوە ا . ئەوەندە سەر خوشی ئەو مەیدانە بوون لەگەل ئەو هەمو دیمەنە رەنگاو رەنگانەشدا نەیانتوانیوە پەل بزیون و بەلایەکی تردا لا بکەنەوە ، یا بکەونە عالەمیکی ترەوە . دیارە شاعری ئیمەش ـ مەلا کاکە حەمە ـ یەکیک بووە لە کورری ئەو مەینوشانە ، مەگەر جار جار نەبی توزی لەو سەرخوشیەی کەم کردبیتەوەو بەلایەکی تردا ئاورریکی دابیتەوە .

ئەمە پەردەی شاعرەکانمان، مابەوە سەر ئەوە کە میژویەکی شعری ئەم شاعرەی خومانمان دەست کەوی . وەکو وترا مەلا کاکەحەمە پابەندی عەنعەنانی غەرامی بووە لە سروشتدا ، لەبەر ئەوە زوری حەز بە ئەورەنگی خەیالاتی نازکی غەرامی کردوە ، گولدەستەی شعری (نالی) ئەوەندەی تر دەماخی چاخ کردوە ، فەلسەفەی تصوفی (مەحوی) کاری تی کردوە ، سەرروای ئەمانەش خەیالاتی غـــەرامی مەولانای جامی و بیرنازکی مەولانای تاوەگوزی ش شورشیکیان لە دلیا کردوتەوە . بە ناچاری لەدەوری فەقیەتی‌دا چاک ئەگریتەوەو لەبەر خەرمانی هەزار خەروارەی شعردا رائەوەستی تا دلی بلیسەیەکی لیوە دیت ، کە بلیسە هات چاکی پرر ئەکا و بەدیاری ئەیباتەوە بو کورری شاعران ، دیاری یان ئەدانی و خویشی لە کوررە کەدا دائەنیشی و « ناری » ئەکا بە ناوی شعری و ئیتر ئەکویتە مەیدانی قسەرەوانیەوە ...

شعری « ناری » لەدو پەردەو نیودا دەر ئەکەوی : . غەرامی ، ستایشی ئاینی . نیو پەردەکەش جار جار دەی بردوە بو نیشتمانی ، بەلام هەر دەم بو بردن نەوەک فەلسەفە دەر خستن ، هەر دەم بو بردن نەوەک قسەلیوە کردن . ئەم غەرامی یە ، کە ناری گرتویەتی وەکو گەلیکی تر لە شاعرەکان لە

رواڵەتا غەرامیە بەلام کە ، لیان بپرسن ئەمە چیە ؟ . ئەلێن ستایشی دڵخوازی حەقیقی ئاینی یە و عەشقیکی مجازی لەپەردەی شعریکی رواڵەتیدا دەری ئەبرین ، مەبەستیان عەشقیکی حەقیقی و ستایشی مینای بالای ئەو کەسەیە کە نیشانی رەحمەتی خوایە ! . جا ئەگەر بەم جورە مەعنایە واتە لە شعری ناری بدەینەوە تەنها یەکێ پەردەیە ، یا غەرامی رواڵەتی و ئاینی پەنامەکی‌یە ، یاخود ئاینی رواڵەتی و غەرامی پەنامەکی !! . کەوابو تو ئەتوانی بە هەر باریکا ئەم شعرەی ناری مەعنا لێ بدەیتەوە سەربەستی لەکاتیکا کە ئەلێ :

خەتی دەرسی عەشقی « ناری » وەکێ رقومی خالە کەت
وا بە لەوحەی گەردنی بێ گەردی وەکێ مینانەوە !

ئینجا بینە سەر ئەوە کە لە باریکی راستی‌دا تەختی لە جونیەتی شعری ناری بدوین بو ئەوە پایەی ناری‌مان لە ئەدەب و ئەدەبیاتی کوردی‌دا بو دەرکەوی .

« ناری » قاپی دلی خوی ئەخاتە سەر گازی پشت ، لە کورەی دەرونیکی بە جوشی عەشقەوە ئەم شعرە غەرامیە ئاگرینانە هەڵئەرریژی و ئەلێ :

چاوەکەم من بویە دایم کارو پیشەم زاریە
حاکی چاوت لەگەل من مائلی غەداریە

شورش و نالینی کەس بێ وەجە و بێ عیلەت نیە
ئاهی من ، فەریادی بولبول ئیشی بێ غەمخواریە

من کە خوینی خوم حەلال زانیوە قوربانی دەبم
حەزرەتی خوینکاری ئەبروت ، مەشرەبی خوێنخواریە !

گەردەپرسی بوچی بێ نەشئەو مەلول و عاجزی ؟
رومەتی زەردم عــــەزیزم شاهدی بیماریە !

کەم بە خەندە بێ بەلامەو حەیفە تەعنم لێ ئەدەی
لیم گەروی توبێ خودا ، ئەم جارە حەردم کاریە

دل لە شامی پەرچەی شەودا بەدایم بێ خەوە
چونکە ئیشکچی لە شەودا عادەتی بیدارییە .

حکمەتی پڕ مەسئەلەی حوسنت لە بوکی حەل دەبێ ؟
هەر صحیفە سەد ئیشارەو رەمزی تیدا جارییە !

خالی روخسارت « هدایەت » ، بەخشی شەرحی زولفەکەت
« قاضی » ئاسا حاشیەی ئەگریجەکانت « لاری »یە !

روت وەکو ئاگر ، موژەت وەکو شیشە ، ئەبروت قیمەکەش
مووحەت زولف و کەبابت جەرگی پارەی « ناری » یە ! .

ناری لە پاش ئەوە گەرازو گەبێ خوی لەگەل دوسلیا ئەکا ئەلی: ئەم دلە کساسەم لەسایەی پەرچەی‌شەوئامیزی تودا هیچ‌خەوی نیە لومەش‌ناکری چونکە کیشکچیە ، پاسەوان وئیشکچی نابێ بنون ! . لە پاشا ئەلی : من سەیرم هەیە هەروا قسەی لابەلا ئەکەم ! ئایا باسی حکمەتی کتیبی جوانی تو تا ئیستە بوکی تەواو بووە ! تا وەکو من بیم باسی چاو و پەرچەمت بکەم ؟ تەواو نابێ‌چونکە هەرلاپەڕەیە لەولاپەڕانە بەهەزاران‌ئیشارەو رەمزی‌وای تیدایەکەهەر یەکە پیویستە چەند قەلەم وزمان شەرحی لەسەر بنوسی . ئینجا دیتە سەر ئەوە ئەلی : خالی سەر رومەتت ریی سەرفرازی بە ئینسان نشان ئەداو بلاو بونەوەی زولفەکانیشت وەکو«قازی»چون‌خوی بلاو ئەکاتەوەو کتیب و دەفتەر لەم‌لاو لەولای خویەوە دا ئەنی دەرزی مەسائلی ورد ورد ئەلیتەوە ئەوەیش بەوجورە باسی نوکتەی ئەو خالەت ئەکا . پەراویزی ئەگریجەکانیشت بە سەریا لاربونەتەوە ، گوێ لەم باسی حکمەتە ئەگرن ! .

ناری لەم شعرەدا جناس و تەلمیحیکی زور جوانی نواندوە لەگەل دەر ـ بڕینی مەعنا غەرامیەکەدا ، ئەوەش بەم جورە :

« قاضی » کتیبیکە لە حکمەتدا هی حسینی مەیبەدییە . « هدایە » مەتنی ئەوکتیبەیە هی اثیرالدینی ئەبهەرییە . « لاری »یش حاشیەیەکە بەسەر کتیبە ـ

گەوەیە . « لار » لە ، لارستانی خوراسانە ... جا ئەلی خالی روخساری تۆ حکمەتیکە پێویستە شەرح بکری : ئەو خالە مەتنیکە ، کە « هدایە »یە . بلاوبونەوەی زولفەکانت شەرحی ئەو مەتنە ئەکا کە کتێبی « قاضی »یە . ئەگریجەکانیشت وەکو حاشیەکەی « لاری » بوون بە پەراوێزی ئەو خالی حکمەتەت !! .. وشەی « لاری » هەم ناوی خاوەن حاشیەکەیە ، هەم ئیشارەیە بۆ چەوت بونەوەی ئەگریجەکە، چونکە حاشیە بە چەوتی نوسراوە . هەم قافیەی شعرەکەشی پێ ریک خستوە ! ..

ئینجا لە ئاخر شعراکانی دوهمی و بە تەشبیهیکی‌تر پێ ئەلی : رومەتت لەوەدا کە پرتەوی گەرمایەکەی عاشق ئەسوتێنی وەکو مەقەلیەکی ئاگر وایە . برژانگەکانتیشی کەبابەو بروەکانیشت قیمەکیشە. زولفەکەشت باوەشێنی ئەو ئاگرەیە . ئەمە دوکانیکی کەبابچێتی لەم لاوە بودانا !. جا ئەلی : گوشتی کەبابی ئەم کەبابخانەیە جەرگی پارە پارە کراوی « ناری »یە بە دەست دوریتەوە ! ..

ئەم دو شعرەی ناری یەکیکن لەو شعرە زور بەرزانەکە لە بابەت تشبیەو بەلاغەوە لە باسی عەشقدا لە زمانی کوردیدا وترابێتن ! ..

لیرەدا پێویستە قسە لە شتیکی وردەوە بکەین :

شاعرەکانی دەوری ئەوەل و ناوەراستی کورد لە هەموشت زیاتر بەوە فیر بوون کە تەشبیهی زولفی یار بە « کەمان » و برژانگی بە « تیرو دەرزی »و بروی بە « شیرو قیمەکیش » بکەن کە ئەمانە گویا لە سەر زەوقی ئەدەبی ئیستە ری ناکەون ! . مەعشوقیک بەو نازکی و نازداریە ئەبی زولفی لە باتی (کەمان) بکری بە پەردەی نازکی ئاوریشمی بەسەر کوگای گەوهەردا هەلدراو . برژانگی لەباتی « تیر » بەتیشکی باریکی بریسکەی ئالتونی بەرهەتاو. و بروی لە باتی « شیر » بە پەرری لە میسک هەلکشراوی بە جوقەی پادشاهانەوە ئاوزان کراو ، چونکە ئەمانە لەگەل نازکی و شوخی‌ستایشی بەرزی

مەعشوقدا ربی ئەکەون نەوکە ئەو شتە ترسینەرە پیشوانە کە پیاو زارەترەکە ئەکەن ! ..

ئەمە ئەوتوی لەبن دەست، ئەمەشەوە ئەمە شتێکی ئاشکرایە کە پەردەی عەقلیەتی هەر دەورەیەکێ! شان بەشانی ئەفەنات و یاسای ئەو دەورەیە ئەچی بەرێوە . دیارە ئەم عەقلیەتەش زورتر لە ئاوینەی میشکی ئەدیب و شاعرەکانا جی گیرتر ئەبی ، چونکە تەنها ئەوانن کە تەعبیر لە کارەسات بدەنەوەو بیکەن بە ئازوخەی پاشەروژ .

جا من لەسەر ئەو باوەررم کە فیربونی شاعرەکان بو تەعبیردانەوەیان لە ستایشی دوستی هاورازیان بەم جورە شتە ترسینەرانە ئەوە پیشان ئەدا کە قەوی کورد قەومیکی جەنگاوەر و شەررانی بوون ، ژیانیان ژیانیکی شەررو شوررو هەردە گەرری بووە ، هامرازی شەو و روژیان شیرو تیرو کەمان بووە . بە حوکمی تەبیعەت ناوو ناپوی ئەم جورە شتانە لە هەموشت زیاتر بەسەر زمان و لە بەرچاوی گەورەو بچوکیانەوە بووە ! . .

ئینجا شاعریک کەویستبیتی راز لەگەل دوستیکیا بکا ناچار بووە بە شتیک قاپی ئەم رازو نیازەی لەگەل بکانەوە کە باو بی و دیار بوبی ، ئەو شتەش کە ئاشکرا بوبیت و لەگەل عەقلیەتی دوستە کەیا لەوانەبی مونوربە بکری تەنها باسی شەررو شورر بووە بە تیرو گورزو کەمان ، چونکە ئەو دوستەش وەکو ئەم ، لە مالیکا گوش کراوە کە چاوی بەشیرو تیرو کەمەندی باوک و براکانی پشکوتوتەوە ـ کە کراون بەدارا بو مەیدانگیرری بەیانی و ئیواران ـ ئەمیش هاتوە بەو شتانە بلمی ئەوی کردوە . ..

کەوابو لەمەوە ئەوە بو ئیمە دەر ئەکەوی کە کورد لە لابەررەی پیشی تاریخەوە تا ئیستە گوردی مەیدانی جەنگ و نەبەرد بوون ، قەومیکی جەنگی و دور لە شارستانی جیان داوە بەسەر پەردەی نازکی ئاوریشم و بریسکەی ئالتونی قال کراوەو و پەرری لە میسک هەلکشراوەوە !! ..

له سالانی ١٦٨٠ ـ ١٧٨٠ دا ژیاوه . (١٧) شریف خانی جوله‌میرگی[1] : ١٦٨٨ ـ ١٧٤٨ . (١٨) شریف خانی هه‌كاری : ١٦٨٩ ـ ١٧٤٨ . (١٩) مه‌حزونی : ئه‌لین نوسه‌ر بووه له دیوانخانی خه‌سره‌و خانی یه‌كه‌م ، والی ئه‌رده‌لان كه له سالانی ١٧١٩ ـ ١٧٥٤ حوكمی كردوه . (٢٠) شیخ حسینی مه‌ولاناوا : هاو ده‌وری نادر شا بوه‌و نادر له ١٧٤٦ كوژراوه . (٢١) محمدعلی سلطان . (٢٢) مه‌لا عبـــدالله بیتوشی : ١٧٤٦ ـ ١٨٠٧ .

---

= دوستایه‌تی خوی له گه‌لیا قایم كردوه . (٣) میر ئه‌سكه‌نده‌ر كوری میر محمد . ئه‌میش ئه‌بی به‌جی نشینی باوكی ، بیست سالیك اداره‌یه‌كی باشی ولاتی پالنـگان هه‌لئه‌سوورینی و ئه‌مری . (٤) سولاغ حسین ته‌كلو . ئه‌مه ئه‌میری « ده‌ینه‌وه‌ر » بو ، كه بیستی میر ئه‌سكه‌نده‌ر مردوه له‌شكر ئه‌كا شاری پالنگان داگه‌گری و هه‌مو ئه‌و ناوه ئه‌كه‌ویته ژیر فه‌رمانیه‌وه ، ئه‌م پیاوه پیاویكی خوین ریژو سته‌مكاربووه ته‌نانه‌ت سولتان‌حسین ته‌كلوی برای له ترسی ئه‌وه نه‌وه‌كه بی كوژی هه‌لدیت و په‌نا ئه‌باته به‌ر محمود پاشای كوری‌شه‌مسی پاشای‌میری میرانی شاره‌زور. له پاش مردنی شا اسماعیل(٠٠) وه‌لیخان ته‌كلو میری هه‌مه‌دان له‌شكر ئه‌كا ولاتی پالنگان داگیر ئه‌كا و سولاغ حسین تـه‌كلو ئه‌گری و ئه‌یكوژی . له‌م كاته‌دا كه ولاتی پالنگان سه‌رگه‌رمی شه‌ر ئه‌بی محمود پاشای میری شاره‌زور به‌هه‌لی ئه‌زانی له‌شكر ئه‌كا ولاتی پالنگان داگیر ئه‌كاو له ده‌ست ته‌كلوكانی ئه‌ستینی ، ئیتر له‌و وه‌خته به‌دواوه ولاتی پالنگان له لایه‌ن حوكمانیه‌كانه‌وه هه‌مو جار ئه‌دری به پیاوی بیگانه » .

(٠٠) وادیاره ئـــه‌م شا اسماعیله شا اسماعیلی دوه‌م بووه كه له ١٥٧٧ مردوه‌و ته‌نها دوسال پادشایه‌تی كرد . له‌پیش ئه‌م دا شا ته‌هماسب بو كه له ١٥٢٣ ـ ١٥٧٥ بووه . شا اسماعیل یه‌كه‌میش له ١٥٠١ ـ ١٥٢٣ دابووه .

(٢٣) مەولانا قاسم . (٢٤) میرزا ئیبراهیم. (٢٥) مەلا محمدی بەردەرەشی بانە : هاو دەوری نادرشابووە . (٢٦) شیخ لطف الله . (٢٧) مەلا تاهری هەورامي . (٢٨) ئـەلیاس بەگ . (٢٩) شیخ مارفي نودیي : ١٧٥٣ ـ ١٨٣٧ . (٣٠) شیخ سراج الدینی تەویلە ١٧٧٤ ـ ١٨٦٧ (٣١) مفتی زەهاوي : ناوي محمدو کوری احمدە ١٧٩٢ ـ ١٨٩٠ . (٣٢) محمد بەگی تیلەکو . (٣٣) مەلا فضل اللەی هەورامي . (٣٤) حاجی کاک احمد ١٧٩٣ ـ ١٨٨٩ . (٣٥) حاجی عەلی محمد بەگی تیلەکو . (٣٦) مەولانا فەرروخی پالنگانی . (٣٧) مەلا حافظ فەرهاد هەشەمیزي . (٣٨) رەزا بەگی هەورامي . (٣٩) حەمەمین بەگی هەورامي . (٤٠) شیخ یعقوب خان . (٤١) ئووەیس بەگ . (٤٢) مەولانا یوسف برای حەبیب بەگی کەلاز . (٤٣) شیخ حەسەنی دمرە هەردي (٤٤) عەبدکەلانەرزاني . (٤٥) عمر نزارەیي . (٤٦) شیخ مصطفی ی نەختەیي . (٤٧) سوفي عەلی کەوانی . (٤٨) مەلا خدری رواریي : ١٧٢٥ ـ ١٧٩٠ . (٤٩) مەولانا عبداللەی هەورامي . (٥٠) شیخ احمدی موبی . (٥١) لالو خەسرەو . (٥٢) شیخ شمس الدینی دەرەهەردي . (٥٣) وەستا مکایلی زەنانی . (٥٤) دەرویش نەوروز . (٥٥) نەغور قولی . (٥٦) سەیقور . ئەم سیانەی دوایی لە حەقەکانی کون بوون[١] .

(٥٧) خانای قوبادي : لە سالانی ١٧٠٠ ـ ١٧٥٩ دابووە . (٥٨) خانەی داجیوەنی لەک : ١٧١١ ـ ١٧٨٠ . (٥٩) شیخ محمد بهاء الدینی بیارە : ١٧١٩ ـ ١٨٧٢ . (٦٠) شیخ مصطفی ی کوری بابەرەسول بەرزنجی :

(١) هەندیک لەم شاعرانەی پیشەوە روژهەلاتی ناس «ف . مینورسکی» بە شاعری گورانی داناون و لە کوردی جیا کردونەتەوە ، بەلام وەک لە باسي «کورد» لەم کتیبەدا لە لاپەرە «٤٤ ، ٤٥» قسەی لیوە کرا کوردو گوران لای ئیمە هەر یەکن .

١٨١٨ ـ ١٨٨٥ . (٦١) ئافەی کوڕری مەلك قاسم ئەیوانی کەلهوڕر ، لە ١٧٩٠ دا مردوە . (٦٢) مەلامهدی شیخ الاسلامی سنە کەبە « ئافە » بە ناوبانگ بووە : ١٨٢٦ـ١٨٨٣ . (٦٣) مەلا محمدصالحی فخر العلمای سنەیی : ١٨٣٠ ـ ١٨٨٥ . (٦٤) میرشکر اللەی دیناوەردی فەیلی : ١٧٤٤ ـ ١٨٣٩ (٦٥) مەولانا خالدی کوڕری احمدی کوڕری حسینی مکایلی: ١٧٧٧ـ ١٨٢٦. ئەم زانا بەرزەی کورد و ڕوژەلاتە لەبەر ئەوە تەنها دو شعری کوردیم لیوە دەست کەوت نەمتوانی پی بەجەرگی خوما بڵیم دورو دریژ ژیانی بنوسم ، ئەگینە ژیان و لاپەرەی ڕوژگاری مەولانا خالد ئەستیرەیەکی هەرە گەشە بە ئاسمانی کوردەوە ، چاوەڕیی ئەوەم کرد بەڵکو هەندێ شعری ترم لە کوردیدا دەست کەوی .

(٦٦) حەماغای دەربەنفەقرە : لە سالانی ١٧٦٥ ـ ١٧٣٢ ژیاوە . (٦٧) زەبونی : کە سلیمان بەگی زەنگنەیە لە سالانی ١٧٨٠ ـ ١٨٠٠ مردوە . (٦٨) مەلانوشای زەنگنە: لە سالانی ١٧٨٠ـ١٨٣٠ دا ژیاوە . (٦٩) مەلا محمدی بانە ١٧٨١ـ١٨٤٣. (٧٠) میرزا شەفیعی جامەریزی دەلوبی : ١٧٨٥ ـ ١٨٣٥ . (٧١) احمد بەگی کوماسی : لە دەوروبەری سالانی ١٧٩٣ ـ ١٨٧٦ دا ژیاوە . (٧٢)عبداللەی کوڕری نصر اللەی ئارەنانی : ١٧٩٥ـ ١٨٥٠ . (٧٣) مەلکە مراویس . (٧٤) شاپرتەوی حەکاری : لە ١٨٠٦ دا دیوانیکی دەستەنی نوسراوەتەوە . (٧٥) خەستە : لە شاعرانی سەدەی ١٣ ی هجریە . (٧٦) ملا محمد امینی امین الاسلامی سنەیی : ١٨٢٤ ـ ١٨٨٣ . (٧٧) مەلا یونسی هەلکانینی . (٧٨) احمدی کویری موکریانی : لە سەدەی هەژدەهەمی میلادیدا ژیاوە . (٧٩) ئەمین بەگی دزەیی . (٨٠) حاجی ملا احمدی نودشی : ١٨١٥ ـ ١٨٨٣ . (٨١) عەلی عاشق : شاعریکی کونی موکریانی بووە ، هیشتا بوم ساغ نەبوتەوە کە لە چە وەختیکا ژیاوە . (٨٢) غولام شا خانی والی ئەردەلان : لە ١٨٦٦ دا مردوە . (٨٣) محمد بەگی دەربەندی .

(٨٤) شیخ حسینی کانی مشکانی : ١٨٢٤ ـ ١٨٨٥ . (٨٥) شیخ محمدی فخرالعلمای سنەیی : کە لەبنەڕەتا خەڵکی گوندی «دژنە» بووە و لە ١٨٨١دا مردووە . (٨٦) محمد حەزین خالدی : لە شاعری کوردوستانی شمالی بووە ، لە «المدیة الحمیدیة» دا شعری هەیە . (٨٧) محمد فیکری . (٨٨) شیخ عبد الرحمانی مەولاناوا : کە بە شیخ عبـدالرحمانی جانەوەرە بە ناوبانگە ١٨٥٨ ـ ١٨٨٣ . جانەوەرە گوندیکە لە مەریوان . (٨٩) رەنجور : ناوی محمد و کوردی یوسف شیخانیە ١٨١٠ ـ ١٨٨٠ . (٩٠) مەستورەخانمی سنەیی : ناوی ماشەرەف و کچی حەسەن بەگی کوردی حەمە ئاغای نازری سنەییە ١٨٠٠ ـ ١٨٤٤ . (٩١) سعداللە کەڵهوڕ : ١٨٠١ ـ ١٨٥٢ . (٩٢) مەلا احمدی شیخ الاسلامی سنەیی ١٨٠٤ ـ ١٨٦٩ . (٩٣) مەحاك : ناوی محمود و کوردی احمدە و لە رەچەڵەکدا زەنگنەیە ، بەلام بە دلوده بەناوبانگە لە ١٨٧٥ مردووە . (٩٤) مەلا قادری شیخ وەسانی : هاوچەرخی حاجی قادری کویی بووە . (٩٥) سری خانمی دیاربەکری : ١٨١٤ ـ ١٨٩٥ . (٩٦) حەیران خانمی نەخچەوانی . (٩٧) عبداللە فانەکەی شیخانی : ١٨١٨ـ١٨٨٥ ، (٩٨) مەلا فتح اللەی سمرد : لەسەرەتای سەدەی ١٤ ی هجریدا ژیاوە ، شعری لە المدیة الحمیدیةدا هەیە . (٩٩) ئامان‌اللە خانی والی ئەردەلان کوردی خەسرەوخانی گەورە ، لە ١٨٢٤ مردووە . (١٠٠) خەسرەوخانی ناکام کوردی ئامان‌اللە خانی والی : ١٧٩٩ ـ ١٨٢٩ . ئەم خەسرەوخانە میردی ماشەرەف خانم بووە و لە ١٨١٩ بووە بـــە والی سنە (١٠١) ئاقەی ئازادە شوخانی کەڵهوڕ . (١٠٢) شیخ حسینی قازی لە سولەیمانی : ١٧٩١ ـــ ١٨٧٠ . (١٠٣) فەقی هومەری جوانڕویی ، شاعریکی شەعبی بووە ، لە دەوروبەری ١٨٧٦ دا مردووە . (١٠٤) احمد بریسی : ١٨١٣ـ ١٨٨٠ . (١٠٥) وەلی دیوانەی کەماڵەیی : ١٨٢٦ـ١٨٨١ . (١٠٦) مەلا لطف‌اللەی شیخ الاسلامی سنەیی ١٨٣٥ ـ ١٨٩٦ . (١٠٧) لەختەر : ناوی امین ئاغاو

کوڕی حاجی بەگزادای کوێی یە ١٨٣٦ ـ ١٨٨٦ . (١٠٨) شیخ عبدالله فیضی : لە ئاخرو ئوخری سەدەی ١٣ ی هجری‌دا بووە ، شعری لە المدینة الحیدیة دا هەیە . (١٠٩) حسین قولی خانی کوڕی مصطفی قولی‌خانی دیوانبەگی : ١٨٣٠ ـ ١٨٨٧ . (١١٠) عبدالله حەسەن مکایلی : ١٨٣٧ ـ ١٨٩٦ . (١١١) مەلا احمد نصیرالاسلامی سنەیی : ١٨٣٨ـ ١٨٩٧ . (١١٢) میرزا رەحیمی وەفایی : ١٨٣٨ ـ ١٨٩٩ . (١١٣) حاجی مەلا عبداللەی کوێی : ١٨٣٩ ـ ١٩٠٨ . (١١٤) کەیفی جوانرۆیی : ١٨٩٤ ـ ١٨٨٣ . (١١٥) مەلـکە جوانرۆیی : هاوّ دەوری مەولەوی بووە . (١١٦) حاجی مەلا احمدی کوڕی مەلا سعیدی تیکانتەپەی موکری : هاو دەوری شیخ رەزا بووە . (١١٧) حاجی مەلا رەسولی دیلیژەیی : ١٨٣٩ ـ ١٩٢٩ . (١١٨) . فەریق : ناوی مەلا رەسول و خەلـکی گوندی « قوخەمامو »ی مەریوانە لە بەین شلیرو بانەدا . (١١٩) مەلا ئابی : ناوی شیخ محمد و کوڕی شیخ سعداللەی مەریوانی‌یە . (١٢٠) مصطفی بەگی باوەجانی ، کە پیان وتوە « مچەگەوج » هاودەوری شیخ رەزا بووە . (١٢١) مەلا وەلەوخانی شاعری جافان . (١٢٢) میرزا یاقوی مایدەشتی . (١٢٣) قەمەر عەلی . (١٢٤) مەلا سالحی سەلارەوەند . (١٢٥) مەلا عبدالخالق پاوە . (١٢٦) زەنوری . (١٢٧) خانەگایی . (١٢٨) شیخ شهابی لونی . (١٢٩) جنونی (١٣٠) داخی . (١٣١) عەلی بەردەشانی گەورە . (١٣٢) عەلی‌بەردەشانی پچوک . (١٣٣) عبدالله فیضی موشی : لە نیوەی ئاخری سەدەی ١٣ ی هجری‌دا ژیاوە . (١٣٤) قادر لموی . (١٣٥) شاکە گەلالی . (١٣٦) مەسور گەلواخی . (١٣٧) یوسف بەگی ئیلامی . (١٣٨) کلاشی ؛ بەربەلی جوانرۆ کەوتوە . (١٣٩) میرزا موسی . (١٤٠) هجری . (١٤١)غەریق . (١٤٢)غەمبار . (١٤٣) سالح لەفەندی ئاغی: لە سەدەی ١٣ـ١٤هجریدا ژیاوە (١٤٤) حەسەن کەنوشی دەلوی : ١٨٤٠ ـ ١٨٩٤ . (١٤٥) مەلا خەلیلی

کورری محمد منەوەری داودە : لە ١٨٩٧ مردوە . (١٤٦) خاکی : ناوی محمدو خەلـکی احمد برزنەیە : ١٨٤١ ـ ١٩١٢ . (١٤٧) مەلا خاکی . (١٤٨) زاهر دیلیژەیی : ١٨٤٢ ـ ١٩٠٠ . (١٤٩) شیخ کولەکەی هەورامی : لە ١٨٦٦ گوزراوە . (١٥٠) امین ئینی سولەئانی کورری احمد : ١٨٤١ـ١٩١٩. (١٥١) احمد فائز کورری سید محمودی گلەزەردەیی : ١٨٤٢ ـ ١٩١٨ . (١٥٢) مەلا سالحی تەررەماری : ١٨٤٥ ـ ١٩٢٠ . (١٥٣) شیخ صمیدی کورری شیخ محمدی دولاش : لە سالانی ١٨٤٦ ـ ١٩٠١ ژیاوە . (١٥٤) سەید سلیمان : شاعریکی خانەقی بووە . (١٥٥) مەلا باقری شیخ الاسلامي سنە ١٨٤٣ـ١٩٠٥ . (١٥٦) مەلا حەمدونی کوبر :١٨٥٣ـ ١٩١٥ . (١٥٧) فەقی قادری هەمەوەنـ ١٨٣٧ ـ ١٨٩٩(*) . (١٥٨) مەلا عەلی شیخانی

---

(*) لە دەورو بەری سالانی « ١٧٠٠ » ی میلادی « خواداقەشەل » ناویک لە عەشرەتی هەمەوەندی دەورو بەری کرماشان بە ناوبانکی شیخ رەزای « هەنگەژالە » وە لە هەـوارگەی خوی ئەبەرری و بە ناوبانی زەهاودا دیی بو بناری پینجوین و ئەچیتە دیی هەنگەژالە بولای شیخ و ئەبی بە دەرویشی شیخ رەزاو ماوەیەکی پی ناچی شیخ لە عەشرەتی « تیلەکو » ژنیکی بو دینیت . خواداد لەم ژنە چوار کورری ئەبي ، یادگار ـ کە پیان وتوە چەلەبي ـ رەمەزان ، رەشید ، سەفەر . زوری پی نەچوە ئەم بەرەبابە لە گوندی هەنگەژالەوە بار ئەکەن و ئەچنە دەشتی بازیان وشاری چەمچەمال بە ناوی چەمچەمالی کونە شوینی خویان لە دەوری کرماشان و بیستونـ ـکە « سولتاناوا » شیان پی وتوە ـ ئاوا ئەکەنەوە و تیایا دائەنیشن . ئەمانە وردە وردە پەرە ئەستینن و هـەر چوار تیرەکەی هەمەوەند ، چەلەبی ـ بەگزادە ، رەمەوەند ، رەشەوەند و سەفرەوەند دروست ئەکەن و ناوو ناوبانـگیکی باش لە دەشتي بازیانا پەیدا ئەکەن =

شنوی . ( ١٥٩ ) مەلا عبدالرحمانی بوورێەری کوردی مەلا جامی ١٨٥٨ ــ

= تەنانەت ئەفسانەیەک لە ناو هەمەوەندەکانا هەیە کە گویا : « لەو سەردەمەدا کە خواداد لە لای شیخ رەزای هەنگەژاڵە بووە شـــەویک خەویک ئەبینی لە خەویا ئاگریک لە سەر کیریەوە بلیسە ئەستێنی و بەر ئەبیتە ئەو شاخ و داخە ، هەر چەندە ئەکەن بەکەس ناکوژێتەوە ا . بەیانی خەوەکەی بو شیخ ئەگیرێتەوە ، شیخ پی ئەلی لە نەتەوەی تو عەشرەتیکی ئازاو گەورە ئەکەوێتەوە . هەر لەبەر ئەمەش بووەکە ئەو ژنە« تپەکوبی »یەی لی ماره کردوە . »

لە راستیدا عەشرەتی هەمەوەند تاریخیکیان لە لاپەڕەی کوردەواریدا گیراوەو بە ئازاتر عەشرەتی کورد بە ناوبانگ بوون ، دو حکومەتی روم و عەجەمیان گەلی جار توشی دەردیسەری کردوە و هەر لە داویشیان دەر نەهاتون ا . پیاوی وەکو « شەریف » هەمەوەندو « جوامیر »ی بەگزادەیان لی هەلکەوتوە ، کە ئەم جوامیرەیان داستانیکی لە حکومەتی ئیرانا هەیە و لە پاشا لە لایەن محمد حسین خان حسام الملکەوە لە ١٨٨٥ بەفیل کوژرا . ژنەکانیشیان ئازاو تفەنگچی و شوورە سوارن . شوین دانیشتنی ئەم عەشرەتە بەینی کەرکوک و سولەیمانی‌یە ، لای روژهەلاتیان روباری باسەرەیە و لای روژاوایان ( قەلا سیوکە ) . لای جنوبیان جەباری ولای شیمالیان ( تاسلوجە )یە . ئـەم عـەشرەتە لە بەین « ٩٠٠ » تا « ١٠٠٠ » خیزانیک ئەبن .

لەو سەر دەمەدا کە « خواداد » و کوڕەکانی لەولاتی چەمچەمالی بازیان ناوو ناوبانگیک پەیدا ئەکەن یەکی لە ئاموزاکانی خواداد کە «چەم سورخاو»ی ناو ئەبی خو بو هەر سە کوڕەکەی ، شاوەیس ، کاکەوەیس و بارام ئەوانیش لە چەمچەمالی کرماشانەوە بار ئەکەن و دین بولای ئەملن ، ماوەیەکی زوری=

١٨٩٦ ـ ناوی شعری « شه‌یدا » بووه . ( ١٦٠ ) مه‌لا محمودی باکی : له

---

= بی‌ناچی « بارام »یان کچیکی چه‌له‌بی هیناوه که ناوی « خاتون » وخوشکی شه‌ریف هه‌مه‌وه‌ن بووه ، بارام لم خاتونه دو کورری بووه ، « عه‌لی گول خاتون » ، « هه‌یه‌ر گول خاتون » . هه‌یه‌ر گول خاتون له شه‌رری به‌بنی تورک و هه‌مه‌وه‌ندا هه‌ر به‌گه‌نجیق ئه‌کوژری‌و هیچ نه‌نه‌وه‌یه‌کی لی به‌جی نامینی . عه‌لی گول خاتونیان (نو) کورری بووه ، مه‌ولا ، فه‌ته ، ئه‌مین ، سه‌عه ، ئه‌حه ، ره‌زا ، سله ، بارام ، مه‌حول . به‌جوریکی تیکررایی لم کوررانه‌ی حواداد و چه‌م‌سورخاوه عه‌شره‌تی هه‌مه‌وه‌ندی ده‌شتی بازیانی ئیمرو که‌وتونه‌وه . هه‌رچه‌نده به به‌ره‌ی چه‌م سورخاو ئه‌لین «سیته‌به‌سه‌ر» ئه‌بی ئه‌مه (سه)تا پسه‌ربی‌و به‌ناوی سه کورره‌که‌یه‌وه بیت به‌لام له‌ره‌چه‌له‌کدا ( سیته‌به‌سه‌ر ) و هه‌مه‌وه‌ن هه‌ر دولا هه‌ر هه‌مه‌وه‌ندی‌و جیا نانه‌وه ، ئه‌و که‌سانه که ( سیته‌به‌سه‌ر ) به‌جاف دا ئه‌نین دور نیه زور چاک لم باسه‌یان نه‌کولیبیته‌وه بویه وایان وتوه‌و تیایا به هه‌له چوون .

ئه‌م عه‌شره‌ته شیوه‌ی قسه‌کردنیان له که‌لهورر ئه‌کا نه‌وه‌ک له جاف ، هه‌مو شافعی مه‌زهه‌بن و زور به‌سوزیشن تیایا . وه‌کو ئه‌مه‌یان هه‌یه ئه‌وه‌شیان هه‌یه ، که لیانه‌وه ئه‌گیررنه‌وه ئه‌وا ئه‌چن :

کاروانیک روت ئه‌که‌نه‌وه ، ده‌مه ده‌می خوراوایه ، یکیکیان نویژی عه‌سری نه‌کردوه . ئاموژگاری ئه‌وانی‌تر ئه‌کا ئه‌لی: ئیوه سه‌ر ریی کاروانه‌که بگرن مه‌یه‌لن بررروا تامن نویژه‌که‌م ئه‌که‌م با نه‌یلم برروا ! .

دیسان له‌گه‌ل ئه‌مه‌شا چه‌ن ره‌وشتیکی تریشیان هه‌یه وه‌کو ئه‌وه ، هه‌ر ، که دوژمنی خوینیان به زه‌بونی هاته به‌ر چاو ئیتر لی‌ئه‌گه‌ررین . ئه‌گه‌ر چون بو روتکردنه‌وه‌ی کاروانیک و ئه‌و کاروانه ژنی له‌گه‌ل بو لی ئه‌گه‌ررین و ده‌ست له کاروانه‌که ناده‌ن . ئه‌گه‌ر هاتو تا کو کیه‌ک له به‌ین دو تیرمیانا =

=هەبوو وە لەو وەختەدا جورئیکی تیکرراپی هات بەسەر هەموپانا، یکیکیان هەلئەستی ئەکەویتە ناو هوزەکانو بەردی ئەگری بەدەستەوە، بانگ ئەکا: کوررینە دوژمنایەتیەکەی خومان با بوەستی‌و ـ لەبەر چاویانەوە بەردەکە لە شوینیک دا ئەنی و ئەلی وا دوژمنایەتیەکەی خومانم لەم شوینە دانا ـ هەستن عیلجارو بکەن با بچین ئەو دوژمنە تیکرراپی‌یە چار بکەین و ئەو وەختە ئەگەررینەوە سەر هینەکەی خومانا ئیتر بەتیکررا هەمو دەستی ئەدەنی(٠).

هەمەوەندە کوچ نەکردوەکانی دەوری کرماشان ئەوانیش لە وەختی خویدا هەرشافعی‌مەزهەب بوون وەکو ئەمان، بەلام بەپی ناوچە لەژیر فشاری سەفەویەکانا ئەوان بوون بە شیعەو لەو وەختەوە ئیتر هەروا ماونەتەوە.

ئەمینیتەوە سەر وشەی « هەمەوەند » . هەندیک ئەلین ئەمە « احمد وەند »ە و کراوە بە هەمەوەندو گویا لە نەتەوەی ئەو « احمد » ناوەن و « وەند » بەمانا « زادە » یە ! . لەگەل ئەوە باوەرری من پیچەوانەی ئەمەیە، من لام وایە : ـ

ئەم وشەیە ئاشنایەتی بە « احمدوەند »ەوە نیە، بەلکو ئەمە لەسەر ئەو شیوەیە کە بە « هەمەوەند » ئەلین « هەماوەند » . ئەسلەکەی « هوما ـ وەند »ە . « هوما » مەلیکی بە نـگینە . « وەند »یش لە پەهلەوی کوندا بەمانا « خاوەن »ە . «هوما» لە سەر زار بووە بە «هەما» . ئینجا هەماوەند ـ هەمەوەند ـ هەمەوەن .

وە یا هەر راستەوراست « هەمەوەن »ە . «هەمە» بەمانا « هەمو »ە .=

(٠) سەرچاوەی بنچینەو پەرەسەندنی ئەم عەشرەتی هەمەوەندە بەم جورە لە عبدالرحیمی هەمەوەن کورری رەشیدی کورری عەزیزی کورری احمدی کورری مەلی گول خاتون وەرگیراوە .

الاسلامی سنه : ١٨٤٩ ـ ١٩٠٩ ، ( ١٦٢ ) خاتو خورشیدی کچی شیخ مارفي کەولوس لە سالانی ١٨٨١ ـ ١٩٣١دا ژیاوە ، ( ١٦٣ ) سید رشید ، ناوی شعري (شەهید) بووەو پیاو چاکیک بووە لەخانەقای شیخی بورهان : ١٨٥١ ـ ١٩٣٣ ، ( ١٦٤ ) محمود پاشای جاف : ١٨٤٦ ـ ١٩٢١ ، ( ١٦٥ ) وەسمان پاشای جاف : ١٨٤٧ ـ ١٩٠٩ ( ١٦٦ ) مەلا عبداللەی عرفان : ١٨٥٤ ـ ١٩١٥ ، ( ١٦٧ ) مهرەبانی کچی مەلا حسنی برواري : لە سالانی ١٨٥٨ ـ ١٩٠٥ ژیاوە ، ( ١٦٨ ) فەقی عبدالرحمانی کورزی فەقی هومەری جوانرروی : ١٨٧١ ـ ١٩٣٦ . ( ١٦٩ ) مەلا سالحی مەلا احمدی سورنج داغی ـ سورنج داغ گوندیکە لە دەوروبەری سەقز ـ لە ١٩٠٠ مردوە ، ( ١٧٠ ) سید احمدی نقیب : ١٨٦٣ ـ ١٩٠٩ . ( ١٧١ ) سید احمدی خانەقا

---

= « ومن »یش لە پەهلەوي‌دا بە مانا « وەکو » . واتەهەمو وەکو یەکن . ئینجا مناسەبە لەگەل ەشرەتەکەدا لە سەر هەر دو مانماکە :

لەسەر یەکەمیان ؛ ئەبی باپیرە هەرە گەورەی ئەمانە خوی لە خویەوە کونوپرر هەلگرابی و ناوی دەر کردبی بە جوریکیوا مەردم لی سەرسام بوبیتن وتبیتیان ئەمە چیە وا زو بەرز بوەوە ؟ . یەکیک لە وەلاما وتبیتی : « بابە ! هوماوەندە » ، واتە خاوەن هوماو نـگینە ، ئیتر ئەو ناوە بررابی بەسەر خویو نەتەوەکەیا .

لە سەر مانمای دوهەمیش ؛ یەکیک لە وەختی خویا چاوی بە هەندیک لەمانە کەوتبیت هـــەمو لە یەک چوبیتن ، مەبەستەکەی خوی ، بوجیا نەکرابیتەوە ! . کە ، لیان پرسیوە ، وتویە « هەمەوەن » واتە « هەمو » وەکو یەک . ئیتر « هەمو وەکو یەک = هەمەوەن » بویان بوبیت بەناو .

بویەش ئەلیم « وەند » بەمانا « زادە » نیە ، چونـکە نە لە پەهلەوي کوندا وە نە لە شیوەکانی کوردي کون وتازەدا وەند نەهاتوە بەمانا زادە .

کوڕی سید حسینی کوڕی شیخ احمدی مەردار: ١٨٧٠-١٩٥٢ . (١٧٢) شکری فەزلی ! هاودەوری شیخ رەزا بووە . (١٧٣) میرزا سەلیمی سابلاخی : لە بەین سالانی ١٩٠٥ - ١٩١٠دا مردوە . (١٧٤) مەلا حەسەنی ابن‌القزلجی : لە ١٩٠٨دا مردوە . (١٧٥) مەلا عبداللەی حاجی قادری کویی لە سابلاخ دانیشتوە ، لە دەوروبەری ١٩١٠ دا مردوە ، ئەم حاجی قادرە حاجی کویی بەناوبانگ نیە . (١٧٦) سید محمد سعیدی کولیجی : لە ١٩٠٦ مردوە . (١٧٧) پیروزی کچی حەسەن کەنوش : لە ١٩١١دا مردوە . (١٧٨) مەلا رحمەاللەی گل : لە ١٩١٧دا مردوە . (١٧٩) شیخ سعیمی شیخ احمدی بەرزنجی : ١٨٤٣ - ١٩٢٠ . (١٨٠) میرزا محمودی سابلاخی: لە ١٩١٥ مردوە . (١٨١) مەلا عارف صائب : ١٨٨٩ - ١٩٢٣ . (١٨٢) شیخ سعیدی کوڕی شیخ محمودی کلدار : ١٨٦٨ - ١٩٢٥ . ئەم شیخ سعیدە ئەوەیە کە ئاژاوەی ١٩٢٥ ی لە تورکیا هەلگیرسان‌و تورکەکان لە داریان دا . (١٨٣) امین فیضی بەگ : لە ١٩١٥ لە حەلەب دیویانە . (١٨٤) شیخ عمری بیارە : ١٨٣٩ - ١٩٠٠ . (١٨٥) شیخ نجم‌الدینی بیارە : ١٨٦٢ - ١٩١٨ . (١٨٦) شیخ بابای غەوسابادی رئیس تەریقەی قادری: لە ١٩١٦ تورکەکان خنکاندیان . (١٨٧) مەلا احمدی حاجی عەلی هەلەبجەیی ناوی شعری «فەوزی» بوەو لە سابلاخ دانیشتوە : لە دەوروبەری ١٩٢٣دا مردوە . (١٨٨) مەلا عەزیزی مفتی سەقز : لە ١٩٢٥ مردوە . (١٨٩) خالصی : ناوی شیخ‌محمدو کوڕی شیخ‌رەزای تالەبانی یە ١٨٧٤ - ١٩٢٥ . (١٩٠) دوکتور سعید خان‌لە: ١٩٢٥ دا مردوە . (١٩١) مەلا محمدی کویری قوبایی : لە دەوروبەری ١٩٢٥ مردوە . (١٩٢) شەفیق : ناوی مەلا احمدو کوڕی مەلا کریمی بیستانە ١٨٧١ - ١٩٢٨ . (١٩٣) مەلا محمدی کوڕی حاجی مەلا عبداللەی کویی : ١٨٨٠ - ١٩٤٣ . (١٩٤) صافی : کاک مصطفی‌ی ئیران : ١٨٧٦-١٩٤١ . (١٩٥) مەلا فەتاح وهبی: ١٨٧٩-١٩٣٩.

( ١٩٦ ) مەلا مارفی کوکی : ١٨٧٣ ـ ١٩٤٦ . ( ١٩٧ ) میرزا حەسەنی صیف القضاة کورری میرزا قاسمی سابلاخی : ١٨٧٧ ـ ١٩٤٤ . ( ١٩٨ ) فەریق حاجی مصطفی پاشا : ١٨٦٨ ـ ١٩٣٦ . ( ١٩٩ ) شیخ بابارەسولی عەبابەیلەیی : ١٨٧٨ ـ ١٩٤٣ . ( ٢٠٠ ) مەلا احمدی مەرخوزي : لە ١٩٢٥ مردوە . ( ٢٠١ ) سید حسین حوزنی موکریانی : ١٨٨٦ ـ ١٩٤٧ . ( ٢٠٢ ) محمد امین زکي عبدالرحمان : ١٨٨٠ ـ ١٩٤٨ . ( ٢٠٣ ) محمود جودەت ١٨٨٩ـ لە ٢٠/ ١١/ ١٩٣٧ خنکینرا . ( ٢٠٤ ) شیخ نجم‌الدین کورری شیخ عبد الرحمانی قەرەحەسەنی : ١٨٩٠ ـ ١٩٤٥ . ( ٢٠٥ ) بابەعەلی بیـــدار خانەقی : ١٨٩٢ـ١٩٤٩ . (٢٠٦) ئەمیر جلادت عالی بەدرخان ١٨٩٧ـ١٩٥١ ( ٢٠٧ ) کامل حسن : ١٨٩٧ ـ ١٩٤١ . ( ٢٠٨ ) مەلا عبداللەی کورری مەلا کریمی پینجوین ، ناوی شعری «مفتی»وزایندەی دیی بیستان بووە : ١٨٩٣ ـ ١٩٥٢ . ( ٢٠٩ ) شیخ عبدالاحد ناکام نەوەی شیخی بورهان : ١٩٠٧ـ ١٩٤٣ . (٢١٠) شیخ احمدی سریلاوە : ١٩٠٤ ـ ١٩٣٣ . ( ٢١١ ) یونس رؤوفی کوبی ، ناوی شعری «دلدار» بووە : ١٩١٧ ـ ١٩٤٨ . (٢١٢) مەلا احمدی قسرت : ١٨٨٩ ـ ١٩٤٥ .



# روژنامەی کوردی

عالەم تیکرا پابەندی کوررانە ئەدەب بەولاترەوە . ئەدەبی کوردي وەکو ئەدەبی قەومەکانی تر لە پیشا لە ناو ئەشکەوتیکا بو کە خیزانیکی نیمچە خیزاني لە کوبی ئاگردانەکیانا کو ئەبونەوە باسی کارەساتی ئەو روژەیان ئەگیرایەوە کە لەگەل دررندەکانا بە سەریانا هاتوە ، ئینجا کەوتەخیزانیکی توزی ریکەو پیکەوەوە ، کەوتە دەوارو رەشمال ، کەوتە گوندو ناو مال ، کەوتە دەم نیمچە خویندەوار ، کەوتە دەمخویندەوارو میرزا ، کەوتە شارو بازارر ، کەوتە کوشکی پیاوی ناودار ، کەوتە سەر کاغەزو تومار ، کەوتە سەرچاپ و بو بەنیگار. لیرەدا ئەم هەمو ژیانە وینەیان دایەوە سەر روژنامەو گوڤار ! . کەوا بو ئاخر پلەی ئەدەبی کوردي گەیشتە چاپو گەیشتە روژنامە . بەم بونەوە میژوی ئەدەبی کوردي داوامان لی ئەکا بزانین کورد لە ئاسمانی ئەدەبی روژنامەدا چی هەبوەو چی نەبووە . ئەوانەی ئاگا دارین بەسەریانا باسیان ئەکەین .

کورد تا ئاخری ئوخری سەدەی نوزدەهەم هەر لەو عالەمەدا بو کە لە پیشەوە باسمان کرد ، لەم میژوە بەدواوە عالەمیکی تری زیاد کرد کە عالەمی ئەدەبی روژنامەیە . کەوابو پیویستە یکە یکە باسی ئەو روژنامەو گوڤارانە بکەین کە تا ئەم میژوە « ١٩٥١ » دەریان کردون : ـ

(١) « کوردوستان » روژنامەیەکی حەفتەیی ئەدەبي بووە ، مدحت بەگ نەوەی بەدرخان بەگ سالی ( ١٨٩٧ ) لە ئەستەمبول دەری کردوە ، لە پاشا لەبەر نەخوشي مدحت بەگ عبدالرحمان بەگی برای دەستی داوەتی لە پیشا لە قاهرە لە پاشا لە « جەنیف » ، لە « فولکستون » ، لە « لەندەن » بەم جورە لە گەررانا بووە تا ١٩١٥ ـ ١٩١٦ . ئینجا « ثریا بەگ » بەدرخان

هینایەوە بو قاهرە ، هەر بەپانزە روژ جاری ژمارەیەکی بە کوردی و تورکی لی دەر ئەکرد. کە ئیعلانی دستوری عوسمانی کرا هەر ثریا بەگ بردیەوە بو ئەستەمبول و لەوی دەری کرد . لە ژمارە یەکەوە تا ۳۱ ی ئەم روژنامەیە ئیستە لە کتیبخانەی ( پروصیا )دایە لە ئەلمانیا .

( ۲ ) گوڤاری ( کوردوستان ) مانگی جاری لە ( ورمی ) مبەشرەکان لە سالی ۱۹۱۲ دەریان ئەکرد . بەلام زور نەژیا .

( ۳ ) « کورد » روژنامەیەکی حەفتەیی ئەدەبی کوردي و تورکي بووە ، کومەلی شیخ عبد القادری شیخ عبیداللە لە ۱۹۰۷ لە ئەستەمبول دەریان کردوە .

( ٤ ) « روژی کورد » گوڤاریکی حەفتەیی ئەدەبي بووە ، لە حەزیرانی ۱۹۱۱ کومەلی هیوا لە ئەستەمبول دەریان کردوە ، ژمارەی یەکەم و دوهەم و سیهەی عبدالکریم ئەفەندی سولەیمانی سەرنوکاري کردوە ، لەو ژمارانەدا وینەی دو پادشاکەی کورد صلاح الدینی ئەیوبی و کریم خانی زەندو بەدر خان حسین کەنعان پاشای تیایانا دەر کردوە . ئەم گوڤارە لە پاشا ناونرایە (هەتاوی کورد) عبدالعزیز بابان هەر بە مانگیجاری ژمارەیەکی بە کوردي و تورکي لە ئەستەمبول لیدەر ئەکرد ، یەکەم ژمارەی لە ۱۱ ی تشرینی یەکەمی ۱۹۲۹ ی رومی ۱۹۹۳ ی میلادی بووە ، وینەی عبدالرحمان پاشای بابان لەو ژمارەیدا هەیە .

( ٥ ) « بانگی کورد » گوڤاریکی کوردی و تورکی ئەدەبي بووە ، هەر بە پانزە روژ جاری خاوەنەکەی جمال بابان لە بەغدا دەری کردوە . یەکەم ژمارە لە ۲٦ ی کانونی دوەمی ۱۹۱۳ م . ۱۹۲۹ ی رومی دەرچوە ، نازانم چەندە ژیاوە . ئەوەندە هەیە زوری لی دەرنەچووە .

(٦) «تی گەیشتنی راستی» روژنامەیەکی حەفتەیی کوردي پیلاني- سیاسي کومەلایەتی بووە ، ئیحتلالی ئینگلیزی لە سالی ۱۹۱۸ لە بەغدا دەری

کردوه . ژمارەی ٢٠ ی بەر ١١ ی مارتی ١٩١٨ کەوتوه ، ئیتر نازانم چەن ژمارەی لی دەرچووە .

(٧) « کوردوستان » روژنامەیەکی حەفتەیی پیلانی ئەدەبی بووە ، لە ئەستەمبول محەمەدمهری یەکەم ژمارەی لە ٢٥ی ربیع الاخری ١٣٣٧ هجری - ١٩١٧ میلادی دەر کردوه ، لە پاش ئەوە کە ٣٧ ژمارەی لی دەرچو لە ٧ ی رەجەبی ١٣٣٨ . ﻫ - ١٩١٨ . مدا داخرا .

(٨) « پیشکەوتن » روژنامەیەکی کوردی ئەدەبی حەفتەیی بووە ، لە شاری سولەیمانی بلاوە دەری کردوە . یەکەم ژمارەی لە روژی ٨ ی تشرینی دوەمی ١٩١٩ دەرچووە . « ٣ » سال ژیاوەو ١١٨ ژمارەی لی دەرچووە .

(٩) « کورد » روژنامەیەکی کوردی و زمانی حالی سمایل ئاغای سمکو بووە ، لە ١٩٢١ لە شاری « ورمی » دەرچووە ، تەنها سە چوار ژمارەی لی دەرچو لەوەدوا پەکی کەوت .

(١٠) « بانگی کوردوستان » روژنامەیەکی ئەدەبی زانیاری حەفتەیی کوردی بووە ، فەریق حاجی مصطفی پاشا لە سولەیمانی دەری کردوە ، یەکەم ژمارەی لە ٢ ی ئاغستوزی ١٩٢٢ دا بووە ، لەم کاتەدا تەنها ١٤ ژمارەی لی دەرچو ، لە سالی ١٩٢٥ دا لە بەغدا (٣) ژمارەی تری لی دەرچو و ئیتر بە تەواوی پەکی کەوت .

(١١) « روژی کوردوستان » روژنامەیەکی حەفتەیی کوردی بووە و زمانی حالی حکومەتی شیخ محمود بووە . م . نوری لە سولەیمانی دەری کردوە . یەکەم ژمارەی لە ١٥ ی تشرینی دوهەمی ١٩٢٢ دا دەرچوە ، تەنها ١٥ ژمارەی لی دەرچو .

(١٢) « بانگی حەق » روژنامەیەکی ئەدەبی کوردی حەفتەیی بووە ، لە سالی ١٩٢٣ تەنها (٣) ژمارەی لە سولەیمانی لی دەرچووە .

(١٣) « ئومیدی ئیستقلال » روژنامەیەکی کوردی حەفتەیی پیلانی و

ئەدەبی بووە لە شوین جەنگی حق دەرچووە زمانی حالی حکومەتی شیخ محمود بووە و لە سولەیمانی دەرچووە . یەکەم ژمارەی لە دوی ئەیلولی ١٣٣٩ی رومی ١٩٢٣ میلادی احمد صبری لە سولەیمانی دەری کردوە ، لە ژمارە چوارەوە رفیق حلمی دەستی دایە تا ژمارە چواردە ، لەوە بەدواوە حسین ناظم دەری کرد . هەموی ٢٥ ژمارەی لی دەرچو .

( ١٤ ) «ژیانەوە» روژنامەیەکی ئەدەبی حەفتەیی کوردی بووە ، حکومت لەسولەیمانی دەری کردوە، یەکەم ژمارەی لە ١٨ی ئاغستوزی ١٩٢٤دا بووە . بەو ناوەوە تا ١٤ ی کانونی دوهەمی ١٩٢٦ « ٥٦ » ژمارەی لی دەرچو ، لە پاشا بو بە « ژیان » ، یەکەم ژمارەی لە ٢١ ی کانونی یەکەمی ١٩٢٦ دا دەرچووە،لە ١٤ ی ئابی ١٩٣٤ کە ژمارە گەیشتە ٤٠٦ حاجی توفیق پیرەمیرد ئیمتیازەکەی بوخوی وەرگرت . لە(٢٠)ی مارتی ١٩٣٨دا کە ژمارە گەیشتە (٥٥٣) ئیتر پیوە درا .

( ١٥ ) « دیاری کوردوستان » گوفاریکی حەفتەیی ئەدەبی کومەلایەتی بووە ، لە ١١ ی مارتی ١٩٢٥ یەکەم ژمارەی لە لایەن خاوەنەکەیەوە صاحبقران زادە صالح زکی بە کوردی وعەرەبی و تورکی لە بەغدا دەرچووە ، هەرچەندە حەفتەیی بو بەلام هەر بە ١٥ روژجاری ژمارەیەکی دەرئەچو ، تەنها ( ١٦ ) ژمارەی تا مایسی ١٩٢٦ لی دەرچو ئیتر وەستا . ئەم گوفارە یەکیک بووە لە گوفارە چاکەکانی کورد .

( ١٦ ) « زاری کرمانجی » گوفاریکی کومەلایەتی ، تاریخی و ئەدەبی کوردی بووە ، لە لایەن خاوەنەکەیەوە سید حسین حوزنی موکریانی یەکەم ژمارەی لە حەزیرانی ١٩٢٦ کە ١٢ ی ذیلقعدەی ١٣٤٤ هجری لەگریتەوە . لە رواندز دەرچو تا ١٩٣٢ . ناوبەناو ئەم گوفارە نزیکەی «٣٠» ژمارەیەکی لی دەر کردوە .

( ١٧ ) « روناکی » گوفاریکی حەفتەیی ئەدەبی کوردی بووە ، لە لایەن

شیت مصطفی وە لە هەولیر دەرچووە ، ژمارە « ١٠ »ی بەر روژی ٢٥ ی نیسانی ١٩٣٦ کەوتوە ، ئیتر نازانم چەن ژمارەی لی دەرچووە .

( ١٨ ) « زبان » روژنامەیەکی حەفتەیی بووە لە مارتی ١٩٣٨ تا کانونی دوەی ١٩٣٩ لە سولەیمانی دەرچووە .

( ١٩ ) « ژین » روژنامەیەکی حەفتەیی ئەدەبی کومەلایەتی کوردی یە ، لە لایەن حاجی توفیق پیرەمیردەوە یەکەم ژمارە لە ٢٦ ی کانونی دوەی ١٩٣٩ لەسولەیمانی دەرچووە . لە ١٩ حەزیرانی ١٩٥٠ کە پیرەمیرد مرد (جمیل صائب) بو بەسەرنوسەری روژنامەکە . لە ١٣ تشرین یەکەمی ١٩٥١ جمیل صائب مرد ، مامی نوری امین محمود سەروکاری روژنامەکەی بە ناوی مدیری مسؤلەوە کرد ، لە ژمارە ( ١١٠٦ ) احمد زرنگ بە ناوی سەروکاری ادارەوە خەریکی بو . لە ژمارە ( ١١٢٢ ) کەبەر ٦ ی تشرینی دوەمی ١٩٥٢ ئەکەوی « گوران » بو نوسین و ئەرکی ناوەوەی روژنامەکە لە گەل نوری امین محمود قولیان کرد بە یەکاو ئیستە لە ژیر ادارەی ئەوانا ئەو روژنامەیە ئیش ئەکا .

( ٢٠ ) « هاوار » گوڤاریکی ئەدەبی نیو مانگی بووە ، نیوەی بەتیپی لاتینی ئەنوسرا لە سەر شیوەی بوتان ، یەکەم ژمارەی لە ١٥ی مایسی ١٩٣٢ لە لایەن خاوەنەکەیەوە ئەمیر جلادت عالی بەدرخان لە شام دەرچووە ، تەنها ١٤ ژمارەی لی دەرچو ئیتر پەکی کەوت . ئــەم گوڤارە یەکی لە گوڤارە چاکەکانی کورد بووە .

( ٢١ ) « زانستی » گوڤاریکی نیومانگی ئەدەبی و تاریخی بووە ، یەکەم ژمارەی لە ٢٥ ی شوباتی ١٩٣٨ لە سولەیمانی لە لایەن خاوەنەکەیەوە صالح قەفتان دەرچوە ، لام وایە هەریەک ژمارەی لی دەرچو .

( ٢٢ ) « گەلاویژ » گوڤاریکی ئەدەبی عیلمی بووە ، مانگی جاریک لە بەغدا دەرچووە،خاوەنەکەی ئیبراهیم احمدو سەر نوسەری علاءالدین سجادی

بوه ، یەکەم ژمارەی لە کانونی یەکەمی ۱۹۳۹ دەرچووە، «دە» سال ژیاوە ، (۱۰۵) ژمارەی لی دەرچووە ، لە ژمارەی ئاغستوزی ۱۹٤۹دا داخرا ، ئەم گوڤارە چاکترگوڤاری ئەدەبی وعیلمي کورد بووە .

( ۲۳ ) « روناهی » گوڤاریکی ئەدەبی حەفتەیی بووە ، لە لایەن خاوەنەکەیەوە جلادت عالی بەدرخان لە شام بەتیپی لاتینی و لەسەر شیوەی بوتان لە تشرینی یەکەمی ۱۹٤۱ یەکەم ژمارەی دەرچووە . ئەم گوڤارە بەریکو پیکی ژیاوە تا لە ۱۹٤٦ دا داخرا .

( ۲٤ ) « دەنگی گیتی تازە » گوڤاریکی پەیامی و ئەدەبی بووە ، بالویزخانەی بەریتانیا لەبەغدا دەری کردوە ، سەرەتا بلاو کەرەوە بووە لە پاشا بەوینەی گوڤار یەکەم ژمارەی لە تشرینی یەکەمی ۱۹٤۳ لە بەغدا دەرچووە ، توفیق وهبی و سید حسین حوزنی موکریاني سەرنوسەری بوون . لە سەرەتای ئەیلولی ۱۹٤۷ دا ئیتر دەر نەچو .

( ۲٥ ) « ری تازە » گوڤاریکی مانگانەیی بووە لە « رەوان »ی روسیا یەکەم ژمارەی لە تشرینی یەکەمی ۱۹٤۳دا دەرچوەو بەتیپی لاتینی ئەنوسرا ئیتر نازانم چەن ژمارەی لی دورچوەو کەی پەکی کەوتوە .

( ۲٦ ) « نیشتمان » گوڤاریکی ئەدەبی و پیلاني بووە ، لە ( مەهابادـ سابلاخ ) مانگی جاریک دەرچووە ، یەکەم ژمارەی لە حەزیرانی ۱۹٤۳ دەرچو ، تا ئەیلولی ۱۹٤٥ تەنها ۹ ژمارەی لی دەرچو لەوەدوا پەکي کەوت . ئەم گوڤارە زمانی کومەلەی ( ژ . ک ) بووە .

(۲۷) « کوردوستان » روژنامەیەکی ئەدەبی پیلاني ـ سیاسي کوردی و زمانی حالی حکومەتی قازی محمد بووە ، لە نیوەی دوەمی کانونی دوەمی ۱۹٤٦ تا کانونی یەکەمی عەینی سال هـــەر بە دو روژ جاری لە شاری ســـابلاغ ژمارەیەکیان لی دەر کردوە . هەموی ۱۱۳ ژمارەی لی دەرچووە .

(٢٨) « روزانوی » گوڤاریکی حەفتەیی ئەدەبی بووە ، لەسەر شیوەی بوتان بەتیپی لاتینی یەکەم ژمارەی لە لایەن خاوەنەکەیەوە کامیران عالی بەدرخان لە ٣ ئەیاری ١٩٤٣ لەبیروت دەرچووە ، ئەم گوڤارە تا سالی ١٩٤٦ ژیاو لەوەدوا پەکی کەوت .

(٢٩) « ستیر » گوڤاریکی ئەدەبی حەفتەیی بووە ، لەسەر شیوەی بوتان بەتیپی لاتینی یەکەم ژمارەی لە لایەن خاوەنەکەیەوە کامیران عالی بەدرخان لە ٦ ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣ لەبیروت دەرکراوە . تا سالی ١٩٤٥ ژیاولەوەدوا پەکی کەوت ، ئەم گوڤارەیان زورتر پررو پاگاندەی جەنگ بو بوهاو پەیمانەکان و بە فەرەنسزیش تیا ئەنوسرا .

(٣٠) « کوردوستان » گوڤاریکی ئەدەبی و پیلانی بووە ، لە پاییزی ١٩٤٥ تا کانونی دووەمی ١٩٤٦ بەناوی کومەلەی دیموکراتی کوردوستانەوە لە سابلاخ ١٨ ژمارەی لی دەرچووە و ئیتر پەکی کەوتووە .

(٣١) «هەلالە» گوڤاریکی ئەدەبی و پیلانی بووە بو لقی حزبی دیموکراتی کوردوستان ، لە ٢١ ی مارتی ١٩٤٦ تا حەزیرانی عەینی سال ٣ ژمارەی لە شاری بوکان دەرچووە .

(٣٢) « هاواری نیشتمان » تاقە ژمارەیەکی بەگوڤاروئەوانیتری بە وینەی روژنامە لە لایەن لاوانی کوردوستانەوە لە سابلاخ لە ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ چەن ژمارەیەکی لی دەرچووە .

(٣٣) « نزار » گوڤاریکی سیاسی ـ پیلانی حەفتەیی بووە ، بە زمانی عەرەبی و کوردی لە بەغدا هەر بە ١٥ روژ جاری ژمارەیەکی دەرچووە ، خاوەنی و سەر نوسەری علاء الدین سجادی بووە ، یەکەم ژمارەی لە (٣٠) مارتی ١٩٤٨ دەرچووە تا ١٥ ی شوباتی ١٩٤٩ (٢٢) ژمارەی لی دەرچوو ئیتر داخرا . ئەم گوڤارە لاپەرەیەکی روناکی لە تأریخی سیاسی کورددا بووە .

( ٣٤ ) « هەولیر » روژنامەیەکی ئەدەبی خویندەواری حەفتەیی‌یە ، بەزمانی کوردی و عەرەبی لە لایەن کومەلی ماموستایانی لقی هەولیرەوە بە ناوی کومەلەوە یەکەم ژمارەی لە ( ١٦ ) ی کانونی یەکەمی ( ١٩٥٠ ) دا لە شاری هەولیر دەرچووە . کومەلی ماموستایان کومەلیکە لە ١٩٤٣ لە لایەن وەزارەتی مەعارفی عیراقیەوە بو هەمو ماموستایانی مەعارفی عراق دامەزراوە، ئەو لقەی لە هەولیر لە ١٩٥٠ دا کرایەوە . دەستەی نوسەرانی ئەم روژنامەیە عبدالمجیدحسن ، عز الدین فیضی و ئەستیر سعید بووە ، لە ژمارە ( ٨٩ )ی روژنامەکە ، کە بەر ٣٠ ی ئەیلولی ١٩٥٢ ئەکەوی حسین رەشوانی لە شوین عبد المجید حسن دانیشت .



# ئەدەبی عالەم

تا ئەم شوینە باسی چونیەتی سەرەتای میژوی ئەدەب و پەیدابونی ئەدەب کرا و هاتینە سەر ئەدەبی کوردی لە پەیدا بونیەوە تا گەیشتە ئەدەبی شاعرە گەورەکانی کورد و ئەدەبی روزنامە .. لە ئیستە بەدواوە ئەمانەوی لە پیشا لە هەر یەکێ لەم پارچە زەویانەدا کە کەوتونەتە روزەلانی کونەوە و خاوەنی ئەدەب و ئەدەبیات بوون بە ئەندازەی دەسەلات توزیکیان لی باس بکەین و لە پاش ئەوە بچینە سەر ئەدەبی روژاوا ، وە یا ئەدەب بە تیکرا لە سەرەتای سەدەکانی ناومراستەوە تا ئیمروز بو ئەوە لە پاش خویندنەوەی ئەم کتیبە بتوانری - با ، بەکەم و کورریش بی - بەراوردیک لە بەینی ئەدەبی کوردی و ئەدەبی عالەمدا بکریت. وە دیسان میژوی ئەدەبی کوردی وەنەبی ئەوەندە تەریک بیت لە عالەم کە بیزی لەم جورە شتانە بیتەوە ! . بەلکو لە گەل ئەوەش کە خراوەتە پشت گوی کەمو زوریک هەر ئەتوانی تاکی تەرازوی خوی راست کاتەوە ..

جا بەو بونەوە کە قسەمان لە ئەدەبی هەر قەومیکەوە کرد ئەدەبیکی کوردیشی لە گەلا باس ئەکەین بو ئەوە هەر دوکیان لەم مەیدانەدا بو دەرکەوی و بەراورد لە بەینی ئەدەبی دو قەومدا بە پی زەمان بیتە دەست پیاو - کە ئەمە خزمەتیکە بەرامبەر بە عیلم و ئەدەب ئەکریت - . سەرەتا لە ئەدەبی میسری کونەوە دەست پی ئەکەین :

## ئەدەبی کوردی و میسری کون

ئەدەبی میسری ئەوانەیە لە کونیەتیدا هاوشانی ئەدەبی کلدانی برروا .

کونتر شتێکێ کە لە میسر بە کونەکانەوە مابێتەوە ( کتێبی مردوان ) ە کە لە دەوری دروست کردنی هەرەمە گەورەکەی میسردا لەسەر توێکلی (بەردی) ـ کە گیایەکە وەکو قامیش لە توێکلەکەیان ئەنوسی ـ نوسراوەتەوە ، ئیستەش نوسخەیەکی لە موزەخانەی بەریتانیادا هەر هەیە . . لەویدا لە پێشا باسی پاڕرانەوە لە خوا ئەکا لەگەل بەستەی نوێژ کردندا ، لە پاشا دیتە سەر ئەوە کە لە روژی دوایدا لێ پرسینەوە هــــەیە و ئەرواح ئەهێنرێتە ژێر حسابەوە . نوسخەیەکیان لەمە ئەنوسیەوەو لەگەل مردوەکەدا ئەیانتایە گوڕرەکەوە ! ...

لەمەوە ئەوە بو ئیمە دەر ئەکەوی کە فیکرەی ئەدەبی لە میسری کوندا لە بەینی چواردیواری پەرستگاکانەوە دەرچووە وبەشی زوری ئەدەبی میسری لەسەر ریی وشوینی ئایینی بووە .. لەم روەوە میسری کون و کورد ـ چە کوردی کون ، چە تازە ـ لە دوشتا وەکو یەکن ؛ یەکەم چون لە میسردا فیکرەی ئەدەب سەرەتا لە پەرستگاکانەوە چوزەرەی دەر کردوە ، لە کوردیشدا هەروا بووە . تەنانەت هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمیش ئەدەب لە کوردەواریدا چە ئەدەبی فەلسەفی ، چە غەرامی ، چە عیلمی هەر لە چوار دیواری مزگەوتەکانەوە سەری هەلداوە .. دوهەم لەوەدا وەکوچون ئەوان نوسخەیەکت لەو نوسراوەیان لەگەل مردوەکەدا ئەخستە گوڕرەکەوە لە کوردیشدا ـ دیارە ئەکەم ئەلین کورد زورتر بو رەوشت و عادەت کوچەری ولادی نشینە کاغاز مەبەستە ـ ئەو کەسە لە دەوری ژیانیا لە وردە بابەتی ناومال زورتر چی خوش بویستایە لەگەلی ئەیانتایە گوڕرەکەوە .

ئەم کردەوەیە هەر چەندە هەروا بە ساویلکەیی ئەکراو ورد نە کراوە-تەوە بەلام ئەوە پیشان ئەدا کە لە بیرو باوەرری کونیانا هەر برروایان بەزیندو بونەوەو حساب بووە ، وەکە حسابی دنیای لێ داوا کرا ، گویا بلێت من هەر شتێکم کردوە لە بەر ئەم شتەم کردوە کە ئیستە لەبەر دەستمایە ، وا لەگەل

خوم هیناوه ا . . ئەم فیکره هەر وا بە ساویلـکەیی هاتوتە خوارەوه بەلام سەرەتاکەی ئاوا بووه . دیسانـ تەنانەت ئیستەش لە هەندی لە کوچەریە دوره دەستەکانا مردو لەو وەختەدا کە گیانەکەی دەر ئەچیت لە وەختی ژیانیا چە جوره ئیشیکي بو بیت لە سەرە مەرگەکەیدا شتومەکي ئەو ئیشەی ئەخەنە دەستەوم ، ئەگەر مالاني بەخیو کردبیت گالوکـ ، ئەگەر جەنگاوەر بوبیت خنجەر ، ئەگەر میرزا بو بیت قەلەمیکـ ئەخەنە دەستیەوه ا . من خوم لە کوردەکانی ( کومابن )دا چاوم پی کەوت کابرایەکـ مرد لە سەرە مەرگەکەیا گالوکیکیانـ خستە دەستیەوه . . دور نیە ئەم فیکرەشە هەر وەکو فیکرەی پیشو بیت ...

ئینجا ئەمە نمونەیەکە لە « کتیبی مردوان »ی میسری کون :

«سەلامت لی بی ئەی خوای گەورەو راست ، هاتوم ا ئەی خوا بو ئەوە شاهدي بدەم لە سەر گەورەییت ، هاتوم ئەی خوا ا خوم بەخشلي حەق رازاندوتەوه و دور کەوتومەتەوه لە ناهەق ، جەورم لەکەس نەکردوه ، ریچکەی پیاو خراپانم نەگرتوه ، سویندم بە درو نەخواردوه ، ئارەزو هەلي نەخەلەتاندوم بو ئەوە چاو ببرمە ژني خزمیکم ، دەستم بو مالي کەس دریژ نەکردوه ، دروم نەکردوه ، نافەرماني توم نەکردوه ، خوم بەوەوه خەریکـ نەکردوه کە قولیکـ لە بەرچاو ئاغاکەی بخەم و ئاغەکەی لی توررە بکەم ، نە لەکەسم داوه نە ئیشم بەکەس گەیاندوه ، کەسم نەکوشتوەو ناپاکیم لەگەل کەس نەکردوه ، بەلـکو کەسیشم هەلنەخراندوه بو ئەوە کەسیکي تر بکوژیت ، نانم لە مزگەوت نەدزیوه ، مالم لە کەس داگیر نەکردوه ، بی قەدەوي ـ بی ئەدەبي ـ م بەرامبەر بە مردوان نەکردوه، قسەی خراپم بەدەما نەهاتوه ،شتیکي پیروزم پیس نەکردوه ، گەنمم بە نرخیکي گران نەفروشتوەو ترازوبازیم نەکردوه ، من پاکم ، من پاکم ، من پاکم ، من پاکم . تا مابوم لە گوناح دور بوم . خوایە لە ریزی سەرکەوتواني لای خوتا دام بنی » . .

کانی دەست ئەم ئەدەبەوە ئەو ئەدەبەشیان بووە کە بەسەروبالای پادشا- کانیانا هەڵدابێت و لەسەر زمانی شەعبەکەوە ئەفسانەو حکمەت و پاساشیان بوبێت . لەم روەوە کتیبی ( وصایا )یان هەیە، کەمی ( بەتاح حوتەب )ە ...
لە چیروکیشدا کوتتر چیروکی میسری کوت حەقانەی ( ئوزیریس )و ( ئیزیس )ە .. بە کورتی ئەم چیروکە :

( ئوزیریس ) رەوانە کراوی خوابو کە داد لەسەر زەویدا بلاوکاتەوە ، مەردمی فیرکشت وکال و دوزینەوەی ( کان ) کرد . ( تحوت ) خوای زانینو زانیاری ئەم شتانەی فیر ئەکرد ، ئینجا ویستی بە هەمو سەرزەویدا بسوورریتەوە بو ئەوە ئەو راسپیریە بگەیەنیت ، خوی بە لەشکریکی زورەوە رویشت و ( ئیزیس )ی ژنی لەسەر تەختی میسرەوە لە شوین خوی دانا ، ئیشی خوی کردو گەررایەوە . برایەکی هەبو ( سیت )ی ناوبو . ( سیت ) ویستی ( ئوزیریس ) لە ناوبەریت ! هینای بانگیشتنیکی بو کردو گەلی لە پیاوە گەورەکانیشی کو کردەوە ، لە زوری نازخواردندا سنوقیکی بەنرخی نەخش کراوی بە ئالتون و زومروت دانا ، هات بەدانیشتوەکانیوت : هەرکە چوە ئەم سنوقەوەو پرری بو ئەیدەم بە خوی ! . دانیشتوەکان یەکە یەکە خویانیان تاقی کردەوە سنوقەکە لە ئەندازەی کەسیانا نەبو . سەرە هاتە سەر ( ئوزیریس ) کە ئەو چوە ناوی پرر بە پرری دەرچو ! . ( سیت )و دەستو پیوەندەکەی هاتن سەر سنوقەکەیان داخست و مشەمایان لی گرت وخستیانە روباری ( نیل )ەوە ! . ئەم باس و خواسە بلاو بوەوە تابەر گوێی ( ئیزیس ) کەوتەوە . زور خەمگین بوو بەژارە دایگرت ، هەستا دەستی کرد بە گەرران لە « نیل »دا دوزیەوە هینای لەشەکەی (ئوزیریس)ی لیدەرهینا گورریکی بو هەڵکەندو ناشتی . (سیت) ئەمەی پی خوش نەبو ، چو لەشەکەی لە گوررەکە دەر هیناو پارچە پارچەی کرد و هەر پارچەیەکی فرریدایە شوینیک .
( ئیزیس ) دیسانەوە دەستی کردەوە بە گەرران ، هەر پارچەیەکی لە هەر

خوێنیک ئەدوزیەوە هــەر لەوێدا گوڕیکی بو هەڵئەکەندو ئەیناشت و دا ئەنیشت بەسەریەوە ئەپلاوانەوە . ئینجا لەگەڵ ( حوریس )ی کوڕیا هانا ئەبەنە بەر خواکان ، ئەوانیش (میت) لە پادشایەتی ئەخەنو (حوریس) لە شوێن باوکی دا ئەنێن » .

ئەم چیروکی ( ئوزیریس ) و ( ئیزیس )ە و پەرستنیان لە میسرییەکانەوە پەرەی سەندو کەوتە یونانو رومان . لە سەدەی چوارەمی پێش میلاد لە دولی ( پیریە ) لە یونان پەرستگاهیک بو ( ئیزیس ) دروست کرا . دیسان لە « پوزول » لە لای ئیتالیشدا لە رومان پەرستگاهیکی تریان بو دروست کرا ، لە ( بومبی )یش یەکیک بو ( ئیزیس ) دروست کرا ، لەویشەوە ئەم پەرستنە گەیشتە ئەسپانیاو فەرەنسا و ئینگلتەرە . لەسەر ئەم باسە نوسەرەکان زور رویشتون . .

میسرییە کونەکان وەکو چون لە ئەدەبی چیروکیدا هەنگاویان هاویشتوە هــەروەها لە ئەدەبی نەفسی و کومەلایەتی و سیاسیو ئاینیشدا ئەو هەنگاوەیان هاویشتوە . جا بەو بونەوە ئەمە نمونەیەکە لە ئاموژگاریەکانی ( بەتاح حوتەب ـ ٣٥٠٠ ) پێش میلاد ، بو کوڕەکەی :

( ئەگەر ئەتەوی خەلک چاکەت بلێن خوت لە چلیسیو تەماع پارێزە ، چونکە چلیسی دەردێکە دەرمانی نیە هاورێتی لەگەلا ناگیرێت . هەرچی خراپەیە لەودا کو بوتەوە ، تورەکەی هەمو سوکیێکە ... ئەگەر لە پاش زەبونی گەورە بویتو لە پاش هەژاری دەولەمەند . وریابە زەمانی ، زەبونیو هەژاریت لە بیر نەچیتەوە ، کوششی خوت بخــەرەسەر زانینو قسەی بەرێوجی . لەپیش ئەوەدا فەرمان بەشتیک بدەیت فیکری لی بکەرەوە ، هەلەشەیی زور خراپە ، ئینجا کە فەرمانەکەت دا لە خوت بایی مەبە ، لە قسەو فەرماندا توندو تیژی مەنوێنە ، هەمو دەم بە شوێن ئەوەدا بگەڕێ کە فەرمانت نەشکیت ، هیمنی گەلی کوسپ تەخت ئەکا ، توڕەیی ژیان تال ئەکا ).

ئەمەش نمونەیەکە لە ئاموژگاریِ سیاسیِ کە (خیتیِ سیەم) ئەیکا بە کورِرەکەی کە (خیتیِ چوارەم)ە : . . (قسەزان و زمان پاراوبە بەهیز ئەبیت ، زمانِ بو پادشا چاکترو بەکەلـکترە لە شیر بو شەرر ، پیاوی ئیش زان و لی هاتوو بخەرە مەرئیش چاوت لەوەوە نەبیِ کە کورری پیاوی گەورەیە، یا بچوکە . دەست بگرە بەداوینی داد و مەبولەوە ، وریابە خراپە لەگەل هەتیو و بیوەـ ژنان مەکە ، یەکی میراتیکی لە باوکیەوە بو ماوەتەوە دەستی بو دریژ مەکە ، تا گوناح لە یەکیك نەبینیِ جەزرەبەی مەدە ) .

نمونەیەکە لە پەستەی گورانیِ شەعبی میسری کون :

( نەخوشم هیچ نەخوشیەکیشم نیـە ، دراوسیکانم سەرم لی ئەدەن . خوشکەکەشم هەر سەرم لی ئەدا . گالتەی پیِ دیت کە پزیشکەکانم ئەبینیت چونـکە ئەزانی دەردەکەم بەوانـ چار ناکریت . مالیِ خوشکم ! . بریا دەرکەوانیِ مالەکەی بومایە بو ئەوە ئەگەر بەمە توررە ببوایە گویم لە دەنگیِ توررەییەکەی ببوایە . وەکو منالیك لەبەر دەم یەکیکا بوەستیِ و زورشەرمیِ لی بکا بەو جورە لەبەر دەم خوشکما ئەوەستام ! ) . ـ میسرییە کونەکان بە دوستیان ئەوت خوشکـ ـ

نمونەیەکە لە غەزەلیِ کچی میسری کون :

( من کە بیرت ئەکەمەوە دلم ئەلەرزیِ و دەست ئەکـا بە تەپە تەپ ، خوشەویستیِ تو وام لی ئەکا لەو ژیانەم دەر ئەکا کە هاوریکانم تیایا ئەژین . نازانم چون جلەکانم لەبەر کەم ؟ چون شتومەکەکانم ریکـ خەم . چون چاوم بررێژم و چون خوم بون خوش کەم ؟؟ ) ...

لە ئەدەبیِ غەرامیِ میسری کوندا گەلی جار رەشایی موی دوستیان کردوە بە تاریکی شـــەو ، وە بریسکەی ددانەکانیِ بەو پررشەو شەوقە کە لە بەرد ئەبیتەوە . ناوی بالای بەرزو سنگی تەررو مەمکی خرریشیان هیناوە . .

* * *

ئینجا ئەدەبی کورد بەرامبەر بە ئەدەبی میسری کون :

وەکو وترا ئەدەبی کوردی نەنوسراوەتەوە و هەلنەگیراوە ، ئەنگو چەلەمەی زەمانو ژیر دەستەیەتی هەموی لە ناو بردوە . بو ئەوە کە ئیمە بتوانین ئەدەبیکی زور کونی کورد بەرامبەر بە ئەدەبی ئاینی میسری کون پیشان بدەین هەر ئەوەمان بە دەستەوەیە کە چەند رەوشتیکی بیرو باوەرری ئاینی ـ کە ئیستە لە ناو کورددا ماوەتەوە ـ بخەینە بەرچاو وەلەمەوە فیکرەی دەوریکی زور کونمان بو دەر ئەکەوی : کە کورد بەرامبەر بە بیرو باوەرری خوا پەرستی چە فیکرەیەکی بووە ؟ . یەکەم فیکرەی شەخس ـ قسن ، دوەم بەردی کیل ، سیەم شتی منگەوت ..

جاری لەپیش ئەمانەدا تیرەی یەزیدی ـ کە یەکیکن لە تیرەکانی کورد ـ ئەوان لە هەمو کەس زیاتر ئاگاداری بیرو باوەرری ئاینی کونی کوردیان کردوە . کە ئەلین ئاگاداری‌یان کردوە ؛ واتە توزی لە سەری ماوەتەوە ئەگینە بەهوی نەبونی خویندەواری لەناویاناو نەنوسینەوەی ئاینەکە ئەویش هەر تیک چوە ، بەلام شتیکی لی هەر وەر ئەگیریت .

ئەوان لە مەبدەئی ئەساسیدا بروا بە ئاهورامزدا و ئەهریمن ئەکەن ؛ ئەویان بو خیرو ئەمیان بو شەرر . وەلە عەناسردا روناکی و تاریکی بروا پی ئەکەن کە ئەمانە بناغەی ئاینی زەردەشتە . با کرژی ئەم ئاینە سە شتە : «چاک بلی ، فیکرت چاک بی ، کردەوەت چاک بی» . مەبەست بە چاک وتن ئەوەیە ئینسان پەیمان بەجی بینی ، قەرز بداتەوە ، ئەوی چاکە بو خەلک ئەوە بلیت ، بە قسە مەردم ئازار نەدا ... مەبەست بە فیکری چاک ئەوەیە کە پیاو فیکری بخاتە سەر خواناسی ، لە ناو مەردما رو خوش و قسە خوش بیت ، لە وەختی ترسا ئاگای لە مەردم بیت ، خەلک فیری خویندەواری بکا ، ریگەی چاکیان بو دانی ... مەبەست بە کردەوەی چاکیش ئەوەیە کە یارمەتی هەژار بدا ، کشت وکال بکا ، ئاوی شیرین وخوش بو خواردنەوە

بژینیتەوە ، کوشش بکا بو ئاسانکردنی ئەو ریگایانە کە ژیانی ژن ومیردایەتی ئاسان ئەکەن ، ئەوی لە خوی زیادە لە ریگەی چاکەدا بلاوی کاتەوە . ئاینی زەردەشت رقی لە پیاوی تەمەل و تەوەزەل ئەبیتەوە ، زور خەریکی کشت و کال و دار ناشتن و مالانداری ئەبی . ئەم سە شتەیان ئایا لەبەر استراتیجی کوردەواری بی ؟ یا لەبەر ئەو پابەندە کونەیان بی بە ئاینەوە کورد زور خەریکی ئەبن .

ئینجا شتەکانی پیشوو : فیکرەی شەخس ـ قسن . ئیستەش لە کوردەـ واریدا باوە ئەگەر پیاوچاکیکی گەورە مرد لە پاش ئەوە کە ناشتیان پەرروی سەوز و سپی ئەکەن بە بەیداخ و لەسەر گوررەکەی ئەیچەقینن . ریبوارو خەلکی تر دین تیلمە تیلمە لەو پەرروە ئەکەنەوە ئەیبەن بە مفەررک . وەکو ئەیبەن ، بویشی دینن . . ئەم رەوشتە بەپی گیررانەوەی پیشینان کە بەرە بەرە لە یەکیان بیستوە رەوشتی پیش ئیسلامەتیە و لە ناو کورددا ماوەتەوە . ئەوان هەر ئەوەندە ئەگیررنەوەو هەر ئەوەندەیان ئاگا لی یە ، بەلام کە پیاو لی بکولیتەوە ئەوە دەرئەکەوی کە : کورد لە بیرو باوەرری ئاینی کونیانا پیاو چاکانیان بە مظهری نوری خوا زانیوە ، تا، لە دنیادا بوون ئەوە ریزیان لیان گرتون، کە لەدنیاش دەرچون بەلایانەوە وا بووە کە روح ئاشنایەتی لەگەل لەشەکەدا ناپچریت و هەمو دەم وەکو پەپولە بە دەوریایە . چەقاندنی ئەم بەیداخانە نیشانەی ئەوەیە کە ئەمانەی لە دنیادا ماون وەکو روحەکە چون ئاشنایەتی لەگەل لەشەکەدا نەپچرراوە ئەمانیش بەو جورە هەر نەپچرراوە ، کە روحەکە ئەمەی دی بەرامبەر بەمان ئەو مهرەبانی و پاریزگاری یە لە دەوریکا لە ، لەشەکەدا بووە بەرامبەر بەمان نواندویەتی ئیستەش هەر ئەینوینی وە ئەو تیلمانە لە بەر ئەوە کاتیک کە لەسەر گوررەکە بووە بونی روح و لەشەکەی گرتوە کە کەوتە هەر مالیکەوە روحەکە ئەچی بە شوینیاناو ئەو مالە پیروز ئەکا . .

کیل : — هەندێ لە پێشاوچاکە مردووەکان — لە بیرو باوەڕی کوردەـ واریدا — ژنان ئەچنە سەر گۆڕرەکانیان مرازیان پێ ئەگرنەوە ، ریزەلە بەردێک لە سەر گۆڕرەکە هەلئەگرن و لە دلیانا مرازەکەی خۆیان ئەلێن و بەردەکە ئەنوسێنن بەکیلەکەوە ، ئەگەر وەکو ئاسنکیش کیلەکە ریزەبەردەـ کەی وەر گرت و گرتیەخوی ئەوە مرازەکە جێبەجێ ئەبێت ، ئەگەر خو نەیگرت ئەوا هیچ . . ئەم کردەوەیەش وەکو هی قسنەکە هەر مظهرێکی روحی بیرو باوەڕی ئایینی کون پیشان ئەدا . .

مەسەلەی مزگەوتەکەش : ـ ئیستەش ئەو قسەیە هەر هەیە لە ناو کورددا ئەلێن : ئەگەر چیلـکەیەک لەمالی مزگەوت کەوتە مالی هەر کەسێکەوە ئەو مالە ئاگری تێ بەرئەبێ . جالەبەر ئەمە ناوێرن بو دزیو دروزنی توخنی مزگەوت بکەون ... من لام وایە ئەمە رەوشتێکە هی پێش ئیسلامەتیە ماوەتەوە ، لە پێشا بیروباوەڕی ئایینیان بەرامبەر بە پەرستشگاکان وابووە ، کە ئیسلامەتی هات ئەو بیروباوەڕرە لە پەرستشگاوە کەوتەسەر مزگەوت . بویەش ئەلێم هی پێش ئیسلامەتیە چونـکە ئەم باوەڕرە زیاتر لە ناو ئەو کوردانەدا بلاو بوتەوە کە دورن لە شارو لادێو لەو شوێنانە کە پێشەوای ئایینی ئیسلامی تێداهەیە . .

* * *

بەرامبـــەر بە چیروکی ( ئوزیریس ) و ( ئیزیس )ی میسری ، چیروکی ( پوشین ) و ( پامیرر ) هەیە لە کوردیدا ، بەلام لە چەوەخت و دەورێکدا بووە ئەمە نازانرێت ، ئەوەندە هەیە کەپنو بەینەکە دەورێکی زور کون پیشان ئەدا . بە کورتی چیروکەکە ئەلێ :

« پادشایەکی زەبەر بە دەست هەبو لە شارێکا قەلەم رەوێکی زوری هەبو ، شارەکەش مەردمێکی فرەی تێدابو ، ئەوشارە تەنیا کانیاوێکی هەبو ، میراوی لەسەر هەبو خەلـکەکە بە نورە ئەهاتن بو ئاو . . روژێک هەراو زەنا کەوتە

شارەوە. پادشایان پێ گەیاند کە (دیو)یەک چوە میراوی دەر کردوەو بەر کانیەکەی گرتوەو نایەلێ کەس بەلای ئاوەکەدا بچیت! ئەوا ئەهلی شار هەمو لە تینوانا وەختە بخنکێن. پادشا بە خۆیو پالەوان وسوپاوە چونە دەرەوە بو چار کردنی دیوە، هەبریان کرد وا دیوەکە لەبەر کاریزەکەدا لێ کەوتوەو ئەبولینیو ئاوەکە پەنگی خواردوتەوە بووە بە دەریاچەیەک. پادشا پالەوانیکی نارده سەری، دیوە هەر پەلیکی بو دریژ کرد گرتیو خستیە ژیر دانی هەر بەکالی کرمانی! . یکیکی‌تر ویکیکی‌ترچو هەموی خواردن، بەم جورە دەکەسی لە ناو برد و توزی ئاهیکی پێ کەوت، ئینجا بورانی وتی: ئەی پادشا ئەگەر هەر بەچل روژ چوار منالم ئەدەیتی بیکەم بەکەبابو بە مەزە، باشە ئەگینە ئەم ئاوە بەرەلا ناکەم هەتا ئەبی بەدەریاییەک ئەو وەختە بەرەلای ئەکەم و ئەبی هەموشارەکە ئاو بیبا، وە ئەگەر هەر کەسیش بی بەلاما بەو جورە ئەیخوم! . پادشا لەگەل پیاوە ژیرەکانیا کەوتنە راویژکردن، هاتنە سەر ئەوە کە هەر بەچل روژ چوار منالی بدەنی ئەوە باشترە لەوەکە هەموخەلکی شارەکە، یا لەبەر لافاو، یا لەبەر بی‌ئاوی بخنکێن. پادشا بە دیوەی وت باشە چیت ئەوی ئەتدەمی و ئاوەکە وردە وردە بەرەلاکە. هەر ئەوکاتە جاری چوار منالیان دایە! . ئەویش هیدی هیدی لە شوین خوی بزوت و منالەکانی هەلگرت و ئەشکەوتیک بو لەسەراوردی شارەکەوە روی کردە ئەشکەوتەکە رزگاریان بو . ئیتر هەر بەچل روژ ئەبوایە چوار منالیان بو بناردابەتە بەرقاپی ئەشکەوتەکە! ...

ئەم ئیشە چەند سالیک بەم جورە مایەوەو منالی لە شارەکە برری و جەرگی هەمو کەسیکی سوتان، هەچ پالەوان و قارەمانیک لە ولاتەکەیا هەبو نەیانتوانی چاریک بو ئەم دەردە بدوزنەوە، پادشاو ئەهلی شار ئیجگار کەوتنە ناخوشی و پەلوپویان لێ‌برا. . جاریان‌دا بە هەمو ولاتندا هەر کەس بتوانی چاری‌ئەم دیوە بکا هەرشتیکی بوی پادشا ئەیدانی.. روژی سەیریان

کرد وا کورره گه‌نجیک له دوره‌وه روی کرده ناو شارو روه‌و باره‌گای پادشاهي خوی کوتا . کورر ، کورر نیه : گه‌له‌گه‌تیکی بالا به‌رزی ناوسنگ پان،هه‌ر باسکیکی گه‌لی کوله‌که‌یه‌و شیروتیرو رم‌و قه‌لغانی له خوی داوه‌و چوه ژوره‌وه . وتی : پادشام! من گه‌م به‌لایه‌تان له‌سه‌رلا گه‌به‌م، به‌لام نیازیکم هه‌یه گه‌بی به‌جی بینیت ! . پادشا وتي باشه بلی ، وتی :

من « پامیرر »م ناوه ، کچیکی گاموزام له‌م شاره‌ی تودایه « پوشین »ی ناوه ، ده‌ی ساله دلمان به یه‌که‌وه‌یه . گیسته مامه‌که‌م نامیداني وه ناشه‌وی به کوشتن و بررین لی وه‌رگرم گه‌مه‌وی گیشه‌که به خوشي بیرریته‌وه ، گه‌گه‌ر گیشیکي وا گه‌که‌ی مامه‌که‌م کچه‌که‌م بداتی گه‌وا باشه . گه‌گینه هه‌ر گیسته گه‌گه‌رریمه‌وه ! . پادشا وتي : باشه چیت گه‌وی بوت جی‌به‌جي گه‌که‌م ..

گینجا « پامیرر » وتی که گه‌یشته سه‌رچل روژه منالمه‌کانی بو مه‌نیرن با، دیوه‌که خوی بیته ده‌ره‌وه گه‌و وه‌خته چاری گه‌که‌ین . که‌چل روژه به‌سه‌ر چو دیوه منالي بو نه‌چو . گه‌هلي شار گه‌وه‌نده‌یان زانی دیوه‌که به‌بوله بول‌و بورره بورر له گه‌شکه‌وته‌که هاته ده‌ره‌وه‌و روی کرده سه‌ر کاریزه‌که ، خه‌لکه‌که هه‌مو زه‌نه‌قیان چو ! . « پامیرر » وتي به پادشا، با گه‌هلي شار هه‌مو له ده‌ره‌وه راوه‌ستن و سه‌یری گه‌م کاره‌ساته بکه‌ن . تیکررا مه‌ردي ناوشار هورروژمیان برد بو ده‌ره‌وه ، « پوشین »یش له‌گه‌ل مه‌ردي‌تردا چوو هه‌مو وه‌ستان . .

گینجا « پامیرر » خوی له دیوه نزیک خسته‌وه‌و په‌لاماری دا ، دیوه‌ش ده‌ستي را کیشا بو « پامیرر » . «پامیرر» شیري داهینایه‌وه‌و دای له مه‌چه‌کي دیوه ، سه‌یری کرد وه‌کو گاسن زرنگه‌ی دی و شیره‌که‌ی په‌رری ! . هه‌ناسه‌یه‌کي هه‌لکیشاو وتی گوژرام ! گینجا رمي بو هاویشت، رمه‌که‌ش شکا. به‌گورز هاته‌ویزه‌ی هه‌رچی کورزی لی گه‌دا هه‌ر ده‌نگ گه‌داته‌وه‌و هیچي‌تر ! . گینجا که‌وتنه زوران گرتن . به‌کتر دینن و گه‌به‌ن ، « پامیرر »

ئه‌گه‌ت بو دیوه هیشتا هه‌ر تازه پشووه‌ ئه‌هلی شار به ته‌واوی وره‌یان به‌ردا به‌که یه‌که وا خه‌ریکن هه‌لدین !.

« بوشین » که ئه‌بینی وا دلخوازه‌که‌ی به‌و جوره که‌وتوته داو ، لوقره‌ی لی هه‌لـگیرا ، نه ئه‌توانی بچی یارمه‌تی بدا ، نه ئه‌شتوانی چاریک ببینیته‌وه ، به ئاشکراش ئه‌بینی ها ئیسته دیوه « پامیرر » بدا به زه‌ویدا و بیخوا ، ها توزیکی تر ! . سه‌ری به‌رز کرده‌وه بو ئاسمانو نزای ئه‌کرد کوتوپڕ چاوی که‌وته قاپی ئه‌شکه‌وته‌که ، سه‌یری کرد وا قه‌فه‌زیک له‌و دیوی تاپیه‌که‌وه‌یه شتیکی تیدایه له پیرپڕن ئه‌کا ! هه‌رده‌م ئه‌دا به‌یه‌کاو فو ئه‌کا به‌سه‌ردیوه‌که‌دا، هه‌رچه‌نده ئه‌و ده‌م ئه‌دا به یه‌کا لیره‌وه دیوه‌که به هیزتر ئه‌بی ! . وتی بی‌و نه‌بی هه‌ج شتیک هه‌یه له ژیر سه‌ر ئه‌م قه‌فه‌زه‌دایه ، خو گیانی من له گیانی پامیرر زیاتر نیه ، من ئه‌م ژیانه‌م ناوی که له‌به‌ر چاوه‌وه ئه‌م دیوه ده‌ست بخاته جه‌رگو دلی پامیرری خوشه‌ویستمه‌وه‌و ده‌ری بینی . ئه‌مه‌ی وت و هه‌ررای کرد بو به‌ر قاپی ئه‌شکه‌وته‌که . رویشت رویشت هه‌تا نزیک بوه‌وه له‌و کاته‌دا دیوه هه‌ستی پی کرد ! . ده‌ستی له پامیرر هه‌لـگرت‌و چو به‌شوین « بوشین »دا . . پامیرر ، که سه‌یری کرد دیوه ده‌ستی له یه‌خـــه‌ی به‌ردا و هه‌ررای کرد ســه‌ری سررما ، که چاک تماشای کرد وا « بوشین » وا به‌ریوه بو ئه‌شکه‌وته‌که ئه‌چیت و دیوه‌که‌ش بو « بوشین » ئه‌چیت ! .. که ئه‌مه‌ی دی ئاگری تی به‌ربو ئه‌میش هه‌ررای کرد به شوین دیوه‌که‌دا به‌لام چون هه‌ررا کردنیک . ده‌ست له سه‌ر شان ! .

بم جوره هه‌موبان له نزیک قاپی ئه‌شکه‌وته‌که به‌کیلان گرته‌وه . دیوه ده‌ستی دریژ کرد بو « بوشین »و « پامیرر » له پشت سه‌ریه‌وه . « بوشین » بانـگی کرد : « پامیرر ! » خه‌می منت نه‌بی به‌لـکو خوت بگه‌یه‌نیته ئه‌و قه‌فه‌زه که له ناوه‌وه‌ی ئه‌شکه‌وته‌که‌دایه . « پامیرر » خوی کرد به ئه‌شکه‌و-ته‌که‌دا قه‌فه‌زه‌که‌ی به‌رچاوی که‌وت هـــه‌ر ده‌ستی پی گه‌یشت دیوه‌که له‌م

لاوه سارد بوەوه هیزی تیا نەماو کەوت ! . . « پوشین » نەوی لە شاخیو ئەبویست رایکیشی بولای پامیرر بەلام لەبەر گرانی بوی کیش نەئەکرا . پامیرر کە دەستی گەیشت بە قەفەزەکە تەماشای کرد ئەمە شتیکی تیدایە لە وینەی پیریژنیکی زور بەرربوت و بە جادوو ئەفسون دیوەکەی راگرتوه ، دەستی نایە سەر دەمی خنـکاندی ، کە ئەم خنکا دیوەکەش لەوی توپی ! تومەز ئەمە کولەکەی روحی ئەم دیوە بووه ! . ئینجا پەنی کەوانەکەی خستە لاقیو رایکیشاو لەگەل پوشیندا هاتنەوه بولای پادشاو ئەهلی شار چونە پیشوازیانەوەو هینایاننەوه ، حەوشەوو حەو روز شاییو ئاهەنگ بو ، پادشا پوشینی لە باوکی سەندو بەراوتەگیری هەمولایەن لە پامیرریان مارەکردو بە خوشی رایانبوارد . »



بەرامبەر بە ئاموزگاریەکانی « پەتاح حوتەب » ی میسری ئەمەش نمونەیەکە لە ئەدەبی کومەلایەتی کوردی کە ئەلی : « مروف خرابە نەکا خرابەی نایەتەپیش . . کەسی ئەسپ رابگری پیویستە درگای بو بلندبکا . . مردو گوناحبار نەبی گوری لی تەنگ نابی . . مریشک چاوی لە قازکرد قنگی دررا . . پیاو کە زور شیرین بو لە گەرووەوە ئەیخون . . هەزار بەرتیل قەرزی نابژیری » ، لە ئەدەبی سیاسی ئەلی :

« کار بە کەسیک ئەسپیرری لە نیوەی ئیشا بەجی نەهلی . . دەستیک بوم نەبرری ماچی ئەکەم . . دەستی حاکم بیبرری خوینی نیە . . قسە بیکیژە ، بیبیژە بیوبژە . . زوررنا بدەرە دەست ناشیەوە فوبە سـەرە گەورەکەیا ئەکا . . پیاو بە گەورەیی فیری پلاو خواردن بو دەست بو لوتی ئەبا . . من ئاغاو تو ئاغا کی جیمان بوراخا ؟ . . گیرەشیوینی سوچی گای بنەیە . . خەتی خوار لە گای پیرەوەیە . . کە شا ، هات میر بەتالە . . » . .

ئەمانە نمونەیەکن بون کەمو کورت لە باری چونیەتی ئەدەبی کوردیدا بەرامبەر بە ئەدەبی میسری کون . . لە شوینی خویدا باسی ئەم قسە کوردیانەو ئەم بەندی پیشینانە کراوە ...

# ئەدەبی کوردی و فارسی کون

مەبەست بە ئەدەبی فارسی کون ئەدەبی پیش ئیسلامەتیە ، وە یا بە جوریکی تر ئەدەبیکە تا ئەگاتە روخانی ساسانیەکان کە ، نوزی دوای سەرەتای سەدەکانی ناوەراست ئەکەوی . لە بەراورد کردنی ئەدەبەکانا لە هەمویانا ئەم ریگەیەمان گرت بو ئەوە لە سەرەتای سەدەکانی ناوەراستەوە تا ئیمروژ بکەویتە بەرگەکەی ترەوە .

ئەدەبی فارسی کون ئەوی مابیتەوە بو ئیمرو بە هوی هەندی ئاویستاوە تەنیا ئەدەبیکی ئاینیە . ئیمە ناتوانین ئەم ئەدەبی ئاینی فارسی کونە لەگەل ئەدەبی ئاینی کوردی پیش ئیسلام، یا کوردی پیش سەدەکانی ناوەراست جیا بکەینەوە ، بەلکو ئەوئەدەبە دیلیەکە لە ناو کورد دا بوە ، هەر ئەو ئەدەبە بوە کە لە ناو فارسیشدا بوە . وەکو چون وتمان ئەو ریشەیە کە فارسی لی جیا بوتەوە لە لایەن رەگەزەوە هەر عەینی ریشەیەکە کوردیشی لی بەرهەم هاتوە . . جا لەبەر ئەمە ئیمە ئەگەر بینین باسی ئەدەبی ئاینی فارسی کون بکەین هەر وەکو ئەوە وایە کە باسی ئەدەبی ئاینیی کوردمان کردبیت لە پیش ئیسلامەتیدا . کەوابو پیویستە بزانین ئەم ئەدەبە دینیە چون بوە کە هەر دولایان ئاویان لی خواردوتەوە ؟ ...

چە فارس ، چە کورد ئاینیان ئەو ئاینە هەرە کونە بوە کە هیندی کون هەیانبو ، لە پاشا جیا بونەوەوکەوتنە سەربوت پەرستی تا «زەردەشت» بە خویو ئاینەکەیەوە پەیدابو . میژو نوسەکان لە دەوری هاتنی زەردەشتو

لەو شوینە کە لێ پەیدا بووە ،هەر یەکە قسەیەکیان کردوە ، هەندیک ئەلێن لەشیمالی ئەفغانستان پەیدا بووە . بەشیکی زوریش لە سەر ئەو باوەرەن کە لە بناری « ورمێ » و ئازربایجان سەری هەلداوە . هەندیکیش ئەلێن لە ناوچە کیوەکانی ئارارات هاتوتە دنیاوە . هەر وەها زەمانی پەیدا بونیشی ئەلێن لە بەین سەدەی بیستەم ، تا پینجەمی پیش میلاد بووە ، بەلام قسەی بەلگەو بناوانی زەردەشتی ئەلێ لە سەدەی حەوتەمی پیش میلاد پەیدا بووە و لە دەوروبەری « ٦٢٠ » ی پیش میلاد کوژراوە . .

« زەردەشت » یا « زرادشترا » کوری « پورشەسپ » بووە . ئەفسانەی کون ئەلێ : لەو وەختەدا کە هاتە دنیاوە دایکی دەنگیکی هاتە گوێ کە : « ئەم کورەبەت پایەیەکی گەورەی ئەبێ و ئەچیتە ئاسمان بو ئەوە فەرمان لە خوا « ئاهورامزدا » وەرگرێ » هەر وەها ئەلێن : کە ، لە سکی دایکی کەوتە خوارەوە دەستی کرد بە پیکەنین . هەر کە توزێ گەورە بو نیشانەی پیغەمبەرایەتی لیوە دەرکەوت . هەر بە منالی خوشەویستی هەمو کەسیک بو ، کە گەیشتە ( ٣٠ ) سالان دەستی کرد بە بانگ کردنی مەردم بو ئەوە خوایەکی تاک و تەنیا بپەرستن . موغانەکان لێ هەستانە سەرپێ ، ناچار ئەوی بەجێ هیشت و چو بو دەوروبەری سیستان و ئەفغانستان ، لەویش هەر لەبەر موغان هیچی پێ نەکرا ، ئینجا چو بو ( بەلخ ) لەوێ فەرەنجیەکی سپی لەبەر کردو هەندێ ئاگری گرت بە دەستەوە و گالوکیکیشی لە داری ( سەرو ) گرت بە دەستەکەی تریەوە و چو بولای « ویشتاسپ شا » وبانگی کرد بو وەرگرتنی ئەم ئایینی تازەیە ، لەپاش قسەیەکی زور « ویشتاسپ » ئایینەکەی وەرگرت و بە دانایی « جاماسپ » ی وەزیری ویشتاسپ ئەم ئایینە لەویدا پەرەی سەند ، تا لە دوایی‌دا جەنگیک لەبەین ئەمان و « ئەرجاسپ » ی پادشای تورانەدا پەیدا بو زەردەشت لەو جەنگەدا کوژرا ، ئایینەکەی لە ناو مەردما مایەوە . مەردمەکەش بون بە دو بەشەوە ، بەشیکیان وەریان گرت

چونکه ئاینی دەولەت بو ، بەشەکەی تریان هەر لەسەر بوت پەرستی خویان مانەوە . ئەم بەشەیان چونکە لایەنگریان نەبو بەتەنگ هاتن، ناچار هەلاتن چون بو هیند و لەوی ئەم باوەرری بوت پەرستیەیان گوررانی بە سەرا هاتو بون بە « بورەهمی » . بەشەکەی تریان هەر لە شوینی خویان مانەوە و ئاینەکەیان روز بە روز لە پیشکەوتنابو هەمو ئەو ولاتەی داگرت و هەمو پادشاکانی فارس وەکو « کورش» و « دارا » باوەشیان پیا کرد ، هەتا ئیسلامەتی هاتە پیشەوە ئیتر هیزو گوردی نەماو کزبو . .

« زەردەشت » کتیبکی هینا بە ناوی « ئاویستا » وە . ئەم کتیبە لە سەرەتادا پچرر پچررو هەر توزیکی لە سنگی یەکیکا بو ، لە دەورەی حکومەتی « ماد »ەکانا « ٧٠٠ ـ ٥٥٠ »ی پیش میلاد بەکوششی ئەوان لەسەر پیست و بەرد نوسرایەوە . لە دەوری هەخامەنشیەکانا دو نوسخە لەم کتیبە هەبو ، یکیکیان لە تەختی جەمشیدا بو لە پادشایەتی (داریوش)ی سیەم پادشای هەخامەنشی ، کە « ئەسکەندەر »ی مەقدونی ٣٥٧ ـ ٣٢٤ پەلاماری ئیرانو تەختی جەمشیدیدا ئەو نوسخەیە تیا چو . یکیکیشیان کەوتە دەست یونانیەکان ، لە پاش ئەوە کە ئەوانیش عیلمی پزیشکی و ئەستیرە زمیری و شتی تریان لی وەرگرت ئەو نوسخەیەش ون بو . . کە کەوتە دەوری ئەشکانیەکان « بلاشی یەکەم » پادشای ئەشکانی ( ٦ ـ ٧٨ ) میلادی کوششیکی باشی کرد بو کو کردنەوەی ئاویستا ئیتر بەبی ریک خستن . کە کەوتە دەوری « ئەردەشیری بابەکان » ـ سەر زنجیرەی ساسانیەکان ـ « ٢٢٤ ـ ٢٤١ »ی میلادی فەرمانی دا بە یەکی لە موغانەکان کە « تەنسور »ی ناوبو ئاویستای لەبەریەک هەلوەشاو ریکو پیک بکاو هەر شتەی لە شوینی خوی دانیو ئاینی زەردەشتی کرد بە ئاینی رەسمی دەولەتی ساسانی ـ وەکو سەرچاوەی هەمو کتیبە میژوەکان ئەلی : ئەوەمان نابی لە بیربچی کە ئەم ئەردەشیری بابەکانە کورد بووە . ـ لە دەوری شاپوری یەکەم، کوردی

ئەردەشیر ٢٤٢ ـ ٢٧١ ی میلادی ئەو بەشە ئاویستایەکە کەوتبوە یونازو هیند و باسی لە پزیشکی و ئەستیرە زمیریو فەلسەفەوە ئەکرد کوی کردەوەو لەگەل ئەمی لای خویانا لیکی دان .

ئاویستا زور گران بو ، هەر لە دەوری ساسانیەکانا شەرحیکیان بە زمانی پەهلەوی بو کرد ناویان نا « زەند » ، ئینجا لەبەر ئەوە خویندنەوەی پەهلەویش گران بو شەرحیکیشیان بو زەند کرد ناویان نا « پازەند » لەپاشا شەرحیکیشیان بو هەندی لە وردە بابەتی ئەم پازەندە کرد ناویان نا « دینکەرد » . ئاویستا (٢٢) نامیلکە ـ نسکە ـ لەسەر سـێ بەش (أ) باوەرو خوا پەرستی (ب) کرین و فروشتن . (ج) فەلسەفە و عیلم . ئەوی کە مابیتەوە هەندیکە لە بەشی یەکەم و دوەم ، بەشی سیەم بەتەواوی تیا چووە . .

« زەردەشت » لە کتیبەکەیا « ئاویستا » لە باری لاهوتیدا خەلک بانگ ئەکا بە پەرستنی خوایەکی تەنیا ، کە « ئاهورامزدا »یەو ئاگای لە هەموشت هەیە ، بەلام لە باری فەلسەفەی عالەمدا ئەلی : دو هیز هەبەو ئەم دوەش بە دریژایی سال لە جەنگدان . دووە کەش یەکی راستو یەکی درو . یەکی روناکی و یەکی تاریکی . یەکی پاکەو یەکی پیس . یەکی چاکەو یەکی خراپە . . ئاهورامزدا نیشانیکە بو راستیو روناکیو پاکیو چاکی . (ئەهریمەن ـ ئەنگرە مینو ) یش رەمزیکە بو درو و تاریکی و پیسی و خراپی . هەر وەها ئەلی : دو مەبدأ لە تەبیعەتدا هەیە کە هەر یەکە پیچەوانەی ئەوی تریانە ؛ روحی دروستکەر و روحی تیکدەر . ئاهورامزدا فەرمان بە هەمو ئادەمیزادیک ئەکا یارمەتی روحی دروستکەر بدا بەوە کە کشت وکال بکاو داربنیژیو مالات بـەخیو بکاو سەگو کەلەشیر رابگریو شـەرر لە گەل روحی تیکدەرا بکا بەوە کە مارو دوپشکو ئەوجانەوەرانەکە بو کشتوکال زیانیان هەیە بیانکوژی ، وە پیویستە لەسەر هەمو کەس ئاوو ئاگرو خاک و با لە پیسی بپاریزی .

پیاو کە سەبری ئەم قسانە ئەکا وا ئەچێتە دلیەوە کە زەردەشت دو تەبیعەتی پەرستوە لە دو خوا دا ، تەبیعەتی چاکە لە ئاهورامزدادا و هی خراپە لە «ئەنگرەمینو»دا ، بەلام لەراستیدا وانیە چونکە ئەلی: ( ئاهورا مزدا ئەزانی ئەهریمەن هەیە ، وەلی ئەهریمەن نازانی ئاهورامزدا هەیە ، ئاهورامزدا لەسەر هەمو شتیکەوەیەو ئاگای لە هەموشت هــەیەو هیچ شتیک وەکو ئەو نیـــە » . جا لەبەر ئەم قسەیە گەلی کەس لە پەیرەوی کەرەکانی زەردەشت وتویانە : با دو هیزیش لەم گەونە دا بی ـ هیزی خیرو شەرر ـ وپیکیشەوە جەنگ بکەن خوای نیکرای گەون هەر یەکە ا. ئەوەندە هەیە شەررەکە وەکو چون ئەچیتە پیستی زستانەوە ئاو ئەمەبینیو ئەرز ئەبەستی ، دارو دەوەن لە گەورە بون ئەخا ، ئەبی بە خەیالیکی پیسیش شك و کافر بون دینیتە بەر هەم . ئەچیتە پیستی هەژاری و تەمەلیەوە ، ئەبی بە گزی و درو کردن ، ئەبی بە بوت و بوت پەرستن ، ئەبی بە تاریکی و بیگەنی ناخوش و نەخوشی و دەرد ، ئەبی بە دررندەو خشندەو مارمیلکەو دوپشك. جا ئەم هیزی شەررە لیشی هەر خراپەو لە ناودانەو هیچی تر .

ئایینی زەردەشت گەلی خەریکی ئەوە ئەبی کە ئادەمیزاد ئەبی چون پاریزی لە روحی خراپە و لە هاوړری کردنی خراپە . مەبەستیشی ئەوە بووە کە روحی خراپە لە ریشە هەلکیشی لە سەرزەویدا بیجگە لە ئاوەدانیو کوشك و سەرا هیچ نەهیلی. هەر وەها کوششیکی زوریشی کردوە بوهوی لەش ساغی و بو ریکو پیکی یاسای ـ قانون ـ کومەل و تاك ... «ئاویستا» یەکەم شتیک کە لەپیش هەمو شتیکا باس ئەکا چارە کردنی لەشی مردوە بو ئەوە دەردو بەلا لیوە نەتەنیتەوە بو زیندوەکان . تەنانەت ئەلی : روحی شەرر کە سەبری کرد وا لەشی مردویک کەوتوە ئەبی بە میشیکی پیس و بەلەشی مردوەکەدا ئەسووریتەوە ، لە پاشا ئەچی بە ناو مەردما دەردو بەلا لە ناو ئەوانیشا بلاو ئەکاتەوە ا . . لە پاشا باسی ئەوە ئەکا کە پیاو ئەبی چون ریز لە

روحی چاکەوە بکریت؟ و لەشي مردو لە کویدا دابنریت؟ و چون ئەو ژورە کە مردووەکەی تیدایە ئەبی پاک وخاوێن بی؟ وە ئەبی جلو بەرگی مردووەکە چی لی بکری ؟ .. ئینجا دیتە سەر ئیشوکاری تیکرڕای مەردم و ئەلی :

بو ئەوە دانەویلەو دار بیتە بەرهەم ئەبی کشت و کال بکریت ، ئەبی ئەو شوینەکە وشک و بەیارەئادەمیزاد ئاوبری بکاو زونگاوله زەویدا نەیەلیت، هەرئادەمیزادیک پیویستە لە ژیانیا داریک بنێژیت،زەوی بو ئەوە دروست نەکراوە کە مردوی تیدا بنێژریت ؛ زەوی بو کشت وکالە ؛ بو ئەوەیە کە ژیان لە دنیادا بەرە بسێنیت ، مردو ئەبی لەسەر کیوەکان دابنری بو ئەوە درندە بیخوا ، یا بو خوی بڕزی . . لە پاشادیتە سەرکەینو بەینی خیزانی و ئەلی :

ئەبی هەمو کەس ژن بێنیت بو ئەوە خیزان زوربیت، وەکو چون زەوی کە خزمەت کرا بە پیت ئەبی ژن و ژنخوازیش ئاوا ئینسانیەت بە پیت ئەکا . ئەبی زون زور چاوبری ژنی سک پڕ بکری بو ئەوە خویو منالەکەی بیمزەررەت بن . . پیویستە لەسەر هەموکەس خانویک بوخوی دروست کاو ژنیک بێنیت و منالی ئبی ، ئەبی پارچە مەرریکی ببیت و لە مالیشا هەمو دەم ئاگری بی . . ئینجا لە باری گیانلەبەریتردا ئەلی :

ئەبی پیاو بەزەیی پیانا بیتەوە ، ئەوی کە پیویستیەتی سەری ببڕی و بیخوا ، ئەوی پیویستی نیە ــ وەکو کوشتنیان بە راو وشکار ــ ئەوە نابی بیکاو خوا خوشي لی نایە . لەمەوە ئەچیتە سەر ئەوە ئەلی :

ئادەمیزاد کەدیتە دنیاوە دو ئەقلی لەگەلایە ؛ ئەقلیکی چاکەو ئەقلیکی خراپە . هەر یەکێ لەم دو ئەقلە ئەیەوی دەستەجلەوی خاوەنەکەی بگریتە دەستەوەو لە کردەوەو وتن و بیرو باوەڕیا بولای خوی رایکیشي ... ئاویستا ژیانی مەردی کردوە بە سە بەشەوە ؛ باوەڕی چاک ، قسەی چاک ، کردەوەی چاک . باسی ئەمانەمان لە مەبانەی ئەدەبی میسری کون و

کوردیدا بە دریژی کرد .. لیرەدا دوایی بە قسەکردن لەژیانی دنیاوە دبڕیت و ئەچیتە سەر ژیانی ئەو دنیاو ئەلی :

روح هەر ئەمینیتەوە ، ئەگەر چاك بو سەرەو ژور ئەبیتەوە بو بەهەشت و چاوەڕری لەشەکە ئەکا تا روژی زیندوبونەوە دیت . ئەگەر خو خراپیش بو نوشی هەمو جەزرەبەیەك ئەبی هەتا ئەو روژە ، ئەو وەختە چاری هەر دوکیان ئەکریت ... ئایینی زەردەشت چاوی لە هەر دو ژیانەکەیە، ژیانی ئەم دنیاو هی ئەو دنیا . زەردەشت ئاگری کردوە بە نیشانە ـ رەمزی هەر دو ژیانەکە . ئەلی : ژیانی مادی بە بی کوشش و تەقەلا نابیت ئاگریش ئەو کوشش و تەقەلایە تیدایە . ژیانی روحیش بی خاوینی و پاکو پوختی نابیت ئاگریش عاملی ئەم خاوینی و پاك و پوختیەیە . . کەوابو ئاگر لە ئایینی زەردەشتدا بو پەرستن نەبووە بەلکو بو رەمزی ئەو دو ژیانە بووە ...

ئەمەی خوارەوەش توزیکە لە تەعالیمی ئەخلاقی و کومەلایەتی ئاویستا کە زەندو پازەند وخوردە ئاویستاو دنیکەرد باسیان کردوە :

یەکی لە روحی حکمەتی پرسی وتی : چون ئەمە ئەبی کە ئادەمیزاد لەشی بەخیو بکاو روحیشی ئازارنەدا ؟ یا،روح بپاریزی و لەشی ئازاری نەگانی؟.
روحی حکمەتەکەش وەلامی دایەوە وتی :

«ئەو کەسەی لە خوار خوتەوەیە بەوچاوەوە سەیری بکە کە هاوشانتە ، ئەو کەسەی هاوشانتە بەچاوی لە خوت بەرزتر سەیری بکە ، ئەو کەسەی لەتو بەرزترە بەو چاوەوە سەیری بکە کە گویا ئاغەتە ، ئەو کەسەش کە ئاغەتە بەچاوی فەرماندارەوە سەیری بکە . بەرامبەر بەخاوەن فەرمان ـ اولی الامر ـ راستگو و فەرمانبەر و کڕنوش بەربە . . دوزمانـ مەبە با رو رەردیت بەسەرا نەیەت ، چونکە دوزمانی لە جادوگەری خراپترە . ئارەزووتەماعت لە ئەندازە دەر مەکە ، چونکە ئەگەر وات لیهات شەیتانی چاپسی بە سەرتا ئەزال بی وکامیابی لە خیرو بیری دنیات لە دەست دەر ئەچی . زور جلەو بو

نوورەیی شل مەکە، یەکێ ئەگەر جلەوی بو شل کرد وانجیاتی خوی لە فیکر ئەچیتەوەو ریگەی ئەو کردەوە چاکانە کە پیویستە بیکا لی تیکئە ئەچی و جەورو خرابە ئابلوقەی ئەدەڵەکای ئەدا . . پیاوی قیناوی لەو وەختەدا کە تینەکەی لەخواتەوە وەکو ئەمەریمەن ـ روحی شەڕ ـ ی لی دیت ، کەوابو هەر لە سەرەتاوە کاریکی وا بکا کە رق نەیگری باوالی لی نەیە . نەفسی خوت بە خەمو پەژارە ئازارمەدە ، چونکە پیاوی خەمبار هەست بەخوشی دنیاو خوشی روح ناکا ، لەشی روژ بە روژ پەزربوت ئەبیو روحیشی بی تین . . لەگەل دوژمنا کەوتیتە جەنگەوە بە عەدل وداد جەنگی لەگەل بکە . ئەگەر هاورریی دوستت کرد بە جوری بیکە کەلیت خوش نود بی . ئەگەر لەگەل لەجەر ـ حقود ـ دا بویت هیچ بەربەرەکانی مەکە ، لەجەریەکەی ئەوەندەی تر مەبزوینە . . هاورریی پیاوی ئارەزوپەرور مەکەو ئیشی خوت مەخەرە بەردەستی . . وریابە لەو کەسەی ناویکی باشی نیە وناوبانگی بەدناوی هەیە دوستایەتی لەگەل دامەخە . . لەگەل پیاوی نەزانا پەیمان مەبەستەو هەلسوکەوتی لەگەل مەکە . ئەگەر لەگەل پیاوی گەوجدا بویت بەربەرەکانی مەکە و لەگەلیا بە یەکێ ریگەدا مەررو . . وریا بە خوت بەماڵو پارەوە هەلنەکیشیت ، چونکە بەجییان دیلیت و هیچ کەلکیکیان بوت نابی . . وریا بە فیز بە باو وباپیر و ئیش وکارتەوە نەکەیت ، چونکە ئەوانە هەر ئەوە بو تو دیلنەوە کە تو بە دەستی خوت لە پیش خوتەوە بینیریت . . ئاگات لی بی خوینت لی نەگوریت و بەزیانی خوت بانی نەبیت ، چونکە موجەت لە ئاخردا هەر رویشتنە و تولەت ئەبیتەوە بەوە کە بچیتەوە ناو زەوی ! ... »

لەبن دەست ئەم تەعالیمەی ئاویستاوە سوراختی هەندی لە پادشاکانی کونی فارس وەکو « دارا » لە سەر تەختە بەردەکانی وەکو (ئیستەخر) ماوەتەوە .

ئەدەبەکەی ئەویش ئیکررا هـەر لـەدەیکی ئاینیەو هەمو روو ، لە ئاهورامزدا ئەکاتەوە . .

بە کورتی ئەدەبی فارسي کون هەر عبارەت بووە لە ئەدەبیکی زەردەشتی و ئاویستا . ئەدەبی پادشاکانیشیان هەموی باسی شەرر بووە کە بەشیوەی فارسي میخی لەسەر بەردەکان هەلیان کەندوە . ئەم شیوەیە غەیری شیوەی نوسینی ئاویستا بووە . شیوەیەکی تریش بووە کە پیان وتوە (پەهلەوی) ئەمەیان لەپاش شیوە زور کونەکە بووە بە شیوەی دەولەت و عیلم و ئەدەب. ئەم شیوەیە مام ناونجی بووە لەگەل شیوە زور کونەکەداو شیوەی فارسي ئیمرروژدا .

تا ئەم شوینە قسەمان لە ئەدەبی فارسي کونەوە کرد ، ئەو ئەدەبە کە تا روخانی ساسانیەکان «٦٥٢» ی میلادی لە ناوا بووە . لەم تاریخە بەدواوە بەر فارسی تازەو سەدەکانی ناوەراست ئەکەوی ئەمە لەبەرگی دوهەمدا باس ئەکریت . .

وەکو وترا ناتوانری ئەدەبي کونی فارس لە ئەدەبی کونی کورد جیا بکریتەوە لە باري ئاینیدا . جا بەم بونەوە وەکو سەیر ئەکریت گەلی شت ئیستە لە ناو کورددا ماوەتەوە کە ئەگەرریتەوە بو دەوري پیش ئیسلامەتیازو بو ئەدەبی کونیان کە ئەدەبي زەردەشت بووە ، بەتایبەتی لە ئەدەبی ئەخلاقی و کومەلایەتیدا ، وەکو ئەوە ئارەزوی گەلەداریان هەیەو حەز بە کشت و کال ئەکەنو کەم مال هەیە سەگی تیدا نەبی و چاوبری ژني زکٹ برر ئەکەن . هەرچەندە لەوەدا پیچەوانەی ئەوە کە حەز بە راوو شکار ئەکەن ادیارە ئەمەیان ئەدەبي ئیسلامەتي گورربوبەتەوە . هەر وەها با ، لەبەر ساردي ناوچەش بی ئاگریان کەم و زور هەر لی نابرریت . بەتایبەتي لە ناو کورددا باوە کە سەدوپکیان سرد جلو بەرگەکەی لەبەخشن بە هەزاریکٹ . ئەم شتانە کە ماوەتەوە ئیسلامەتیش برریاري لە سەرداوە . دیسان کورد بەتەبیعەت حەز بەدار ناشتن ئەکاو بە بەنجە خزمەتی زەوی ئەکا ...

# ئەدەبی کوردی و چینی کون

چین ئەو ولاتە پان و درێژەیە کە لە دەورێکی زور کونەوە ئاشنای ئەدەبو پابەندی هەندی خەیالات بوون ، ئیستە هەر چەندە ئەکەن ناتوانن بگەنەوە بەو ئەدەبە کە هەیانبووە ! . نەوەکو هەر ئەوەندە بەلکو نایەلن هیچ ئەدەبیکیان لا بدەن لەو ئەدەبە کە هەیانبووە ! . جا لەبەر ئەمە چینیەکان لە لایەن ئەدەبەوە ئیستە لە هەمو قەومیک وشکترن و لە هەمو کەس زیاتر پابەندی کونە پەرستین ... ئەدەبی چینی با هەمو جورە لقیکیشی لێ ببیتەوە هەموی هـــەر لە دەوروبەری مەبادئی ئەخلاقیدایە . رەوشتی پیشینانی خویانیان کوکردوتەوە بو ئەوە پاشینەکانیان لەسەری برروزو لەوە لانەدەن !.

سەر چاوەی ئەدەبی چینی هەمو مەبادئە بەرزەکانی « کونفوشیوس »ە ؛ ئەم فەیلەسوفە پیغەمبەری ئەدەبی چین و دانەری بناغەکەیەتی . لە سەدەی شەشەمی پیش میلاددا لە ناو قەومەکەیا هەلـکررا ؛ سەیری حکرد یاسای دەرەبەگیوا ، چینی پلیشاندوتەوەو بوتە هوی لە ناو بردنی قەومی چین ، چە بە شەررو شورر ، چە بەکارو باری ئابوری ، لەگەل ئەوەش نە فیکری ئەوەی بو دیانەتی لاهوتیو کەهەنوتی دابنی ؛ وە نە خوێشی بە شاعرو جادو-گەر ئەزانی ، هینای دەستی خستە ئەدەبی چین و هەمو کوششیکی خستەسەر خەریک بوز بە زیانی تاک ـ فەرد ـ و زیانی دەولەتەوە بوئەوە برروا و رەچەلەکی دەرەبەگی لە بن دەربینی .

ئەم و سوقرات جیاییەکیان ئەوەدا بو کە : سوقرات خەریکی ئەخلاق ئەبو لە باری لنظریو وردبونەوەدا ، بەلام « کونفوشیوس » تەنیا کامەرانی تاکی ئەویست لە باری کردەوەو هەمەلیدا . هەر لەم ریگەیە بو کە لە چیندا

ناو نرایە ئایینی « کونفوشي » ، چونکە ئەم برروایە دان بەوەدا نانی کە هیزیک هەبەو چاوبری کاروباري ئادەمیزاد ئەکا ، بەلـکو ئەلی مادام دنیا عبارەت بی لە ژیاني کردەوە ـ حەیاتی عەمەلي ـ ئەبی هەمو شتیک لە دەست ئادەمیزادەکە خویا بیت وە ئەبی هەمو کارو فەرمانیک بکەویتـــە دەست حکومەتیک کە بتواني بە پوختي ئیش بەریوە بەری .

حکمەتەکاني کونفوشیە لە پینج کتیبدایـە : کتیبی میژو ، کتیبی گوران ، کتیبی شعر ، کتیبی رەوشت و باس و خواسي بەهار و پایز . ئەم کتیبانە هەر چەندە مادّە کەیان پیش کونفوشیوس کەوتوە بەلام ئەو بویەیەکي تری بەسەرا هیناوەو بەهي ئەو ئەناسرین . تەنیا شتیک کە بە تەواوی بە دانراوي کونفوشیوس بناسری هەر « باس و خواسی بەهارو پایز »ە . ئەمە نمونەیەکە لە ئەدەبي ئەو کتیبە کە ئەدەبی چینە :

« ئادەمیزادی تەواو بە شوین پیویستي خویا ئەگەرری لە لای نەفسي خوی،ئادەمیزادی بیخیر لەلای یکیکی تر بەشوینیانە گەرری .. ئادەمیزادی تەواو بەبی هەرا هەرا ئیش بە پوختی و ریکوپیکی ئەگری بەبی ئەوە مەیل بەلای قەومیەتی خویەوە بکا ، ئینسانیەتی خوش ئەوی . . پیاوی دانا وەنەبی نرخ لە قسەبنی لەبەر خاوەن قسەکە ، یا بە سوکي بزانی لەبەر ئـــەو بەلـکو تەماشای قسەکە ئەکا . . پیاوی تەواو ئەوەیە کە رەوشتي لە سەر شعور بە واجب دابمەزرینی ، کە ئەمەی بو ئەبی ئەوەشي بخاتە بال کە هەلەشە نەبی ، بەچیشا ئەمە دەر ئەکەوی؟ بەوەدا کە روحي خوبەخت کردني بی ، کە وابو پیویستە لە ســـەری بە ئەخلاق بیت و لەگەل ئەمەشدا راستی و دلسوزي بنوینی ، ئەگەر ئەمانەی کرد بەراستی ئەوە ئیتر پیاوی تەواوە . »

* * *

ئینجا بەرامبەر بەم ئەدەبی چینیە بزانین ئەدەبی کوردي چونە ؟. کورد، نە کونفوشیوسی تیدا بووە وە نـە ناوی کونفوشیوس ، یا ژیەیەکی تری بو

هیلراوەتەوە،ئەگەر کونفوشیوسی چین نەخرایەتە سەر کاغەز ئیستە ئەویش لە هینەکانی کورد خراپتر ون ئەبو، ئەمەش ئینکار نا کری کە هیچ قەومیک بی پیاوی ژیر نەبووە،جا با ئەو قەومە کیو یەکی پەتی، یا بەر بەر یەکی روت بو بیت لە چاو خویا شتیکی هەر بووە ، چونکە میللەت وەکو باخچەی پادشاهان وایە هەمو جورە میوەو گولیکی تیدایە، بەلام کە ناویان ون بو ئەمە ئەوە نا گەیەنی کە بیرای بیرای کەسیان نەبووە . . جا ئیمە دینین بەرامبەر بەم ئەدەبی چینیە چەند ئەدەبیکی پەندی پیشینانی کورد ئەخەینە بەرچاو کە پایەی ئەخلاق و عەقلیەتی ئەو رابوردوانەمان بو دەر ئەخا . کورد ئەلی :

« یان پیاویکی باشبە ، یان بیوروداس بە ، یان بمرە بوخوت خەلاس بە . بیور « تەور » ە . هاوالی هاوالان زورن ، پیاوی کردنی کەمن . جی بچینی ئەوە ئەدرویتەوە . زمان و دلت وەکو یەک نەبن بو مردن چا کیت . » .

تەماشا ئەکەی ئەم چەند پەندە وەکو لەگەل قسەکانی « کونفوشیوس » و چینا لە یەک بوتەدا قال کرابیتنەوە وایە .

# ئەدەبی کوردی وهندی کون

ئیمە لیرەدا مەبەستمان بەراوردیکە لە مەعبینی دو ئەدەبدا جا، با یکیکیان گەلی کونتریش بی، لە مەبەستەکەمان لا نادا ، چونکە ئەدەب پەردەی قەومەو بەراورد کردن لە بەین ئەدەبی دوقەومدا مەعنای بەراورد کردنی دو قەومەکە خویانە ... بەلی ! ئەگەر بهینری بەرانبەری ئەدەبی ئیستەی فەرەنسە بکریتە لەگەل ئەدەبیکی وەکو چیندا ئەمە زور بی جی یە ؛ بویە بی جی یە چونکە ئەوشاعرە، یا ئەو ئەدیبە کە ئەدەبەکەی ئیستەی فەرەنسە دا ئەلی لەبەر ئەوەکە ئیستە دەوری خویندەواریەو چاپ هەمو شتیکی بلاو کردوتەوە کابرای ئەدیبی فەرەنسە ئەدەبەکەی چینی خویندوتەوە،ئەگەرشتیکی وەکو ئەوی وت

ئەوە گومانی تیدا نیـــە کە لەوی وەرگرتوە ! . بەلام لەگەر قەومیک خویندەواری تیدا نەبو وە لە هەمو باریکا ئاشنایەتی لەگەل عالەما بڕرابو لەگەر ئەدیبیکی ـ تەنانەت لەم سەدەی بیستەمەشدا ـ هات شتیکی دانا هەر بە کون ئەژمیرریت و هەر وەکو تەعبیر لە شوری ئەدیبیکی دو هەزار سال لەمەو پیش لەو قەومە بدانەوە وایە : چونکە خویندەواری لە ناوانەبوەو نیە کە بلیت بە هوی خویندنەکەیەوە ئاشنا بوە بە فیکری ئەدبی قەومەکانی تر ـ چە تازەیان چەکونیان ـ عەلاقەی هاتو چوش لە بەینیانا نەبوە تا بوتری ئەم ئەدیبە چوەتە ئەو شوینە و لە بونی دەمیان تی گەیشتوەو هاتوتەوە شتیک ئەلیت کە وەکو هینەکەی ئەوان وایە ! . . بەلکو هەر شتیک بلیت هەر لە روی شعورە سادەکەیەوەیەتی نەوەک لەروی هەلسوکەوتی روحی، یا جسمی بی لەگەل بیگانەیەکدا ! . .

کەوابو ئیمە ئەگەر بەرامبەری ئەدەبی کوردی بکەین لەگەل ئەدەبی قەومیکی تردا ـ با ئەدەبی قەومەکەی تر زور کون بیت و ئەمیش زور تازە بیت ـ هەر وەکو بەرامبەری کونیک لەگەل کونیکا کرابیت وایە ، چونکە ئاشنایەتی روحی و جسمی نەبوە تا بلیت هەق نیە ئەم کون و تازەیە بەرامبەری پی بکریت رەنگی تازەکە لە کونەکە وەرگیرابی . . ئەمـــە لە لایەکەوە ، لە لایەکی ترەوە ئەدەبەکەی کورد لەبەر ئەوە لەســـەر کاغەز هەلنەگیراوە وەکو چون ئەوە هەلئەگری کە ئەدەبی دو سەد سال لەمەو پیشتر بی ئەوەش هەلئەگری کە ئەدەبی دوهەزار سال لەمەو پیشتر بی . . هەر جوربیت : هی دو سەد سال بیت یا هی دو هەزار سال هەر تەعبیر لە شوریکی صافی ناوچە ئەدانەوە . ئەو ناوچەیە بەبی عەلاقاتی خارجی دو هەزار سال لەمەو پیش چە تاسیریکی کردوتە ئەدیبیکی ئەو وەختە عەینی ناوچەی دو سەد سال لەمەو پیشیشی هەر ئەو تأسیرە لەکانە سەر ئەدیبیکی وەختی خوی . . جا ئەمانەیە کە ئیمەی هەلبژراندوە بو ئەوە ئەدەبی کوردی بەراورد بکەین

ئەدەبێکی کۆنی ئەبری کوردیدا ! . کەوابو ئیستە ئەلێن ئەدەبی هیندی و کوردی :

دەشتەکانی دەورو بەری قەزوین نیشتمانی قەومیکی ئاری بون . لەبەر تا کوکی بەینی خویان هەندیکیان ولاتەکەیان بەجی هیشت و سەرەوخوار بونەوە بو ئاسیای ناوەراست ، هاتن ، هاتن تا گەیشتنە کویستان و دارستانەکانی روژەلات . ماوەیەک لەوی مانەوە ئینجا چاویان بریە دەشتەکانی هیندو بوی کشان ! . دانیشتوە ئەسلیەکانی خویان کە پیان ئەوەتن «داسی» بەرەنگاریان بون ، کە زور بو قەواڵە بەتاڵە ! نەیانتوانی بیانگیرنەوە لەویدا جی گیر بون و ناونران «هیندوس» و داسیە ئەسلیەکانیان خستە ژیر سوخرەی ئیش وکاری خویانەوە ، ئەوانیش ناوەکەیان گوررا ، ناونران «شودراس» — کە بوزیەکان هەندیکن لەمانە — . هەندیکی تر لەم داسیانە هەرسەریان دانەنەواند بو ئەم لیشاوی ئاریانەو هەلاتن چون بو «دەکەن» و ئیستەش هەر لەوین . .

ئەم شەررو شورری بەینی ئاری کوچ کردوانە و بەینی «داسی»یە نیشتەجیکان سەرچاوەی زورتر لە ئەفسانەو داستانەکانی هیندە . ئەم ئەفسانانەهەتا زەمانی ئەمانە پیشەوە ئەوان لەبەرچاو هیندوسەکان پیروزتر وگەورەتر ئەبون ، هەتا وایان لی هات کتیبە پیروزەکەی هیندوس «ڤیدا»ی لی دروست کرا و کەوتنە سەر ئەو بروایە کە ئەمە خوا ناردوبە بو هەندی لە پیاوە گەورە رابوردوەکانیان ! ... لەم هیندوسانە «بورەهمن»ەکان پەیدا بون — کە ئەمانە سەرەتا دەستەیەک بون کاهن و خزمەتی «ڤیدا»یان ئەکردو پاسەوانی بون — ، لە پاشا پەرەیان سەند تایبنی بورەهمییان لی بەیدابو ، لە «شودراس»ەکانیش ئایینی «بوزی» هاتە ناوەوە . .

قسەکانی «ڤیدا» هەمو رو ، لە هیزی نەیمەت ئەکاتەوە ؛ بەیانی کە تاریکی شەو لا ئەبا ، خوراوا کە ئیشیکی وا لەکا پیاو ئەخانە شەو و عەزیەتی

روژی لە کول ئەبیتەوە ، باران کە دەغلوودان ئەرروینی . ئەمانە هەمویان بو ئەوە ئەشین کە پیاو سوپاسیان بو بکا . دیسان هەر لە «ڤیدا»دا ئەلی پیاو ئەبی لە خوا بپاررێتەوە بو ئەوە دەغلوودان و مالات زور بکا ، عمر دریژ بکا و رولەی چاک بدا بەپیاو .. هەر وەها ئەلی : بپاررێتەوە کە ئاری‌یەکان پاریزیو زالیان بکا بەسەر دوژمنا و هەر لەسەرەوەبن . لە باسی ئەو دنیاشا ئەلی روح ئەبی هەر بمینیتەوە تیاچونی نابیت .

کە هیندوسەکان لە دەشتەکانی «پەنجاب»داجی‌گیر بون دیسان روەو روژهەلاتی ئەوی پەلاماریکی‌تریان دابەوە ، لە دەوروبەری «گەنج»دا گیرسانەوە . بە تایبەتی دو تیرەیان ـ کە «پانگالا»و «بهاراتا» یان پی ئەوتن ـ بەسەر ئەوانیتردا زال بون . لەو وەختەدا کە اغریقەکان ئابلوقەی شاری «تروادە»یان دابو ئەم دو تیرەیە جەنگێ لەبەینیانا هەلگیرسا ، ئەم جەنگە بو بە سەرچاوەی شەررو شورریکی ـ مەلحەمە ـ شعری دریژ کە تاریخ و ئەفسانەی هیندی تیکلاو کرد و پی ئەلین «ماهابهاراتا» . بە کورتی ئەم چیروکە ئەلی :

(«پاندو» پادشای «بهاراتا» مرد ، پینج کورری منالی لە شوین بەجی‌ما لەگەل برایەکی کویردا کە ناوی «زریتارشترا» بو . براکەی نیشتەسەر تەخت و کوررەکانی «پاندو»ی لەگەل کوررەکانی خویدا بە خیو کرد . بە کوررەکانی «پاندو»یان ئەوت «سەروکەکانی پانداڤا» و بە کوررەکانی «زریتارشترا»یشیان ئەوت «سەروکەکانی کوراڤا» ... «دروپادا»ش پادشای «پانگالا» بو ، لەسەر شتیک «درونا» ـ کە پیاو ماقولیکی شارەکە بو ـ زیزی کرد . «درونا» باری کرد وچوە لای «زریتارشترا» لە «بهاراتا»و بو بە ماموستای سەرو سواری کوررە پادشاکانو فیریانی کرد . «زریتارشترا» لە تولەی ئەم کردەوەیەیدا لەشکریکی دایە کە بچیت تولەی خوی لە «دروپادا» بکاتەوە . چوو گەلی لەولاتی «پانگالا»ی گرت .

« زریتارشترا » پیرگو ، ویستی یەکێ لە کوڕرەکانی « پاندو » بخاتە سەر تەخت . کوڕرەکانی خوی نەیانهیشت و ناچاریان کرد کە « دریوزان » ـ کە کوڕری گەورەبو ـ بیکا بەجی‌نشین . ئەم کوڕرە ترسی پاشە ، روژی لە ئاموزاکانی هەبو ، هینای ئاگری بەردایە خانوەکەیان ، ئەوانیش ناچار هەلاتن بو بیشەلانەکان ! .

هیندوسەکان رەوشتیان وابو ئەگەر کچیکیان شوی بکردایە مەیدانی تیرەندازی و شەرر دائەمەزرا هەر کەسە تیایا سەر کەوتایە کچەکە شوی پی ئەکرد .. «دروپادی» کچی « دروپادا » پادشای « پانگالا » جاررچی نارد بو ئەوە جارربدا مەردم بین مەیدانداری بکەن هەر کە،سەر کەوت شوی پی ئەکا . « ئەرجون » کە کوڕرە گەورەی « پاندو » بو وە زور شارەزای تیرەندازی و سواریش بو ئـــەمەی بیست و هات بو « پانگالا » جلی کاهنیکی بورەهمی لە بەر کردو روی کردە مەیدانی تیرەندازان . مەیدانەکە پرربوبو ، « دورپادی » یش هات و بو ، بە چەپلەریزان . مەیدانداری بە شەپوریک کرایەوە . تیرو کەوانیکی گەورە دانرابو بو تاقی کردنەوە گویا هەر کەهەلیگرت ئەوە ئەو کەسە سەرکەوتووە . زور کەس هات کەس پی هەلنەگیرا ، « ئەرجون » هات هەلیگرت وتیری پی هاویشت و نیشانەکەی شکاند . « دروپادی » چو ، چەپکە گولیکی پی‌بو ــکردی بە بەرسنگی «ئەرجون»دا ، یانی کردی بەمیردی خوی ! . خەلـکەکە لەبەر ئەوە دوژمنا یەتی لەبەین کاهن و پیاو ماقولاندا هەبو وە ئەرجونیش جلی کاهنی لەبەردا بو توررە بونو وتیان چون ئەبی کچی پادشا کاهنیک بەزیاتر بزانی لە پیاو ماقولیک !؟ . ئەرجون کە ئەمەی بیست جلەکانی لەبەر خوی داکەند . خەلـکەکە سەیریان کرد ئەمە کاهن نی‌یە ، کوڕرە پادشایە ! . .

ئەرجون کچی پادشای مارەکرد و سەر لە نوی ئەستیرەی سەروکەکانی پاندائا هەلهاتەوە . «دروپادا»ی خەزوری ئەرجون هاو پەیمانیکی بەدەستی

هەبو، ئەرچون و براکاني داوایان لی کرد کە یارمەتیان بدا بو ئەوە بچن « بهاراتا » لە « زرەتارشترا »ی مامیان وەربگرنەوە ، ئەویش پشتیوانی کردن و چون « زرەتارشترا » هیناى نیوەى روژاواى ولاتەکەی ـ کە شوینیکی بی خیر بو ـ پیدان و نیوەى روژەلاتەکەشي ـ کە شوینیکی بەپیت بو ـ داى بە کوڕەکاني خوی . ئەم سەروکانەی پاندافا کەوتنە چاوپری کردني ولاتەکەو ئاوەدانیان کردەوە و گەلی شاریان تیایا دروست کرد ـ « دەلهی » یەکیکە لەوشارانە ـ . ئەم ملکدارەی ئەمان لەجەرپەکی لە دلي « دریوزان » دا هەلگیرساند ، کەوتنە سەر ئەوە فررو فیلیکیان لی بکا . هیناى هەموی بانگیشتن کردن و قوماری بو دامەزراندن ، لە قومارەکەدا گزي کرد هەر شتیکیان هەبوو نەبو لی بردنەوە و کەوتنە سەر ساجی ئەلی ! .. ئینجا ئەمەی بو دامەزراندن پی وتن :

ئەبی دوانزە سال خوتان ون کەن ، لە پاش دوانزە سالە سالیکی تریش لە شاریکا دانیشن ، ئەگەر ئیمە ـ کە سەروکەکاني کوراڤاین ـ لەم سیانزە سالەدا نەماندوزینەوە ئەوا ئەو وەختە مال و ملکەکەتان ئەدەینەوە . ئەم هەزارانە چونو بە بیشەلان و جەنگەلستانەکانا ویل بون . « دروپادی » ژني « ئەرچون »ی شیان لەگەل بو ، مەگەر خوا بزانی ئەم دوانزە سالەیان بەچە جەزرەبەیەک بردە سەر ؟! ... رازو نیازو بەسەرهاتی ئەم دوانزە سالەیان لە بیشەلانەکانا کو کزاوەتەوەو ناو نراوە « کتیبي جەنگەل » . بەراستي شتي زور بەنرخ و سەیری تیدایە پایەی ئەدەبي هیندي بە تەواوي بەرز کردوتەوە .

لە پاش دوانزە سالە هاتنە شاری « مانسیا » و خویان گوری ، دویان بون بەشوان ، یەکیکیان بە دەرگەوان ، یکیکیان بە مەیتەري ولاخان ، یکیکیان بە ئاشچی کوشکی شای خانەدان ، « دروپادی »ش بو بەکارەکەري شاژن لە ئەندەرون ! . ئەم سالي سیانزەهەمەیش دە مانگي رویشت ، کەوتنە

خوتي خوتي كە گويا زوری نەماوە لەم دیلەتیە رزگاریان بی . لەم ماوەیەدا سەرکردەی لەشکر چاوی بە «بروبادی» ئەکەوی و دلی لی ئەچی! زوری خەریک ئەبی بوی دەست نادا، لە پاشا توشی جەزرەبەی ئەکا . لەسەر ئەمە یەکی لە براکان ئازایەتی دیتـــە جوش و سەرکردە بی شەرمەکە ئەکوژیت ! . لەم ماوەیەدا « دربوزان » لە هەمو ولاتی هیندا هەر چاوە چاوی بو بەلــکو ئەم برایانە بدوزیتەوە ، بەهیچ نەگەیشت .. بەلام روژیک ئەوەی بیست کە : پەنیوی کەوتونە ( مانسیا ) وە . سەروکەکانی کوراڤا ئەمەیان بە هەل زانی بو ئەوە مانسیاش دابگرن ، لەشکریان بو کرد . پادشای ( مانسیا ) — کە منالیک بو — ئەویش لەشکری کرد و چوە دەرەوە ، ( ئەرجون ) جلەوی ولاخەکەی بو ئەگیرا . پادشای منال کە چاوی بە لەشکری دوژمن کەوت بی هوش بو وکەوت ! . ئەرجون پەلاماری داو نرکاندی وتی : ( من ئەرجونم ! ) و روی کردە لەشکری سەروکەکانی کوراڤاو تارو ماری کردن . لەم ماوەیە سیانزە سالە تەواو بو ئینجا هاتن داوای مال و ملکەکەیان کردەوە ( دربوزان ) وتی ئیوە بەپی قسەی خوتان ئەبزەتونەنەوە ، هیشتا سیانزە سالەکە تەواو نەبوبو ئەرجون خوی ئاشکرا کرد .. ئەم بررو بیانوە بوەوە بەهوی دامەزراندنی شەرر لە بەینی هەر دو بەرەکەدا . لە ئاخرا ئەم پینـج برایە ـ سەروکەکانی پانداڤا ـ سەرکەوتن و ( دربوزان )یش کوژرا . )



بەرامبەر بەم چیروکی هیندیەی لە کوردیشدا چیروکیک هەیە وەنەبی لەبیرو باوەرردا زورلیک دوربن، ئەگەر دوریش بن ئیمە ئەوەندە کوشش هەر ئەکەین کە بکەویتە ســەر کاغەزو لەمە زیاتر لە ژیر پەردەی لەفــکر چونەوەدا نەمینیتەوە ! .. چیروکە کە ئەگیرنەوە ئەلین :

« ( بەرگرد ) و ( فەرگرد ) دو برابون هەر لە باپیرە گەورەیانەوە دەستە

جەوی عەشرەتەکەیان لەولای (پا کتریان) بە گەورەیی بو مالەوە، فەرمانی رەوانو کام رەوا بون . روژی لە روژان ( بەر گرد ) دائیەنیشو چولەکایەک بەسەر سەربانی بەرری و بریاسکایەکی لی کاوتە خوارەوە و کەوتە گوشی ئەم ، کە کردیەوە دو دانە گەوهەری شەوچراغی تیدابو ، هەر کە چاوی پیان کەوت ئاوی چاوی هات و هەر دو چاوی کویر بون ! .. پزیشک و داو دەرمان نەما ، هیچی کەلکی نەکرت . لەولاشەوە مال و دەولەتەکەیان روژ بە روژ لە کورتی ئەدا ، تەنانەت سەگیکی کونیشیان هەبو کە سالەهای سال بو لەبەر قاپیە کەیانا کەوتبو هــــەر کە ( بەر گرد ) ئەچوە دەرەوە، یا ئەهاتە ژورەوە سەگەکە بی ئــەوەرری و ئەگەر یەکی لە خزمەتــکارەکانی لەگەل نەبوایە ئەیخوارد ! . هەر وەها ئەسپی تایبەتی سواری خویان هەبو ـ ئەو ئەسپە کە جاران هەر کە ئەمان دەمر ئەکەوتن پشتی دائەنەوان ـ ئیستە ، کە چاوی بە یەکی لەمان ئەکەوت دەستی ئەکرد بە جوتەوەشاندن و هەلئەهات ! . بە کورتی روژ بە روژ لە کورتی یان ئەدا ، روژی فلان خزمەتــکار و کارەکەر لیان هەلئەگەررایەوە ، روژی فلان عەشرەت و خیل لیان ئەتورا . بەم جورە ئەستیرەیان کەوتە لیژی و دنیایان لی بو بە چەرمی چولەکە ! ..

لەم کارەساتە بە جاری سەریان سر رما، هیچ شەخس و پیاو چاکیک نەما نەگەررن چاریکیان بی نە کرا . . دایکە پیریکیان هەبو روژیک وتی : « من لە باوکتان و باوکیشتان لە باپیرە گەورەتانەوە بیستومە کە ئەم بنەمالەیە ئەکەونە جوشی جوانی و بەرزبونەوە کوتوپرن سەرەو لیژ ئەبنەوە ئیتر نازانم هەلئەستنەوە یا هەلنائەستنەوە ! ئەو تو سەرەو روژە ئەم روژە بی کە ئیمە تو شمان بووە ؟ . . ئەم قسەیە ئەوەندەی تر دلی ( بەر گرد ) و ( فەر گرد ) ی تەنگ کرد . شەوی فەر گرد بەم و تو ویرەیەوە ئەتلایەوە تا خەوی لی کەوت ،هەر کە چاوی چوە خەوو نەچو کوتوپرر دەنگیکی هاتە گوی وەکو لە دەمی بەری دەربچی وابو وتی : ( بررو ! حەو جوت بدررە ، حەوشار بگەررە ،

حەوشت بگۆررە ، حەو خێر وەرگرە ! ) هەر ئەمەی بیست و لە خەوەکە راچەنی ، ئیتر هەر چەندی کرد خەوی لێ نەکەوتەوە ، ئەو شەوەی روز کردەوەو بەیانی خەوەکەی بو دایکی گیرایەوە . دایکی وتی : (روله من هەر ئەوەندەی لێ ئەزانم هەستە بچو حەوجوت پیلاوی ئاسنین دروست کە تا ئەیاندرریت بگەرری ئیتر لەمە بەولاوە نازانم . ) .

ئەمان لەم قسەدا بون هەرا دا کەوت هەر ئەوەندەیان زانی دەوریان گیرا ! تومەز ئەمە کونە دوژمنیکی عەشرەتداریان هەبو ، کە ئەزانی ئەمان بەم جورە روزگار پشتی تی کردون بە هەلی ئەزانی لەشکر ئەکاو دیت ناوەستیتەو تا تەنانەت ئابلوقەی کوشکەکەشیان ئەدا ! . ئەو لەشکرە تا ئەگەنە ئەوشوینە هیچ کەس نابی بەرەنگاریەکیان بکا ! . (فەرگرد) هەر ئەوەندەی پی ئەکری دەستی پیریژنەکەی دایکی‌و براکویرەکەی ئەگریت و هەلدین و ئەچن لە ئاشەکونیکا ئەمیننەوەو سەری خویان کز ئەکرن . لیرەدا فەرگرد بەتەواوی دل تەنگ ئەبی و هیچ بەدلیا نایە تەنیا ئەوە نەبی کە ریگەی عەودالی بگریتە بەرو برروا . هەلئەستی حەوجوت کەوشی ئاسنین لەگەل خوی ئەباو دەشت ئەگریتەبەرو دایکو براکەی لە ئاشە کونەکەدا بە کەساسی ئەمیلنەوە ! . حەو سال هەردە گەرری کرد ، چولوبیابانی پشکنی‌و ولات نەما نەسوررێتەوە و جەزرەبە نەما نەیکیشی ! .. داستانی ئەم حەوسالەی گەلی کتیب لە چیروکی کوردیدا پرر ئەکاتەوە بەلام ئیمە چاومان لی پوشی . .

روژیکی لە روژان بی دەرەتان و سەرگەردان بە چولیکا ئەسوررایەوە ، ماندو مردو ، برسیو تینو ! . لە دورەوە چاوی بە ئاسکیکی کەوت ، دەست لەسەر شان نایە سەر ئاسکەکە ، ها ، لیرە ، ها ، لەوی راوی ئەنا هەتا ئاسکە لە زەویکدا خوی کرد بە کونیکا ، فەرگردیش بە کونەکەدا بە شوینیا چوە ژورەوە ، سەیری کرد ئەمە دەشت‌وکانیاوەو دارو دارستانە ، هیچ سوراخیکی لە ئاسکەکەوە نەدی ! بەلایەوە سەیر بو . هەندیکی تر چو ، تەماشای

کردوا دو ئاخوڕر یکیکیان سەگیکی لەسەر بەسراوەتەوەو یکیکیان ئەسپیکە بەلام بەر ئاخورری سەگەکەیە لە(کا)وەی ئەسپەکەیە لە (ئیسکە)ئەوانیش هەر نوزەیەکیان تیدا ماوە ا . زوری بەزەیی پیانا هاتەوە هینای ئیسکەکەی لەبەر ئەسپەکە هەلگرت و کردیە بەر سەگەکە ، کایەکەشی لە بەردەم سەگەکە هەلگرت‌و کردیە بەر ئەسپەکە . هەندیکی‌تر رویشت تەماشەی کرد ئەمە داریکەو گومیکی لە نزیکەوەیە ، دارەکە لەبەر تینویتی هەمو لق‌و پوپەکەی وشک هەلگەرراوە ، گومەکەش لەبەر ئەوە بەرەکەی گیراوە ئاوەکە بەنگی خواردوتەوە و بوگەنی کردوە زور دلی بەدارەکە سوتا ، چو کونی گومەکەی بەرەلا کرد ئاوەکە خورر چوەبن دارەکە ، هـەم دارەکە بوژایەوە ، هەم گومەکە بوگەنەکەی نەما . هەندیکی‌تر رویشت پشیلەیەک‌و مەرریکی بەرچاو کەوت بەسراونەتەوە بەلام پشیلەکە بیچویکی هەیە بەسراوە بەمەررەکەوە ، مەررەکەش بەرخیکی هەیە بەستراوە بەپشیلەکەوە ا . نەپشیلەکە شیر ئەدا بە بەرخەکە وەنە مەررەکەش شیر ئـەدا بە بەچکە پشیلەکە ، بەرخ و بیچوە پشیلەکە لە برسانا زەرد هەلگەرراون ، پشیلەو مەررەکەش لە بەر ئەوە چاویان لە کورپەکانیانەو دەستیشیان نایا ـ نگانی هـەر وەختە لە تاوانا بال بگرنەوە . ئەمیش هینای بەرخ‌و بەچکە پشیلەکەی هەر یەکە خستە بەر دایکی خویان و بەرەلایشی کردن ، باررەی مەرر وبەرخ‌و میاوەی پشیلەو بەچکەی لە خوشیانا گەیشتە عاسمان .

هەندیکی‌تر رویشت گەیشتە کانیاویک تینوی بو چوە سەر کاریزەکە ئاو بخواتەوە سەیری کرد وا لەبنەوە قەفەزیک دیارەو کوتریکی لە نازایەو بەردەیەکی رەش لە ناو قەفەزەکەدا دراوە بەسەر کوترەکەدا . دەستی برد قەفەزەکەی دەر هیناو درگاکەی کردوە کوتر هەر نوستوە ا . هەر چەندە دەستی پیوە ژەند خەبەری نەبوەوە ئینجا پەرروەکەی لەسەر سەری لابرد خەبەری بوەوە بەلام هەلنافرری ا. سەیری کرد شتیک لە دەمیایە

دەستی برد دەري هينا تەماشا ئەكا ئەمە ئەنگوسیلەیەكە ، هەر كە ئەنگوسیلەی لە دەم كوتر دەرهينا كوتر دای لە شەقەی باڵو هەڵفري بە ئاسمانا. كە كوتر هەڵفری هەواكە گورراو گژوبایەكێ پەیدا بو ! تەماشای كرد لەشيشی خەریكە تیك ئەچی ، چاري نەبینی بيجگە لەوەنەبی كە بەرەودوا بگەرریتەوە . .

دەستی كرد بەگەررانەوە كەچی لە پشتەوە ئەوا یەكی بانگی ئەكا پی ئەڵی مەرروا . لای كردەوە هیچ دیارنیە و دەنگەكەش هەر دیت ا. هیچ گوپی نەدایە پی پیا هینا هەتا گەیشتەوە مەرروّ پشیلەكە. گوپی لی‌بە ئینجا دەنگەكە بە مەرر و پشيلە ئەلی بیگرن ! ئەوانیش ئەلین نایگرین كورپەی دواینەتەوە . دەستیان كرد بە خوسن‌دان بە دەنگەكە . . هات گەیشتە دارو گومەكە دەنگەكە وتی دارو گوم بیگرن ا. وتیان نایگرنن ئاوي داوین‌و بوگەنی لابردوین . گەیشتە سەگ‌و ئەسپەكە دەنگەكە بانگي كرد سەگ‌و ئەسپ بیگرن ! ئەوانیش وتیان نایگرین ئالیك‌و خواردني داوینی . هاتەوە هەتا گەیشتەوە بەر كونەكە . سەیری كرد دو شیر راست‌و چەپ‌بە بەر كونەكەدا هاڵواسراوە و ریگە نیە بچیتە دەرەوە ، گەلی خەریك بو ریگەیەكي بو نەدوزرایەوە .شمشیرەكەي خوی دەرهینا ویستی بەشمشیرەكە،شمشیرەكان لابدا، هەر كەشمشیرەكە كەوت لە شیرەكان دنیا بو بە توزو باوگەردولول.شریخەیەكێ هات لە میشكیا دەنگي دایەوە و كەوت ا . لە پاش توزی ســـەري بەرز كردەوە هیچی‌بەرچاو نەكەوت ، نەدارستان‌و دەشتەكە ،نەكون و شیرەكە ا . توزی خوین رژاوەو هیچي‌تر ! بەلام لەشي زور سوكەو دلیشی خوی لە خویەوە زور خوشە . . ئیتر كەوتە ئەو دەشتەو نازاني بو كوی ئەچی‌و ئەم شوینە كوی‌یە ؟! .

پیلاوەكاني دررابو پیلاوی‌تریشی نەما بو لەپي‌كا ، لە شەكەتیاو لەبەر ژاني قاچی لەبن كاني‌وداریكا دانیشت بو ئـــەوە توزی بحەسیتەوە ، زوریشی

برسیە . کوتوپرر لەدورەوە بررە سواریکێ دەرکەوتن و هاتن بو سەر کانیەکە دابەزین و دانیشتن ، هەروا کەوتنە قسەکردن لە بەین یەکدا . فەرگردیش داوای نانی لی کردن ، نانیان دایە ، ئینجا لی پرسین ئەم شوینە کوی بەوە ئیوە کێن و بو کوی ئەچن ؟ ... ئەوانیش وتیان ئیمە پیاوی « بەرگرد » شاین ، ئەمە حەوت سالە برایەکي بی سەرو شوین رویشتوە ئیمە ئەمە چل روژە بە شوینیا ئەسوورریینەوە و ئەپرسین هیشتا هیچمان لیوە دەست نەکەوتوە ! . فەرگرد لەم وەلامە سەری سرما ! . وتي بەرگرد شا خوی کي بەو براکەی کی یە ؟

وتیان بەرگرد شا پیاویکی بنەمالە بو ، برایەکي هەبو « فەرگرد »ی ناوبو لە پیش حەوسالدا بەرگرد شا خوی چاوی کویر بو و دنیا پشتي تی کرد ، هەر شتیکیان هەبو و نەبو لە دەستیان چو ، دوژمن هات ولاتەکەشي لە دەست سەندن ، لە پاشا دەربەدەر بون . ئیمسال بەرگرد شا چاوەکەی چاکێ بوەوەو گەررایەوە ، هات دوژمنی لە ولاتەکەی دەر کردو مالو ملکەکەیشی سەندەوە ، لە پیش حەو سالدا «فەرگرد »ی برای بی سەرو شوین رویشتوە ئیستە پیاوی خستوتە هەمو مەملەکەت بە شوین براکەیا وە ئیمەشي ناردوە بو ئەم ناوچەیە ئەمە چل روژە ئەسوورریینەوە ریی بەدییکان نەکردوە !! ..

فەرگرد وتي کەواتە « من فەرگردم » ! . سوارەکان هەمو هەستان و کرنوشیان بو برد وتیکررا پیکەوە لیاندا رویشتن . فەرگرد وتي من تا ئەم ولاتە هەمو لە دوژمن پاکێ نەکەمەوە و هەموی نەگرم ناچمەوە مالەوە . پیاوەکان وتیان هەر فەرمانیکێ بکەیت ئیمە لەژیر دەستاین . ئینجا بیني پیوە ناو دەستی کرد بە پەلاماردان ، روی ئەکردە هەر شارو لەشکریکێ لەیکرت و ئەیشکاندن ، هەتا حەوشاری حەو مەملەکەتی ئەو دەورەی گرت و بە پیروزي و سەر بەرزي روی کردەوە ولاتەکەی خوی ! . لەبەر ئەوە ئەم بیە گەورە بو لە سەر تەخت دانیشتو بەرگردی

جوابچوکی بو بەوەزیری و فەرمانداریی ولاتەکەیان کرد . »

ئیمە کە سەیری ئەم دو چیروکە بکەین - چیروکی هیندی و کوردی - ئەوە بخەینە ئەو لاوە کە ئەویان زور کونەو ئەمیان وەکو نازانری زور کونە ئەوەش هەر نازانری کە تازەیە ، گەلی گەلی لیک ئەوەشینەوە ، وەکو لە بیر و باوەرری رەگەزیکی تایبەتی سەریان هەلدابی وانە ! .. ئەمانە، یا ئەفسانە بن، یا داستانیکی راستەقینە بن لەم رووەوە هەر دوکیان لە تاکی تەرازوـ یەکدان . ئەمیلیتەوە سەر ئەوە ئەفسانەکە یەکیکە لەو بەردانە کە پایەی رەوشت و عەقلیەت و ئەدەبیاتی قەومیکی پی دەر ئەکەوی ، لە هەر یەکەیانا شتیک هەیە کەوینەی رابوردوی قەومەکە بدانە دواوە، وەکو ئەوە : ـ

چون لە ئەفسانەی هیندیەکەدا دنیا پشتی هەلـکرد لە سەروکەکانی پانداڤا ـ کە کوررەکانی « پاندو » بون ـ لە هی کوردیەکەشدا بەو جورە پشتی کردە بەرگرد و فەرگرد . لە هی هیندیەکەدا جەزرەبەی دوانزە سالەی سەروکەکانی پانداڤا ـ کە سەرچاوەی گەلی ئەفسانەی هیندیەـ لە هی کوردیەـ کەشدا جەزرەبەی حەو سالەی بەرگرد و فەرگرد ـ کە ئەمیش گەلی داستانی کوردی تیدایە ـ . لەهی هیندیەکەدا شەررو شوررو مەیدانداری سەروـ کەکانی پانداڤا لەگەل سەروکەکانی کوراڤا ، لە هی کوردیەکەشدا شەررو شورری بەرگرد و فەرگرد لەگەل ولاتەکانی دراوسیانا بو سەندنەوەی ولاتەکەیان و گرتنی ولاتی تر ...

هیچ ئەفسانەیەکە لە باریکی ئەدەبی و عەقلی دا نابی خالی بی لە دەرزو پەند . ئەفسانەو چیروکی کوردی ئیستەش هەر لە کوبی ئاگرداندا پررو پیرێژنان ئەیگیررنەوە بو ئەوە ئاغەی مال خەوی لی بکەوی یا ، منالو رەوالی پی بخەلەتینن ! . لەگەل ئەوەدا ئەگەر بینە سەر راستی ئەفسانە بو ئەوەنییە ، بەلـکو پەندو ئاموژکاریەکە ، کە قسە لە سوررانەوەی میچی دنیا ئەکا و شانوی ئاسمان پیشان ئەدا ، وەکو لەم چیروکە کوردیەدا ئەمە دەرئەکەوی

یەکەم ئەو دەرزە دائەدا کە پشت بە دنیا بەستن ئیشی پیاوی ژیرنیە ، دنیا وەکو میچە ئەخولیتەوە وەکو خوشی تیدایە ناخوشیشی تیدایە ، وەکو بەرزی تیدایە نزمیشی تیدایە، هەموی وەکو پەردەی سینەما دیت و ئەرروا ! . دوەم پیاو تا رەنج نـــەدا نا گاتە گەنج ، تا چەرمەسەری وشەونوخونیو جەزرەبە نەبینی نا گا بەمراد . سیەم لەخراپە خراپەت توش ئەبی و لە چاکە چاکە ، هەمو دەم پیاو ئەبی خەریک ئەوەبی لە ئیشی چاکە بەولاوە هیچی تر نەکا . ئەگەر فەرگرد ئەو چاکانەی لەگەل سەگ و ئەسپ و شتەکانی تردا نەکردایە هەر لەو شوینەدا سەری تیا ئەچو . چوارەم پیاو نابی کول بدا ، دەستی دایە هەر ئیشیک ئەبی تا سەر لەگەلی بیت، ئەگەر نەیبردە سەر هەم خوی ناهومید ئەبی، هەم ئیشە کەش ناچیتە پیستیکی وەهاوە کە یکیکی تر کەلکی لی ببینی .



ئەمانەوی ئیمە لە هەمو سوچیکەوە بەراوردی ئەدەبی هیندی و کوردی بکەین ، بویەش ئەمانەوی چونکە مستی نمونەی خەرواریکە . لە چیروک و ئەفسانەدا ئەوەندەمان دەر بری . لە پەندی پیشینانیشدا چەند دانەیە دەر برین . . پەندی پیشینانی هیندی ئەلی:

«لی قەومان بەردی مەحەکە بو تاقی کردنەوەی دوستی راستەقینە ... نەخوشی و خەم و مەینەت و ئازار هەموی لە پاشەروکی ئەو هەلانەیە کە پیاو لە رابوردودا کردونی ... بەزەیت بیتەوە بـــەو کەسەدا کە داوای بەزەییت لی ئەکا ، خیرو بیرت وەکو باران بیت، مانگ رونا کیەکەی بەسەر ساغ و نەخوش و بەسەر ئاغەو نوکەردا بلاو ئەکاتەوە ... شوین دوژمنی راست بکەوە نەوەک دوستی ناراست ، دوستایەتی و دوژمنایەتی بە قسەو بەناو جیانا کریتەوە، بەلـکو بە ئەقل و کردەوە جیا ئەکریتەوە ... لە وەختی دەولەمەندیتا لە خوت بایی نەبیت، وەکو چون کچ یاری بەبوکە شوشە ئەکا چارەنوسیش بەو جورە یاری بەپیاو ئەکا ! . »

پەندی پیشینانی کوردی ئەلی :

« کەس ئەوەیە لە روژی تەنگانەدا فریاکەوی .. روژان روژی لە دوایە: حەتاهاتم بو هەر هات هاتم بو ، کە نەهاتم بو روی تاریکیم بو ! . . وەختی کاروبار ئەمانکەی بەیار ، وەختی چزوبز ئەمانکەی بەدز ! . نەگبەتی خوی باشە قورتەکانی خراپە . دوستی دوستم دوستمە ، دوژمنی دوژمنم دوستمە . دوژمنی دانا بو بە دوستم ، چاوەری کە بکەوی کوستم . خیری وەکو بارانی بەهارە . . دوژمن ئەگەر بچوکیش بی هەر ئیشی زل ئەکا » . .

# ئەدەبی کوردی وعیبری کون

ئەدەبی عیبری سەر حەلقە زنجیرەیەکە لە ئەدەبەکانی « سامی » کون کە لە دەوروبەری جزیرة العربدا سەری هەلداوە ، بویە لەوی پەیدا بووە چونکە عیبرەکان لە پی دەشتەکانەوە هاتن بەسەر « ئەردن » دا و لە « فەلەستین » گیرسانەوە . . لەپیش ئەم هاتنەیانا بە شیوەی ئارامی[1] قسەیان ئەکرد ـ کە ئەم شیوەیە لە هەمو زمانی بە عەربیەوە نزیکتر بو ـ . کە چونە فەلەستین شیوەی قسەکردنی دانیشتوەکانی فەلەستین ـ کە شیوەی کەنعانی بو ـ وەریان

---

( ١ ) ئارامیەکان ئەچنەوە سەر ئارامی کوری سامی کوری نوح . لەمانە چەند تیرەیەکی سامی بون هەندیکیان چونە کەنعان « فەلەستین » لە دەوروبەری سەدەی سیانزەهەمی پیش میلاد لەوی دانیشتن . هەندیکیشیان لە دەوروبەری سەدەی دەیەمی پیش میلادەوە هاتنە عراقەوە ، لەمانە کەلدانی پەیدا بو . پاشماوەی ئەم کەلدانیانە لە عراقدا هەتا دەوری عەباسیەکان بە شیوەی خویان قسەیان ئەکرد وەبگرە تا ئیستەش، هەندیکی تریان لە شیمالی هاموا دانیشتن و بەرەی « حیثی » یەکانیان برراندەوە .

گرت و کردیان به شیوەی نوسین و قسە کردنی خویان . هەر چەندە ئەمەیان کرد بەلام هەر زمانیان پاک نەبوەوە لە زمانە ئەسلیەکەی خویان ـ کە زمانی ئارامي بو ـ . جالەبەر ئەمە جیاوازیەکی کەم لە لایەن شیوەی قسە کردنەوە لە بەین ئەمانەدا و لەبەین کەنعانی ، یا فەلەستینەکانا پەیدا بو ، هەر لەبەر ئەمەش بو کە زمانەکەی خویانیان ناونا « زمانی عیبري » . لەبەر ئەم هاتو چو کردنەیان و بی جیگەییەیان ئەو ئەدەبە عیبریە کە پیاو ئیستە بیگري بە دەستەوە تاریخ میژوي ئەگیرریتەوە بو هەزارو سەد سالیک پیش میلاد .

ئەوی لیرە ئیمە بیگرین بە دەستەوە و بەرانبەري پی بکەین لەگەل ئەدەبي کورديدا تەنیا دو شتە ، یەکەم « کتیبی پیروز ـ توراة وانجیل » کە ئەمە ئایەتیکە لە ئایاتی ئەدەب . دوهەم پەندی پیشینانیان کە لە زەمانیکی کونەوە بەبي گورراني خویان کەوتوتە سەر زمانیان و ئەحوالي عەقلیەیان پیشان ئەدا .. جا بەم بونەوە ئیمە چاویک ئەخشینین بەکتیبی پیروزدا بەو ناوەوە کە کتیبیکی ئاینیە و هیچ کتیبیکي ئاینیش خالي نیە لە ئەدەب ، دیسان وەکو ئەدەبیشە کتیبیکی تاریخیشە ، ئەگەر بەناوی تاریخیشەوە قسەی لیوە بکریت هـــەر وەکو ئەوە وایە کە قسە لە بەلـگەکانی « هیرودوت » و « گەزەنەفون »ەوە بکریت .. ئەگەر خو بەناوی ئەدەبیشەوە قسەی لیوە بکریت وەکو گویچکەت لە دەنـگي ئەدەبیکی زور خوش بیت وایە .. دیارە قسە لەم جورە شتانەوە زیانیک بە ئاین ناگەیەني ، نەوەک هەر ئەوەندە بەلـکو قازانجیکي زور گەورە بە میژوو ئەدەب ئەگەیەنی .

« توراة » کەپي ئەلین « پەیمانی کون ـ عهدی قدیم » ئەوشتانەیە کەپیش مەسیح نوسراوەتەوە و بناغەی ئەدەبي عیبری و ئاینی جولەکەیە ، وەکو ئەوانە بناغەی ئاینی گاوریشە و کتیبیکي هەرە گەورەیە لە ئاداب و رەوشتی هەمو قەومەکاني گاوردا . جولەکە وگاور هەر دوکیان دان بە

« پەیمانی کون ـ توراة » دا ئەبینین ، لە پاشا لیک جوی بونەوە ؛ کتیبی جولەکە بو بە « تەلمود » و کتیبی گاور بو بە « پەیمانی تازە ـ عهدی جدید » یانی ؛ انجیل . .

« تەلمود » هەندە یاسایەکە کە سەروکەکانی ئاینیی جولەکە شەرحیان لی کردوە ، چە خوی چە شەرحەکەی ئەو رەوشت و عادەتانەیە کە جولەکەکان پشت بە پشت ئەیبەنەوە سەر « موسی . ع » . . ئەم دەستگرتنەی جولەکە بە رەوشت و عاداتی کونیانەوە کردویەتە کاری کە هەر لە زەمانیکی زوەوە تا کو کي لەگەل گاورەکانی ئاوروپادا بکەویتە بەینیان . هەر وەها جولەکە لەبەر ئەم رەوشتەیان گویا خوینی خویان بە پاکي هیشتونەوە ؛ نە ژن بە کەس ئەدەن وە نە ژنیش لە کەس دینن بەلام لە دەوری کونیاناوا نەبون وەکو « عەزرا » ی کاهن ئەیگیریتەوە خوینەکەی خویان بە هوی ژنو ژن خوازیەوە لەگەل غەیری خویان پیس کردوەو جولەکەیەکی ساغ لە نەوەی اسرائیل نەماوەتەوە . دیسان لەم سەد سالەی دواییەدا بە هوی تیکلاو بونیان بە ئاوروپاوە ئەوەندی تر خوینیان تیکچو . . « تەلمود » ئەگەر سەیری تەنیا لوختەی رەوشتي تیدا بکریت تاقە کتیبیکی عالەمییە . بەلام ئەگەر سەیری ئەقل وشکی جولەکەکان بکریت وەنەبی کاریکاتە سەر ئەدەبی قەومیکي‌تر یا کردبیتی ؛ بیجگە لە جولەکە خویان قەومیکي‌تر کەمتر تەماشای ئەکەن و ئەیخوینننەوە ، دیسان لەگەل ئەمەشدا هەر وەرگیراوەتە سەر زمانی ئاوروپاو نوسەرەکانی ئاوروپا گەلی جار قسەی تەلمود و پیاوی جولەکە بووە بە سەرچاوەی ئیلهامي نوسینیان ...

ئەم « تەلمود » ە تا کو کرایەوە نزیکەی سە سەدەی کیشا ؛ واتە : لە سەروبەري سەدەی چوارەمي پاش میلاد تا ئاخرو ئوخری شەشەم . دیسان خویشي ئەبی بە دو بەشەوە یەکەم « میشنا » کە کومەلە ئەحکامیکي شەرعیەو گویا لەسەر رەوشتي « پەیمانی کون » دروست کراوە و بە عیبري

نوسراوەتەوە ، دوهــــەم ( جار ) کە بە عیبري و ئارامي نوسراوەتەوە ، ئارامی‌ش ئەو لوغەتەیە کە بەشي زوري ( بەعانی تازە )ی لە ســەرەتا دا پی نوسراوەتەوە .. جا ئەم چیروکە نمونەیەکە لە ئەدەبی عیبري ، یا جولەکە کە لە ( تەلمود ) دا هەیە : ـ

« جەلیک سەروکی شاریک نوکەرەکەی خوی ناردە بازارر (ملسی) یەکی بو بکرریت ، پیاوەکە ، کە چوە بازارري ماسي فروشەکان سەیری کرد هەموی فروشراوە تەنیا ماسیەک نەبی ئەویش جولەکەیەکی بەرگ درو لە سەری وەستاوە هەر زیادی ئەکا . پیاوەکە وتي : ( ئەم ماسیە لە سەر من بە پارچە ئالتونیک ) . جولەکەکە وتي ( لە سەرمن بە دو ئالتون ! » . نوکەرەکە لیزیاد کردو جولەکەکە زیاتری کرد ، جولەکە کەنەیهیشت ماسیەکەی لەدەست دەرچی تا بە دە ئالتون کری ! . نوکەرەکە بە دەستی خالي هاتەوە بولای ئاغەکەی و کارەساتەکەی بو گیررایەوە ! .. سەروکەکە توررە بو ، ناردي بە شوین جولەکەکەدا ، هینایان و لی پرسی :

(تو فرمانت چی‌یە ؟) . وتي : ( قوربان بەرگ دروم ) « ـ کەوابی چون ئەتواني ماسیەکي وا گران بکرریت ؟ وە چون ویرات زیاد بکەیت لە سەر ئەو ماسیە کە پیاوەکەی من ئەیویست بیکرریت ؟ ئاخر نەتزاني ئەمە مني پی ئەشکیم ؟ ! » جولەکەکە وتي : ( قوربان نیازم کردبو سبەینی بە روژو بم وە ویستم ئیمررو ماسی بخوم بو ئەوە بتوانم روژوەکە بگرم ، لەبەر ئەمە نەمتوانی دەست لە ماسیەکە هەلگرم ! ) . سەروکەکە وتی : ( بە چی‌دا روژیکي وەکو سبەینی گەورەترە لە روژیکي‌تر ؟ ) ، جولەکەکە وتی : ( قوربان بەچي‌دا تو گەورەتریت بەسەر پیاویکي‌تردا بو ئەو پایەیە کەلە سەریت ؟ ! ) سەروکەکە وتی ( پادشا ویستویەتی کەمن ئەم پایەیەم بیستو ئەو پی داوم ) . جولەکەکە وتی : ( هەر وەهاش پادشای پادشاهان ویستویەتي کە روژیکي وەکو سبەینی لە روژەکانی‌تر گەورەتر بیت ، جالەبەر

ئەمە ئیمە هیوا دارین کە خوا لەبەر ئەو روژە لە گوناحان ببوریت ! )
سەروکە کە وتي : « کەوابی تو راست ئەکەیت و بررو بەربی خوتەوە » .
جولەکەکە لیدا رویشت . » ...

• • •

ئیمە نامانەوی بگەررین بە « توراة » دا و میژوی توراة بگیررینەوە ، چونکە باسکردن لە ( ٣٩ ) « سفر » ولە راستیشدا هەمو ( ٣ ) سفر بیت ؛ ئەسفاري قانون ، ئەسفاري پیغەمبەران ، کومە لە قسەیەکي تری هەموجورە میژویکي وەکو میژوی ئەدەبی کوردي ئیشیکی بەمەوە نیە . مەبەست ئەوە بو کە تەنیا نمونەیەک لە جەوهەري ئەدەبي « تەلمود » ـ کە ئەدەبیکي عیبریان پیشان ئەدا ـ بخەینە بەرچاو ئەو کەسەکە چاوي بە ئەدەبیکي کوردي ئەکەوی لە بەرامبەر ئەودا . جا ئەدەبە کوردیەکەی بەرامبەری ئایا لە ئاینەوە بدویت یا لە شتیکی ترەوە ئەوە مەبەست نیە چونکە تەنیـــا دەر برربنی جەوهەري ئەدەبە کەمان ئەوی نەوەک نەوعەکەی .. دیسان ئەگەر بیتو ئەدەبي کوردي هەمو ببررین بسەر ئەدەبي ئاینیدا ئەبي ئەوە بچیتە دلمانەوە کە بیجگە لە ئەدەبي ئاینی هیچ ئەدەبیکیتر لە کورديدا نیە لەگەل ئەوەدا وایش نیە ... هەر وەها ئەمەش ئەوە ناگەیەنی کە ئەدەبي عیبری هەموی هەر ئاینی روتە بەلام ئەوە ئەگەیەنی کە دەی بو هەر شتیک بردبیت چە لە هاتو چوی بنی اسرائیلدا بی ، چە لە شەرر و شوربوابی ، چە لە کومەلایەتیدا هەر تیکلاوی کردوە بە ئاینەوە .. تەنانەت یەکیکبوە کو « مِلْتُنْ » شاعری ئینـــگلیزي کە گەلی خەیالي جوان جوانیشی لە «سفری تەکوین»دا نواندوە هەر نەیتوانیوە بە تەواوي لە ئەدەبیکي دیني لابدا ! . کەوابو ئیمە خومانـــ نایەسلینەوە بەوەوە کە بلین : ئەو ئەدەبە عیبریە کە ئەیهینین و بەرامبەري لەگەل ئەدەبیکی کوريدا پی ئەکەین، لە بەر ئەوە ئەو دیلیە ئەبی ئەدەبە کوردیەکەش هەر دینی بی ، چونـــکە وەکو وتمان : ئیمە مەبەستمان

دەربرینی جەوهەری ئەدەبەکەیە نەوەک نەوعەکە . جا لەبەر ئەمەیە کە ئەلین : ئەدەبي کوردي ئەلی :

« چەلیک منالە کوردیک لە روژیکی پایزدا دنیا سارد بو جوە دەرەوە لە دەشتی بەر مالەکەیانا بەچکە ماریکی بەرچاوکەوت کە ، سەرما سرری کردبو نەیئەتواني ببزویتەوە ، ئەمیش بەلایەوە جوان بو زوریش بەزەیي پیا هاتەوە لیەوی هەلیگرتو هینایەوە بو مالەوە و خستیە کوشیەوەو لە گوپی ئاگردانەکە لەبەر ئاگرەکە دانیشت . زوری پی نەچو تولە مارەکە بەتینی ئاگرەکە گەرمی بوەوە و کەوتە جرموجول ! . راست بوەوە ویستی بدا بە منالەکەوە !. لەوکاتەدا باوکی منالەکە کردی بەژورا و بەچکە مارەکەی کوشت و بەکوررەکەی وت : « رولە ! چاکە لەگەل نائەهلا مەکە بەشیمان ئەبیتەوە .. رولە ! چاکە کردن لەگەل پیاوی خراپا وەکو خراپەکردن وایە لەگەل پیاوی چاکا ! » .

ئەوە بو لەپیشا وتمان « پەیمانی کون » بو بە دو بەشەوە : یەکي « تەلمود » یەکی « پەیمانی تازە » کە انجیلە ، مەبەستمان ئەوە نەبو کە لە ئەدەبی « انجیل » وەربگرین ; جونکە انجیل کە « کتیبی پیروز »ەو ئەبی بە چوار بەشەوە : انجیلی « متی » ، هي « مرقس » ، هی « لوقا » ، هی « حنا » وە ئەمانە لەپیش هەمو شتیکدا زیاتر قسە لە ژیاني عیساوە ئەکەنو لە راستیشدا کاریکی زوریشیان کردوتە سەر سەرچاوەی ئیلهامي ئەدیبەکان ، تەنانەت ئەوانەش کە گاور نین . بەلام لە لایەن ئەدەبیەوە هیشتا لە زمانەکانی تردا بەتەواوي ئەم انجیلە جی خوی نەکردوتەوە ، مەگەر « ئارنیست رینان » فەیلەسوفی فەرەنسزي نەبی کە ئەو ژیاني عیسای بەراستي لە شیوەیەکي ئەدەبي زور جواندا گیراوەتەوەو ناوی ناوە « ژیاني مسیح » . . هەر جوربیت سەر - چاوەی ئەم کتیبە هەر « توراة »ە و ئەوە بو ئیمەش نمونەیەکان لی خستە بەرچاو ، لەوە زیاتر لە مەرام دەر ئەچیت .

* * *

دیسان ئەوە بو وتمان جوریکی تر لە ئەدەبی عیبری پەندی پیشینانیانە ـ کە ئەمانەوی لەگەل هی کوردیدا رو بەرویان کەینەوە ـ . بەلی جولەکە پەندی پیشینانی خویانیان لە زەمانیکی زور کونەوە بو ماوەتەوە کە ئەم پەندانە ژیان و تەفـکیرو رەوشتیان لە زەمانی رابوردودا ئیستەپی دینەوە بەرچاو ، کە چون هەندی جار گەورەیی و هەندی جار ژیر دەستەیی بە سەریانا هاتوە ؟ وە چون لە ناو مالدا را ئەبویرن ؟... جا ئەمە چەند دانەیەکە لەو پەندانەیان :

« ـ ١ ـ « جوانی چەپکە گولیکە ، پیری بیە کولە » واتە : تاج لە دەوری گەنجیدا جوان و سوکە ، لە دەوری پیریدا گران و ناشیرینە . ـ ٢ ـ « توترک هەر لە منالیەوە دەرزی دروست ئەکا » . واتە : منال ئـــەو کردەوانە کە لە دەوری مندالیدا ئەیکا پیاو ئاگادار ئەکا لەو کردەوانەی کە لە دەوری گەورەییشدا ئەیکا . ـ ٣ ـ ئیمە لە مندالیدا پیاو بوین، کە پیر بوین لە بەرچاو مەردم بوین بەمنال » یانی هەندی کەس هەر لە مندالیدا زیرەکی و بزیوی ئەنوینی و ئیشی گەورە گەورەیان پی ئەسپیرن ، کە پیر بون ناتوانن ئیشەکە بکەن وەکو مندالیان لی دیتەوە . ـ ٤ ـ « پیاوی پیر ئەلی من بو شتیک ئـەگەریم کە ونم نەکردوە . » واتە پیاوی پیر کەپشتی کومایەوە چاو ئەبریتە زەوی وەکو شتیکی لیون بوبیت ! . ـ٥ـ« هەژاری بە شوین هەژاریدا ئەروا » . ـ ٦ ـ « لەبەر قاپی دوکان دوست و برادەر زورە ، لەبەر قاپی هەژاری نەدوست هەیە نەبرادەر » یانی کە دەولەمەند بویت برادەرت زورە ، کە هەژار بویت کەست نیە . ـ ٧ ـ « ئەگەر وتیان دوستیکت مرد برروا بکە ، ئەگەر وتیان دەولەمەند بو برروا مەکە » واتە : قسەی ناخوش زورتر رو ئەدا هەتا هی خوش . ـ ٨ ـ « ژنی شەست سالە وەکو کچی شەش سالە هەررا ئەکا بەشوین دهول و زورنای زەماوەندا ! » یانی ژن باەزور پیریش بی هەر هوشی وا بەلای دایکیەتیەوە . ـ٩ـ « پیلاویکم ناوی گەورەتر بی لە پی خوم » واتە ژنهینان لە بنە مالەیەکی دەولەمەنتر

له پیاوه که وه‌نه‌بی کامه‌رانی بی . ـ ١٠ ـ «ئه‌گه‌ر گه‌مال پیت وه‌رری بچوره ماله‌وه ، ئه‌گه‌ر دیله‌سه‌گ پیت وه‌رری له مال ده‌رچوا» . لیره‌دا مه‌به‌ستیان به « گه‌مال » زاوا و به « دیله سه‌گ » بوکه . یانی لوتوپوتی زاوا هه‌لئه ـ گیریت به‌لام هی بوک هه‌لنا گیری ...

به‌رامبه‌ر بهم په‌ندانه چه‌ند په‌ندیکی پیشینانی کوردیش ئه‌هینینه‌وه ، له پاش ته‌ماشا کردنی هه‌ر دوکیان پایه‌ی هه‌ردولایان و گرانی وسوکی‌یان به‌رامبه‌ر به‌یه‌ک ده‌ر ئه‌که‌وی پیویست ناکا ئیمه ده‌ری برین .. په‌ندی پیشینانی کوردی ئه‌لی :

« ـ ١ ـ ( پیاوی پیر کوچکی ماله ) واته : هیچی پی نا کری هه‌ر له‌مالا ئه‌که‌وی . ـ٢ـ (روناکی مانگ سه‌ر له ئیواری دیاره) واته : که ئیش چاک هاته پیشه‌وه هه‌ر له سه‌ره‌تاوه دیاره . ـ٣ـ(بونکسه بالای چل گه‌زه ریشه) بونکس ـ بست . یانی که سه‌یری ته‌مه‌نی ئه‌که‌ی منداله، که سه‌یری ئه‌قلی ئه‌که‌ی پیره . ـ ٤ ـ (پیاوی پیر قاچی ئه‌بی به سه ) یانی هیزی نامینی دار ئه‌گری به ده‌سته‌وه . ـ ٥ ـ (نه‌گبه‌تی خوی چاکه قورته‌کانی خراپه) واته پیشه‌نگی نه‌گبه‌تی هات، له‌شکره که‌شی دیت . ـ٦ـ ( مه‌گه‌ز له ده‌وری شیرینی ) مه‌گه‌ز ـ میش . واته : مه‌ردم له ده‌وره‌ی شت کو ئه‌بنه‌وه . ـ ٧ ـ ( به‌لا وه‌کو پلو بوش ئه‌سورریته‌وه ) یانی ناهه‌مواری و خراپه ئه‌وه‌نده زوره به هه‌مو لایه‌کدا ئه‌سورریته‌وه . ـ ٨ ـ ( بیزوی پیره‌ژن بوکینی‌یه » واته ژن له پیریشدا خه‌یالی جوانی هه‌ر له ده‌ست نادا بو ئه‌وه بی به دایکی کوران ! . ـ ٩ ـ ( نه‌پیلاوی ته‌نگ ، نه مالی به‌جه‌نگ ) یانی ژن له‌مالا که خوی به زیاد زانی ماله‌که ئه‌کا به ئاژاوه و تالی ئه‌کا . ـ ١٠ـ ( کچم له‌گه‌ل تومه، بوکی گویت لی بی ! ) واته : راسته‌و خو ناتوانی له‌گه‌ل بوکه‌که‌دا قسه بکا کچه‌که‌ی ئه‌کا به په‌رژین ! .

ئه‌گه‌ر ئیمه به وردی ته‌ماشای ئه‌م دو جوره په‌ندی پیشینانه بکه‌ین

له هه‌مو سوچیکه‌وه گه‌لی لیک ئه‌چن‌وه وه‌کو ئه‌وه وایه‌که‌ئه‌م دووه،له‌یه‌کی شوین ژیابیتن . ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر یکیکی نه‌شاره‌زا سه‌یری هه‌ر دو کیان بکا هیچ ناچیته دلیه‌وه که ئه‌مه هی دو قه‌ومی جیاوازن مه‌گه‌ر به‌وه‌دا لیکیان بکاته‌وه که مه‌عنای زورتر له هی کوردیه‌که‌دایه له‌گه‌ل جوانی وشه‌و دل چه‌سپی عباره‌ته‌که‌دا . .

# ئه‌ده‌بی یونانی و کوردی

بی گومان زیانی ئینسان وه‌کو بیشه‌لان پرریه‌تی له هه‌مو جوره ته‌رگه‌زو چاکه‌یه‌کی ، به‌تایبه‌تی ئینسانی پیش تاریخ که ئه‌مه هیچ لایه‌رره‌یه‌کی نایگیرریته‌وه . وه‌کو ژیانه‌که وایه جیهانه‌که‌ش به خوی‌و ئاسمان و فه‌له‌که‌کانیه‌وه له‌و خراپترن و ته‌لیسمه کانیان له‌و گرانتره ! . ئه‌وه‌نده هه‌یه هه‌تا ئاده‌میزاد زیاتر هاتوته پیشه‌وه تاقی کردنه‌وه زورتر ناچاری کردوه به‌وه که له شت ورد ببیته‌وه ؛ له‌وه ورد ببیته‌وه بزانی ئه‌م گه‌ونه‌چی‌یه ؟ ئه‌م ئه‌ستیره‌و روژه چین ؟ و چون ئه‌سوورینه‌وه ؟ چون ئاده‌میزاد و گیانه‌به‌ره‌کانی‌تر دروست کراون ؟ و بوچی ئه‌م گوله سوره و ئه‌وه‌یان زه‌رده ؟ . ئه‌مانه ورد بوته‌وه و خه‌ریکی بومو کوششي ئه‌وه‌ی کردوه که بگا به وه‌لامیک . . ئه‌مه‌ی کردوه به‌لام وه‌نه‌بی توانیبیتی ئاده‌میزاد و غه‌یری ئاده‌میزادلیک بکاته‌وه ـ وه‌کو ئیستا لیک ئه‌کرینه‌وه ـ لای وابووه هه‌مو گه‌ون یه‌ک شته‌و هه‌مو گیانه‌به‌ریک گیانیکي هه‌یه وه‌کو گیانی ئاده‌میزاد ! . نه‌وه‌کی هه‌ر گیانه‌به‌ر به‌لکو دار ، با ، روژو مانگیش هه‌ر گیانیان هه‌یه وه هه‌رکه بو خویان وه‌کو ئاده‌میزاد له کاروباری ژیانا سه‌ربه‌خون ...

جا له‌به‌ر ئه‌م باوه‌رره ئاده‌میزادی پیشو له نه‌بیمه‌تی کولیوه‌ته‌وه و

ویستویه حەقیقەتیک وەربگریت . ئەم لی کولینەوەیە ناچاری کردوە بە هونینەوەی قسەو ریکخستنی ئەو جورە شتانەکە لە ئادەمیزاد بوەشیتەوەو لە دارو دەوەنەکەش هەر بوەشیتەوە . بو هەر ظاهرەیەک ئەفسانەیەکی داناوە . ئیمە ناوی بە ئەفسانە ئەبەین ئەگینە لە حەقیقەتا ئەو شتەی ئەو دایناوە ئاوینەی عەقلیەتی بووە ، واتە : ئەقلیەتی بو دوزینەوەی شت هەر ئەوەندە برری کردوە ! .. جا هەر ئەم ئادەمیزادە ، کە نەتەوەی ئادەمیزادە پیشوە کەن ، کە ، ویستیان دەست بدەن بە دانانی ئەدەبو کردنەوەی قاپی ئەدەبیاتەوە هیچ چاریان نەما ئەبوایە ئەفسانەی ئادەمیزادە سەرەتایی- یەکانیان بهینایە و بیان نوسیایە - ئەو ئەفسانانەکەدەم بەدەم ئەگیرانەوە و هـــەر بەرەیەکیش کە ئەهات بەپیزیری خوی شتیکی لی زیاد ئەکردو بەشی خوی ئەخستە سەری ! - ...

دیارە ئەم ئەفسانانەش کە ئەبن بە بناغەی ئەدەب ئەبی بەپی کەمو زوری ظواهرەکان بیت ، سەیر ئەکەی ئەفسانەیەک سەرەتای عالەم و سەرەتای دروستکردنی ئینسان ئەگیریتەوە،ئەفسانەیەک بەردەی ژیان ئەگیریتەوە کە چون ئادەمیزاد فیری رمبازیوسوالەت دروستکردن و کەتوکال بووە؟، یکیکی تر قسە لە چونیەتی مانگو روژو ئەستیرەوە ئەکا ، ئەفسانەیەک کاروباری پاش مردن ئەگیریتەوە . ئەمانەش بویە وا زورن چونکە ظاهرەکانیان زورن ، یانی ئەگەر گەون ، یاروژ ، یا مانگ ، یا ئادەمیزاد ، یا بەردەی ژیان نەبوایە دیار بو قسە لە هیچیانەوە نەئەکرا ... مەبەست بە ظاهرەکەش ئەو تاقە شتەیە کەبووە بە هوی ئەفسانەکە ... ئەم ئەفسانانەش کە پیاو لیان ورد ئەبیتەوە وەکو لە مەعنادا هەموئیەک بن وایە چونکە هەمو لە یەک نوختەدا ئەبن بە شەریک ، ئەو نوختەیە کە ئاشنایەتی «نیر»و «می »یە پیکەوە ! . جا ئەم نیرو مییە ئیتر چە لە ئادەمیزادەکەدا بی ، چە لە غەیری ئەوا ، یانی ئەم غەریزەی ئارەزوی جوتبونە بو هەموشت هەیە . .

ئەم بیرو باوەڕە سەرێ ئادەمیزادی کیشایە لای ئەوە کە باوەڕ بە چەند خوایەک بکاو هەر یەکە لە شوێنێکا دانیشتبن وە هەر یەکە جورە ئیشو کارێکی ئادەمیزادە کە هەلسوڕرێنن !. وەکو چون هەندێکیشیان هیچ ئیشیان نیە تەنیا دوژمنایەتی کردن نەبێ لەگەل ئادەمیزادا ـ ئادەمیزادەکەش بویە نوێژو نیازی بو ئەکرد لە ترسی زیانی، نەوەک لەبەر خوشەویستی ! .

لێرەدا سەیر ئەکەیت ئەفسانە هەمو بون بە هوی ئەوە کە ئایین دروست بێ . لەبەر ئەوە سەرچاوەی ئەدەب بو بەم ئەفسانانە وە ئەفسانەکانیش ئاشنا بون بە ئایینەوە ؛ ئایینیش بەدرێژایی زەمان هەر لە پەرستشگاکانەوە بلاو بونەوە . پەرستشگا لە زور جێگای ماڵەی کوندا بێشکەی ئەدەب بووە وەکو ئێستەش لە کوردەواریدا هەر ماوەتەوە ..

ئەمە رێکەوتێکی زور سەیرە ـ وەکو تاریخیش بومان ئەگێڕێتەوە ـ هەمو قەومەکانی سەر زەوی لە ئەفسانەو گورانی شەمی‌ودرکاندنی عاتفەدا وەکوخێزانی تەنیا بنەماڵەیەک بن وانە،هەمو بە یەک دەنگ‌و لەسەر یەک تەل دەنگ ئەدەنەوە ؛ سەیر ئەکەی گورانی روژهەلات لەگەل گورانی روژاوادا ناتوانی لێکیان جیا بکەیتەوە . چیروک و داستانی هەمو قەومێک با زور دوریش بوبێتن لەیەک ـ چە لە جێگەدا چە لە زەماندا ـ وەکو لە یەک تەنور هاتبێتنە دەرەوە وانە ، یا ئەگەر لە تەنورێکیش نەهاتبێتن هەر زور لە یەک نزیکن . جا ئایا ئەم کارەساتە ئەبێ هەر رێکەوت ـ مصادفە ـ بیت ؟ یا ئەوەبیت کە رومانی‌و جرمانی ، یونانی و اغریقی ، هیندو فارس و کورد لەگەل بەرەی « اسکندناوە » و روس‌دا هەمو بلێن : سەرـ چاوەی ئەفسانەو داستانی ئیمە لەوتیرە ئادەمیزادەوە هەستاوە کە پێ ئەلێن « ئاری » و لەشاخەکانی ئاسیای ناوەڕاست‌دا دائەنیشتن لە پێش ئەوەدا بلاوەی لێ کەنە روژاواو هەندێکیان قەومەکانی ئاوروپا دروست بکەن ؟؟

! رەنگی ئەمە بیت ! ئەگەر یەکێک نەلیت : خو ئەم لێکچونی ئەفسانەیە

لە بەین قەومەکانی ئاری وغەیری ئاریشدا هەر هەیە !! . ئەگەر ئەمو ئەمە ئەمە بلیت ئەلین ئەوانو سەرچاوەکە لە ئەقلی یەکەمەوە هەلگیراوە کە جومالی بەسەر هەمو قەومەکانا کراوە !! ...

لیرەدا بو وینە یەکی دو نمونە لە ئەفسانەی یونان دینینەوە، وە یەکی دوەکیش لە هی کوردی یە. هی یونانیە کە بو ئەوە کە کاریکی زوری کردوتە هەر ئەدەبی عالەم بە تیکرا وە لە سەر ئەدەبی ئاوروپا بەتایبەتی ... هی کوردیەکەش بو ئەوە بتوانین چاویک بخشینین بە ئەدەبی ئەم دو قەومەدا ـ کە لەم روژەلانی کونەدا دانیشتون ـ چە لە کوندا و چە لە تازەدا . کە ئەمبەملان کرد یەکەم ئەوە دەر ئەکەوی کە ترازوی ئەقلیەتی دو قەوم دیتە دەست ، دوهەم بەرامبەرییەک لە بەین ئەم دو ئەدەبەدا لە باری جەوهەری ئەدەبدا ! ...

(قسەی « کیوپید و سەیکە » ـ کوپید = خوای دلداری . سەیکە = نەفسی » . )

( «سەیکە» کچی یەکی لە پادشاکان بو ، ئەوەندە جوان بو ئەوەندەجوان بو « ڤینوس » ـ کە خوای جوانی بو ـ وتی چون ئەبی من خوای جوانی بم ئەم کچە بەم جوانیەوە بەربەرەکانیم بکا ؟ ! هات بە « کیوپید»ی کوری خوی وت کە « سەیکە » بکوژیت بالیتر کەس نەمینی بەربەرەکانی جوانی ئەو بکا .. « کیوپید » چوە سەر سەرینەکەی «سەیکە» بو ئەوە بیکوژی ! کە سەیری جوانیەکەی کرد هەروا شیت بو ! و دلی لی چو، سوینی خوارد کە نازداریکی وا بی گوناح لە نـــاو نەبات، بەلام لە بەر قسەکەی دایکیشی هەروا تیریکی بە درو روەو سنگی هاویشت . ئینجا هەمو جار لە تاریکی شەودا ئەچو بولای و ئەم پەیمانەشیان بەست: کە «سەیکە»نە، لی بپرسی ناوی چیە وە نە تەماشای رومەتیشی بکا » . ئەگەر خو پەیمانەکەی نەبرد بەریوە ئیتر کیوپید هاتو چوی نەکا ! .. « سەیکە » ماوەیەکی زور پەیمانەکەی خوی

برد بە ریوە بەلام لە دلیا هەر بوبو بە گری هەتا هەویک خوی نەگرت هەستا چراکەی داگیرسان و تەماشای رومەتی کرد ! . کوتوپرد دلوپی لە رون گەرچەکە کەوتە سەر رومەتی « کیوپید »و خەبەری بوەوە ، هەر هەستاو لە کونە بەروژەکەوە چوە دەرەوەو هەلهات و تورا ! . « سەیکە » توشی ئیش و ئازاری یارەکەی بو ، کوششیکی زوری کرد تا ئاشتی کردەوەو هینایەوە بولای خوی . » ) .

* * *

ئەفسانەیەکی وا لە کوردیدا ، ئەلی :ـ

« گول و بولبول لە بەهەشتدا هەر دوکیان لە سەر کانیاویک بون . « گول » پەری بو ، « بولبول » فریشتە . گول تەماشای کرد بولبول جوان چاکەو زور زیرەکە دلی لی چو ، پی وت « من پەیمانم لەگەل ئەم کانیاوە کردوە کە میرد بە کەس نەکەم بەلام کچیکم لە سکایە ناوم لی ناوە ( بو ـ بون خوش ) ئەیدەمی . توایش ئەبی پەیمانم بدەیتی کە بەلای کەسەوە خوست نەکەیت » . ئەویش وتی باشە .. سەر لە ئیواری گول چوە سەر کانیەکەو پرسی پی کرد کەمن برریاریکی وام داوە بە بولبول . ئەویش وتی باشە بولبول فریشتەیەکی جوانە ... هاتەوە بە سک پرری و چوە سەربان و چاوی لیک ناو راکشا بو ئەوە کچەکەی ببیت . . بولبول هاتە سەری ، لە خوشیانا دەستی کرد بە هەرا هەرا ! . جار جار گول لە ژیر لیوەوە چاویکی ئەکردەوەو پی ئەوت : کوررە خوست مەکە !. ئەو هەر زیاتر گەرم ئەبو .. هەتا کەوتە دەمە دەمی بەیانی ، کەوتە ئەوکاتە کە گول کچەکەی بی . « با » لەدورەوە گوپی لە دەنگی بولبول بو ـ ئەویش دەمی بو دلی چوبو لە « بو » ! ـ کە گوپی لەم خوستە بو بە هەررا کردن هات ، بولبولیش ئەوەندەی چریکاندبو شەکەت بوبو خەوی لی کەوت ! « با » کردی بە « بو » دا و فرراندی ! . بولبول کە خەبەری بوەوە سەیری کرد « بو » نەماوە ! لە گولی پرسی ? . ئەویش وتی

ئاخر نەموت دەنگ مەکە ؟ !. ئەوەتە « با » هات ملی پیوە بو بردی ! . سەر لە نوی برریاریان بەستەوە . بولبول هەر وازی نەهینا لە گورانی شادی هەتا لە بەهەشت دەریان کردن ، ئیستەش هەر هاوار ئەکاو ئەگری ، ئیستەو ئەوسا نەگەیشتەوە بە بونخوش ! . » .

تەماشای ئەم دو چیروکە ئەکەیت هەر دوکی ئەفسانەیەو هەر یەکە لە قەومیکەوە سەری هەلداوە ، بەلام لە نوختەی جەوهەری دا وەکو یەکیک بن وانە ، لەوەدا کەنەفس نابیت ئەوەندە لە خوشەویستیدا رو بچیت و بچیتە خوارەوە ئەگینە لیدور ئەکەیتەوەوجیای ئەکویتە بەینیان . ئەوەندە هەیە لە کوردیەکەدا ئەوەیشی تیدایە کە هەر کەسی ئەبی لەگەل رەگەزی خوی‌دا ئاشنایەتی پەیدا کا بو دلخوازی ئەگینە بیگانەپەرستی ئەمە سەرەنجامی ئەبی ! ... ئەمە نمونەیەک بو لە ئەفسانەی یونانی بەرامبەر بە ئەفسانەی کوردی . ئینجا لە بەینی شعری مەلاحمی یونانی و کوردی‌دا ...

* * *

لە سەدەی نوهەم یا ، دەهەمی پیش میلاددا شاعریکی کویر لە شارەکانی یونان لە ئاسیای پچوکدا ئەگەرراو ئەفسانەی کونی ئەکرد بە شعرو بو مەردمی ئەخویندەوە . ئەلین ئەم کابرایە « هومر » یا « هومیروس »ی خاوەنی «ئەلیاذە» و « ئوذیسە »ی یونانیە .. هەندیکیش ئەلین «ئەلیاذە»و « ئوذیسە » دو داستانی کونی یونانن و بەدریژایی زەمان دانراون ، هەر شاعریک هاتوە شتیکی لی زیاد کردوە ، وشەی « هومیروس » رەمزیکە بو ئەوشاعرانە کە دەستیان خستوتە ئەم دو داستانەوە . بەلام ئەو قسەیە زورترە کە ، هی شاعریکی تەنیا بن ، بوبە پیشینەکان هەر یەکە شوینی لەدایک بونی «هومیروس» یان نسبەتداوە بە شارەکەی خویانەوە . .

ژیانی « هومیروس » زور تاریکە چونکە ئەو سەردەمە کە میژونوسەکانی یونان ویستیان پیاوەکانی خویان باس بکەن ـ واتە لە سەدەی پینجەم و

چوارەی پیش میلاد ـ هەر ئەوەندەیان لە هومیروس ئەزانی کە ئەفسانەیەکی وای هەبوو هیچی تر . تەنانەت لە دەوری ئەفلاتون و ئەرەستوادا بیرای بیرای هیچ ئاگایان لە شاعرە کونەکانیانەوە نەبو ، بویە ئاگایان لیان نەبو چونکە شتومەکی چاپ لە ناوا نەبو تابیانزانن ، ئەو شعرانەش کە لە هومیروسیان ئەگیرایەوە هەر دەملو دەم بو لە یەکیان ئەبیست ـ وەکو حالی کورد تا ئەم دەورەش ا ـ . وا دەر ئەکەوی ئەم « ئەلیاذە » و « ئوذیسە »ی هومیروسە لە سەرەتاوە وەکو ئیستە ریک و پیک نەبووە ، بەلکو لە سەدەی شەشەمی پیش میلاددا وا ریک خراوە . . هەر وەها گومانیش لەوەدا نەبو کە ئەم شعرانە هی هومیروسە تا ئاخرو ئوخری سەدەی هەژدەهەم ، لەم وەختەدا « فریدرک وولف » عالمی ئەلمان ئەم قسەیە هینایە ناوەوەو دلی خەلکی کرمی کرد بەوە کە ئایا ئەم شعرانە هی هومیروسە یان نەأ ؟؟. ئیستەش هیشتا هەر بە تەواوی ساغ نەبوتەوە ... ئینجا بزانین (ئەلیاذە) و (ئوذیسە) چیەو چون ئەتوانین شتیکی کوردی لە بەرامبەر ئەوەوە دابنین ؟ . .

ئەلیاذە ـ کوبونەوەی زەماوەن بو «چونو[1]» و «ڤینوس» و«مینرڤان» سە خواژن بون، ئەوانیش لەو کوبونەوەیدا بون . «ئیریس» خواژنی ناکوکی

---

( ١ ) ئەم ناوانە لاتینین نەوەک یونانی ، لە تەرجەمەی ئینگلیزی و فەرەنسزی و عەرەبیەکەشدا هـەر بە لاتینی هیناویەتی . « چونو » یانی خواژنی ژنومیردی ، یونانیەکەی « هیرا »یە . . « ڤینوس » یانی خواژنی دلداری و بەش قەشەنگی ، یونانیەکەی « ئەفرودیت »ە . « مینرڤان » خواژنی زیرەکی و گیان شیرینی ، یونانیەکەی « ئەثینا »یە . « چوپیتر »یش لە یونانیدا « زیوس »ە . ئەم ئەفسانەیە ئەو هەراو هوریایە ئەگیریتەوە کە لە بەین ژن ومیردی خولقی و لەش قەشەنگی و دلداری وە لەبەین زیرەکی و گیان شیرنیدا روی داوە .

سیویکي هیناو ئەم وشەیە لەسەر هەلـکەند : «بو خوازني جوانی» وفرێدایە ناویانەوە ! . سە خوازنەکە بو بەشەرریان، هەر یەکەیان ئەیوت من خوازنی جوانیم ! . خوای هەرە گەورە « چوپیتر » برریاری دا کە « پاریس » ی کورری « پریام » ـ پادشای تروادە ـ بییت بەناوبژی کەریان . «پاریس» حوکی بو « ڤینوس » کردو سیوەکەی دایە . «پاریس» بەم کردەوەیە ، کە نواندی خوی کرد بە دوژمنی خوازنەکانی‌تر ! . . زوری پی نەچو ( پاریس ) سواري دەریاو چو بو یونان بو بە میوانی ( مینیلاوس ) پادشای (اسپرته) . خانەخوی خزمەتی ئەم میوانەی زور جوان کرد، بەلام میوانەکە ناپیاو دەرچو دلي چو لەژنەکەی کە ( هلن )ی ناو بو و زور جوانیش بو هەلیخەلەتانو لەگەلا خوی بردی بو شارەکەی خوی ـ شاری‌ترواده ـ !.

ئەم کردەوەیە بە جاری ( مینیلاوس )ی سەغلەت کرد ، لەشکریکي زوري کردو دەنـگ هەمو پادشاکاني یونانی کرد کە یارمەتی بدەن بو ئەوە بچیت ژنەکەی بهینیتەوە . . لەم پادشایانە ( بولیسینر ) و (ئەخیل) و (ئەگاس ) و ( دیومد ) و( نستور ) و ( ئەگا مەمنون ) ـ برای مینیلاوس ـ کە ئەمانە هەمو پالەوان وپیاوی گەورەبون قسەیان دایە . ( ئەگامەمنون ) کرا بە سەروکي لەشکری یونان . ( هیکتور )یش ـ کە کورره گەورەی ( پریام ) پادشای ترواده‌و میردی ( ئەندروماک ) بو ـ کرابە سەروکی لەشکری ترواده . . خواکانیش بون بە دو بەشەوە ، هەر بەشیکیان نایانه پال لەشکریک ! . ( چونو ) و( مینرڤان ) دیارە نایانە پال لەشکری یونان بو ئەوە تولەی خویان لە « پاریس )و هاوریکاني بکەنەوە( ڤینوس ) و ( مارس ) ـ خوای شەرر ـ دایانە پال لەشکری ترواده . ( نبتیون )یش توزی مەیلی ئەکرد بەلای لەشکری یونانەوە ، بەلام ( چوپیتر ) و( ئەپولو ) خویان بە بی لاینکري هیشتەوە . ئەم شەررە « ٩ » سال دریژەی کیشا . لە پاشا کیشە .

لە بەین ( ئەخییل ) و ( ئەگامەمنون ) دا پەیدا بو ، چیروکی ( ئەلیاذە ) لەم کیشەیەوە هەلئەستیت ! ...

لەشکری یونان رشانەوەی تی ئەکەوی ، ژیلەی مەری ئەلی : لەبەر ئەوە « ئەگامەمنون » بی پەیمانیەکی کرد بەرامبەر بە کاهنەکەی ـ ئەپولو ـ تیرە زەهراویەکەی تی گرتن و بەم دەردەی بردن . «ئەخییل» لەم بی پەیمانیەی « ئەگامەمنون » توررەبو وتی ئیتر من لە لەشکری یونانەدا شەررناکەم و گەررایەوەو . « ثیتس »ی دایکی « ئەخییل » لە « جوپیتر » پاررایەوە کە یارمەتی کوررەکەی بدا بو ئەوە تولە لە« ئەگامەمنون » بکاتەوە. «جوپیتر» لە خەوا بە « ئەگامەمنون »ی وت کە بچیت بو ترروادەو گویا ئەیگریت ! . ئەگامەمنون بەم خەوە دەستخەررو بو هەستا چو بو تررواده . هەر دو لەشکر ریزیان بەست تەنیا ئەخییل و هاوریکانی نەبی توررە بون و لە سەرەی جەنگ هاتنەدەرەوە ! . . لەوکاتەدا کە دو لەشکری یونان و تررواده لە بەرامەر یەکەوە وەستابون و شیریان لەیەک ئەسو « مینیلاوس » روی کردە مەیدان و داوای « پاریس »ی کردا. وتی لەبەر ئەوە ئەو ژنەکەمی بردوە و ئیمە بووین بە هوی ئەم شەررە ئەبی خوی بیت مەیداندارم لە گەل بکا . . «پاریس» کە گوی لەم قسەیە بو لە لەشکر هاتە دەرەوەو روی کردە مەیدان!. ئیتر هەر دو لەشکر شەرریان وەستان و سەیری کارەساتی ئەم دو سوارەیان کرد.. لە پیشا « پاریس »رمەکەی ئاوقەی «مینیلاوس» کرد بەلام زریەکەی نەیهیشت رمەکە کاری خوی بکا !. ئینجا نورە کەوتە نورەی « مینیلاوس » داوای یارمەتی لە « جوف » کردو :ـ

« رمەکەی راوەشان و هاویشتی بو پاریس زریەکەی کون کرد .. دەست وەشاندنیکی گران بو ا سوارەکەی خستە مردن . زریەکەی درری بەلام پاریس هیشتا خوی نەدا بە دەست مردنەوە . مینیلاوس خیرا شیرەکەی لە کالانە زیوینەکەی دەر هینا. دەستی بەرز کردەوەو هینایە خوارەوە بەسەرناو

چەواني پاريسدا . شيرەکە وردبو ! پارچەکاني بە دەستە وشکك بوەکەيەوە مايەوە. ئينجا وتی: تەماشاکە! نە، رمەکەم کەوتوە نەشيرەکەم شکاوە . . ئەو لە هەردو کيان رزگاری بو . ئەمەی وت و پەلاماری دوژمنەکەی دايەوە . . جلەوی ولاغەکەی شل کردوخوی نزيک کردەوە لە پاريس . بو ئەوە رايکيشي بولای لەشکری اغريق، ئەمەی کرد. بەم ئيشەی ناو و سەرکەوتنيکی بەرزی وەر ئەگرت . ئەگەر « ڤينوس » خوی نەگەياندايەتە « پاريس » . . ميئيلاوس سەيری دەستی خوی کرد . . تەماشای کرد تەنيا تاسکلاوەکەی بە دەستەوە ماوە . هەليسورران و هاويشتي بوناو هاوريکاني . هاوريکانی بەغەلبەغەلب لە دەورەی تاسکلاوەکە کوبونەوە . سوارەکە سەرلە نوی خوی کو کردەوە بو ئەوە خوينی دوژمنەکەی بررێژی ، چوەلايەوەو رمەکەی بە توورەييەوە بو راوەشاند . کوتوپرر ئەو خوازنەکە کە دلداران دليان لی ئەچي پەيدا بو . . – مەبەست ڤينوسە – بو ئەوە ديسان يارمەتي دوستەکەی بدا لەم مەيدانەدا . ئەوي ويستي بە خيرايي جیبەجی کرد . . . ئەتوانی بيکا چونکە خوازنيکی بەدەسەلاتە . . . پيچای لە پارچە هەوريکی جوانەوەو لە چاو گومي کرد . برديە ژورەکەی خوی – ژوري پاريس – پشوی پيا هاتەوەو ورەی پی دايەوە » .

<u>ئوذيسە</u> : – اغريق ترواديان گرت « ميئيلاوس » « هلن »ی ژنی سەندەوەو هينايەوە بو «اسپرتە» . پالەوانەکاني اغريقيش هەمو گەررانەوە بو ولاتي خويان تەنيا « يوليسيز » نەبی ، « پەنلوپ » ی ژني و «تەلماکس»ی کورری هەرچاو لە دەرگا بون کە ئەويش بگەرريتەوەو بو خوی لە شاری « ئاتاکا »دا هەمو پيکەوە بو خويان رابويرن . کەچی ئەو لەولاوە توشي دلخوازي و مەينەتی دلارامي بوبو ! . ئەفسانەی « ئوذيسە » دەست پی ئەکا !. ئەوەندە هەيە پيويست ناکا ئيمە لەسەری بررووين وبيگيررينەوە . . .

* * *

زیانی بەبناغەی باسەکە ناگا ئەگەر بەرامبەر بەم ئەفسانەی یونانیە داستانیکی کوردی بهینینەوە، وە ئەم ئەفسانەو داستانەش لەسەرلەوحەدا یەکیک نەبن وە یا لیکەوە دوربن . هەروەها نابی کەسیش ئەوە بلیت کە وا : چاوملن لەوە پوشي لەباسي بەراوردی ئەدەبی کوردی لەگەل ئەدەبیکی بیگانەدا ئەبوایە ئەو دوشتە کە ئەخرینە دو تاکي تەرازوەکەوە پیوستە لە یەک شتەوە قسەیان بکردایە ، بەلام چون چاولەوە پوشین کە ئەدەبیکی سەدەی حەڤدە-هەمي پاش میلاد چون ئەبی لەگەل ئەدەبی سەدەی دەهەمی پیش میلاد بەراورد بکریت ؟! .

نابی ئەمە بونری چونکە وەکو لە شوینیکیتردا هەر ئەم قسەیەمان کردوە : ئەم بەرامبەریە عیلمیاً وەختی راست نیە کە ئەدەبە پاش کەوتوەکە فیکرەی لە ئەدەبە پیشکەوتوەکە وەر گرتبیت - بودانانی داستان - ئەو وەختە راستە، نابی بکری چونکە هەر یەک شت ئەبی وەبەیەک شتیش لەگەل خویدا بەرامبەري بی نا کریت ! . بەلام ئەگەر هاتو ئەدەبە پاشکەوتوەکە نە بەخەو ، نە بە ریگە ، نە بەنوسین ئاگای لە ئەدەبە پیشکەوتوەکە نەبو ئەوە با دەهەزار سالیشان بەبن بیت هەر وەکو لە یەک زەماندا بوبیتن وایە، هەر یەکەیان سەر بەخو تەعبیر لە شعوري سادەی قەومیک ئەداتەوە . وەکو ناتوانیت ئەوە بلیت کە « هومیروس » لەو سەردەمەدا فیکرەي لە یەکیکیترەوە وەر گرتوەو ئەویش هاتوە « ئەلیاذە »ی داناوە ، ناتواني بلیت کە « احمدی خاني »یش فیکرەی لە هومیروسەوە وەرگرتوە و هاتوە « مەم وزین » ی داناوە ! . چونکە تاریخ اثباتي ئەکا ؛ کە احمدی خاني نەیزانیوە ئەم دنیایە هومیروسیکی تیدا بوە ! بەچیا بیزاني ؟. « ئەلیاذە »یەک کە بەزماني یوناني کون بوبیت وە احمدی خانیەک لە عەربی و فارسي بەولاوە هیچی تری نەزانیبیت ئـــەم یونانیەی لە کوی وە رگرت ؟! .

وە دیسان ئەو وەختەش هیشتا « ئەلیاذە » وەرنەگیررابوە سەر عەرەبی

ابوتری لە عەربیەکەی وەرگرتوە . ئەوا وتمان وەریش گیررا بو ، چاپ ئەوەندەی پەرەی نەسەندبو . هەتا نوسخەی عەرەبي ئەلیاذە بکەویتە بەرچاو احمدی خاني . وتمان چاپیش پەرەی سەندبو احمدی خاني دەرزی لە مزگەوتیکی کوردەواري‌دا بووە ، مزگەوتي کورەدواری ئیستەش بە تەواوي ئاگای لە ئەدەبیاتي عـەرەبی نیە نەوەک هی یونانیەک کە کەوتبیتە سەر زماني عەرەبي ! . کەوابو بەرامبەري کردني « ئەلیاذە » و « مەم‌و زین » لە تەنیا فیکرەی چیروک و داستاندایەو جی خوبەتی‌و هیچ رەخنەی لی ناگریت .

لەسەدەی حەڤدەهەمی پاش میلاد دا احمدی خاني لەمزگەوتەکاني ولاني بایەزیددا دەرزی ئەخویند، هەموجارئەی بیست کەریش سپیەکان لەپیشینەکاني خویانیان ئەگیررایەوە کەلەم ولاتي « بوتان » ە « ئەمیرزەینەدین » ناویکی کورد بەسەر ئەو ولاتانەدا فەرمان رەوا بووە . دوکولي لەباغچەدابووە ؛ یەکی « ستی » یەکی « زین » . سەران و کەلانتەراني زوریشی لەژیردەستابووە، یەکی لەو سەردارانە « ئـەسکەندەر » ناو بووە کە کەسي بەکەس نەزانیوە تـەنیا میر زەینەدین نەبی ، « سە » کوزری هەبووە، تاژدین ، چەکو ، حیفو . ئەمانە پالەوانەی زەمان و شیري مەیدان بوون . تاژدین برایەکی بوە « مەم » ی ناو بوە و میرزا زادە بوە، هەرچەندە برای باوک‌و دایکي نەبوەو بەناوبیگانەبوە بەلام گەلی لەچەکوو حیفو دوستربوە . ئەم دونەجوانە دونەمامی بیشەلانی میرزەینەدین بوون وەکو چون « ستي » و « زین » دو دلاراي لالەزاري جەمال بون ! . .

روژی لەروژان کەسەری سالی نەوروز ئەبی میرزەینەدین و ئەهلي ولات تیکررا ئەچن‌بو سەیران . لەم گەشتەدا تاژدین‌و مەم (ستی) و زینیان بەرچاو ئەکەوی ، ئاگری دلخوازي لەدلي هەرچواریانا بلیسە ئەسێنی . (ستی) بو ( تاژدین ) و ( زین ) بو ( مەم ) ! . ئیترداستاني ( مەم‌وزین ) لەم ئاگرو - پوشوەوە دەست‌پی ئەکا، کە چون دلداري لەبەینیانا رو ئەدا ؟ و چون لەدوري

یەکێ بەکێ کەوتوولەبن ؟. و چون « حەیزەبون »ی داپیرە ئەکەویتە بەین ؟ تابە دریژی داستان ئەبڕیتەوە . کە ئەگانە ئەو شوینە تازدین لەدوریەو چەوسانەوی مەم دەستی نهینی کاری ئی ئەکاو شاعر ئەلی :

... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ...

هەر لحظە دگەل بران بە شەرربو — قصدا ددلی وی ئەڤ خەبەر بو
رابت بغضب بچیتە پیش میر — داخواز بکت مەی بتقصیر
جلوکێ بچن مەی رجاکت — سوچو گونەهێ مەی تکاکت
دامیر زورا برای بردت — یا ئەڤ سەر و مال ئی بدردت
عارف وەهەکوتە روستەمی زال — ئەڤ ئەمر بێن محالە بی قال
بێجەنگ و جدال وبی تهوّر — قەت فی شغلی مکن تصور
ئەڤ معرکە نابێن بدیوان — ئەم مانە وصبحە صحن میدان
یاقنج ئەوە ئەم صبە سواربن — هەر سە بسلاحو کاروبار بن
چارنە و جوشنان دبەر کەین — زندانە و مغفران لسەر کەین
گورزان بهژین ، رمان بیازین — ئەڤ رەنگە مەی ژمیر بخوازین
یاوی بکوتەکێ مەی خو بردین — یا جلە بەردی سەری بدەردین
گەر وی بڤی رەنگی مەم رهاکز — دەردی ددلی مە وی دواکر
ومرمای مصر لسەر عنادی — ئەم دی بکرین ورەنگێ جهادی
ژەوەل ڤەبچن « بەکر » بکرکەین — وی مدبرە ژیرە دەربەدەرکەین
هەر بەر دەرەکی کەرەك لبەربت — خصمانەی قنج سەر بسەربت
میر ئەر زورا بکت تعصب — رابت لمە ئەو بکت تغلّب
ئاشی ئەجەلی وسا بگیرین — تشبیە جبان سەران بهێرین
بوهتانە بکینە رقص و گوڤەند — تابینە تماشەی شەکەر خەند !
گافا وەکو دەست بدەینە حەربان — محبوب تماشەکت بضربان
هەر لحظە ببیژن ئەو پەریزاد — دەستی توە ئەی جوان مەریزاد

هندک بگرین ، هەنک تناکن　　هندک بکەنن ، هەنک دوعاکن
دلدار نظر بکن ژبورجان　　دوردانە بدرکفن ژ دورجان
شەهزادە ژپەنجەران نظرکن　　گول پیرەهەنان دبەرخوکرکن
هەر دەم ببهن ژ نازنینان　　سەد مدح و هەزار ئافەرینان
تاژدین خەبەرا برای گەکر　　عەکم ددلی خودا بجەکر

ئەگەر تەماشایەکي ئەم دو ئەدەبە - ئەدەبی یونانی و کوردي - بکەین لەهەر دویانا بازاري خەیالبازي ئەبینریت ، لەهەر دویانا مەیدانداري لەسەر دلخوازي ئەبینریت ، لە هەر دویانا دەست و بازوی پالەوانان ئەبینریت . ئەوەندە هەیە لەکوردیەکەدا وەکو ئەمانەی تیدا هەیە ئەوەشي تیدایە کە دوستیك یادی دوستیکي ئەکا ، نەوەك دوستي دلخوازي بەلکو دوستي برایەتي . غیرەت و وەفای پەیماني برایەتي تاژدین ئەوەپیشان ئەدا کە ؛ چون بەخوبو براکانیەوە لەپیناوی دوستایەتی مەمدا ـ ئەو مەمەکە ئاگری عەشقی زین کلکوی داگیرساندا ـ سەروماليان دابنین . ئیمە لی کولینەوەکي بی لایەنگري بکەین نەوەك هی قەومي ؛ ئەگەر وەفاداري لەپیناوي برادەريدا لەکوردەواریدا نەبوایە ئەمانە خویان لەخویانەوە نەئەکوتنە سەر ئەو ریگەیە . . کەوابو ئەم داستانە وەکو داستاني غەرامي و شەرر و شورر و خەیالە داستاني وەفاداریشە ...

## ئەدەبی رومانی و کوردی

بویە ئەدەبەکانی رومان کەوتنە سەرئەوەکە فەن بدوزنەوەو خوشەویستي نیشتمان بینەنە ناوەوە چونکە چاویان لەوەوەبو کە ئەدەبەکەیان بکاتە ئەدەبي یونان ، نەوەك هەر ئەوەندە بەلکو لایان وابو ئەگەر ئەم هەنگاوەیان هاویشت ئەدەبەکەی ئەمان پیش هینەکەی یونانیش ئەکوی !.. لەروایاتی

شانودا ئەمەیان بو نەکرا، بەلام لەشعردا زوري نەمابو بیگەني . زوری نەمابو کەشاعری هەرە گەورەی لاتین « ڤەرجیل ٧٠ ـ ١٩ »ی پیش میلادپیغیان بکەوی ! . .

شتي سەیر روئەدا !. ئاوروپاییەکان هەتاچەند سەدە ، کەبیان وتایە شاعر ئیتر هەرمەبەست « ڤەرجیل » بو ! چون کە بوترایە فەیلەسوف مەبەست«ئەرەستو» بو ، وە یا چون لەباسی شاعرانی کورد دا بوتری«مەلا» مەبەست شیخ احمدی جزیری‌یە ئەویش وابو . .

« ڤەرجیل » بویە ئاوروپاییەکان لە سەدەکاني ناوەراستدا بەرزیان کردبوەوە و « دانتی »یش لە سەدەی سیانزەهەمدا هەر بە « رابەر »ی ناو ئەبرد چونکە بەبی‌ کیشە تاقە شاعرێکی رومان بو . بویەش تاقانە بو چونکە « بەستەی شوان ـ اناشیدالرعاة »ی هەبو ، کە شوان چون لە لادیی‌دا رائەبویری و لە بەین یەکدا دەست ئەکەن بە دەمەگالتە و چیروک گیررانەوە ؟. ئەبویست بەم شعرانەی شان بدا لە شعری « تیوقریتس » لە یونانندا !. شاني لی‌داولیشي پیشکەوت چونکە « ڤەرجیل » ئارەزوی دیەني تەبیعەتی بو، باسی باخەکاني شیمالي ئیتالیای ئەکرد کە تیایانا دانیشتبو. هەر لەبەر ئەم شعرە لادی‌یانەی بو کە « ڤەرجیل » بو بە شاعریکي ڤەومي‌ی ئیتالیای کون وتازە ، بویەش وای لی هات چونکە باسی دیەنەکاني ئیتالیای بەجوری ئەکرد ، کە شاعریکی‌تری رومان نەیکردبو . بویەش کەوتبوە سەر ئەم هەوایە چونکە چاوي بە بررە بیشەلانەکەی باوکی کەوتبو ئیتر بەستەی شواني بودانا .. پاش ماوەیەک « روما » تیکچو ئەمیغیان برد بو محا کە ، توزی دلي بە خوی خوش کرد ، گویا بە هوی زمانپاراوی‌یەوە رزگاری ئەبیت و لە پاشا ئەبی بە محامی و بەم ئیشەی زیاني لادي لا ئەبا ، کەچی لە محکەکەیدا زماني پیکاهات و ئەو ئارەزوەی بو نەهاتە دی ! . . وتی ئەبم بە میژونوسي رومان ، سەیری کرد هیچی لی نازانی !. لە پاشا گەررایەوە بو

لادێو چاوی برینەوە بیعەلانەکەی باوک و دەستی داوەوە بە شعری دیعەنی تەبیعەتەوە . لەمەوە بو ئەو جورە شعرانە کە جوتیارو شوانـ ئەیلێن . زورتریش کە کەوتە سەر ئەم جورە شعرانە ـ شعری جوتیار ـ ( میسناس) وەزیری ( ئوغستس ) هانە هانەی ئەدا ، ئەمەش بو ئەوە کە لادیەکان بچنە شارەکانەوە . . ( دْرَیْدِنْ ) شاعری گەورەی ئینگلیز ئەم بەشە شعرەی ( ڤەرجیل ) ـ کە باسی دیعەنی تەبیعی ئەکا ـ لە لاتینیەوە کردویە بە ئینگلیزیو بەلاغەتی تیدا نواندوە،لە ئینگلیزیەکەشەوە کراوە بە عەرەبی.

ئەمە نمونەیە کە لەو شعرانەی کە باسی بەهار ئەکا :

« بەهار هات جەنگەڵی جوان کردو گەلای تازە کردەوە .. مندالدانی زەوی دەمی کردەوە بو توو . . لەو کاتەدا گەورەی خواکان لە بەرزیەوە هاتە خوارەوە . . بو ئەوە بررژیتە ناو بوکە تازە جوانەکەیەوە ـ کە ئەو نمەبارانانەن و شت ئەرروێنن . . ئەندامی لەگەل لەشی بوکەدا تیکلاوبو . . پرروشەگیا دەستی هینا بە خویا . . بەیارمەتی خوا گژوگیا خەملیو بو بە گولاله . . بالندە دەنگە خوشەکان رویان کردە جەنگەلانە تەریکەکان . گیانەبەر ـ کە تەبیعەت دەستی تیانەوە ژەندبو ـ رەنگی دلداری و غەزەل ـ خوانیان هەلهینایەوە ... »

( ڤەرجیل ) شاعری رومان لە باری دیعەنی تەبیعەتدا بەم جورە ئەسپی خوی تاوداوە . (حاجی‌قادر)ی کویی‌ش لەمەیدانی دیعەنی بەهارا ـ کە دیعەنی تەبیعەتە ـ بە(٥٢)شعر مەیدانداری ئەکا . ئەمە نمونەیەکە لەو بررە شعرەی:

وتم بە بەختی خـەوالو بەسە ئەتوبی خوا
لە خەو هەلستە زەمانی بچورەوە ئـەولا

گوررەی بەهاریە ، ئیستیکە شاخو داخی چیا
پررە لە لالەو نەسرین و نیرگس و شـەملا

له گرمه گرمي سه‌حاب وا، له هاژه‌ی باران
چیایه پرر له هه‌راو و ، نه‌وایه پرر له سه‌دا
پرره له سیل و له گولاوه‌کانی روی زه‌مین
پرره له به‌رق‌و بریقه‌ی بروسکه جه‌وّی سه‌ما!
شکوفه دره‌ه‌می شاباشي بای وه‌عده ده‌کا
له شه‌وق مه‌قده‌مي خه‌ملیوه دارو به‌ردی چیا
پیاله‌ی زه‌رری نه‌رگس له سه‌ر که‌فی سیمین
پرره له شه‌بنمی وه‌ک دررو لؤلؤو لالا
گولیش به به‌نجه‌ی فـه‌یروزه جامی یاقوتی
له‌بو نثار مه‌یـــایه پرر له زه‌ررو ته‌لا
له شادي وه‌ک سه‌فی شاني ، له کیوو که‌ژ ئه‌زهار
هه‌زا به خه‌لعه‌تي گولـگون ، ده‌که‌ونه ره‌قس‌و سه‌ما
چه‌مه‌ن له لاله میسالی خه‌تی روخي دلبه‌ر
سیاه چادری لی‌بوته خالي ســه‌ر گونا!
له‌کن بنه‌وشــه‌و وخاوو هه‌لال‌و بــه‌یبونی
میسالی پیسته‌ی خاوه عه‌بیری میسکی خه‌تا
چیا له ته‌وقي ســه‌ری دارژاوه تا که‌مه‌ری
چو زولفی په‌ررچه‌ی دره‌هم، چوپه‌ررچه‌ی په‌رره‌زا .
به‌جوشي ئاگری گولناري کاني هه‌لده قولی
میسالی دیده‌ی وامق له حه‌سره‌تی عه‌زرا !

... ... ... ... ... ... ... ...

ئه‌گه‌ر ئیسته راسته‌و راست پیاو سه‌یری شعره‌کانی (فه‌رچیل)و(حاجی‌قادر) بکا ئه‌لی ئه‌وانه‌ی که فه‌رچیل وتونی نابی له به‌رامبه‌ر هینه‌کانی حاجی‌قادره‌وه به شعر ناو ببرین ، بویه‌ش وا ئه‌لي چونکه ته‌ماشای رواله‌ته‌کیان ئه‌کا

ئیتر چاو لەوە ئەپوشي کە هەر شتیک وەرگیررابە سەر زمانیکيتر جەمالي عبارەتي تیک ئەچی . . ئیمە کاریکان نەبیت بەسەر قافیەو وشەکانیانەوە چونکە هینەکەی ڤەرچیل لەئەسلي لاتینیەکەدا لە عبارەتدا ئەگەر لە هینەکەی حاجی زیاتر نەبی کەمتر نیە . . دیسان توخنی ئەوەش ناکەوین کە ( ڤەرچیل ) وەکە شاعریکی یونانی لە شعرەکانیا دەی بو فەلسەفەش بردوە . بەلکو هەر قسە تەنیا لە فیکرەکەدایە ، ئەو فیکری بو دیەني تەبیەت چوە و باسي کردوە ، حاجیش لای لە دیەني تەبیعي کردوتەوە و خوی تی هاویشتوە . ئەگەر تەنها سەیری ئەم پەردەیە بکەین ئـەم ئەدەبی کوردیە ئەگەر لەو ئەدەبەی رومانيیە زیاتر نەبی شان بەشاني ئەو هەر ئەرروات . بویەش ئەرروا چونکە ئەگەر ( ڤەرجیل ) چاویکي بە کتیبەکانی یونان کەوتبیت حاجی چاوی بەچی کەوتوە ؟ . . راستە حاجی ئەم شعرانەی لە ئەستەمبول وتوە ، بەلام بو دیەنپەرستي وەکو هەر لە کوردەواريدا بوبیت وایە ، وەنەبی کە لە کوردەواري دور کەوتوتەوە ئاسوی فیکری لەباری دیەنپەرستي یا ، باسي دیەندا لیک کشابیتەوە !..

* * *

ئەقلي روماني بو بەشوین کەوتني فەلسەفە شوین پي یونانیان هەلئەگرت . « لوکریشس » شاعری رومانـ ئەیویست فەلسەفە لەشعردا جی بکاتەوە . ئیجگاریش ئەو بررە شعرە فەلسەفیە ئەدەبیەکەی کەناوی نابو « تەبیعـەتي هەموشت» زور زور پیوە ماندو بو ، هوی ماندوبونەکەشی فەلسەفەکە بو ، کە نەیئەهیشت قافیەی شعرەکاني بوبیتەوە ، بەلام گویی بەگراني فەلسەفە هـەر نەئەداو شعری بەقافیەی خوی هەر دائەنا . ئەم شعرانەی « لوکریشس » وینەیەکن بو شعری لاتینیەکي ئیجگار بەرز ، تەنیا « ڤەرچیل » نەبی کەس ناتوانی پیشي کەوی . ئەمهەمو عەزیەتەی کیشاکەچی هەر لەچنگ رەخنە-گرەکان رزگاري نەبوا ، پیان ئەوت ئەو باسە ئەوگرتویە بە دەستەوە بوشعر

نا. کونجی چونکه نه ، وشەو نه وەزن و نەقافیەی لەوانه نیە که له ریزی شعره جەره بەرزەکانا دابنرین ! ..

لەم شعرانەی « تـەبیعەتی هەموشت » فەلسەفەی ئەبیقوری یەکان دەربـ ئەبرریت ، له هەندی شویلیا لەوانەیه رەخنه گر هەلی دەست کەوی ، چونکه ئەلی : « شت ، شت نیه » . که ئەلیت ئەو شته وەکو ئەو شتەوایه ئەوەیکیکیان لەوی تریانەوە پەیدابووه .. کەون لەبوشایی و لەگەرد پیک هاتووه .. مادە تیا ناچی » . ئینجا لەسەر گەرد ( ذره )و بزوتنەوەی گەرد ئەررواو دریژەی ئەدانی که ئەجسام چون پەیدا ئەبیو چون تیا ئەچی ؟ .. کەسەرئەکەی لـەم جورەشتانه شعر ناتوانی بیانکریته خوی ، کەوابو رەخنه گرەکان ناهەقیان نیه !

( لیونارد ) شاعری ئەمەریکی هـەموشعرکانی ( لوکریتس ) ی کردوه بەئینگلیزی ، ئەمه نمونەیەکه لەو شعرانەی ، که ، رو له ئەبیقور ئەکاو ئەلی :

(تو ! ئەو کەسەی بەرزت کردوتەوە له تاریکیدا . روناکیەکی که ریگەی پی رون ئەبیتەوە بو کامەرانی.. تو ! ئەی سەرمایەی شانازی یونان ! من شوینت ئەکەوم .. شوین پیەکەت هەلئەگرم هەنـگاو بەهەنـگاو .. بەربەرەکانیت ناکەم بەلام وەکو تو ئەکەم .. ئایا پەررەسیلـکه بەربەرەکانی ( قو ) ئەکا ؟! ـ ( قو ) مەلیکی مل دریژی جوانه لەئاودایه ـ ) ...

لەو وەختەدا که زەوی بەرگی سەوز ئەپوشی ئەلی :

(زەوی لەو وەختەوە پەیدا بووه بەهەمو وینه گیای رواندوه .. گیای لیروا به بیخەوش ، چه ، بیدەشتی ، چه ، سەرکیوی .. میرگی جوان بو بەگولی زەردو سور .. دارەکان خەریکی ئەوەبون رقەبەری لەگەل یەکی بکەن بو بەرز بونەوە .. بەلەوەر و گیانلەبەر هەموجلی پەرر و موو ، فەرایان لەبەر کرد .. زەوی جوانی بەدیەن گیاو داری روانـد .. ئینجا لەناو سکیەوە گیانلەبەری حەرکردو ئەوانه لەوەرران .. لەپاشا گیانلەبەرەکه کەزوربو ، بوبه هەمو

رەنگ و شکلیک . . وەکو بە زموی دایکانەوە گوملن لەدایکیتیدا بیە . . ژیان تیکررا لەوەوە هات . ) .

***

مەلای جزیری لە بابەت فەلسەفەی وەحدەتەوە بررە شعریکی هەیە ئەگەر لە رواڵەتا لەگەل هینەکەی (لوکریتس) جیابن لە ئەسلی فەلسەفەکاریدا یەک ئەگرنەوە ، بەلام تەنیا فەلسەفە ئیتربەرزی ونزمی هەرکامیان ئەوە شعرەکان خویان دەری ئەخەن . جائەمە نمونەیەکە لەو بررە شعرەی مەلا :

... ... ... ... .. ... ... ...

فەرق واحـــد ژ ئەحـەد لی دمقامی صمدی
بەحقیقەت کو یکن هەردو ، چە واحد چە احــد

یەکە دەریا تو بزان قەنج ، چە مەوج و چە حباب
داصلدا حکو حەی ئاڤە ، چە ئاڤ و چە جەمەد

ئافتاب احـدیت لە خودا گرتیـــە کون
نەکو حوسنەک هەیە لی گرتیە چەمشینی مە رەمەد

حوسن وزانی بوت ولاتان ژ جـەمالی صمدە
ژمثالا صنمی وەکو تـەجەلا بـەصمـد

.. ... ... ... ... ... ...

بابە تاهری هەمەدانیش ئەلی :

بەهـار ئایی بەهــەر لالە دلی بی — بەهەر لالە هـەزاران بولبولە بی
بەهەر مـەرزی نیارەم پا نهادەن — مەباد ئەز مو بەتەر موتە دلی بی

پیاو کەبەراوردی فەلسەفەی ئـەدەبی ئەم دو قەومە ئەکا — رومانی و کوردی — ئەلی ئایا چەکارەساتیک بووە کە تەنگی دریژی زمانی هیناوەتەوە یەک بو ئەوە ئەم دو فیکرەیە بگەنەوە بەیەک !!؟...

ـــــ ٥ ـــــ

# دوایی

خوم گەلی بە بەختیار ئەزانم کە خوا یارمەتی دام و توانیم لە ماوەی چەند سالدا بە کوششی فیکری و مالی ئەم کتیبە ـ کە میژوی ئەدەبی کوردی ـ وە یا بە واتەیەکی فراوانتر « دائرة المعارفی کوردی » یە بینمە بەرهەم و پیشکەشی بکەم بە قەومی خوشەویستی کوردو بە هەمو بیگانەیەک . رەنگی بزانری کە ماوەیەکی دریژ قەلەمی نوسەرەکانی کورد لە سەر لاپەرەکانی « گەلاویژ » ـ ئەو گەلاویژە کە تاقە گوڤاریکیان بو ـ ئیشی ئەکرد ، منیش بە شانازیەوە ئەم وت دو گوڤاری گەلاویژ و « نزار »تان پیشکەش ئەکەم . کە ئەوان ئاوابون من هەر مامەوە ! . هەر ئەو مانەوەیەم بو کە هینام ئەدەبی کوردیم کرد بە کوشکیک و بە دنیایک ، بەلام نەک بە کوشکیکی دارو بەردو ، چونکە ئەو جورە کوشکانە خویان ناگرن لە بەر پلاری گەرمای هەتاوی هاوین و سەرمای بەفری زستانا زوتیا ئەچن ! کردم بە کوشکیک نە ، باکی بە کلپە و بلیسەی هەتاوی هاوین بی ، نە بە توف و کریوەی بورانی زستان ! تا دنیا دنیا بی وەکو نیشانی سەرتاجی پادشاهان هەر بیریسکیتەوە ، ئەمەش بو ئەوە ئەدەبی کوردی و قەومی کورد بچنە ریزی ئەدەب و قەومی عالەمەوە . جا هیوادارم ئەو قەومە ئەم دیاریەم لی وەربگرن و ئەوان ئەم دنیای روحیە بکەن بە دیاری بو جیهانی ئیستەو لەمەودوا . .

۳ ی ربیع الاول ۱۳۷۲ } بەغداد<br>
۲۱ ی تشرینی دوەم ۱۹۵۲ }

علاء الدین سجادی

# بو دانانی ئەم کتیبە ئەم سەرچاوانە تەماشا کراون

١ ـ تاریخی ئاشوری کون : سیر سدنی سمیث . چاپی لەندەن ١٩٢٨

٢ ـ دانیشتوەکانی شیوی رافدەین : اذئم سپایزر . چاپی فیلادلفیا ١٩٣٠

٣ ـ چوار سەدە لە تاریخی تازە : ای . اج . لونگریک .
« اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث »
چاپی لەندەن ١٩٢٥

٤ ـ گەشتەکەی ای . بی . سون . چاپی لەندەن ١٩١٣

٥ ـ یادداشتی ای . بی . سون لە بارەی کوردەکانی جنوبی .
چاپی بەغدا ١٩١٨

٦ ـ لە دەریای سپیەوە تا خلیجی فارسی : دوکتور ماکس فرایهرن .
چاپی بەرلین ١٩٠٠

٧ ـ لە تەوریزەوە تا تەختی سولەیمان : ا . ج . بی . رولسون . ١٨٣٨

٨ ـ کوردستان ، پیش کو : سی . جی . ئیدموندس . چاپی لەندەن ١٩٢٢

٩ ـ وردبونەوەکانی : فون لوشان و سولاک و ئوژەرپیتەر .

١٠ ـ نوسینەکانی : مینورسکی و نیکتین لە ئینسکلو پیدیای بریتانی‌دا(*) .
چاپی لەندەن ٢٩ ـ ١٩٣٧

١١ ـ توراة ـ عهدالقدیم : انجیل ـ عهد الجدید . بە تەرکی (رچارد واطس)
چاپی لەندەن ١٨٢٢

---

(*) ناوی کتیبی روژهەلاتی ناسەکانم هەر بە کوردی نوسی ، چونکە من کتیبم بو کورد نوسیوە ، ئەوانەی ئینگلیزی ئەزانن ناوەکانیان وەر بگیرنەوە سەر ئینگلیزی . بەلام هی عەرەبی و فارسیە کە کورد خوی ئاشنایەتی .

١٢ ـ تاریخی تەبەري : محمدی کوڕی جەریر . چاپی قاهره ١٩٣٩

١٣ ـ مروج الذهب : عەلی کوڕی حسینی مەسعودي . چاپی قاهره ١٩٣٨

١٤ ـ تأریخی کامل : ابن ئەثیر . چاپی قاهره ١٣٣١ هـ .

١٥ ـ تاریخی ابن خلدون . چاپی قاهره ٨٠٨هـ

١٦ ـ تجارب الامم ـ ابن مسکویه . چاپی قاهره ١٩١٤

١٧ ـ دائرة المعارف الاسلامي : محمد فەرید وەجدی . چاپی قاهره ١٢ ـ ١٩١٨

١٨ ـ مفصل جغرافیای عراق : طه هاشمی چاپی بەغدا ١٩٣٠

١٩ ـ گەشتەکەی میستەر ریچ : تەرجەمەی بهاءالدین نوري .

چاپی بەغدا ١٩٥١

دانانی بە فەرەنسی کامیران جەلادەت بەدرخان

٢٠ ـ القضیة الکردیة : دوکتور بلەج شیرکو . وەرگێڕانی محمد علي عوني چاپی قاهره ١٩٣٠

٢١ ـ من عمان الی العمادیه : عەلی سەیدو گوراني . چاپی قاهره ١٩٣٩

٢٢ ـ التعریف بمساجد السلیمانیه : ماموستا شیخ محمدی قزلجی .

چاپی بەغدا ١٩٣٨

٢٣ ـ خلاصة تأریخ الکرد و کردستان : محمد امین زکی بەگ .

چاپی قاهره ١٩٣٩

٢٤ ـ تأریخ الامارات والدول الکردیة : محمد امین زکی بەگ

چاپی قاهره ١٩٤٨

٢٥ ـ مشاهیر الکرد و کردستان . بەرگی (١) محمد امین زکی بەگ

چاپی بەغدا ١٩٤٥

٢٦ ـ مشاهیر الکرد و کردستان بەرگی (٢) محمد امین زکی بەگ

چاپی قاهره ١٩٤٧

٢٧ ـ عشائر العراق الکردیة : ماموستا عباس عزاوی محامی .

چاپی بەغدا ١٩٤٧

٢٨ ـ المنشى البغدادي : تەرجەمەی مامۆستا عباس‌عزاوی محامی
چاپی بەغدا ١٩٤٨
٢٩ ـ تأريخ الآلهة : فاروق الدملوجي — چاپی بەغدا ١٩٥٠
٣٠ ـ تاج العروس : سيد محمد مرتضى الحسيني . — چاپی قاهره ١٣٠٧ ﻫ
٣١ ـ الياذة هوميروس لەگەل شەرح : سليمان بستانى — « « ١٩٠٤
٣٢ ـ معجم الادباء : ياقوتى حەمەوى . — « « ١٩٣٦
٣٣ ـ عقد الفريد ، ابن عبد ربه — « « ١٩٤٠
٣٤ ـ تەفسیری بیضاوی . — « « ١٣٥٥ ﻫ
٣٥ ـ شفای ابن سینا — چاپی دارالفنون ١٣٠٣ ﻫ
٣٦ ـ قصة الادب في العالم : احمد امين وزكى نجيب محمود .
چاپی قاهره ٤٣ ـ ١٩٤٨
٣٧ ـ احياء علوم‌الدين : غزالى . — چاپی قاهره ١٩٣٣
٣٨ ـ تأريخ الفلسفة الحديثة : يوسف كرم . — « « ١٩٤٩
٣٩ ـ المدخل الى علم النفس : صالح الشماع . — چاپی بەغدا ١٩٥١
٤٠ ـ الفلسفة الشرقية : دوكتور محمد غلاب . — چاپی قاهره ١٩٣٨
٤١ ـ قصة النزاع بين الدين والفلسفة : دوكتور توفيق الطويل .
چاپی قاهره ١٩٤٧
٤٢ ـ شرح المواقف : سيد شريف جورجانى — چاپی قاهره ١٩٠٧
٤٣ ـ دائرة المعارف الاسلامى — « « ١٩٣٧
٤٤ ـ تاريخ الدول العلية العثمانية : محمد فريد بەگ . — « « ١٨٩٦
٤٥ ـ تأريخ اوربا الحديثة : علي حيدر سليمان . — چاپی بەغدا ١٩٣٢
٤٦ ـ المدنية الجديدة : يوسف ضياء الدين پاشا الخالدى .
چاپی ئەستەمول ١٣١٠ ﻫ
٤٧ ـ تأريخ الأدب العربى : احمد حسن الزيات . — چاپی قاهره ١٩٠٢

٤٨ ـ تأريخ هيرودوتس له فەرنسیەوە : حبیب بسترى .
چاپى بيروت ٨٦ ـ ١٨٨٧
٤٩ ـ الادب التمثيلي اليوناني . سوفوكليس : تەرجەمەى ( طه حسين ) .
چاپى قاهره ١٩٣٩
٥٠ ـ اليزيديه : عبدالرزاق حسنى . چاپى بەغدا ١٩٢٩
٥١ ـ تأريخ ايران قديم: حسن پيرنيا ـ مشيرالدولة . چاپى تاران ١٣٠٨ . ش
٥٢ ـ تأريخ عالم آراى عباسى . چاپى تاران ١٣١٣ ﻫ
٥٣ ـ تأريخ سرجون مالـكولم . چاپى لەندەن ١٨٢٩
٥٤ ـ تأريخ شرفنامه : ئەمير شرفخانى بتليسى . « قاهره ١٩٣٠
٥٥ ـ تأريخ بيهق : محمد كوررى حسينى بيهق . چاپى تاران ١٣٢٤ . ش
٥٦ ـ كورد و پيوستكى نژادى وتأريخى او : رشيد ياسمى .
چاپى شركة چاپخانەى تابان
٥٧ ـ كردستان : علي اصغر شميم همدانى . چاپى تەوريز ١٣٩٢ . ش
٥٨ ـ روضة الصفا : رضا قلى هدايت . چاپى تاران ١٣٠٧ ﻫ
٥٩ ـ حبيب السير . غياث الدين . « « ١٢٧١ ﻫ
٦٠ ـ كتاب تأريخ سال يكم و دوم دبيرستانها . چاپى تاران ١٣٢٠ . ش
٦١ ـ آثار عجم : محمد نصير فرصت شيرازى . چاپى بمبي ١٣٥٤ ﻫ
٦٢ ـ دينكرد . تأريخى ئاويستاو ئەدەبيانى پەهلەوى : محمد جواد مشكور .
چاپى تاران ١٣٢٥ . ش
٦٣ ـ گلستان سعدى . « بمبى
٦٤ ـ شاهنامه : فردوسى . باهتمام مرتضى‌ى حسينى چاپى بمبى ١٣٠٨ ق
٦٥ ـ تأريخ ادبيات فارسى : بديع الزمان خوراسانى چاپى تاران ١٣١٤ . ش
٦٦ ـ تأريخ ادبيات ايران : دوكتور رضا زاده شفق . چاپى تاران ١٣١٣ ﻫ
٦٧ ـ فرهنگە نفيسى . چاپى تاران ١٨ ـ ١٣١٩ . ش

٦٨ ـ تأريخى كوردو كوردوستان : ماموستا شيخ محمدى ايت الله كردستانى
له روژنامەى « كوهستان »
٦٩ ـ فەلسەفەى ئيران باستان ( انتشارات انجمن زرتشتيان )
چاپى بمبى ١٣١١ . ق
٧٠ ـ مزديسنا وتأثيرآن در ئەدەبيات فارسي : دكتور محمد معين
چاپى تاران ١٣٢٦ . ش
٧١ ـ حافظى شيرازى : بەسرمايەى ( بنگاه پەروين ) « « ١٣١٩ . ش
٧٢ ـ تأريخ سليمانى : محمد امين زكي . چاپى بەغدا ١٩٣٧
٧٣ ـ شعر و ئەدەبياتى كوردى : ماموستا رفيق حلمى . « « ١٩٤١
٧٤ ـ گوڤارى گەلاويژ .
٧٥ ـ گوڤارى دەنگى گيتى تازە .
٧٦ ـ گوڤارى هاوار .
٧٧ ـ گوڤارى ديارى كوردوستان
٧٨ ـ كەشكولەكەى محمود پاشا .
٧٩ ـ روژنامە كوردى‌يەكان .
٨٠ ـ ديوانە كوردى‌يەكان .
٨١ ـ سوراخە دەستخەتە كورديەكان ، كە لاى خوم هەيە .



# ناواخن